

مەیجەر سۆن

# گەشتێک بۆ میسۆپۆتامیا و کوردستان لە بەرگی نادیاردا

لەگەڵ تێبینییە مێژووییەکان

لەبارەی تیرە و خێڵەکانی کورد و کلدانەکانی کوردستانەوە

مینە

لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە






٢٠١٨




**لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی یادگار- سلێمانی**

**ناوی کتێب: گەشتێک بۆ میسۆپۆتامیا و کوردستان لەبەرگی نادیاردا...**

**ناوی نووسەر: ئی. بی. سۆن ( مەیجەر سۆن )**

**وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: مینە**

**بابەت: مێژوویی**

**تایپ و دیزاین: مینە**

**نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم/ ساڵی 2018**

**تیراژ: 1000 دانە.**

**نرخی: 8.000 دینار**

**ژمارەی سپاردنی ( 922 ) ساڵی 2017، لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان پێدراوە.**

مەیجەر سۆن

# گەشتێک بۆ میسۆپۆتامیا و کوردستان لە بەرگی نادیاردا

لەگەڵ تێبینییە مێژووییەکان

لەبارەی تیرە و خێڵەکانی کورد و کلدانەکانی کوردستانەوە

مینە

لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە

2018

# پێرست



وێنەی سەرۆکێکی جاف، باشووری کوردستان

# پێشەکی وەرگێڕ

سەردەمانێك گەشتیاران، بە هەموو گۆشەو کەنارەکانی جیهاندا بڵاوبووبوونەوە، هەریەکە بە مەبەستێك و بۆ وردبوونەوە و لێکۆڵینەوە لە بواری ئەو بابەتانەی، کە خوازیاربوون توێژینەوەی لەبارەوە بکەن، دەستیان بە پشکنین کردووە.

ئەم گۆشە دوور و تەریکەی وڵاتی کوردنشین، هاوشێوەی میللەتانی دەوروبەری، ژمارەیەك گەشتیار و مژدەدەرانی لە قۆناغە جیاجیاکاندا بۆ هاتووە، هەر یەکەیان بە خواستی تایبەتی خۆیان و بە فرمانی ئەرکی سەرشان، ماوەیەکی دیاریکراو لە وڵاتی کورداندا ماونەتەوە و لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی خۆیان جێبەجێکردووە و گەڕاونەتەوە.

مەرج نییە ئەو گەشتیارانە هەر هەموویان، کاتێ کە هاتوونەتە ئەم وڵاتانە، لەڕووی چاکخوازی و بۆ خزمەتی لایەنێك لە مێژووی مرۆڤایەتی، یان باری کۆمەڵایەتی ئەو میللەتانەی لەسەر ئەو خاکانە دەژیان، هاتبێتن و تەنیا لەپێناوی خزمەت بە مرۆڤایەتیدا ئەو کارانەیان جێبەجێکردبێت. هەروەها ئەوەش راستە کە لەپاڵ ئەو ئەرکەی پێیان سپێردراوە، زۆرێك لەوانە، لە کارەکانیاندا کاری زۆر مرۆیانە و پڕ بە پێستی واتای چاکخوازی، زۆر شتیان پێشکەشی مێژووی مرۆڤایەتی کردووە.

ئەوەی من لێردا دەمەوێت تیشکی بخەمە سەر، ئەو کارە نایاب و پڕ لە زانیارییە دۆستانەیەی (مەیجەر سۆن)ە، کە لەپاڵ جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی بۆی هاتووە، زۆر لایەنی شاراوە و نادیاری لە بواری مێژوویی، باری کۆمەڵایەتی، کەسایەتی تاکی کورد، کولتوری نەتەوایەتی، لایەنی جوگرافیای ناوچەکە، پەیوەندی ئەو میللەتانەی دەوروبەریان و زۆر لایەنی تریشی بەوپەڕی راستگۆیانە و نەترسانەوە ئاماژە و دیاریکردووە.

ئەم بەرهەمە وەك سەرچاوەیەکی مێژوویی، ئەمڕۆ لە رووی زانستی بابەتیانەوە، نەتەوەی کورد دەخاتە ئاستی بەرپرسیارێتی ئەوەی، کە چاوێك بە مێژووی خۆیدا بگێڕێتەوە و کەم تا زۆر خوێندنەوە بۆ ئەو زانستە بکات، بەپێی سەردەم و قۆناغە مێژوویەکان، هەڵە و راستی ئەو زانستە دەبێ دیاریکرێت، تا بتوانرێت لە داهاتودا گۆڕانکارییەك لە ئاستی ژیانی سەردەمیانەی خۆیدا بکات.

ئەوەی تەواو ئاشکرایە ئەوەیە، کە نەتەوەی کورد تا ئەم چرکەساتەش نەیتوانیوە پەیوەندی مێژوویی و سیاسیانەی خۆی لەگەڵ میللەتانی دەوروبەریدا، بەشێوەیەکی زانستیانە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەڵکو زۆرجار هەڵسوکەوتی سادەوساکاری سۆزداری کاریگەربووە و گوێ نەدراوە بەلایەنی توێژینەوە و خوێندنەوەی مێژوویی بۆ ئەو پەیوەندیانە. هەر بۆیە تا ئەمڕۆش بە ئاشکرا لاوازی لەو ئاستەی مێژووی نەتەوەی کورد - دا دەبینرێت.

لەدیدی نووسەری ئەم کتێبەوە، کە گەشتیارێکی بە رەگەز ئینگلیزە و بە مەبەستی تایبەتی و بەرژەوەندی دەسەڵات و دەوڵەتەکەی خۆی هاتۆتە ئەم ناوچەیە. ئاماژەدەکات بە زۆر لایەنی باری نەتەوایەتی، شوێنی کورد لە وڵاتەکەدا، پەیوەندی لەگەڵ میللەتانی دەوروبەر، لە رووی ژیانی پیشەیی و جۆری مامەڵەکردنی لەگەڵ روداوەکانی سەردەم. هەروەها لە زۆر لایەنی تری وەك زمان، جۆری دیالێکتە جیاوازەکانی ئەو زمانە و پەیوەندی نێوانیان، ئەدەب بە هەموو شێوەکانی کە لەو رۆژگارەدا بەرچاوبووە، جلوبەرگ و رەنگانەوەی لەسەر ئاستی کەسایەتی کورد، تاکی کورد و بیری نەتەوایەتی. هەروەها لە رووی شوێنی جوگرافیای وڵاتەکە و کاریگەریی لەبارەی هەڵسوکەوت و جۆری بیرکردنەوە و مامەڵەکردنی نەتەوەی کورد بەو کاریگەرییە، کە تا ئەمڕۆش لە زۆر کتێبی مێژوویی کە بە پێنوسی دوژمنانی ئەو نەتەوەیە نووسراوە، کەم تا زۆر ئاماژەیان بەو لایەنانە نەکردووە، کە نووسەری ئەم کتێبە لە رووی زانستیەوە هەندێ لایەنی خستۆتە روو، کە بە ئاشکرا تەنیا خاڵی لاوازی میللەتێکی وەك کورد نییە، بەڵکو هاوشێوەی نەتەوە چیانشینەکانن. ئەو میللەتانەشی لەو لایەنانەوە بەو شێوە هەڵەیە مامەڵە لەگەڵ مەسەلەی نەتەوایەتی کورد دەکەن، هەرگیز نەیانویستووە بەهیچ جۆرێ بەدیدێکی زانستیانەوە بڕواننە ئەو لایەنە. هەمیشە بۆ بەرژەوەندی خۆیان زۆر شتیان پشتگوێ ناوە، کە من لێرەدا راستەوخۆ لۆمەی ئەو لایەن و دەسەڵات و سیستمانە ناکەم، کە ئەو راو بۆچوونانەیان لەبارەی کوردەوە هەبووە و تا ئەمڕۆش بە دڵنیاییەوە هەیانە. بەڵکو خودی کورد بەرپرسە لە گۆڕانی ئەو دید و بۆچوونانەی دۆست و دوژمنانی کورد. چونکە تا ئەمڕۆ کەم تا زۆر تیشکێکی لاوازیش بەدیناکرێت لە هەوڵ و کۆششێکی زانستیانە بۆ نەهێشتن و قەڵاچۆکردنی ئەو هۆ و هۆکارانەی کە لاوازی بەسەر نەتەوەی کورد - دا دێنێت.

لێرەوە پێویستە زیاتر روون و ئاشکراتر بدوێین و ئەو بابەت و لایەنانە کە نووسەری ئەم کتێبە زۆر بوێرانە ئاماژە و دیاریکردووە، لێی بکۆڵینەوە و بزانین ئەگەر هەڵەن، ئایا شیاوی راستکردنەوەن،

یان وەکو برۆ هەر دەبێت بەسەر چاوە ڕەشەکانی کوردەوە بێت. ئەگەر ڕاستیشن، ئایا مەودای بەرفراوانکردنی ئەو ڕاستیە هەیە، تا لەبەرژەوەندی نەتەوەی کورد بخرێتە گەڕ و لە داهاتوودا بتوانرێت کەم تا زۆر گۆڕانکاری لە ڕەوتی مێژووی خۆیدا بکات.

بە بۆچوونی نووسەری ئەم کتێبە پێکهاتە و بنەچەی نەتەوەی کورد بریتیە لە شێوە خێڵایەتی و خۆی لە قەوارەی دەیان تیرە و هۆز و خێڵدا دەبینێتەوە. هەروەها چونکە شوێنی وڵاتی کوردان زیاتر سەخت و شاخاوییە، بۆیە ئەو دیاردەیە هاوشێوەییەك لەگەڵ میللەتە چیانشینەکانی تریشدا پەیدا دەکات، کە بەپێی زانستی ethnology – نەتەوەزانی، یان نەتەوەناسی. ئەو میللەتانەی لەناو شاخەکاندا دەژین، دەکەونە ژێر کاریگەریی ئەوەی کە بەپێی سەختی شوێنەکە میزاژی دڕندەیی، توندوتیژی، سەرەڕۆیی، پیاوکوژی و خوێنڕێژی تێدا سەرهەڵدەدات و لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا پیادەیدەکات و مامەڵەی پێوە دەکات. هەروەها هەر بەپێی ئەو زانستە هەندێ هۆکاری تریش هەیە، هاندەری ڕاستەوخۆی پیادەکردنی ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانەیە. لەوانەش: نەبوونی زەوی و خاکی کشتوکاڵی، کە بە دەگمەن لەناوچە شاخاویە سەختەکاندا کشتوکاڵ دێتە بەرهەم. هۆیەکی دی، دووری یان نەبوونی شار و شارۆچکەی بازرگانی لەو ناوچانەدا، کە تیرە و خێڵە شاخاوییەکانی تێدا دەژین و ئەوەش دوریاندەخاتەوە لە شێوازی شارستانی. ئەوانە و زۆر هۆکاری دی دەبێتە هاندەر لە دروستکردنی تاکی ڕاوچی و خوێنڕێژ و دز و جەردە و ڕێگردا. هەروەها بۆ دابینکردنی پاوان و لەوەڕگای ئاژەڵەکانیشیان، ناچارن لەگەڵ خێڵ و تیرە و هۆزەکانی هاونەژاد و هاوڕەگەزی دەوروبەریاندا، هەمیشە لە ناکۆکی و دوژمنایەتیدا بن و بگرە زۆر جار دەبێتە هۆی ئەوەی کە هاوئاهەنگیش بێت لەگەڵ دوژمنانی ڕاستەوخۆی نەتەوەکەیاندا، تەنیا لەبەر هەندێ لەو دەستەکەوتە لاوەکیە سادەوساکارانەی لەلایەن دوژمنەوە بەڵێنی درۆیان پێدراوە، کە لەوانەیە لەمیانەی وتوێژێکی دۆستانە و برایانە و هاوڕەگەزیدا، بگەنە ئەنجامێکی شیاو و گونجاوی ئەوتۆ، کە هەردوو لایان لە قازانج و زیانیشدا پێکەوە هاوبەش بن، هەروەها ببنە هێزێکی گەورەتر بۆ بەرەنگاری دوژمنانی بێگانە و ئەوانەی دەخوازن وڵاتەکەیان داگیربکەن و خۆشیان لەناوبەرن.

لە مێژووی پیاهەڵکژان و چنگچوون بە خوێنی یەکتردا، دەیان و بگرە زۆر زیاتریش نمونەی پڕ لە ئەنگی لە مێژووی نەتەوەی کورد- دا تۆمارکراوە، کە ئەگەر زانیستیانە هۆکارەکانی بەرپابوونی ئەو ئاژاوە و خوێنڕشتنانە شیکرێتەوە و بەدواداچوونی بۆ بکرێت، ئەوەندە بێ نرخ و لاوازە، کە لە ڕاستیدا شیاوی قەشمەری و بەسوك تەماشاکردنە.

هەر وەك چۆن "مەیجەر سۆن" لە لایەکی ئەم کتێبەدا دەڵێت: " ئەوە سیمایەکی بەرچاوە لە ژیانی کورد- دا، چونکە هۆی ئەوەی بۆچی ئێران و تورکیا پارێزراون لە داگیرکردنە مەزنەکان لەلایەن کوردەوە، کە لەوانەبوو پێچەوانەی ئەوە رووبدات، نەبوونی توانای خێڵەکانە بۆ پێکەوە ژیان بە ئاشتی لەگەڵ یەکدیدا- ئەوەش دیاردەیەکی دەگمەن نییە لە سروشتی نەژادە شاخاوییەکان لە هەموو لایەکی جیهاندا."

بەو پێیەی سەردەمی نووسینی ئەم کتێبە دەگەڕێتەوە بۆ سەد ساڵێك لەوەبەر، ئەو کاتەی دیمەنی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان لە وڵاتی خۆیاندا لەبەر دیدی "مەیجەر سۆن"دا پڕ بووە لە جیاکەرەوەی ناوێزە و سەیر و سەمەرەی ئەو رۆژگارە و هەرگیز لە دیدی ئەمڕۆوە بەراوردی زانستیانە هەڵناگرێ، بەڵام کاتێ بەناو بابەتە جیاوازەکانی ناو ئەم کتێبەدا شۆڕدەبیتەوە، سەرتاپا پڕە لەو شتانەی ئەمڕۆش بەهەمان شێوە لە ژیانی نەتەوەی کورد- دا دووپاتدەبێتەوە و کەم و زۆر هاوچەرخیانە وێنەی دەکێشنەوە و بە بەرگی نوێوە دووبارە و سێبارە دەکرێنەوە.

تاکی کورد وەنەبێ هەر لەو ئاستانەدا مابێتەوە کە لەسەرەوە ئاماژەی بۆ کرا، بەڵکو زۆر جاریش لەپاڵ مەبەستی خێڵەکەی و بۆ بەرژەوەندی سەرۆکی تیرەکەی کەوتۆتە جەنگ و لە دەیان نەبەردا سەرکەوتنی بەدەستهێناوە و ئاستی خێڵ و تیرەکەی و سنووری گەرمیان و کوێستانی لە ناوچە تایبەتیەکەی خۆیدا بۆ ماوەیەك لە دوژمن پاراستووە.

هەروەها هەندێ جاریش ئەو راپەڕینانە شێوازێکی نەتەوایەتی وەرگرتووە، زیاتر فراوانتر و هەرێمگیرتر بووە و بۆتە راپەڕینی نەتەوایەتی، یان جوڵانەوەی ئازادی، یان شۆڕش بە واتایەکی بەرفراونتر. ئیدی ئەو راپەڕین و جوڵانەوە و شۆڕشانە لە ئەنجامدا بەرەو چی ئاقارێك سەری هەڵگرتووە و بۆ بەرژەوەندی تیرەیەك یان ناوچەیەك یان شێوەزار و دیالێکتێکی تایبەتی رۆشتووە. هەر لە ئەنجامی ئەوانەشدا میللەتی کورد زیانی لێکەوتووە و تاکی کورد بێبەش و دۆڕاو بووە، چونکە سەرکەوتنی هەر تیرە و ئیماراتێك و تەنانەت بەپێی شێوازی هاوچەرخیش هەر پارتێکی سیاسیش، لەدوایدا ماڵی کورد سەربەشی ماڵان کراوە و زەوی بەپیت، شێخ و ئاغا و دەرەبەگ و بنەماڵە دەستەڵاتدارەکان لە هەر قوناغێکدا قۆرخیانکردووە و بوونەتە موڵکی تایبەتی و مۆرکی گشتی پێوە نەماوە. ئیدی هەمیشە تاکی کورد لە خزمەتی شێخ و ئاغا و بنەماڵە دەستەڵاتدارەکاندا ماوەتەوە و بواری ئەوەی پێنەدراوە کە هاوشێوەی تاکەکانی نەتەوە جیاوازەکان،

خۆی خاوەنی بیر و هۆش و کیانی تایبەتی خۆی بێت و هاوبەشبێت لە بەرژەوەندی گشتی نەتەوەییدا.

بەڵێ تاکی کورد هەرگیز شیاوی لۆمە و سەرزەنشت نییە لەو کارەساتانەی لە ناو وڵات و دەورویەریدا روودەدات، بە گەواهی زۆرەوە کە لە خوێندنەوەی زانستیانەی مێژوودا ئەوە بە ئاشکرا دیارە، تاکی کورد هەمیشە خەباتگێڕ بووە، گیانی قوربانی تێدا بووە، بە هەزاران نمونەی قارەمانێتی تاکی کورد لە مێژوودا تۆمار نەکراوە، چونکە مەدالیای ئەو قارەمانێتی و ئازایەتی و خەباتگێڕیە دراوە بە سەرەك تیرەکەی، یان بە ئاغا و شێخەکەی، یان بە سەرکردەی سیاسی پارتەکەی. تا ئەمڕۆش دانوساندنەکان لەگەڵ دوژمندا، تەنیا لە بەرژەوەندی و لە پێناوی پاراستنی پاوان و خێر وبێری سەرکردە و بنەماڵەکاندایە.

ئەوەی کە نووسەری ئەم کتێبەی لە گەشتەکەیدا تەواو سەغڵەتکردووە، ئەوەیە کە تاکی کورد لە هەر ئاستێکی کۆمەڵایەتی، یان هەر ئاستێکی فەرمیدا بوویێت، بە مافی خۆی دەزانێت، کە راستەوخۆ دەروازەی کۆمەڵێك پرسیاری تایبەتی بەڕووی کەسی بەرامبەریدا بکاتەوە.

هەروەها سەرسامە لەوەی کە هەر هەموو کەس لە هەر شوێنێکدا ژیابێت، دەنگوباسی سیاسی و توێژینەوەی سیاسی و تەتەڵەوبێژنگی باس و خواستە سیاسیەکان لەسەر ئاستی دەرەوە و ناوخۆشدا لێکدانەوەی بۆ دەکات و زووربەی ئەوانەش نەخوێنەوارن و تەنانەت رۆژی لە دایکبوونی خۆیان نازانن. لەوبارەیەوە دەڵێت:

" هەموو بازرگانانی ناوچەکە ئاڵۆشی دابڕان و دووری بەغدا لێیدابوون، چونکە کەللەیەك شەکر لە مانگی نیساندا بە دوو قڕان بوو، ئێستا بە پێنج قڕان دەیفرۆشن، رۆژانێکە لە چاخانەکاندا کەس ناتوانێ چایەك بخواتەوە، چونکە شەکر نەماوە و خەڵکی وەك خویەك، لەوێ هەر دادەنیشن و بەبێ چایی، جگەرە دەکێشن و دەمەتەقێی سیاسی دەکەن."

هەروەها وەك خەمخۆرێك، سۆزی تایبەتی خۆی هەیە بەرامبەر مەسەلەی نەتەوایەتی و نیشتیمانی ئەم وڵات و میللەتە. زۆر بەداخە کە کورد بەپێی ئاستی جوگرافیا و ئاستی هۆشیاری نەتەوەییەوە دووچاری کارەسات و لەناوچوون و چەوسانەوە و ناوزڕاندن بووە، کە زۆربەشی بە ویستی خۆی نییە و رەنگی بۆ نەڕشتووە.

نووسەر نکولی لە ئازایەتی و چاونەترسی تاکی کورد ناکات، بەڵام سەرزەنیشتی ئەو تاوانە هەمەجۆرانە دەکات کە خان و ئاغا و شێخ و بنەماڵە و دەستەڵاتدارە گێلەکان بەرامبەر نەتەوەکەی

خۆیان کردوویانە و لە پێناوی پاداشتێکی سوکدا لەلایەن دوژمنانی نەتەوەکەیانەوە دەستیان لەگەڵدا تێکەڵکردوون و دژی هاوولاتی و هاونەژاد و هاوزمان و بگرە هاوینەماڵەش شانبەشانی دوژمنان خوێنی میللەتەکەی خۆی رشتووە. کە بە دڵنیاییەوە ئەگەر لە زانایانی ئاژەڵناس بپرسین، کە ئایا لە هەڵسوکەوتی کام جۆرە ئاژەڵێکدا ئەو جۆرە رەفتارانە بەدیکراوە، لە وەڵامدا ئەستەمە و وەڵامەکەی نەرێییە.

لەمیانەی سەدەی رابردوودا گیانی نەتەوایەتی لە چوار سەردەمدا بێداربووەوە و خۆی دڵنیاکردەوە لە هەوڵەکانی بۆ فڕێدانی نیلەی ژێردەستەیی تورکەکان لەسەر شانی خۆیان. یەکەمیان لەساڵی 1806دا روویدا، کاتێ عەبدولڕەحمان پاشای بابانی سلێمانی، ماوەیەکی دووردرێژ قارەمانانە لەدژی تورکەکان بۆ سەربەخۆیی کوردستانی باشووری لە جەنگا بوو، کە لە ساڵی 1808دا لەلایەن پاشای بەغداوە لە دەربەندی بازیاندا بەسەریا سەرکەوت، ئەویش بە یارمەتی لەلایەن پاشایەکی کورد کە دوژمنایەتی لەگەڵ ئەمدا هەبوو، لەلاوە هێرشی بۆ کرد و بەسەریدا سەرکەوتن.

لەم نموونانە زۆرن لە مێژووی نەتەوەی کورد- دا و نەگبەتیەکەش ئەوە نییە، کە ئەو پاشایە، یان ئەو سەرکردەیە، دژی پاشا و سەرکردەیەکی ترە، بەڵکو ئاستی کولۆڵێکە ئەوەیە کە تاکی کورد، ئەوەی وەك تاکێك لە ریزی چەکدارانی ئەو پاشا و شێخ و ئاغا و دەستەڵات و پارتانەدان، تەنیا بەندەی فرمانن و هەموو ئەو شتانەی پێی راسپێری کراوە، دژی هاونەژاد و هاوولاتی و هاوزمان و بگرە هاوئایینی خۆی جێبەجێیدەکات و ئەو هەستی نەتەوایەتیەی باسی لێوەدەکرێت بەهیچ شێوەیەك لای ئەو جۆرە کەسانە بوونی نییە و بیری لێنەکراوەتەوە.

ئەوەش زیاتر لەبەرئەوەی کە نووسەر دەڵێت: "گیانی دەرەبەگایەتیی راستەقینە لە نەژادەکەدا بەهێزە. تایبەتە بە چیاکان و بۆ خێڵەکەی خۆی، شانازی زۆر بەوەوە دەکات کە کوردە، باکووریەکان بە وتەیەکی سەرۆکەکەیان چەك هەڵدەگرن، هەرگیز ناپرسن تا هۆکەی بزانن."

لە پیاهەڵکۆان و دوژمنایەتی و شەڕی براکوژی نێوان دوو خێڵ، دوو بنەماڵە، دوو ئایدۆلۆجی جیاوازدا، هەرگیز تاکی کورد نەهاتۆتە جواب، یان غیرەتی ئەوەی نەبووە کە چەکەکەی دابنێت و شەڕی براکوژی لە بەرژەوەندی ئاغا و شێخ و سەرکردەکەی نەکات و هۆشیاری ئەوە لە گیانی خۆیدا بەرجەستەکات کە ئەو سەرکردە و ئاغا و شێخ و دەرەبەگە بەبێ ئەو تاکە جەنگاوەرانە، یەکسانن بە هیچ. کەواتە دەکرێ تاکی کورد ببێتە بناغە بۆ یەکێتی نەتەوایەتی و چیتر رێ نەدات ئەو شێوازی سیستمی دەوڵەت و رامیاریە پیادەکرێت.

گەشتێك بەناو بابەتەکانی ئەم کتێبەدا، رابەریتدەکات بەرەو زیاتر خۆناسین، لەسەردەمانی سەدەیەك لەوەبەر و تا ئەمڕۆش، کە بەهەمان بەهاو پێوانە دەپێورێت و کەم تا زۆر گۆڕانێکی ئەوتۆی تێدا نەکراوە. کەواتە با ئیدی لێرەوە هەوڵبدرێت لێکدانەوەیەکی زانستیانە بۆ بابەتە مێژووییەکان بکرێت، تا لە داهاتودا هەر هیچ نەبێت ساویلکانە دۆستی کەس نەبین و بڕوامان تەنیا بە خودی نەتەوایەتی خۆمان هەبێت. چونکە لەبەرەبەیانی مێژووەوە تا ئەمڕۆ، هیچ میللەتێکی نەژاد جیا، دۆستی ئێمە نەبووە و پەیوەندیشیان پێمانەوە تەنیا بەرژەوەندی تایبەتی بووە.

هەروەك مەیجەر سۆن لە بارەی کەسایەتی کوردەوە دەڵێت: "ئیدی ئەگەر یەکێ بتوانێ بە سەختی لەگەڵ وەسفی عیرفانی هاوڕابێ، کە لەلایەن گەشتیارێکی فەرەنسیەوە بەشێوەیەکی کورت دەڵێت:" کوردەکان قۆز و بەهێز و هوشیار و زۆر جوانن و ئەگەر شارستانی هێڵەکانی بۆ ئەوان هەبووایە، ئەوان لە دراوسێ تورکەکان و فارسەکان پێشتر دەبوون. هێشتا مرۆڤ دەتوانێت ئەوان بە باشتر ببینێت، بەگوێرەی ئەو نەژادە زۆرەی کە ئێستا لەبەر خۆری "شارستانیدا" شانازی بەخۆیانەوە دەکەن."

**چەند تێبینیەك لەبارەی کتێبەکەوە:**

1. لەبارەی ناونیشانی کتێبەکەوە (گەشتێك بۆ میسۆپۆتامیا و کوردستان لە بەرگی نادیاردا)، بەتایبەتی ئەو بەشەی کە باس لە بەرگی نادیار دەکات، پێویستی بە هەندێ روونکردنەوە هەیە، چونکە بەرامبەر وشەی (DISGUISE)ی ئینگلیزیەکە، وەك زاراوەیەکی فەرهەنگی زیاتر واتاکانی " خۆگۆڕین، روخسار گۆڕین، دەماخکردن، هەروەها رواڵەت و روخساری درۆ." کەواتە دەقاودەق لە کوردیدا زاراوەیەکی تایبەتی نیە پڕ بە واتای زاراوە ئینگلیزیەکە بێت. بەڵام لێرەدا نابێ ئەوەمان لەیاد بچێت کە هاتنی مەیجەر سۆن بۆ ئەم ناوچانە و مانەوەی وەك هاونەژادێکی ئێرانی و لەوێش بەتایبەتی وەك فارسێك. دەبێت زۆر لەوە زیاتر بە هۆشیارییەوە خۆی نادیاربکات، کە ئەوەش تەنیا بە روخسار و رواڵەت و دەم هەڵپێکان و جلوبەرگ گۆڕین ناکرێت. چونکە ئەو خۆشاردنەوەیە داوای بنەما و هێمای زیاتر دەکات. ئەگەر لەگەڵ شێوازی جلوبەرگەکەیدا، وەك میرزا غولام حسێن شیرازی، زمانی فارسی وەك شیرازییەك نەدوایە، مەحاڵە قۆنسوڵی ئێرانی لە ئەستەنبوڵ پێی بڵێت پێویست بەو خۆشاردنەوەیە ناکات و وەك ئینگلیزێك خۆت بەیان مەکە. هەروەها ئەگەر هەڵسوکەوت و کولتوور و بیروباوەڕی ئایینی و مەزهەبی شیعەی

له خۆیدا بەرجەستە نەکردایە، بێگومان هەر بە گۆڕینی جلوبەرگەکەی پۆلیسێکی نەخوێندەوار پشت ملی دەگرت و دەینەاردەوە بۆ لەندەن. تەنانەت وەك ئێرانی و وەك شیرازیش، ئەگەر زمانی کوردی بە باشی نەزانیبایە و هەڵگری نیشانەکانی ئیسلامی نەبووایە هەرگیز بەو سەربەستیە لە سلێمانیدا نەیدەتوانی تەنیا بە جلوبەرگی کوردی یان شێوەی جلوبەرگی فارسیەوە خەریکی بازرگانی بێت و خۆی لەناو ئەو کولتوورەدا بگونجێنێت. گۆڕینی ئەو شتانە لە خودی کەسایەتی مەیجەر سۆندا لە بەینی مەغریب و عیشادا نەکراوە. ئەوە کاری بۆ کراوە و سەرقاڵی و ساڵانێکی دوورودرێژ هەوڵی بۆ دراوە.

2. بە پێویستی دەزانم ئەوەش بێنمەوە یادی خوێنەر، کە بیر و بۆچوونەکانی ئەم بەرهەمە راستەوخۆ پەیوەندە بە خودی نووسەرەوە، بە دڵنیاییەوە زۆر لایەن و بابەت ئاماژەی پێکراوە، کە لەوانەیە زۆر زەق و هێرشئامێزبێت. من وەکو وەرگێڕێك مافی ئەوەم نییە کەم تا زۆر لەو بابەتانە کەم بکەمەوە یان بقرتێنم و بگرە مافی ئەوەشم نییە کە لە پەراوێزدا هیچ روونکردنەوەیەك بدەم.

3. بەڵام ئەگەر وەك وەرگێڕەکەی عەرەبیەکە، لەگەڵ وەرگێڕانیشدا لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونی بۆ کردووە، ئەو دەتوانێت لە پەراوێزدا ئەو شتانە دیاریکات، کە لای خۆیەوە پلانی بۆ دارشتووە. بەڵام هێشتا لەگەڵ ئەوەشدا بۆی نییە ئەو هەموو بەیتە شیعرانە تێکەڵی دەقی نووسینە وەرگێڕاوەکە بکات، یان بە خواستی خۆی، یان بە فرمانی بڕواکەی، ئەوەی نەیویستووە وەریبگێڕێت لە دەقەکەی دەرهێناوە و هیچ ئاماژەیەکیشی پێ نەکردووە.

لە کۆتاییدا دەڵێم خۆشحاڵم ئەگەر توانیبێتم بەم بەرهە خزمەتێکی نەتەوە و نیشتمانەکەی خۆمم کردبێت، هەروەها ئەوەش دەڵێم کە تەواوی نووسینەکانی ناو ئەم بەرگە بریتیە لەنزیکەی 120 هەزرار وشە، ئەگەر هەڵەیەکی چاپ، یان دەستەواژەیەکی نارێکت بەرچاوکەوت 119.999 وشەکەی ترت بیر نەچێت.

مینە/ مانچەستەر.

2017/12/18

## سەرنجێکی سەرپێیی

ئەم بەشانەی لای خوارەوە گێڕانەوەیەکی سادە و ساکاری گەشتێکە بە میسۆپۆتامیا و باشووری کوردستاندا، لەو یاداشتانەوە سەرچاوەی هەڵگرتووە، کە بە درێژایی گەشتەکە لە ئەستەنبوڵەوە بۆ بەغدا، بەناو ئەو وڵاتانەدا کۆکراونەتەوە.

من لەو بڕوایەدام و بە ویژدانەوە ئەوەش دەڵێم، لێرەدا وەسفێکی زۆر مەزنی ئەو شتانەم کردووە، کە تا ئێستا نەناسراون، هەروەها دیمەنی ئەو شوێنانەم خستۆتە روو کە خۆیان ناسراون، بەڵام لە دید و تێروانینێکی ترەوە.

چەند بارودۆخێك پێویستی کردووە بۆ بەیانکردنی راستی زانینی تەواوی زمانی فارسی، تا ئاستی ئەوەی، کە نووسەر وەك یەکێك لە خۆیان بەناویاندا بپەڕێتەوە. لە ترسی ئەو دەرکەوتنە ناپێویست و هێرشبەرە، من دەڵێم ئەو رووداوانە داوای هێمای خۆیان دەکەن و لە میانەی چیرۆکەکەدا روونەدەکرێتەوە. لە بەشە مێژووییەکانی کتێبەکەدا، کە تا رادەیەکی زۆر پەیوەندە بە مێژووی نوێوە، توانیم هەندێ مەسەلە بە تەواوی رووی نوێگەریی بدەمێ، بەتایبەتی لەبارەی مێژووی کوردەوە، لەو نامانەوە کە لە شاە عەلی هەورامان، شێخ رەزای کەرکوك، تایەر بەگی جاف، ماجید بەگی جاف و محەمەد عەلی بەگی جافەوە پێمگەیشتوون، هەروەها لە کاتێکدا بەشێکی زۆریشی لە میانەی پەیوەندی و گفتگۆکانی کە لە هەڵەبجە و سلێمانی بەڕێوە چوون.

لەو بڕوایەدام ئەو زانیاریانەش زۆر دەگمەن بن. بە گوێرەی ئەو بەشەشی پەیوەندە بەمێژووی کلدانەکانەوە، من زۆر قەرزداری (م. بەدریە)م، کە سەرۆکی میللەتی موسڵە، هەروەها حەبیب بەدریەی براشی، ئەوان دەستیان بە مێژووە کۆنەکانی موسڵدا دەگەیشت، کە بە سنگێکی فراوانەوە رێگەیان پێدام کەڵك لە زانیاریەکانیان وەربگرم.

ئەوەی لێرەدا لێی دەترسێم: بەکارهێنانی ئەو بڕە راناوی کەسیی یەکەمەیە، وەك راناوی (من)، کە لەو بڕوایەدام ببەخشن، چونکە بەبێ ئەوە گێڕانەوەکە نابێتە چیرۆکێکی تایبەتی.

شێوازی گێڕانەوەکە، لەوانەیە لایەنگیری کوردی پێوە دیاربێت، بۆیە دەبێ دان بەوەدا بنێم، کە زۆر پیاوەتی و سۆزی رەسەنم لێیان بینیوە- هەرگیز ئەوەم پێش نەهاتووە- لە هیچ کۆمەڵێکی تری ئەو

بێگانانەی لە شوێنی تر بینیومن، من قەرزداری سوپاسێکی زۆریانم، بۆ ئەو هەموو چاکەیەیان کە لەسەرمە، لەپاداشتی ئەوەدا کەمترین شتێك کە بتوانم پاداشتی چاکەیانی پێ بدەمەوە، تیشك هاویشتنە سەر دۆزینەوەی کەسایەتی نیشتمانیانە، کە تا ئێستاش ئەوان ناودەبرێن بە نمونەی دڕندەیی و دەستدرێژی و نامرۆڤایەتی.

موحەمەڕە

ئی. بی. سۆن

## بەشی یەکەم

# لە ئەستەنبوڵ

بەیانیەکی دڵتەنگ لە ئەستەنبوڵدا، کاتێ لە وێستگەیەکی ڕەش و تاریکدا لە شەمەندەفەر هاتمەخوارێ، بە چەشنی ئەو سەدان وێستگانەی دی، کە لە هەموو لایەکی کیشوەرەکەدا هەیە، بە مەبەستی مانەوە بۆ ماوەیەك لە پایتەختی عوسمانیدا. مانەوەیەکی دوورودرێژ لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کێشیکردم بۆئەوەی بە دڵنیاییەوە دەمکرد و لە هەمان کاتدا خۆشحاڵییەکی زۆر وردی پێ دەبەخشیم لە ئاسوودەیی و هۆی حەوانەوەی ڕۆژئاوایی. هەرچەند من بێ ئاگابووم لە بەشەکانی ڕۆژئاوای ئیپراتۆریای تورکی و هەمان هەر ئەو دید و بۆچوونانەم هەبوو کە زووربەی خەڵکی لە لای خۆمان هەیانە، لەوە دەچێت ئەستەنبوڵ شوێنێکی حەوانەوەی پۆشتە و ڕازاوە بێت، کە تا ڕادەیەك لەو خاڵەدا لە نێوانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتدا هاوشێوەیە، هەڵبژاردن لە هەموو جیاکەرەوە پێویستیەکانی ژیانی خۆشگوزەرانی، کە دەستت پێی بگات، لە کتێبەکان و کتێبخانەکان و توانای یەکسانی ڕێی دەربازبوون لەنێوان خەڵکی ڕۆژهەڵاتی و دەوروبەریان، بێ ئەوەی پێویستی بە گەشتێکی دوورودرێژ و لیستێکی درێژ هەبێت. بێبەختانە من نە شارەزای ئەستەنبوڵ بووم و نە شارەزای کەشوهەوای زستانەکەشی بووم، هەروەها نە دانیشتوانەکەشیم دەناسی. من هەرگیز مامەڵەم لەگەڵ تورك نەکردووە و یۆنانیەکانیشم لە مێشکی خۆم دەرکردووە، کە لە سەدا سی و پێنجی (35٪) دانیشتوانی ئەم پایتەختە پێکدەهێنن. سەردەمانێك مافی سەروەرییان هەبووە و ئێستاش زووربەیان تا ڕادەیەك لە جیهانی بازرگانیدا بەتوانا و دەستەڵاتدارن.

لە ڕاستیدا، کۆی بڕی زانیاریم لەو چرکەساتەوە من گەیشتوم ئەوەندەیە، کە ئەستەنبوڵ بریتیە لە سێ بەش، یان سێ ناوچە، ئەوانەش: پێرا و گەلەتە و ئەستەنبوڵە و ئوتێلێکی تێدایە پێیدەوترێ (پێرا پالاس)، بەهای تێچووی زۆر دوورە لە ئاستی شێوازی ئەو خانوچکەیەی ناو جزدانەکەی من. لەلایەن کەسێکەوە کە نەمدەزانی خەڵکی کوێ بوو، ئامۆژگاریکرام کە بچم بۆ پەنسیۆنی فرەنسی لە گەلەتە، دڵنیایکردم هەرزان و خاوێن و دڵگیرە. میواغخانە فرەنسیەکە لەوانەیە لە لایەکی تری ئەو وڵاتە بێت و زۆر جاریش وەهایە، کۆی ئەو سێ شتە، لەوە دەچێت نەخشەیەکی نایەب بێت، کەواتە هەڵهاتنە لە بەرپرسی گومرگی وشك و بێزارکەر لە وێستگەکە، شتەکانم خستە سەر دوو چەرخەیەك کە پێیان دەوت ڤیکتۆریا، ئیدی بەسەر بەرد و چاڵوچۆڵی قوڕیندا دەڕۆشتین، ئەوەش بارودۆخی ڕاستەقینەی شەقامەکانی ئەستەنبوڵ بوو. بەناو شەقامە نێوانڕۆکاندا شۆڕبووینەوە و

ملی ڕێی خۆمان گرتبووەبەر، لەو شوێنەی کە ئەسپەکان ترامیان ڕادەکێشا تەقە و هاڕەی سمەکانیان دەهات، بەناو ڕیزە دوکانەکاندا ڕۆیشتین، زۆربەی شتومەکەکانیان ئەو شتە هەرزانانە بوون، کە لە هەموو شارێکی ئەوروپادا بەرچاو دەکەوێت، پاشان بۆ پردی سەر ئاوەکە کە پێیان دەوت: (شاخی ئاڵتونی)، کە ناوێکی زۆر هەڵەی ناوێزەیە لە دیسەمبەر/کانونی یەکەمدا، کە هێمای گاڵتەجاڕی هەندێ گەشتیاری بێ هیوا و ئاوات دەکات. بە گەیشتنمان بۆ پردە سەیرەکە، لە ناوەندی قەرەباڵغییەکی زۆر چڕی پیادەڕەودا ڕاوەستاین، خەڵکەکە فێستی ئەمریان لەسەردا بوو، هەروەها هەندێکیان شەفقەی باولەری[1] لە سەر نابوو، یان هەر شێوە کڵاوێکی تری وڵاتانی ئەوروپی، دەبووایە پێنج قوڕۆش کرێی پەڕینەوەیان بدایە. هەروەها بۆ ئەوەی کەس لە پارەدان خۆی نەدزێتەوە، لەوبەری ڕێگەکەوە ڕیزێك لە بەرپرسانی تورك بە جلوبەرگێکی تەواو دیار و ئاشکراوە ڕاوەستابوون، کە بریتی بوو لە بەرگێکی هاودامانی سپی. شاخە ئاڵتونیەکە ڕەنگی قوڕێکی زۆر ئاسایی بوو، هەروەها لەژێر پردەکەدا بڕێکی زۆر بەلەم و کەشتی هەڵمین هەبوو، کە بە بسفۆردا بۆ کەنار دەریای ئاسیایی دەهاتن و دەچوون. شۆستەکانی بەندەرەکە بە شێوە و شێوازێکی ناشیرین ڕێکخراوە، بەندەر و نوسینگەی بارکردن، لە پشتیشەوە شوێنێکی بەرز لە زەویەکەوە، کە وەسفێکی فرەنسی و ئەندازیاری بیناسازی فینیسی گەڵەتە و پێرا هەڵناگرێ.

کوخ و شوێنی حەوانەوەی کرێکاران بەدرێژی و ڕیزە پەنجەرەی پیس و نارێك، کە ڕووبەڕووی ئەستەنبوڵ دەڕوانێت بەسەر ئاوەکەدا. هەروەها ئەو شاخە دیوار و پەنجەرانە شێوەیەك بەسەر ماڵەکانی سەر گردەکەوە بەڕیز پێکدەهێنن و باڵەخانەی گەڵەتە بەشێوەیەکی خڕ بەرزبۆتەوە و بەیداخێکی تورکیای بەسەرەوەیە.

ڕێگەی پردەکە بە تەختەی پان تەختەڕێژکراوە، کە دوو دانەی هەرگیز لە یەك ئاستدا نییە، ئەوەش دەبێتە هۆی دواخستنی ڕێکردن بەسەریدا، بۆیە خەڵکی زیاتر حەزئەکەن بە پیادەڕۆکەدا بڕۆن.گەڵەتە کۆتایی بە شەقامێك دێت کە بە دڵنیاییەوە پڕە لە خەڵك و عەرەبانەی خەڵك گواستنەوە و بارهەڵگرتن، هەروەها هەموو ئەو سەڕافانەی لە گەڵەتە و ئەستەنبوڵدا کاردەکەن لەوەدەچێ لەوێدا کۆبووبێتنەوە. پێچکردنەوە بەلای ڕاستدا دەچێ بۆ لای ترامێکی زۆر و بەدرێژایی شەقامەکەش پڕە لە دوکانی گەورە و بچووك، هەروەها بەدرێژایی کەنارەکان پڕبوو لە کرێکاری سەر ئەو گەمیانەی لە بەندەرەکانی ئەوروپا و ڕۆژهەڵاتەوە دەهاتن. بێگومان یونانیەکان زۆرینەن و

---

[1] - شەفقەی باریزانی بۆلینگ کە شەفقەیەکی سپی سانی چواردەور هەڵگەڕاوەیە... وەرگێر.

ژمارەیەکی زۆر لە شەرواڵە شینە تەسکەکان لەگەڵ کراسی رەنگینی یاخە داقڵیشاو و چاکەتی بەژن بچووك و کڵاوی تەوقەسەر خڕ لە چەشنی باڵینە لەو ناوەدان. هەروەها ئەرمەنییەکی زۆر و رۆژهەڵاتی لە هەموو جۆرێك. ئیتالیەکان، لەم گۆشەیەی ئیتالیەکانی گەڵەتەدا لە هەموو شوێنێکدان و زمانی شەقامەکەش جگە لە تورکی هەموو زمانێکە.

لێرەو لەوێ کۆمەڵێکی ناتەبا و هەمەچیزە و ئاژاوەگێڕ و شەڕانی، کە کۆیانە چەرمەکانیان نابووە سەر پشتی خۆیان – وەك دیاردەیەکی تایبەت بە ئەستەنبوڵەوە کۆڵهەڵگرەکانی بزێون- هەروەها ئەو هات و هاوار و گاڵتە و گەمەیەی لەم شارە جیهانیەدا لەسەر زمانە و هەرگیز هیچی لێ تێناگەیت.

کوردەکان بەهێزترین خەڵکانی ئەم ناوچەیەن و زووربەیان لە خەڵکە باشەکانی دانیشتوانەکەن، بەزۆری بەسوك تەماشاکراون، کە لەوانەیە لەبەرئەوەبێت جۆرێك توندوتیژیان هەیە و فێڵیازن.

ئیدی ئەو شەقامەمان جێهێشت و سەرکەوتین بەسەر سەرەوژورکەیەکدا، کە خانوی گەورە، گەورەی بۆ کرێ تێدا دروستکرابوو، عارەبانەکە گەیشتە رێگەیەکی دوورودرێژ، کە بەدرێژایی لاپاڵی گردەکەدا دەڕۆیشت.

دەبووایە ئەم شەقامە پێی بوترایە باشترین رێگا، یان خراپترین پێداویستی، بەڵام بە داوایەکی تر مامەڵە لەگەڵ وشەکە دەکەین، کە ئەوە باشتر روونەدەکاتەوە، ئەم شەقامە شادەماری تەواو گرنگی هاتوچۆی گەڵەتەیە، بێگومان هێشتا رێڕەوێکی پان و بەرینی چەوڕێژە، لەگەڵ بوونی کونی ئاوەڕۆی گەورەی ناوێزە لە چەند شوێنێکدا. لەبەر نەبوونی زێراب لەژێر زەویدا، چەوڕێژەکە شۆڕبۆتەوە بۆ ناوەند و بەناو کونەکاندا قوڕ و چڵپاو و ئاوی زیادە شۆڕدەبێتەوە بۆ خوارەوە. هەروەها زبڵ و شتومەکە رەقەکان، بەهەرحاڵ، کە هەموو دانیشتوانەکە لە بڵاوکردنەوەیدا بەشدارن، بە کۆمەڵ لە دەوروبەری رێگاوبانەکەدا کۆکراوەتەوە، ئەوەش نیشانەی بۆگەنی و چۆنیەتی ژیانی دانیشتوانی دەوروبەرەکەیە. لەوەسفی ئەم شەقامە سەرەکییەدا لەگۆشەی ئیتالیەکانەوە سەرجەم ئەستەنبوڵ دەبینرێت، جگە لە چەند شەقامێکی رێکوپێك نەبێت لە بەری لای بسفۆڕ لە پێرا، کە بێگانە دەوڵەمەندەکانی تێدا دەژین.

لەبەردەمی دەرگای خواردنگەیەکدا ماڵئاوایم کرد و ئەوەندە نەبوو کە عارەبانەکە راوەستابوو، ژنێکی بە ساڵاچوو دەرگاکەی کردەوە و بە زمانێکی رەوانی ئیتالی پێشوازیکردم.

# ژیانم لە پێرادا

چونکە شارەزایم لەو زەمانەدا تا ئاستێك بوو، بۆیە بە دەنگێکی بەرز "ماریە"ی بانگکرد، ژنێکی بەسۆز و زۆرزانی سی ساڵانە، کە لە ژێرزەمینێکەوە لە پشتی ژووری نانخواردنەکەوە دەرکەوت و بە فەرنسی پێی وتم کە ژووریان هەیە، مەرجە زۆر گونجاوەکانی پێوتم و داوای پێشەکی کرد و ئەوەندەی نەخایاند خۆم لەناو ژوورێکی رانەخراودا لەگەڵ کورەیەکی ئاسن، چەرپایەك، شوێنی دەستشۆرك و مێزێکی بچووك بینییەوە.

ئەوە باشترین ژوور بوو. بۆنێکی تیژی گرانماڵەکەی پڕ کردبوو، کە ئەوە سروشتی چێشت لێنانە لای ئیتالیەکان و هەروەها نیشانەی بوونی ئاوەڕۆگەیەکی زۆرە لە ماڵەکەدا، دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە پێنج ئاودەستی تێدایە.

بەڵام شێوکردنەوە لە ژووری نانخواردندا پێویستی بە تەواوکردنی سەرگوزشتەی ئەم میوانخانە سەیر و دەگمەنەیە، کاتێ ئەرمەنیەکان و خەڵکانی رۆژهەڵاتی دەبینی کە خواردنەکانیان بە چەقۆ دەخۆن و پاروی سەیر و سەمەرە دەگلێنن و چەتاڵیش بە ئامرازێك دادەنێن کە بۆ خەڵکانی کەم سەلیقە و ترسنۆکە.

بۆ رۆژی دوایی بە کۆڵانە پێچاوپێچەکان و بەناو گۆلاو و قوڕ و چڵپاودا چووم بۆ پێرا، چەند سەعاتێکم بەسەربرد لە هەوڵی دۆزینەوەی نیشتەجێیەکی باشتر و گونجاوتر لە نرخدا، بەڵام دوای ئەوەی هەندێ ژووری پیس و بۆگەنی هەمەجۆری ئەرمەنی و یونانیەکانم بینی، کە لە هەموو خاوێنی و کەلك و جوانیەکەوە بەدووربوون، پاشان تەواو بەختەوەربووم بە بینینی پیاوێکی روسی، کە بەشێکی لە یەکەیەکی ئەستەنبوولێدا بەکرێ گرتبوو، دەیویست بۆ ماوەی سێ مانگ بیداتەوە بەکرێ، چونکە بە سەردان دەچوو بۆ مۆسکۆ.

تەواو شادمان بووم بەوەی کە ئەپارتمانەکە لە باشترین شوێنی ئەستەنبوڵدا، لە خانویەکی نوێی نزیك بە ئوتێلی (پێرا پالاس)دا بوو، پاك و خاوێن و بە شێوەیەکی باش رێکخرابوو، نزیك بووینەوە، بە بڕی رەزامەندی لایەنی ئەو، من لە خەیاڵی خۆمدا هیوادارم، بەهەرحاڵ، هاوڕێکەم سووربوو لەسەر ئەوەی کە رێکەوتنێك مۆربکەین و بە دەم خواردنەوە و شتی خۆشەوە لە یەکێ لە مەیخانە جیاوازەکانی دەوروبەری پێرادا، پاشان لەگەڵ خانمێکی رۆمانیدا هاوڕێیەتییان پەیداکرد و خواحافیزیی لە من کرد و لەگەڵ ناسیاوە نوێکەیدا رۆیشتن.

بەدرێژایی مانەوەم لە ئەستەنبوڵدا پەشیمان نەبووم لەو ڕێکەوتنە بۆ ئەو شوێنە خۆش و دڵگیرە، کە کەوتبووە ناوەندی پێراوە و بەزۆری لە شارۆچکەیەکی فرەنسی دەچوو، خەڵکی تورکی تێدا نەبوو، جگە لە ژمارەیەك کۆڵهەڵگر و شۆفێری ئۆتۆمبیلی گواستنەوە، کە فێستیان لە سەردابوو، لەگەڵ پۆلیسە هەمیشە مەست و سەرخۆشەکان. خەریکە ئەوەم لە یاددەچێتەوە، کە بۆچی هاتووم، واتە، بۆ بەدەستهێنانی پەیوەندیکردن بە لا ڕۆژهەڵاتیەکەی شارەکەوە. لە ڕاستیدا، یەکێ ناسیاوییەکی زۆر لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژئاواییە خۆشمەشرەفەکانی وەکو فرەنسیەکان و ئەرمەنی و ڕۆمانی و ڕوسی و بەڵقان و هاوشێوەکانیان پەیدابکات، ئەوە هەمموو کاتەکەی بەفیڕۆ دەڕوات. من لە ڕاستیدا بیرمچووە دەستبکەم بە خوێندنی زمانی تورکی، زمانێکی باشی فرەنسی لەگەڵ کەمێ یونانی فێربووم، کە لە ئەستەنبوڵدا وەکو زمانی تورکی کەڵکی هەیە. بەهەرحاڵ دوای ماوەیەك، کە کەشوهەوا ڕێگە دەدات، سەردانی ئەستەنبوڵ دەستپێدەکات و لە هەمموو کتێبە ڕابەرەکان دووردەکەومەوە و خۆم شوێنە دڵگیرەکان دەدۆزمەوە، تا کاتی خۆشیان تێدا بەسەربەرم و هەمموو گۆشە و کەنارەکان و ناو دوکانەکانی فارس و تورك لە بازاڕی گەورەدا دەگەڕێم، کە هەمیشە دڵنیابووم لەوەی پێشوازییەکی گەرم دەکرێم، چونکە بە ئاسایی فارسەکانم خۆشدەویست و خۆزگەی ئەوەم دەخواست تێکەڵیان بم و تەمەنناى ئەوەم دەکرد.

لە بازاڕی گەورەدا دیسانەوە بچمەوە ناو گیانی ئەو ڕۆژهەڵاتییەی تێیدا ژیاوم و چارەنوس بۆ جارێکی تر هێنایەوە پێشم، هەرچەند کاریگەری ئەوەش لە گێڕانەوەکەی (میستەر تۆماس کوك)ەوە هاتووە لە ڕێکخستنی ئەوانەی لەگەڵیان ژیاوە و هەوڵی داوە (نهێنی لە ڕۆژهەڵاتی نادیارەوە) لە دوکانەکانی یونانیەکاندا دیاریبکات.

ئێستا فێستێکم لە سەردایە و دەمەوێ پیاسەیەك بکەم و کڵاو و فێستی تورکی ڕزگارم بکات لە جێی سەرنجی خاوەن دوکانە بازرگانە یونانیەکان، کە زیاتر لە هەمموو ئەو خەڵکەی تر لە شارەکەدا هاودامانت دەبوون بۆ ئەوەی شتێکیان لێبکڕیت. بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لە بازاڕەکەدا لەناو هاوڵاتیانی ئێرانیدا بووم، جگە لە تەبریزی کەسی ترم نەبینی.

تورکەکانی ئێران برێکی کەم فارسی دەزانن، بەڵام لە ئەنجامدا شیرازییەکم دۆزیەوە و زۆر شادمان بووم، چونکە بۆ ماوەی دوو ساڵ لەناو شیرازیەکاندا ژیاوم و هەمیشە بیرەوەریە خۆشەکانم بیردەکەوێتەوە و بەتایبەتی ئەم شیرازیەش، تەواو شادمانی کردووم بە چەشنی گەوهەرێکی باشووری ئێران "مرواریەك لەناو زەمرووددا".

## کۆنسوڵی گشتی ئێران

بەهەرحاڵ، ئەگەر ماریفەت و خزمەت و میوانداری پێوانەیەك بێت، ئەوا شیرازیەکەم بە دڵنیاییەوە پڕە لە گیانی هاوشێوەی ئەو سیفاتانە.

هۆی ئەو خۆش رابواردنە گەورەیەی هەمبوو لەناو هاوڕێکانم لە ئێراندا، بووە هۆی بەسەربردنی ئەو ماوەیە لەگەڵ کۆنسوڵی فارس.

بیستبووم کە دۆستێکی دێرین سکرتێری دووەمە لە کونسوڵێتەکەدا، رۆژێکیان بە کۆڵانە پێچاوپێچەکاندا رێی خۆم دۆزیەوە لە ئەستەنبوڵدا بۆ خانویەك کە بە رەنگی سوورێکی چڵکن بۆیەکراوە و بەیداخێکی وڵاتی ئێران بەسەریەوە دەشەکایەوە.

رووەکردە گۆڕەپانێك و دەرگاوانێك بە تورکی دەرگاکەی لێکردمەوە، کە لەو کاتەدا بە گران لەو زمانە تێدەگەیشتم، منیش بە فارسی لەگەڵیدا دووام، ئەوەی زیاتر لە ئەوروپیەکی ونبوو چاوەڕواندەکرد، چونکە زمانی فارسیەکەی خۆی لاواز بوو، بۆیە ناردمی بۆ لای "میرزا"یەکی دەم و زمان شیرین، یان کاتب بە وتەی تارانی.

پاشان هەواڵی (میرزا حەسەن خان)م پرسی، پێیان وتم کە ماوەیەك لەوەبەر چۆتەوە بۆ ئێران، بۆیە رووم وەرچەرخاند بۆ ئەوەی شوێنەکە جێبهێڵم. خەریك بوو دەگەشتمە دەم دەروازەکە، بەهەرحاڵ، پیاوێکی کورتەباڵا بە هەڵەداوان هات و زۆر بەرێزەوە بە زمانی فارسی داوای لێکردم و وتی: (خاوەن شکۆتان بفەرموون) بۆ لای قۆنسوڵی گشتی، کە ئارەزوی بینینتان دەکات.

دوایکەوتم بەسەر پلیکانەکان و بەناو کۆمەڵێك جوتیاری ئازەربایجانی، کە لەو ناوەدا چاوەڕوان بوون، بردیانمە ژوورێکی گەورەی باش فەرشکراو بە فەرشی ئێرانی، لەوێ قۆنسوڵی گشتی لەپشتی مێزی نوسینگەکەیەوە دانیشتبوو، پیاوێکی پیاوانەی فارسی تەمەن ناوەنجی. بە تەنیشتیەوە لەسەر قەنەفەکە سکرتێری یەکەم بوو، کە پیاوێکی بچکۆلەی دەم بە پێکەنینی تەبرێزی بوو.

سەرسام بووم لەوەی کە بۆچی دەیەوێت ببینێت، لەوانەیە تەنیا بیەوێت بزانێت من کێم و چ کارێکم لەگەڵ میرزا حەسەن خاندا هەیە. بە شێوازی فارسی سڵاوم لێکرد، کە بەپێی داب و نەریتی ئەوێ، ئەوەی دێتە ژوورەوە سڵاو لەوانەی ناو ژوورەکە دەکات. وەڵامی سڵاوەکە لەلایەن دانیشتوانەوە دەدرێتەوە. داواکەیم پەسەندکرد بەوەی کە دانیشم و چاوەڕێی ئەو بکەم بۆ قسەکردن، دوبارە دوای نەریتی فارسی دەکەوین، کە قسەکردن قەدەغەیە، بەلایەنی کەمەوە دەبێ ئەوە بزانی، کە لەو دوو کەسە کامیان گرنگە دەست دەکات بە گفتوگۆ. ئەو دەستیکرد بە پرسیارکردن و وتی: دەمێکە لە

ئەستەنبولّی، نیازت وایە بمێنیتەوە، چۆنە بە لاتەوە و لەو بابەتە شتانە و پاش ئەوەی ئەو پرسیارە سەرەتاییانەی لێکردم، ئیدی هەڵوێستەیەکی بۆ کرد، لەو کاتەوە کە دوو فارسەکە دایاننابووم بە شێوازێکی پڕ لە ڕێز و گرنگی پێدان، من سەرم لێتێکچووبوو لە لێکدانەوەی ئەو هەڵوێستە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوان بە ئاسایی تا رادەیەکی زۆر چالاکن لە سەغڵەتکردنی میواندا. دوای دەقیقەیە سەغڵەتی و نائاسوودەیی، کۆنسوڵ کوتوپڕ بەشێوەیەکی فەرمی بەخۆشحاڵییەوە وتی- " لە راستیدا ئەم خۆشاردنەوەیەی بۆچییە؟ ئەم درۆیانەشی ناوێت، راستگۆیی باشتر بوو، شوێنی بنەڕەتی خۆتم پێ بڵێ." بۆ چرکەساتێك سەرسامیەك دایگرتم، ئەم جۆرە وتووێژانە لە تورك دەوەشێتەوە، بەڵام لە فارس! بۆ وتن شتێك نییە بیڵێیت تا ئەم گۆڕانکاریە کوتوپڕەی لە هەڵسوکەوتی ئەودا پێ لێکبدرێتەوە، بە هیچ جۆرێ ناتوانم هۆی ئەو بەدواداچوونە پڕ لە نەزاکەتە، یان بێ نەزاکەتانەیە تێبگەم. لە سادەوساکاری خۆم بیرمکردەوە کە بانگێکی خۆڕایی بکەم، کەچی خۆم بینیوە کە وەك جۆرە تاوانبارێك مامەڵە دەکرێم، ئیدی چاوەڕێی بەرچاوڕوونی تر بووم.

"درۆ؟" پرسیم.

"بەڵێ درۆ، من گومانم نییە کە تۆ شیرازیت، زمانەکەی خۆت خیانەتی بە تۆ کرد و منیش تەمەننا دەکەم بزانم چیت کردووە، کە ئەم شێوە لەبار و گونجاوەت بۆ خۆت رازانۆتەوە و ئەو چیرۆکە لاوازەت وەك ئینگلیزێك رێکخستووە.

کوتوپڕ بۆم دەرکەوت ئەمە نوێنەری محەمەد عەلی شایە، ئەوەی بەر لە شەش مانگ لەوەبەر لە رێی کودەتاوە دەستەڵاتی رەهای گرتە دەست، هەروەها بە شێوەیەکی زیاتر بنەڕەتی ئەنجومەنی پەرلەمانی هەڵوەشاندەوە و زۆریان لەو لایەنگرانە هەڵهاتن بۆ ئەورووپا و لە بەرگی ئەورووپاییدا سەفەریاندەکرد. دیارە من لەبارەی یەکێکیانەوە بە هەڵەدا چووبووم.

لەم گێژاوەدا بیرم لە پاسپۆرتەکەی خۆم کردەوە، خۆشبەختانە بۆم دەرکەوت، لەگەڵ چەند نامەیەکدا پێکەوەیە، یەکێکیشیان بەو زووانە لە باڵوێزی فارسیەوە نێرابوو بۆ خانمی سۆن، دوای هەندێ تەنگوچەڵەمە توانیم پێناسنامەی خۆم بسەلمێنم.

رووخۆشی باڵوێز لەو چرکەساتەدا گەڕایەوە. بە رێزێکی زۆرەوە بانگیکردم بۆ سەر کورسییەکی قۆڵداری پانوپۆڕ، جگەرەیەکی بۆ پێکردم و بانگی چایی کرد. سەردانەکە لەو ساتەوە شێوەیەکی بانگهێشتنێکی ئاسایی وەرگرت بۆ پیاوێکی فارسی. هەرچەند مۆڵەتم خواست، هێماشم بەوە کرد کە بەهیوام نەیەوێت وەك شۆڕشگێڕێك بمگرێت، ئەویش وتی، بیرکردنەوە لە هەموو مەسەلەکە

## فارس و تورك

نوکتەیەکی باشە: " باشە، تۆ دەبووایە بە فارسییەکی زۆر رەوان قسەت نەکردایە" تۆ خەڵکی وڵاتی خۆتان دەبینی کە زۆر لە دواوەن لە فێربوونی زمانەکەماندا، کە یەکێك دەردەکەوێت وەك ئێمە قسە بکات، تۆ لەو بڕوایەدای ئێمە باوەڕ بکەین؟"

دواتر زۆر جار یەکترمان بینیوەتەوە و ئەویش هەمیشە دەیبینیم لەگەڵ ئەو هەوایەی پیاوێك کە هەندێ گاڵتەوگەپی زۆر گەورە و پەیوەندیەکی نهێنی لەنێوانیاندا هەیە.

لە دەوروبەری دیسەمبەر/1908دا، پەرلەمانی تورك جڵەوی کاری گرتە دەست و لە میانەی کێشە و هەرای تاقمە تورکەکاندا و بەناو بەیداخ و چەپکە گوڵەکاندا، خۆپیشاندانی نوێنەران و دیبلۆماسییە بێگانەکان لە ئەستەنبوڵ دریان بە رێگەکە دا بەرەو ماڵەوە، بۆ دانیشتن بۆ ماوەی چەند مانگێك و سەلماندنی بێ ئەنجامی.

هەڵوێستی فارسەکان سەرنجراکێشەربوو، کە یەکەم رووبەڕوو بوونەوەشیان بوو لە ئازار و سزای نوێنەرایەتی میللی. بەهەرحاڵ، لای خەڵکی وایان دانابوو کە فارسەکان لە ئەستەنبوڵ و سەمیرنادا، دە هەزار کەسێك دەبوون، کە خۆپیشاندانیان دەکرد و لە ناخی دڵەوە لەگەڵ ئەنجومەنی تورکیدا بوون. ئەگەر ئەو ناونیشان و پیرۆزباییەی یانە سیاسیەکانی فارس باوەڕی پێبکرێت، ئەو گریمانەش راست و دروستە. فارسەکان بەهەرحاڵ، هەمیشە بۆ نرخی بەرژەوەندی زیندوون و ئاشکرایە لە میانەی لێبوردەیی تورکەکانەوەیە زۆر بوونی مەزهەبەکان لە لایەن باڵوێزی ئێرانییەوە بە گومڕایی لەبەرچاو گیراوە. پێویستە سۆزی روون و ئاشکرای خۆیان لەگەڵ جوڵانەوەی میللی عوسمانیدا دەربڕن.

لە ماڵە تایبەتیەکانی خۆشیاندا، تانە و توانج لە بیانیەکان، هەمیشە لەسەر زاری فارسەکان بوو.

ئەو پەناهەندانەشی وەکو شیعە، بەڵام وەك دەڵێن کەمتر لەوان هاوسۆزییان هەیە لەگەڵ هەر جوڵانەوەیەکی سونییە تورکەکان و وەك چەند جارێکی تر بینراوە پاش دووبارە بوونەوە لە هەڵبژاردن و خۆڕێکخستنی ئەنجومەنی تورکی هەڵەیەکی زۆر هاوبەشی دەکات لە ئاژاوە و دەبێتە هۆی رووخاندنی یەکەم پەرلەمانی فارسی. بۆ گەڕان بەدوای بەرزترین خاڵی لوتبەرزی لە هەوڵ و کۆششی میللەتدا، کە لە سەردەمانی پێشوتر زیاتر بەربەرییە. لەسەرو ئەوەشەوە، خراپ بوون بە چەشنی فارس لەژێر دەستەڵاتی رژێمی کۆندا، هەروەها جوتیارێکی زۆر و دانیشتوانی شارە سادە و ساکارەکان هەرگیز ئەوەندە خراپ نەبوون، بە شێوەی ئەوەی لە تورکیادا بەرامبەرە و ئەگەر پلەی

باڵآ له گەندەڵیدا هەبوبێت ئەوا لەناو دەستودائیرەی ئیمپراتۆریەکاندا هەبووە، کەمێ لە شارەزایانی تورك و فارس هەیە، کە لەم هونەرەدا دەست ناخەنە ناو دەستی تورکیاوە، بەهەرحاڵ لەم شارانەی ئاسیادا.

بەم جۆرە فارسەکان تەماشایاندەکرد، هەموو ئەو کێشانەیان دەبینی، کە دەبێت بەسەریدا زاڵبن، کێشەکان بەهۆی سەرکێشی و ناپاکی یۆنانی و ئەرمەنیەکانەوە ئاڵۆزتر دەبوون و چاوەڕوان دەکرێ تەنگوچەڵەمەی پڕ لە کارەسات ببینرێ وکاتێ کە هات وەك ئەوەی پێشبینیان دەکرد، بە هەڵوێستێکی سەرکەوتووانەوە " من ئەوەم پێوتن" کە ئەوان خۆیان ئامادەکردووە، بە هەستی ئەوەی کە مەسەلەی دوژمنێکی کۆن یەکالآبکەنەوە.

تەنیا ئەنجامە کوتوپڕەکان لە کردنەوەی پەرلەماندا، کاریگەری لەسەر دانیشتوانی شارەکە هەیە، چەند ستونێك ئامادەکرابوو بۆ هەندێ لە رۆژنامەکان کە پڕبوون لە هەواڵی وتاربی. یەك تۆز جیاوازی نەبوو لەوەی کە پەرلەمانی خۆمان لە لەندەن ئامادەیاندەکرد بۆ رۆژنامەکانی لەندەن و بێئاگایی و مەستیەکی زیاد لە پێویست بەتایبەتی لە ریزی پۆلیسدا هەبوو. هەرێمەکانی دەوروبەر، لێکدانەوەیەکی تایبەتی خۆیان بۆ (ئازادی) هەبوو، ئەویش باری یاخی بوون بوو لە یاسادا بە هەموو جۆرەکانیەوە، کە تا ئاستی ئەو خاڵە بەرزبۆوە، کە لە مێژووی تورکیادا نەبووە، بەلایەنی کەمەوە لەو بەشانەی ئاسیادا، کە ئەم کتێبە گرنگی پێدەدات.

پاشان، لەسەرەتای 1907دا ئەوە بە برێکی تەواو دڵسۆزییەوە لە ئێراندا پێچدەکاتەوە، کاتێ لەسەر وەختی مەرگی (موزەفەرودین شاه)دا یەکەم دەستوری فارسی دامەزراند، لەو وڵاتە نەگبەتەدا کۆمەڵانی پشتگوێنراو بەهیوای (ئەنجومەن) بوون کە بگەڕێتەوە، لە ماوەی چەند رۆژێکدا دەرمانی چارەسەر بۆ ئەو نەخۆشیانە بدۆزنەوە، کە گەورە بوون و بوونەتە بەشێکی جیانەبووە لە نەتەوە لە میانەی سەدەکانی حوکمڕانی ناجۆردا و سەرنەکەوتنی نوێنەری گەڵ تەنانەت لە مەسەلە ناوەندیەکانیشدا، کە لە کۆتایدا بووە هۆی تەقینەوە لە هەموو لایەکی وڵاتەکەدا و هاتنەوەی محەمەد عەلی پاشا، کە توانی هێزی رەهای خۆی لەو ماوەیەدا بسەپێنێت.

لە ئیمپراتۆریای تورکیشدا بە کردەوە هەمان شت روویدا. نایەوێت بڵێت، بەشێکی چالاکی زۆری خەڵك لە بوونی سوڵتان عەبدولحەمید وەك زۆردار و چەوسێنەر پەیوەندار بوون. بەتایبەتی ئەو قەشە بەدەستەڵاتانەی شوێن و رێیەکیان هەیە و ئەوانەی سامانێکیان گردکردۆتەوە، ئەویش بەهۆی ئەوەی لای سوڵتانەوە پەسەندێتیان بەدەست دەهێنا یان هاوبەشییان لەو سامانەدا دەکرد.

## شێخ- ول- ئیسلام

قوربانیانی دەستی ئەم کۆمەڵە گەورەیە چاوەڕێن لەگەڵ بانگەشەی (حریات) ئازادیدا ئەم ستەمکارانە بەخێرایی لاببرێن و بچنە خانەی بیرچوونەوەوە، بەڵام بەتێپەڕبوونی ڕۆژگار، خۆێنمژان و هەروەها خوێنرێژان بەهێزێکی زۆرترەوە لە کردەوەکانیاندا بەردەوامبوون، خەڵکی بە هاندانی لایەنە سیاسیە نوێکان لە هەموو لایەکەوە ڕاپەڕین. خێڵەکانی عەرەب و کورد، کە دەیانخواست ڕژێمی نوێ بەشێك لە گرنگی پێدان و هەندێ لە سەربەخۆیی کۆنیان بۆ بگەڕێنێتەوە. ئەو باجەی سەپێنرابوو بە سەریاندا و سەربازگیری بۆ بەهێزکردنی لەشکری سەربازی گۆڕانی بەسەردا نەدەهات، بۆیە وەك یەك لە ئەنجومەن و سولتان ڕاپەڕین و ئەو بارودۆخە بووە هۆی ئەوەی کە لە کاتی نووسینی ئەم کتێبەدا، پێشنیارکرا، کە چەند بدرێت بە تورك و سوپاکەی بەپێی توانای خۆیان بۆ ماوەیەکی داهاتوو. بە ویژدانەوە ئەوەش بڵێین، کە دەڵێن زۆربەی ئەم تەقینەوانە لەلایەن سولتان عەبدولحەمیدەوە بە نهێنی زیاتر ئاڵۆزکراوە، بەوەی کە میللەتی زەلیل و ریسواکردووە، بەشێوەیەك کە لە سەردەمی شای ئێراندا هەرگیز گۆڕانی ئاوا بنەڕەتی لەناو میللەتەکەدا نەبینراوە.

بەهەرحاڵ، کۆتاییەکەی تەواو وەك محەمەد عەلی شاه بوو، بۆ چەند مانگێك دواتر هەردووکیان خۆیان بە لەکارخراو و خانەنشین بینییەوە.

هەرچۆنێ بێت، سیاسەتی ئەستەنبوڵ باش دەزانرێ کە لەوێدا پێویستی بە هەواگۆڕین هەیە، بۆیە ئێمەش دەگەڕێینەوە بۆ بابەتە بنەڕەتیەکەمان لەبارەی فارسەوە. دوای گەیشتنم بە ئەستەنبوڵ بۆم دەرکەوت، کە کوردێکی زۆری لێیە، بەڵام هەموو کرمانج بوون یان تیرەی زازای کوردستانی تورکیای باکووری بوون، منیش تەمەننامەدەکرد کوردێکی کوردستانی باشووریی ئێرانی پەیدابکەم، یەکێ لەو هۆیانەش بۆ بینینی کەسێکی ئاوا ئەوەیە، دەمویست ئەو لێکۆڵینەوانە تەواوبکەم کە ساڵێك بوو لە کرماشانی ڕۆژهەڵاتی ئێراندا پێوەی خەریکبووم. بەهەرحاڵ، بە ڕێکەوت ڕۆژێك فارسێکی دۆستم هەواڵی پێدام، کە شێخێك لە سنەوە، لە کوردستانی ئێرانەوە گەیشتۆتە ئێرە، بەڵام تەنیا وتی ناوی شێخول ئیسلامە و شوێنی نیشتەجێکەی نادیاربوو، وای هەستدەکرد لە یەکێ لەو کاروانسەرایانەی ناو ئەستەنبوڵدا بێت و لەوە زیاتر نەیدەتوانی شتێکی ترم پێبڵێت. وەك شێخیش کێشەکە لەوەدابوو کە ئەو سوننییەکی دەمارگیرە و منیش ناتوانم لەوە زیاتر لە هاوڕێ شیعەکەم چاوەڕوان بم، کە لەوە قوڵتر زانیاریم پێبدات. بڕیارمدا بیدۆزمەوە، بەهەرحاڵ، بەو جۆرە چەند ڕۆژێکم بەسەربرد لە سەر و ژێرکردنی کۆڵان و شەقامە ناخۆشەکانی ئەستەنبوڵدا،

# دیدەنیەکی زانخوازی

پرسیارم لە هەموو میوانخانەکانی موسڵمانەکان دەکرد و ڕۆژانە زووربەی کاروانسەراکانم دەپشکنی و پرسیاری شێخول ئیسلامی سنەم دەکرد، ئەوەی دڵخۆشکەر بوو ئەوە بوو، لە گەڕانەکەمدا بەو بڕە وشە تورکیە پرسیارمدەکرد، کە فێربیووبووم. وەك هەمیشە لە تورکیا ئاوابووە، شت فێربوون و حەز بە شت زانین ناخۆش و ئاڵۆز بووە. هەرکەسێك کە پرسیارم لێ دەکرد، زنجیرەیەك پرسیاری دەکردەوە، وەکو: بۆچی و لە کوێوە هاتوووە و کێیە و کەی، کە ناشارەزایم لە زمانەکەدا ڕێی نەدەدا وەڵامیان بدەمەوە. لە کۆتاییدا، بەهەرحاڵ، لە ئەنجامی پەیداکردنی لیستێکی زۆر لە کاروانسەراکان و یەك بەیەك گەڕانیان، شوێنی نیشتەجێ بوونی شێخم دۆزییەوە. ئەم کاروانسەرا تایبەتیە وەکو هەموو ئەوانی تری ناو ئەستەنبوڵ بوو، بینایەکی بچووکی دوو نهۆم بوو، ژووری بێ پەنجەرە بەدەوری گۆڕەپانێکدا کە لە ناوەندی خانووە بچکۆلەکەدا بیناکراوە و بریتیە لە بۆشایی جیا جیا بە شێوەیەکی یەکسان. نهۆمی یەکەم بریتی بوو، لە ڕاڕەوێك و ژوورەکانی کەوتبووە سەر، پیاوێکم لە گۆشەیەکدا بینی، یان ڕاستر بڵێم وەك خاوەن ماڵێك. ئەو کاتانە کەشوهەوا زۆر ناجۆر بوو، بەشێوەیەك هەر وەسف ناکرێت، ڕۆژانە کرێوەی بەفر و زریانی باوباران، بەستەڵەکی دەشت و گردەکان لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژهەڵات، دەمویست بزانم ئەم کەسەی لە وڵاتی پڕ لە خۆرەتاوی ئێرانەوە هاتووە، ئامۆ بەم ڕۆژە ناخۆش و تاریکانە، چۆن دەتوانێ لێرەدا بژی، هەروەها چی لەوەش ئازایەتی تر بێت، کە بتوانیت بەم هەموو قوڕوچڵپاوەی ناو شەقامەکانی ئەستەنبوڵدا بچیت بۆ لای. خزمەتکارەکەیم بینی، کوردێکی سنەیی بوو، فارسیەکی کەم قسەی دەکرد و سەرسام بوو لەوەی ئەورووپییەك بە کوردی بدوێت، هەر زمان لە دەمیا نەما. بەهەرحاڵ، ڕۆژی چاوپێکەوتنمان دیاریکرد، دوو ڕۆژ دواتر جارێکی تر بینیمیەوە، کە زریانی بەفرو باران ماوەی نیوسەعاتێك مەودای بینینی بەرپێی نەدەدا، لە پێراوە بە گەڵتەدا بۆ پردی شاخی زێڕین- هەلیج، ئێستا بە ئاڕاستەی یەك شوێن لەوەدەچێ ڕەشەبا هەموو سەهۆڵی سەر زەوی بەسەر ئەستەنبوڵدا بێنێت. لە گۆڕەپانی کاروانسەراکەدا بە خۆبەکێشکردن بەسەر کۆمەڵە بەفردا، کەسیش لەو ناوەدا نەبوو، سەرکەوتم بەسەر پەیژە شڕوشەقەکەدا، لەکۆتایی ڕاڕەوەکەدا لە دەرگایەکی نزمم دا. یەکێك بە فارسی هاواریکرد (کێیە) و منیش بە هەمان زمان وەڵامدایەوە، پێی وتم وەرە ژوورەوە و منیش چووم. کڵاوڕۆژنەیەکی بچووك شوێنەکەی تەواو ڕووناککردبووەوە و بەشێوازی هاووڵاتیانی ئێران

شتەکانی ناوی ڕێکخرابوو. بەرامبەرم سەماوەرێکی زەرد لە پشت ریزێك پیاڵە چاوە دانرابوو. سەماوەرەکە قۆرییەکی چای گچکەی بەسەرەوە بوو، کوردە خزمەتکارەکە نێرگەلەی فارسیی لە تەنیشت مەقەلێیەکەوە پڕدەکردەوە. سێ یان چوار سندوقی تەختەی ئێرانی کە بە بسماری سەرە مسیی کرابوو بە دیوارەکەدا، لە گۆشەیەکدا پێداویستیەکانی ڕێگاویانی تێدابوو، کوزەڵەیەکی ئاوی گڵێن (ئافتابە) مەسینە و جۆرە تەشتێکی مس بۆ دەست و دەموچاو شتن و دەستنوێژ هەڵگرتن، هەروەها شتومەکی تر کە هەموو گەشتیارێکی ئێرانی ئاشنایە پێی. زەویەکە بە جۆرە راخەرێك داپۆشراوە، .کە لەنیوەی ڕێگەکەوە دەستپێدەکات و پێی دەوترێ کلیم و ئەو کلیمە لە کوردستانی ئێران دروستدەکرێت، هەروەها دوو پیاو بەرامبەر یەك دانیشتوون و قاچیان کردبوو بەژێر لێفەیەکدا، کە لەوە دەچێ بەسترابێت بە کورسیەکەوە. شێخ ئەوەیان بوو، کە برۆیەکی پڕ و ریشێکی ڕەشی هەبوو، ئەوەندە سامدار و توڕە دیاربوو، کە بەس بوو بۆ تۆقاندنی ئەو کەسەی بەبێ ژووان هاتبێت بۆ دیدەنی، هەروەها هاوڕێکەشی لە هەمان بارودۆخدا بوو، لەویش بە تەمەن تر بوو، هەردووکیان یەکی مێزەرێکی گچکەی سپییان بە سەرەوە بوو، بەڵام لەوە نەدەچوو کە جلوبەرگی میللی خۆیان بە جلوبەرگی ئەستەنبوڵی گۆڕیبێت، چونکە دوو پاڵتۆی ئەستووریان لەبەردا بوو. کورسیەکەی ژێر لێفەکە دەوری مەقەلێیەکی مسی پڕ لە پشکۆی خەڵوزی داوە، کە پێیدەوترێ (کورسی)، ئەوەش شێوازی کوردانەیە بۆ مانەوەی هەوای گەرم. ئاشکرایە گەرماییەکی زۆر کە لەژێر لێفەکەدا پەنگ دەخواتەوە و بە ژوورەکەدا بڵاونابێتەوە، کە لەو حاڵەتەدا زۆر ساردیشە. شێخ ئاگاداربوو لە هاتنەکەی من و بە فارسی بەخێرهاتنی کردم، بەڵام بە شێوەی کوردی، کە تەواو پێوەی دیاربوو، منیش قاچەکانم کرد بەژێر لێفەکەدا، کە ئەویش رایکێشا بۆ لای چەناگەمان و بۆ چەند دەقیقەیەك ڕێز و ستایش لەگەڵ ئەو و پیاوە پیرەکەدا ئاڵوگۆڕ دەکرا. لەم حاڵەتەدا لەوانەیە بەلای نامۆیەکەوە بەکارهێنانی ئەو کورسیە شتێکی بێ مانا بێت: شێوەی سێ پیاو لەسەر شێوە چەرپایەکی گەورە دانیشتبن، لێفەکەش لێفەیەکی ئاسایی سەر چەرپایەك بێت و پشتیەکانیش یارمەتی پشت چەمانەوەمان دەدەن بەسەر سەرجێگاکەدا لە یەکتری. ئەوان زۆر بێتاقەت بوون بەو کەشوهەوایە، بەڵام کە من وتم لە کوردستانەکەی ئەوان بووم و شارەزای وڵاتەکەیان و زمانەکەیانم، کەمێ کرانەوە، بە دەم چایی خواردنەوە و جگەرەکێشانەوە دەستیانکرد بە گفتوگۆکردن و زانیاریەکی زۆریان لەبارەی خێڵەکانەوە دامێ، ئەوەی من بۆی هاتبووم، بەڵام تەمەننای ئەوە ناکرێ لە یەکەم دیداردا بەدەستی بێنیت.

بەهەرحاڵ، ئاووهەوای ئەستەنبوڵ لەو شوێنەدا ئەوەندە کاریگەربوو، بۆیە شێخ بڕیاریدا لەگەڵ یەکەم کەشتیدا بچێت بۆ بەیرووت و بگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە لەسەر سنووری ئێرانی تورکی لە وڵاتی کوردستانی باشووریدا.

نائاسایی نەبوو، کە حەزمدەکرد یەکەم جار بزانم بۆ لە کوردستان دەرچووە و دووەم، بۆچی نیازی نییە بۆ ئەوێ بگەڕێتەوە، وێستانێکی کەم نزیك سەرسنوور و بۆ ماوەیەکی کورت. یەك دوو پرسیاری لای من قوتکردەوە، بەڵام دیاربوو گومانی لە هەموو بێگانەیەك هەبوو، منیش دەبووایە رازیبم بە بۆچوونەکانی خۆم، کە لەوانەیە لەوە زیاتر نەبێ وەك پەناهەندەیەکی سیاسی خۆی بناسێنێت، بەهەرحاڵ، لەوە دەچوو تەواو لەم ژینگە نامۆ و چەپەڵەدا بێزاربوويێت، لەگەڵ زمانەکەی و شێوەی یادەوەریەکانی لە کوردستانی ئێراندا، زۆر بە توندی لەم شوێنە نائاساییەدا، لەو وڵاتەی کە لاسایی ئەورووپا دەکاتەوە و هەرچییەکی تێدایە بێفەڕە.

بەگشتی، سێ چاوپێکەوتنم لەگەڵیدا کرد، ئەو رازینەبوو بێت بۆ پێرا، کە وەك شارۆچکەیەکی پڕ لە ژن و دوکان و بازاڕی ئەورووپی بیستبووی، لەسەر شێوازی فڕەنسی. کە سەرومێزەرەکەی و جلوبەرگەکەی تەواو بە ناجۆر دادەنا بۆ ئەو شوێنە. بۆیە هەموو جارێك هەر لەژێر لێفەکەدا لەگەڵ هاوڕێکەیدا دەمبینی، زۆر بێتاقەت، زۆر بێدەنگ، هەناسەی ساردی هەڵدەکێشا و باسی هیچی نەدەکرد جگە لەو شوێن و خەڵکانەی لە پشتی چیاکانی ناوچەی خۆیانەوە جێیانی هێشتبوون. ماوەی ناسیاویم لەگەڵیدا هەرچەند تەواو کەم بوو، کەچی بووە هۆی بەرپابوونی بیرێك لەو کاتەوە هاتووم بۆ لای و بێزاربوون لە ئەستەنبوڵ وردە وردە لە بیروباوەڕمدا دەردەکەوت. لەگەڵ ئەوەی کورد نەبووم و لە دابونەریت و فەرهەنگی خۆم دانەبڕاوم، وەك کەسێکی دانیشتوی رۆژهەڵاتی ئێران، کەچی تاسەی سەربەستی دەشت و چیا دەکەم و بیر لە کاروانی هێمن و لەسەرخۆی کاروانەکان و ئاواز و گۆرانی شوانەکانی قەدپاڵی گردەکان و هەوای پاك و بێگەرد و هەتاوی سوتێنەر دەکەمەوە. ئەمە هەموو باسوخواستی ئەو و بیر و بۆچوونی من بوو. شێوە زارەکەی و هەروەها فارسیە قورسەکەی بە شێوەیەکی روون و ئاشکرا وێنەیەکی زیندوی ساڵێك لەوەبەرە. وێنەی جوان و دڵفڕێنی دەشت و گردەکانی کوردستان، خۆرئاوابوون بەسەر دەشت و لوتکەی بەفریندا و ئەوەی زیاتر لەم رۆژگارەدا خەوی پێوەدەبینم، ئەو زارە گرانانەی لە گوێمدا ماون، بەهێزترین سەرنجڕاکێشیی رێگاکە گەشەیکرد.

شێخ ڕۆشت و ئیدی شتێکم لەبارەیەوە نەبیست، بەڵام یادی خۆی و ژووره خنجیلانەکەی دەکەم، ئەو گۆشەیەی کوردستان لە ئەستەنبوڵدا، لەگەڵ دابونەریتی ماڵەکەیان کە تێکنەچووە بەو هەموو چاخانە و شوێنی پشودانی ناو شارەکەش، من ڕۆژانە وێنەی چوونی بەرەو سووریا و وردە وردە نزیکبوونەوەی بۆ سنووری کوردستان بە دەشتاییەکانی دیجلەدا هەرگیز لە پێش چاوم دوور نەدەکەوتەوە. من تەنانەت بیر لەو ڕۆژە دەکەمەوە کە ئەو دەبێت بگاتە یەکەم شارۆچکەیەکی کوردی کە توشی دەبێت، کە لەوانەیە بەر لەوەی بگاتە ئەوێ رووتیبکەنەوەو خەریکبێت لە لایەن کوردەوە بکوژرێت. لە کۆتایدا بڕیارمدا لەگەڵ کەشوهەوادا: ئەگەر لە ڕاستیدا لە ڕۆژێکی تایبەتیدا ئاسمان سایەقە و هەوا گەرم بێت، ئەوا دەمێنمەوە، ئەگینا بیر لە شتی تر ناکەمەوە جگە لەوەی بەرەو بەیرووت دەچم و لەوێشەوە ڕێگەی خۆم بەرەو کوردستان دەدۆزمەوە. بە دڵنیاییەوە گیرفانم ئەوەندە پڕ نییە، من ناتوانم وەکو ئەوروپییەکان بچم بۆ گەشت، لەگەڵ خزمەتکاردا و بۆ هەموو شت دووچەندانە پارە بدەم و باشترین جێگا لە هەموو شوێنێکدا بۆ مانەوە بەکاربێنم. ئەگەر ڕۆشتم، پێویستە فێست بکەمە سەر و وەك هاووڵاتیەکی ڕۆژهەڵاتیی بپەڕمەوە، پێویستە خواردنی تایبەتی خۆم بکڕم و سەوداوامامەڵە و مشتومڕی تایبەتی خۆم بکەم، دەبێ هەموو ئەو شتانە بکەم کە ئەوروپی ناتوانێ یان هەرگیز بە یادیا نایەت بیکات. لە ئێراندا وەك فارسێك تاقیکردنەوەی ژیانم لە بەرگی نادیاردا هەبوو، ئەوەش ئەرکێکی ئاسانە بۆ منێکی بێگانە لەناو بێگانەکاندا و هەر جیاوازیەك لە میانەی نەریتماندا لەسەر ئەو ڕاستەییە دادەنرێت. هەروەها شتێکی دڵڕفێنی تایبەتی هەبوو، گەشتکردن دوور لە چاوی کەسانی ترەوە و نە بە عەرەب و نە بە تورکت نەزانن، بەناو سووریادا و شۆڕبوونەوە بە دجلەدا بۆ کوردستان. کاتێ گەیشتمە ئەوێ من دەبێ زیاتر لە ماڵەوە بم، بۆ ئەوەی دوو تا سێ شێوە زار و فارسییەکی جوان فێربم، کە وام لێدەکات وەك فارسێك بەناو کوردەکاندا تێپەڕم و ئەو خۆ گێلکردنە بشارمەوە لە خوو نەریتێ کە لە ڕۆژهەڵاتدا بنەچەی ژیانە. بەگوێرەی پەیڕەوی ئیسلامیەوە لە ئێراندا هەموو ئەوانە فێربووم و وەك شیعەیەك دەمتوانی نوێژەکانم بکەم و باشترین دەمەتەقێ بە قورئان بکەم. ئیدی هەموو شتەکان بەپێی نەخشە دەڕۆیشت و هەرزانیش بوو، من دەبێ زۆر وڵاتی نوێ و خێڵ و تیرەی نوێ ببینم و بناسم. دەبێ شێوەزارێکی زۆری زمانی کوردی فێربم، کاتێ تەواو بووم دەبێ لە ئاستێکی دروستی زانیاریی خەڵکدا بم، لەبارەی ڕێوشوێن و سروشتیانەوە، وەك ئەوروپییەك کە لەوانەیە لە ماوەی 10 ساڵدا بتوانێ بە دەستی بهێنێت. ئیدی بۆی دانیشتم و چاوەڕێی بڕیاری کەشوهەوا بووم...

## بەشی دووەم

# لە ئەستەنبوڵەوە بۆ هیرا پۆلیس

"چاوەکانم کەوت بە چۆل و رەیکادا هەڵمباری چوو بە ڤمیران جەکادا."

واتە (چاوەکانم کەوت بە تەنیایی و رێگا، هەستام و چووم بۆ کۆچی شوێنەکان)

گۆرانی کوردانی ئەرزنجان.

کەشوهەوا بۆ من ئەوەندە خۆش نەبوو کە لەبەرخاتری ئەوە بمێنمەوە، تا لە رۆژی بڕیارەکەشم نزیک دەبوومەوە، وردە وردە ئاڵۆزتر دەبوو، رۆژێکی زریاناوی و باران بوو، کە بەرەوخوار چووم بۆ گەڵەتە و خۆم لە کەشتی هەڵمی هاتوچۆی (ماساجرس ماریتیمس) بۆ بەیرووت ناونووسکرد.

هەندێ کاروویار هەبوو دەبوایە جێبەجێبکرێت، من پاسپۆرتم هەیە، بەڵام دەبێ بەڵگەنامەیەك دەربێنم، کە پێی دەوترێ (تەسکەرەی عوبور)، واتە بەڵگەی پەڕینەوە وەك پاسپۆرتی گەڕان لە تورکیادا، کە لە لایەن پۆلیسەوە دەردەکرێت. بۆیە دوای ئەوەی فرمانم لە قۆنسوڵەوە وەرگرت، بەرێکەوتم بۆ ئەو کۆمەڵە کوخانەی لە ئەستەنبوڵ پێیان دەوتن (ئسکی زەپتیە) واتە (پەیڕەوی یاسای پێشو)، پاش چوونم بە پەلە لە کوخێکەوە بۆ کوخێکی تر بۆ ئەوەی چەند (ئەفەندیەك) دیداربکەم، ئەوانەی کە ئەرکیان مۆرکردنی داوانامەکەم بوو، لەپڕ لە گۆشەیەکی نادیاری بۆشاییەکی چەپەڵەوە بەڵگەیەکیان پێدام. نوسەرەکە بە دڵنیاییەوە ئاگای لە بوونی من نەبووە لە بیناکەدا، بە لایەنی کەمەوە خۆم بینییەوە وەك تورکێك دانراوم و سەرەتا باڵایەکی مامناوەندی قژی رەش و بێ ریش، لەگەڵ سمێڵێکی رەش تەواو بە وردی دیاریکراوە و لە کۆتاییشدا ئاینی (پرۆتستانت).

من لە میانەی زووربەی گەشتەکەمدا وەك موسڵمان تێدەپەڕیم، کەچی لێرەدا هەموو نەخشەکانم هەڵوەشایەوە، ئەویش بەهۆی فەرمانبەرێکی تورکەوە کە لە پاسپۆرتە گەمژانەکەیدا بە پرۆتستان ناوی بردووم.

زۆر بە ئاسایی نارەزایم دەربڕی و بە توندی دژی کارمەندە پۆلیسەکانی کە هەموو شت دەزانن راوەستام، کە ئەم تیرە و مەزهەبەیان بۆ هێناومەتە پێشەوە، کەچی بەشێوەیەکی ئاسایی لە نارەزاییەکەم سەرسام بوون، هیچ شتێیەکیان نەدەزانی لەوە زیاتر کە هەموو تورك موسڵمانە و هەموو ئەرمەن کرستیانە و هەموو فرەنسیەك کاسۆلیکە و هەموو ئەمەریکی و ئینگلیزیش پرۆتستانە. بەڵام ئەوان ئەوە بە ناوی ئایینی نەتەوە جیاوازەکان دادەنێن و ناتوانن پیاوێکی ئینگلیز

## کێشەکانی پاسپۆرت

بخەنە سەر مەزهەبێکی جیاواز لەوەی بۆی دیاریکراوە، کە لەوانەشە ئەو پیاوە ئینگلیزە کاسۆلیك بێت ئەو بۆچوونە زۆر زۆر هیچ وپوچە و ئەوەندەی تر قینیان لە هوشیاری من دەبزوە و ئاشکرایە و من لەوەش دڵنیابووم. بۆیە بەرامبەر ئەو وشە تورەکەرە دەبێ بووەستی و منیش وتم بە نهێنی دەیسرمەوە یان لە شوێنی پێویستدا دەیدڕێنم.

رۆژی دەرچوون وەك رۆژانی مانگی رابردوو باراناوی و سارد بوو، بەڵام من بە گەشبینیەوە تێمدەڕوانی، لەبەرئەوەی لە چەند رۆژی داهاتودا گردۆلکە هەتاوگرەکانی سووریا دەبینم. کەشتیەکەمان (سەخالین) بوو، کەشتیەکی کۆنی دڵگیر و فراوان بوو. وەرزی بەهارێکی زوو لەگەڵ خۆیدا یەکەم گەشتیارانی بۆ فەلەستین هێنا. هەر کە چوومە ژوورەوە یەکەم وشەی ئینگلیزیم بیست لەو کاتەوە کە لە لەندەن دەرچووم. لایەنەکان تەواو نەگونجاو بوون. چوار یان پێنج قەشەی کاسۆلیکی رۆمانی لەگەڵ کۆمپانیایەکی سەرمایەداری ئایینی دەچوون بۆ قودس بۆ حەج، هەروەها کۆمەڵێکی زۆر گەورەتر لە خاوەن کارگە دەوڵەمەندەکان، کە لە شاری (لیدز) و (لەستەر)ەوە و دەرزەنێکی تر لە شار و شارۆچکەکانی ناوەندی بریتانیاوە هاتوون. لە لای دووەمەوە بریتی بوون لە هەندێ لەوانەی تۆماس کوك لاساییان دەکاتەوە و بریتین لە شەش بەرێزی ئایینی کارامە، کە هەر یەکەیان سەر بە مەزهەبێکی جیاوازی دابڕاوی بریتانی بوون. هەروەها ئەوانە هەموویان لادێیی بوون. ئەمریکییەك و ژنەکەی، پاشایەکی تورك و خێزان و ئەفەندیەکانی هاوەڵی و هەندێ ئەڵمانی و فەرەنسی دوور لە یەك کەشتیەکەیان بە تەواوی پڕکردبوو. هەرچۆنێك بێت زوویێ یان درەنگ من دەبێ دەست بکەم بە پۆشینی فێستەیەك، لەو بڕوایەدام باشتر وایە هەر ئێستا دەستی پێبکەم و بەرگەی مەرەخەسی فارسێك کە دەچێت بۆ ئێران، تا خۆم لە تورکیش هەڵە بکەم، کە ناتوانرێ لەوە زیاتر لەوێدا بەرگی نادیاری بپۆشم. لە شێوازی هاوولاتیەکی دوورە وڵات و لە رێگادا بۆ ئەو شوێنانەی کە ناوی ئینگلیزییان زۆر بە دەگمەن بیستووە، هەستێکی سەیرم کرد، کە لە هاوولاتیانی ئەورووپی دابڕام، کاتێ گوێم لێبوو باسی گەشتەکەیان و نەخشە و پیلانە نوێکانیان دەکرد، هەرکاتێ ئەوان پێویست بوو فەلەستین و میسر بزانن و جارێکی تر بگەڕێنەوە بۆ شارە ناوەندیەکان دوای ئەوەی زانیارییان لە وڵاتانی رۆژهەڵات پەیداکردووە. زۆر سەیرە ئەو گۆڕانە سادەیە بە سەرداپۆشینێك دەتوانێت چی بکات! ئەوەتا من لە راستیدا تەنیا فێستێکم کردۆتە سەرم، دابڕاوم، نیگام بۆ خوارەوە بە شێوەی یەکێك کە بەبێ تێبینی کردن بە لەندەندا بڕوات و

# سەرکەوتنەکانی نادیاریەکەم

کەس ئاوڕی لێنەداتەوە، ئینجا بە دەنگی بەرز هاواریاندەکرد"ئەوە تەواو تورکێکی شارستانیە" دەبێ چەند ژنی هەبێت؟ ئیدی لەو جۆرە پرسیارە رۆژهەڵاتیە کۆنانە. بێئاگایی ئەو خەڵکانە زۆر سەیر بوو، ئێمە لە نزیکەوە دەمانبینین، بیرمە، بەیانی رۆژێکی (میسیلین)، هەموو هێزی قەشەکان و گەشتیاران لە وێستەگەی شەمەندەفەر ئاڵابوون لەگەڵ پەرتوکی رێنمایی و چاویلکەکان. مشتومڕیان لەسەر بەرزایەکان بوو، کە ئایا (خیوس)ە یان (رودس)ە، بێئاگابوون لەو نەخشە گەورەیەی سەر پلیکانەکانی ساڵۆنەکە، کە دەتوانرێ لە ماوەی دوو دەقیقەدا بە بیرکردنەوە ئاستی خۆمان لەسەر هێڵی رێگاکە دیاری بکەین. خەریکی لێکۆڵینەوە بوون، ئەوان بە دڵنیاییەوە سەرسامبوون بە جوانی و شکۆ و بەرزاییەکانی ئەرخەبیل بەناو ئەوەی پیاتێپەڕین، نەك زۆر بە خێرایی، هەروەها تامەزرۆ بوون بۆ بینینی ئەو شوێنانەی پەڕاوی رێنومایيەکە بە باشی دیاریکردووە.

(رودس)، کاتێ گەیشتینە ئەوێ و ئەوان دڵنیابوون لەوەی کە ئەوێ سایپرس نییە، جۆش و خرۆشێکی لەنێوانیاندا بەرپاکرد، دەمەتەقێ لە نێوانیاندا لەبارەی پەیکەرە زلەکە و قاچەکانیەوە ئەوەندە گەرم بووبوو، بابەتەکەی بۆ ماوەی دووسەعاتێك بە زیندوویی هێشتەوە، دوای ئەوەی کە دورگەکە لەژێر ئاسۆی شیندا ون بوو، "تەواو شینە وەك دەریای بلاکپوڵ"، وەك پیاوێکی خەڵکی مانچەستەر بە گیانێکی سەخاوەتانەوە ئەوەی دڵنیاکردەوە.

پێش ئەوەی دوو رۆژمان لەناو دەریادا بەسەردا تێپەڕێت، بەبێ ئاگایی هەندێ وشەی ئینگلیزیم لە دەمم دەرچوو، ئەوەش بۆ پیاوێکی زۆر قەڵەوی دانیشتوی نیوکاستڵ، کە زۆر بە توندی پێی نا بە پێما و منیش بەبێ هەستی وەڵامی داوای لێبووردنەکەیم بە دەستەواژەیەکی ئینگلیزی دایەوە، زۆر بە سەرسوڕمانەوە تێیڕوانیم و وتی ئاسمانەکە... بە ئینگلیزی دەدوێیت؟

وتم: بەڵێ، لە بریتانیا گەورەبووم.

ئەویش وەڵامی دایەوە (ئۆی) لەوە دەچوو بەوە ئاسودەبێت، "ئەوە مەسەلەکە شیدەکاتەوە، ئەی بۆ کوێ دەچیت؟"

پێم وت دەچم بۆ ئێران، پێشبینیە گەورەکەی ئەو لەم کاتەدا رزگاریکردم لە تۆمەتێك، لەبەرئەوەی هێشتا: دەیوت "ئۆی، کەواتە تۆ دەبێ یەکێ لەو گەورەپیاوانەی ئێران بیت، کە لەم دواییەدا لە بریتانیا بوون بۆ پەرلەمانی ئێرانی. ئێ دەی، بریتانیات پێخۆشە، چی بەشێکی بە باشی دەزانی؟

وەڵامدایەوە: "کێنت و سوسێکس،"بەشێوەیەکی بەرز و راستگۆیانە وەڵامدایەوە، تێبینیەکانی یەکەمی و هەموو باشوورم پشتگوێ خست، بەوەی کە من هەرگیز لە لینکۆڵن بەولاوە نەچووم بۆ باکوور. لەوێدا یەکێ لە هاورێکانی قسەکەرەکە هاتە لامانەوە و منی پێشکەشکرد لەگەڵ هەندێ گرنگیپێدانادا، لەقسەکانیا بۆم دەرکەوت سروشتناسە کە تازە شتێکی دەگمەنی دۆزیوەتەوە.

ئەم بەرێزە هەموو وردەکارییەکی ئینگلیزی وەك من و تۆ قسەدەکات و فارسە و ئەچێت بۆ ئێران.

ئیدی لەو چرکەساتەوە، لەناو ئەو خەڵکەدا من زۆر ناوداربووم و بۆم دەرکەوت کە لە راستیدا ئەوان دەچوونە دڵەوە، بەتایبەتی کە من زانیاری ئەوەم دەدانێ کە پەیوەندە بە ئێرانەوە، وتم ئەوان لە دیدێکی پڕ لە سۆزەوە دەڕواننە بریتانیای دەستووری و داوای یارمەتی لەو دەکەن و دایدەنێت بە هاورێیەکی دێرین لە بەرامبەری رووسەکان، کە قینیان لە قەوقازیەکانە.

راستی فارسی بوونم تەواو ئاسایی بوو، ئەوانیش لەوە دەچوون خۆشییان لە دۆستایەتم بێت، هیچ شتێکیش شادمانیان ناکات لەوەی کەسێ باسی کەموکوڕی وڵاتەکەم بکات، ئامانجەکانی و هەست و سۆزەکانی، مێژووەکەی و کولتورەکەی، ئاین و ئەدەبەکەی و هەموو ئەو بابەتانەی دێ بە خەیاڵدا. لە هەموو بۆنەیەکی لەم جۆرانەدا بابەتی نزیك و گرنگم هەیە کە پرسیارێکی زۆر قوت دەکاتەوە و منیش بەختیارم بەوەی کە لە توانامدایە تیشکێکی گەورە بهاومە سەری. ئەوان دەبێ بە راشکاوی بیڵێن کە دید و بۆچوونی پێشوویان زۆر گۆڕا و ئەو هەڵوێستە گشتییەی بەدەستیان هێناوە، کە لای ئەوان بێ رەنگ و نادیار بوو، چونکە راستەقینە و راستگۆیانەیە، ئەگەر کەسێکی پۆلیش نەکراو کە بە باشی بە ئاگانەبێت، پێویستە لە گەڕانەوەیدا بۆ ئینگلتەرا لە خۆی دڵنیابێتەوە. لە رۆڵگێڕانی ئەم بەشەدا گریمان من رۆڵێکی زۆر هەڵخەڵەتاوانە دەگێرم، بۆ ئەوەش تاکە بەهانەم ئەوەیە کە من بە راستگۆیانە تەمەنناى خێر بۆ ئێران دەکەم، کە چەند ساڵێکی خۆشم لە تەمەنی خۆم تێدا بەسەربردووە و ئەم جلوبەرگ و خۆگۆڕینەش لە جیاکەرەوەیەکی زیاترە بەوەی کە من ئینگلیز نیم. بەهەرحاڵ، بەباشی ئەو شێوەیەی وەرگرتووە، کە تەمەنناى ئەوە دەکات پەسەندی هاووڵاتیانی خۆیشی وەك فارسێك بەدەست بهێنێت.

بۆیە زۆر بە خۆشیەوە کاتەکە تێدەپەڕی، بەجۆرێ کە من بەبینینی گردەکانی بەیرووت بەداخەوە بووم، کە تا دەهات نزیك دەبوونەوە. ئەوانە دوا کەسانێکی ئینگلیز بوون کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ دەیابینم، لەبەر خۆنادیارکردنم نەمتوانی سەردانی قۆنسڵەکان بکەم، کە لەو شارانەی سەر رێگەم بوون.

## له بەیروت

بە داخێکی زۆرەوە خواحافیزیم لێکردن و بینمن کە رۆشتن بە رابەریی کەسێکی مەترسیدار، مەسیحیەکی خەڵکی ئەو ناوچەیە، کە حەزکردنی بە ئامۆژگاری خۆهەڵقورتاندن لە کاروویاریاندا لە چاوەکانیا دەدرەوشایەوە. وەك ئەوەی تەماشامدەکردن، بێتاقەت و سەرگەردان کەوتونەتە ئەو رێیە و نزیك بوو بەخیلییان پێبەرم کە بە فەلەستیندا دەریا دەبڕن و لەناو شەمەندەفەر و ماشێنی تایبەتدا هاتوچۆ دەکەن و لە ئوتێلە پلە بەرزەکاندا دەمێننەوە و لە هەمان بەرگی رێکوپێکدا دەگەڕێنەوە بۆ ئینگلتەرا، بەڵام من دەستمکردووە بە پرۆژەیەکی زۆر جیاواز، بۆ ئەوەی هەمیشە چاوم لە قرۆشێ بێت و ئامادەی درۆکردن بم.

بۆیە لەگەڵ دوو تورك و عەرەبێکی مەسیحی خەڵکی حەڵەبدا خۆم لەناو بەلەمێکی بچووکدا بینیەوە، ئیدی لەوێوە کە بەکۆمەڵ دەرچووین بۆ ناو کولتوورەکانی کۆمەڵانی عەرەب، تورك و هەموو جۆرە رۆژهەڵاتییەك.

من لەلایەن کەسێکی سوورىاییەوە رێبەدیی کرام، کە وەك هەموو کەسانی تر لە بەیرووتدا فرەنسی قسەیدەکرد، تا لە ئوتێلێکی بچووك لەسەر قەراغی بەندەرەکە دابەزم و ژوورێکیان بە رووکاری بەندەرەکەدا دامێ، کە بەرهەیوانێکی بچووکی هەبوو، بەڵام دەبوو بە ئاگاوە بەکاربهێنرێت، چونکە ماشێنە پیس و چەپەڵەکان لەژێرەوە دەوەستان و جۆرێ دوکەڵی زیانبەخشیان لە خەڵۆزەوە فرێدەدایە دەرەوە، لەو ماوەیەدا هەڵمێکی پڕ لە دەنگە دەنگ لە دەمەوانەی پاراستنەوە دەهاتە دەرەوە. ئەو خاڵە کۆتایی ترامی لوبنان بوو، کە بەسەر گردەکاندا دەکشا بۆ خاڵێك کە پێیدەوترێ رەیاق.

ئوتێلەکە لەلایەن تورکەوە بەڕێوەدەبرا، خاوێن و فێنك بوو، بەڵام بۆ نانخواردن دەبووایە بچویتایە بۆ ئەودیوی گۆشەکە بۆ جۆرێ لە خواردنگە بەناوی (ئەلفەرانگ)، کە کۆمەڵێك لە حاجیانی هەمە رەگەز لە مەکە گەڕابوونەوە و لەسەر کورسیە بچکۆلەکان دانیشتبوون و سەیری چەقۆ و چەتاڵەکانیان دەکرد، کە سفرەچیە یونانیەکە خستبوویە بەردەمیان.

بەیرووت- یەکێکە لە شارە مەزنە دەریاییەکانی فینیقیە، کاتێ صور کەشتیەکانی نارد بۆ دوورگەکانی تین؟ ئیدی لەو کاتەوە لە گەشەکردندایە و ئێستا شارێکی رازاوەی جوانە، لە لێژایی ئەو گردانەدا بیناکراوە کە سووریا لە دەریای سپی ناوەڕاست جیادەکاتەوە. دانیشتوانەکەی، من وا هەستدەکەم، کە زووربەی مەسیحیە و تەنیا لە کۆڵانەکانی بازاڕە بچکۆلەکەیدا هێمای راستەقینەی

شارێکی ڕۆژهەڵاتی پێوەدیارە. ئەوانی تریش، ڕێگایەکی پانی خۆڵ، گۆڕەپان و باخچەی گشتی گەورە و ترامی کارەبایی لە هەموو لایەك. زمانی شوێنەکە زیاتر فڕەنسیە وەك لە عەرەبی، ئینگلیزیش سەرنجی تەواو رادەکێشێت لە کۆلیجی ئەمەریکیەکەی ئەوێ. وەکو حەیفا و تەرابلس لەسەر هەمان کەناری دەریایە و لەسەر خاڵێکی بچووکی خاکێکە و رووە و باکورە، بەندەرەکەی بە دیوارێکی دەریایی بەهێز پارێزگاری دەکات، کەنداوێکی قوڵ دەورەی داوە. لە ڕۆژهەڵاتدا بۆ خۆئامادەکردن بۆ گەشت، سەرەتا دەبێ ئەوە پەیدابکەیت کە تورك پێیدەڵێت (وێلداش) و فارس پێیدەڵێت (هامڕا)، واتە هاوڕێی سەفەر. بەو بۆنەیەوە و بەبێ ئەوەی بە دوویا بگەڕێم، کەسێکی تورك لە (کونیە) پەیدا بوو، کە لە هەمان ئوتێلدا دەمایەوە. ئێمە لەگەڵ خۆرئاوابووندا بە شەمەندەفەر چووین بۆ حەڵەب، هەروەها خۆشبەختانە لەبەرئەوەی زۆر تورکیم نەدەزانی بۆیە وتووێژی نێوانمان سنووردار بوو، پێیوتم کە لەبەرئەوەی 24سەعات بەرێگاوە دەبین، بۆیە دەبێ هەرچیەکمان بوێت بۆ خواردن لەگەڵ خۆمان هەڵیبگرین. بەو هۆیەوە چووین بۆ بازاڕی ئەو ناوە و لەو کەسانەی خواردنیان لە سەبەتەکاندا دەفرۆشت، برێ پرتەقاڵی نایاب و هەندێ نان و تێکەڵەیەك لە کولیچە و چۆرەکی شیرینم کڕی. لە سەعات شەشدا دوو حەماڵمان بەکرێ گرت و شتومەکەکانمان برد بۆ وێستگەکە، چەند یاردێك لە دوورەوە لە قەراغی بەندەرەکەدا داماننا و پاش ئەوەی جانتاکانمان بە ڕێژەیەکی بەرز تۆمارکرد، کە لەوە دەچوو بەهۆی هەڵسوکەوتی قێزەونی ئەو ئەفەندیە سەربازناسایەوە بوویێت، بلیتی جۆری پلە دوومان وەرگرت بەرەو حەڵەب. زۆر باش بوو کە کارمەندی فڕانسی شتەکانیان دابینکردبوو، دواتر هاوڕێکەم پێیزانی کە دوو مەجیدیەی زیاتر داوە بە بارکردنی جانتاکان و یەك مەجیدیش لە نرخی بلیتەکە زیادی لێسەنراوە، کە بێگومان ئەفەندیەکە و بلیتبڕەکە بەرپرسن لەو کارە. بەهۆی کۆڵهەڵگرێکی لاوی عەرەبەوە لەو شتانە دەربازبووم، کە ئەویش لەبەر هەندێ هۆ کە شیاوی رونکردنەوە نییە، ئەو خستمیە ژێر چاودێری خۆیەوە و کە شەمەندەفەرەکە کەوتەڕێ هیچ دەستخۆشانەیەکی وەرنەگرت. ئەو فارغۆنەی خۆمان تێدا بینیەوە بەرەو رووی یەك و ئەژنۆکانمان لەیەك گیربووبوو لەگەڵ 10 کەسی تردا پڕبوو. کورسیەکان یان تەختەی دانیشتنەکان، کە بە پێوانەیەکی دیاریکراو دروستکراوە، بە تەواوی 15 گرێ پانە و ئێمە دەبێت لەم فارغۆنەی تێداین هەرچۆنێ بێت شەو بەرێبکەین. چوار کارمەندی ئیتالیی هێڵی شەمەندەفەرەکە زۆر پیس و بۆگەن بوون و شەشەکەی تریان بەرگی سەربازیان پۆشیبوو.

## سوکایەتیکردنی ئێرانیان

ئەو تورکانەی لە شاری خۆیان دوورن، لەوەدەچێ هەمیشە بەرگی سەربازی بپۆشن، بۆیە بێ هیوایی بە روخساریانەوە بەدیدەکرێت، چونکە گرنگیەکی ئەوتۆیان پێنادرێت. ئەو سەربازانە بەدڵنیاییەوە ئەفەندی بوون و سیانیان شمشێریان بەستبوو، ئیدی پیاو هەموو شتێکی بە بیریدا دێت، تەنانەت کابرای فەرمانبەری گومرگیش حەقی خۆی بوو. خۆشبەختانە چونکە ئەوان سەرقاڵی خۆیان بوون، ئاگایان لە ئێمە نەبوو. بۆ ماوەیەك دەربازبووین و کات بەسەردەچوو، کەسانی تورك خۆیان لە ئیشوکارمان قووت نەدەکردەوە، نە خەڵکانی مەدەنی و نە کەسانی فەرمیش.

نزیك سەعات چواری بەیانی، دوای خەوێکی نائارام و زۆر کوتوپڕ، لە تاریکیەوە چووینە دەرەوە و بیابان دەدرەوشایەوە. ئەوەش (رەیاق) بوو کە چەند لقێکی فراوانی لێدەبێتەوە بۆ حەڵەب. خۆشبەختانە شەمەندەفەرە نوێکەمان، هەرچۆنێك بێت زیاتر فراوانە، کە گەیشتین ئەو ئامادەبوو، ئێمەش پەلەمانکرد، واگۆنە نوێکەمان کەمتر جەنجاڵ بوو. شوێن و جێی خۆمان دیاریکرد و کاتێ هێشتا چاوەڕێماندەکرد، دەنگی یەکێکی پەشۆکاو، کە تازە گەیشت و دەترسا شەمەندەفەرەکەی لە کیس بچێت، بێدەنگی رەوانەوە.

یەکەم شەمەندەفەر دەرچوو، هەموو کەس دانیشتووە و خەریکین بووەستین بۆ ئەوەی رێبدەین بە گەشتیارەکان سەرخەوێك لە کەشێکی بێدەنگیدا بشکێنن. لەپڕ کۆمەڵێك خەڵك دەنگیان لێبەرزبووەوە، بەڵام ئەوە سەرنجی من بوو لەم خاکی عەرەب و تورکەدا روخساری ئەسفەهانیەك ببینی، لە ئێرانەوە دەڕواننە پەنجەرەکەمان، نیگایەکی دوور کە هێشتا لە دوورەوە بانگ ئەکات و بە زمانی فارسی هاوار دەکات ئەرێ شوێن هەیە. گروپێکی بچووکی ئەسفەهانی نائارام لەبەرگی میللی خۆیاندا بە راکردن هاتن و بێگومان هەندێکیان لە فارگۆنەکەی ئێمەدا لایاندا، بەڵام هەندێ ئەفەندی هەوڵیاندەدا بەرەو ژووریان بەرن تا شوێنی چوونە ژوورەوە پەیدابکەن. زووربەیان عەرەبی و تورکییان نەدەزانی، کەچی دەیانویست بچن بۆ حەڵەب. سەرسامیەك لە هەڵوێستی ئەفەندیەکی هەڵچوودا کە ناتوانرێ باسی لێوەبکرێت، رازی نەبوو جێگا بدات بەو هەژارە ناشارەزایانە، کە بە دڵنیاییەوە وتیان ئێمە کرێی سواربوونمان داوە، منیش خۆمکرد بەناو مەسەلەکەدا و بە زمانی فارسی لە یەکێکم پرسی کێشەکە چی بوو. بۆ چرکەساتێك سەرسام بوون، گوێیان لە زمانی خۆیانە و لەلایەن فێست بە سەرێکی تورکەوە قسەی پێدەکرێت، بەڵام لە ئەنجامدا گوێی دڵنیایکرد و کێشەکەی باسکرد.

قیژاندی "باه! لعنه الله علیهم" " نەفرەتی خوایان لێبێت". لە دیمەشقەوە بلیتی پلە دوومان هەبووە، کەچی ئەوان ئێمە و خێزانەکانمانیان خستە ناو فارگۆنی ئاژەڵەکانەوە، ئەو کوڕی سەگە سونییانە، توخمی ئەو تورکە دەڵەشڕانە، ئێستاش بگرە ئەوەشمان نادەنێ و تەنانەت وەك ئەوەی ئەو وتی من بیستم بە دەنگی بەرز قیژاندی بە عەرەبی وتی "لا مکان للعجم" شوێن بۆ فارس نییە و بە قینێکی تورك ئامێز " گیت دیشاردە کۆپەیك ئۆگلو" واتە "بڕۆ دەرەوە سەگباب". بێبەختانە ئەو پیاوە حاجیانەی لە مەکەوە گەڕابوونەوە لەم دەرگایەوە پاڵیان پێوەدەنان بۆ ئەو دەرگا، نەفرەتیان لێدەکردن و بە گومراهانی شیعەی زەندیق وەسفیان دەکردن، لە هیچ شوێنێك جێیان نەدەکردنەوە. بەجۆرێ سوکایەتییان پێدەکردن، کە هەرگیز لەوە پێش لەو شێوەیە نەبینراوە.

کوتوپڕ لە شوێنێکەوە بەرپرسێکی فڕەنسی پەیدابوو، کە کەمێ سۆزی بەرامبەر سوننە و هەروەها شیعە موسڵمانەکان هەبوو، ئەو کێشەکەی چارەسەرکرد، ئەوەش بەهۆی ئەوەی کە فارگۆنێکی تری بەست لە شەمەندەفەرەکە و فارسەکانی دوورخستەوە و بە تەنیا دابنان، کە شوێنەکەیان فراوانتر و ئاسودەتر بوو لەوانەی کە تێیدا دەچەوسانەوە، ئیدی بەو جۆرە دەستمانکرد بە نوستن، تا لە تیشکی خۆری بەعلەبەك بەئاگا هاتینەوە، شوێنێکی مەزنە لەگەڵ یادەوەرییەکانی رابردوودا، بەڵام زۆر بە خێرایی لەم حاڵی حازرەدا کەوتە دواوە و جێمان هێشت، کاتێ کە شەمەندەفەرەکە گرنگی نادات بە پەرستنی (بەعل) و نە بۆ چرکەساتێ لە لایدا دەوەستێ، ئینجا لە داوێنی بەرزاییەکاندا بەردەوامدەبێت بۆ ناوچەی حومس و حەما، کە دوو شاری عەرەبیە و دانیشتوانە مەسیحیەکانی لە دەستوری تورك و دیدی خۆویستی موسڵمان پاراستووە. لە میانەی چەند سەعاتێکدا لە حەڵەب، دوو کاربەدەستی میری سەرکەوتنە شەمەندەفەرەکەوە و پاڵیان دەنا بەو گەشتیارانەوە کە لە شوێنی خۆیاندا نەبوون و دەیانخستنە لاوە، دوای چەند دەقیقەیەك یەکێکی قەڵەو، دەفتەرێکی پیس و شڕی لە گیرفانی دەرهێنا و تێیدا کەوتە نیشانەکردن، کاتێ کە سەیری گەشتیارەکانی دەکرد وەك وێنەی هێلکارییان بکێشێت ئاوا بوو.

دوای تەواوبوونی ئەو کارە نادیارە، ناردی بۆ هاوەڵەکەی، ئەویش دوای ئەوەی خوێندیەوە لەگەڵ دەست خۆشیدا بۆی گەڕانەوە و هەردووکیان دەستیانکرد بە پرتەقاڵ خواردن و توێکڵەکانیان زۆر بە وردی لەبەر پێی دراوسێکانیاندا فڕێدەدا، ئەوە بۆ ماوەی نیو سەعات یان زیاتر ئاوا دەڕۆشت، کاتێ یەکێك تەماشای سەعاتەکەی کرد، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە دواکەوتوون و بەخێرایی چوو لە دەرگاکەوە بە پیادەڕۆکەدا بچێتە دەرەوە.

# نازانم ڕەحەتی گیانە

دوای کەمێك، بەهەمان شێوە دەرکەوتەوە و دانیشتەوە و تێبینیەکانی تۆماردەکرد و ناسنامەکەی دەرهێنا کە ئەفسەری پۆلیس بوو، کارەکەی ئەوەیە دڵنیابێت لەوەی ئەگەر ڕێگە بە هەموو گەشتیارەکان بدات بچنە ناو حەڵەبەوە بەبێ ئەوەی مەترسی لەسەر بەرپابوونی ئاژاوەی سیاسی، یان کردنی هەر جۆرە تاوانێك هەبێت. ئەوە چوار مانگ دوای کردنەوەی پەرلەمان بوو، چوار مانگ دوای ئەوەی پێمان وترابوو، کە کۆت و بەندی کۆن لەسەر گەشتکردن بە تەواوی لابراوە، ئەوەی کە سوڵتان و سیخوڕەکانی دایانمەزراندبوو، چونکە پاشماوەی چەوسانەوە و قۆناغی تاریکیە.

بەهەرحاڵ، ئەو ئەفەندیە وەك دیاربوو لەو یاسایانەش زۆر بەرزتر بوو، وەك بۆم دەرکەوت هەموو ئەوانی تر لە دوایدا ناچارن تەواوی زانیاری بدەن. بێبەختانە میکانیکێکی ئەڵمانی تێدا بوو، کە دەچوو بۆ حەڵەب بۆ بازرگانی کارگە دانان لەوێ، لەبەرئەوەی ئەو ئەورووپی بوو، من وام دانابوو کە ئەفەندیەکە تەواو سەغڵەتی کردبێت، کە کاری تێکردبێت تا زانیاریەکانی بشارێتەوە، بەوەش ئەو تاوانباری دەکرد. هەروەها جۆری کارەکەشی پۆلیسەکەی بێتاقەت کردبوو، من واهەستدەکەم، لەوانەیە نەزانی بووبێتە هۆی ئەو پاشقولگرتنە بێبایەخە، لەبەرئەوەی کاتێ پرسیاری کارو پیشەی ئەورووپیەکەی کرد، پێیوت (موهەندیس) وەاتە ئەندازیارە و ئەویش واتای وشەکەی نەدەزانی.

نۆرەم لە ریزەکەدا هات و تۆزێکیش لە لێپرسینەوەی ناجۆر دەترسام، من وەك ئینگلیزێك هەمیشە هاونیشتمانانم کە لەم ناوچانەدا گەشتدەکەن، لە فارگۆنی تایبەتدا دادەنیشن و شەفقەی بەرگری لە هەتاو لەسەر دەکەن و خزمەتکار و خزمەتچیان لەگەڵدایە. ئەگەر وتم من فارسم لەوانەیە پیاوەکە رازی بێت، بەڵام هەمیشە ئەوە هەیە کە داوای گەواهی و پاسپۆرت دەکرێت، هەڵبەتە من نازانم، لەوانەشە لە حەڵەب هەموو لایەکی تاقیبکرێتەوە لەگەڵ تێبینیەکانی ئەم خەڵکەشدا.

بۆیە کەم زانیاریم لە زمانی عەرەبی و تورکیدا وای لێکردم کە نەزانانە هەڵسوکەوت بکەم، بە هێماکردن نیشانەی ئەوەم پێشاندا کە من دەچم بۆ ئێران، هێمام بۆ خۆم دەکرد، لە رۆژهەڵاتەوە و دووبارەم دەکردەوە (بۆ ئێران). پرسیارێکی زۆری لێکردم، کە ئەگەر وەڵامم بدایەتەوە لە کێشە ناجۆرە دژبەیەکەکاندا دەیبەستمەوە، بەڵام لە ئەنجامدا، بێ هیوا بوو لەوەی هیچ وەڵامێ لە منەوە ببیستێت، بۆیە کوتوپڕ وازیهێنا، بۆی دەرکەوت کە لە وەرزشدا گاڵتەوگەپ نییە، من وای بۆ دەچووم و چوو بۆ لای قوربانییەکی زیاتر هۆشیارتر.

نزیکەی سەعات 4:00 دوای نیوەڕۆ گەیشتینە حەڵەب، یان راستر بڵێم وێستگەی حەڵەب، کۆتایی ئەو هێڵی ئاسنەی بە ناوێکی سەیرەوە دەکشا "هێڵی ئاسنی نێوان دیمەشق و حومس و حەما".

لەوە سەرسامبووم کە کەس پرسیاری پاسپۆرتی نەکرد، تەنیا شتێکی ناخۆش ئەوە بوو، کە گەشتیارانی پلە دووەکان جانتا و شتومەکەکانیان تا سەعاتێکی تر نادەنەوە. کاتێ ئەو زانیاریەمان پێگەیشت، لەلایەن ئەوانەی سۆسەی مشتەرییان دەکرد، تا بیانبەن بۆ ئوتێلەکانیان، زۆر بە توندی هێرشیان بۆ هێنایین، خۆشبەختانە ئەوە دوا شت بوو بینم، هەموو ئوتێل و سۆسەکەرانم لەگەڵ حەڵەبدا خستە دواوە. بەهەرحاڵ، ویستم خۆم بەزۆر بهاومە ناو عەرەبانەیەکەوە، ئیدی خۆم لە رێگەیەکی فراوان و دوور و درێژدا بەرەو ناوشار بینیەوە و بۆی دەرچووم. یەکەم دیاردەی شارستانی شارەکە قەڵاکەی بوو، کە تەوقەسەرێکی تەختی هەبوو.

حەڵەبی هاوچەرخ وەك ئاشکرایە شارێکی عەرەبییە، زمانی سەرەکی زمانی عەرەبییە، فرەنسیەکان هێشتا نەیانتوانیوە وەکو بەیروتی بەسەربێنن، هەرچەند چەند شەقامێکی فراوانیان هەیە، کە نووسراو و تابلۆکان لەلایەن هەندێ دوکاندار و وێنەگر و خاوەن ئوتێلە یونانیەکان و ئەرمەن و سووریاییەکانەوە بە فرەنسییەکی نارێك نووسراوە و هەڵواسراوە.

زووربەی رێگاکانی لە نێوانی دیوارە بەرزەکاندا راڕەوێکی بەردرێژە، لەگەڵ پەنجەرەی تەنراو کە هەمیشە عەقڵی رۆژئاوا لەگەڵ حەڵەب هاوبەشی دەکات.

جگە لەوانەش بازاڕێکی جوانی هەیە، کە ریزە قەفەزی لەسەر شێوازی رۆژهەڵاتی ئاسایی تێدایە، کە خاوەنەکانیانی تێدایە و شتومەکی ئەوروپی و ناوخۆش دەفرۆشن، کە لە هەموو بازاڕەکاندا لە ئەستەنبوڵەوە بۆ ئەفغانستان هەمان چەشنە شت هەیە.

بۆ ئەوانەی لە رۆژهەڵاتی دووردا نیشتەجێن، وەك هەنگاوی یەکەم بۆ جاری دووەمیش دێنەوە بەرەو ئەم وڵاتە دێرینە. بە خۆشییەوە بەناو ئەو دوکانە هەمیشە سەرقاڵانەدا دەسوڕامەوە و پێداویستی رێگا، مۆم، شەکر، چا، قۆری فافۆن و شوشە بۆ چالێنان، کلیلی پەنیر هەڵپچڕین و میوە...هتد، هەروەها هەندێ شتم لەو عەرەبانەش کڕی کە لەودیو کەللە شەکرەکان و قوتوەکانەوە دانیشتبوون و خۆیان لە پاڵ ئەو قەڵا شتومەکانەوە توندکردبوو.

لە دید و تێڕوانینی چەرخی کۆنی حەڵەبەوە، تەنیا دیمەشق لە رۆژئاوای ئاسیادا لە پێشەوەیە (کە دوای 3500 ساڵ لە گرنگی، هێشتا لە ئاستێکی بەرچاودا ماوەتەوە) هەروەها هەندێ دیاردەی مێژوویی خۆی پێوەماوە.

# کەرخەمیش

ئەوە شارێکی حیتیەکان بووە و نەخش و نیگارەکانی ناو زمانەکە لەسەر دەروازەکانی قەڵاکە گەواهی ئەوە دەدەن، لەم چرکەساتەدا ئێمە دەزانین لە کام چەرخی کۆندا لە سووریا گەورەتر بووە لەو ئیمپراتۆریا جوانەدا، کە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژی 3000 ساڵی بەردەوامبووە (700- 3700 بەر لە زایین) و کە لە دواتردا و لە بۆنەی تردا باسی لێوەدەکەین.

لەگەڵ ئەوەشدا کە هەمیشە، ئەگەر هەرچیەك لەبارەی حەڵەبەوە لە تۆمارە کۆنەکاندا بیسترابێت، ئەوە زۆر نزیکە لە (کەرخەمیش)ی سەردەمی کۆنەوە، لەوانەشە هەستابێ و لەگەڵ ئەویشدا لە جەنگی ئاشووریەکاندا روخابێت، کە بەردەوام بوو لە 700- 100 پێش زایین، لەگەڵ ئەوەی لە نەخش و نگارە بەردینەکانی نەینەوادا هێمای بۆ نەکراوە، قەڵای کۆینجوك و ئاشوور لە زریانی نەتەوەکاندا، سیزیانەکان، سیمەریانەکان و عەرەبەکان و لەسەرو هەمووشیانەوە مادەکان کاتێ ئاشووریەکان روخان خرۆشان. ئیدی کەرخەمیش لەبیرچووەوە و حەڵەبیش تا سەردەمی مەسیحیەت کەس نەیبستبوو. لەوانەیە لە دەوروبەری ئەو کاتەی (قەدیس پۆلس) پەیامەکەی نارد بۆ ئەنتاکیە، حەڵەب گۆڕابێت بە مەسیحی (کارەکانی یانزە پەیامبەرەکە 24- 19)، بەڵام لە سەردەمی ئیسلامدا بەڕاستی دەستیکرد بە رۆڵگێڕان لە سیاسەتی سووریادا. ئیدی سەرۆك قەشەنشینی بەخۆیەوە بینی و لەسەرەتای ئیسلامدا تەواو گرنگی خۆی هەبووە، کاتێ جەنگی مەزن لە ناوچەکەد لە ساڵی 657 دوای زایین بەرپابوو. لە ساڵی 1056 زاینی (ئەلب ئەرسەلان)ی مەزن داگیریکرد و دوای سەدەیەك بینی سەلاحەدینی ئەیوبی دژی خاچپەرستەکان داکۆکی لە قەڵاکە دەکرد. هەرچەندە وەك هەموو رۆژئاوای ئاسیا ئەویش کەوت، بەرلەوەی مەغۆلە بەربەریەکان لە ساڵی 1260دا تاڵانی بکەن. لە رۆژانی دواتردا ژمارەیەکی زۆر سۆفی و پیاوانی ئایینی ئیسلامی تێدا دەرکەوت.

لە جەنگی نێوان تورك و میسردا لە نیوەی سەدەی رابردودا، شەڕەکە لەوێد بەرپابوو، سوپای میسری شارەکەی بۆمبارانکرد. سەربازگەیەکی گەورە لەلایەن ئیبراهیم پاشای سەرکردەی سوپاکەوە بۆ داڵدەی سەربازەکانی تورك لە دەرەوەی شارەکەدا دامەزرێنرا. من نەمتوانی کنە لەو قەڵا چۆڵەی ئێستادا بکەم کە پڕە لە بێ هیوایی و بەڵام ئەگەر تەنانەت بشمتوانیایە، لەوەش زیاتر فێرنەدەبووم کە مێژوونووسەکان و زانایانی شوێنەوار سەردانیانکردووە و بەدرێژی هەموو مێژووەکەی ئێستا و رابردوویان پێشکەشی خوێنەرانیان کردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا، حەڵەب یەکێکە لە شارە باش و ناودارەکانی ڕۆژهەڵات، بەتایبەتی بۆ خەڵکی ئینگلیز، لەبەرئەوە نوێنەرانی کۆمپانیای ڕۆژهەڵاتی عەرەبی لێرەدا ژیان و لێرەشدا مردن و سەردەمانی پێشو بازرگانی شام و حەڵەبمان بۆ بازرگانە ناودارەکانمان هەبوو.

وەکو دیاربەکر و موسڵ و بەغدا، حەڵەبیش لەگەڵ کردنەوەی کەناڵی سوێسدا زۆری لە گرنگی خۆی لە دەستدا، لە سەردەمی خۆیدا لەسەر ڕێی نێوان باکوور بۆ ڕۆژهەڵات بوو. هێشتا وەك دیارە هێڵی ئاسن لە ئاستێکی لاوازدایە، هەرچەندە خەریکن هەندێ لە گرنگی پێشوی خۆی بۆ بگەڕێننەوە، لەگەڵ ئەوەی وەکو هەموو شوێنەکانی تریش تورك فەرمانڕەوایی دەکات و خۆیان بەسەردا سەپاندووە. لەم چرکەساتەدا بڕێکی زۆر گەورە قوماشی لۆکە بەرهەمدەهێنرێ، کە زۆری دەنێرێت بۆ ڕۆژهەڵات و جلوبەرگی تایبەتی دانیشتوانی کوردستانی باشووری تورکیا و باکووری میسۆپۆتامیا پێکدەهێنێت. من زۆر بە گرانی نیو ڕۆژێك لە حەڵەب بووم، لە ناوچەیەکی پیسوپۆخڵ لە ئوتێلێك بەناوی ئوتێلی سووریە، کە لەلایەن کەسێکی ئەرمەنییەوە بەڕێوەدەبرا و لە ڕاستیدا ڕێگرنەبوو لەوەی موسڵمانان لەوێ بمێننەوە، کاتێ کە عەرەبانچیە تورکەکە دەرکەوت و ویستی بکەوینە ڕێ بۆ ئەوەی بمبات بۆ دیاربەکر، کە شارێکی گەورەی ترە لەسەر ڕێگاکەم، من دەمویست دوو ڕۆژێك لەوێ بمێنمەوە، بەڵام ئەو حەزی دەکرد بڕوات چونکە لەسەری ئەو سەرەوە هەندێ گەشتیار چاوەڕێیاندەکرد، لەبەرئەوە نابێت دوابکەوین، ئیدی بۆیە دوای چەند سەعاتێك خۆم لە یەکێ لەو ماشێنانەدا بینییەوە، کە لەو ناوەندەدا لەنێو شارەکانی سووریادا کاریاندەکرد.

دڵەڕاوکێ تا ڕادەیەك وەکو بۆنیتی سەر چەرخی عارەبانەکە نەبوو، تەختەبەند یان جامفاسەکەی ساباتی لەسەر شۆفێر و گەشتیارەکان دەکرد و پەردەکانیش ئەگەر هەبێت دادەدرێتەوە بۆ پارێزگاری گەشتیاران لە هەتاو و زریان. هەر لەوێدا پێویستە هەموو جانتاکانیش جێبهێڵیتەوە، ئاسودەیی و جێبوونەوە پەیوەندە بە دانانی ئەو شتانەوە بە شێوەیەکی ڕێکوپێك، خۆشبەختانە من کەمم پێبوو، ئەو تاکە سەندوقەی پێمبوو خستمە کۆتایی پێشەکەیەوە و توانیم بۆشاییەکی چوارگۆشەی فراوانم هەبێت، لەگەڵ ڕاخەرێك لە ژێرمدا بۆ دانیشتن و پاڵدانەوە لەسەری.

پارچەی بچووکی وەك کتێڵەی ئاو یان سەماوەر لە دەرەوە بەزۆر خاڵی جیاوازەوە چەسپکراوە و بەوێوە دەمێننەوە تا دەشکێن یان بەر شتێك دەکەون، بێگومان هەر ئەوەش چارەنووسیانە.

## باب

هەروەها دەبووایە بەرپرسی ئازوقە رێکبخرایە، بۆ خواردن گەیاندن لە رێگەوبانەکەدا کە هەندێ جار نائاساییە. تەنیا رۆشنایی سەفەرەکەم بوو، ئێمە چەند تەبەقە نانێك و خورما و پیازمان لەگەڵ خۆمان هەڵگرتبوو، بە گوێرەی میوەوە بێبەختانە لە مانگی مارچ/ ئازارەدا وەرزی نییە.

لەبەر هەندێ هۆ عارەبانچییەکە منی بە حاجی دەزانی کە لە مەکەوە گەڕابمەوە، منیش بۆ خۆشاردنەوە ئەوەم بە هەلێکی باش زانی، هەروەها تا رادەیەکیش رێگەکەی بۆ دابینکردم، کە من بە مۆڵەتی ئەو وەستابووم، تا زۆر درەنگ بوو کە بیگۆڕن و دەستبەجێ بە دەوری فێستەکەمدا دەسماڵێکی سپیم تێوە ئاڵاند، کە نیشانەی حاجییەکە دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی.

بە عارەبانەکەمان لە دەوروبەری نیوەڕۆدا لە حەڵەب دەرچووین و چەند دەقیقەیەك لە شارەکە دوورکەوتبووینەوە و لەسەر بەرزاییەکانەوە چاوێکم بە دەوروبەری خۆماندا گێڕا و شتێکم بینی کە بیابانی سووریا بوو بەبێ گردەکان، لە هەندێ شوێندا زەویەکەی لەلایەن گوندنشینە عەرەبەکانەوە بەکارهێنرابوو، بە چەشنی گردۆڵکەی دەوری شارەمێرووله، شێوازی ئەندازیاریەکەی بە درێژایی رووباری فورات لە شێوەی دارەکەوتی شەکردا بوو. بۆ ماوەی چەند سەعاتێك عارەبانەکەمان بە رێڕەوێکی تەختدا بردینی و تا نزیکەی رۆژئاوابوون رێگەیەکی پێکنەهێنا، کاتێ گەیشتینە نێوان چەند گردێکەوە، لەپڕ کەوتینە گوندێکەوە کە دانیشتوانەکەی پێیان دەوت باب. بێگومان نزیکی حەڵەب لەوانەیە بازاڕی کەمێ باشی تێدابێت، لەگەڵ کاروانسەرای خاوێن و باش، کە ژوورێکی سەرەوەی دەڕوانێت بەسەر حەوشەکەیدا، کە پڕە لە هێستر و کەر و وشتر و ئەسپ و مەڕ، ئیدی شوێنی حەوانەوەم دۆزییەوە. ئەم کاروانسەرایە لە بەردی سپی دروستکراوە و یەکێك بوو لەو خانە چاکانەی لەو ساڵانەدا بینیومە. شێوازەکەی ریزێك ژوور، هەندێکی نۆ پێ لە سەرو ئاستی زەویەکەوە بوو، هەروەها لە یەك لادا دروستکرابوو. بەرامبەرەکەێ تەویلەیەکی گەورە و لەسەرو ئەویشەوە ریزێك ژوور بوو کە من یەکێکیانم بەکرێ گرتبوو. دەروازەی خانەکە بە ئاسایی داڵانێك و چەند ژوورێکی بچووکی لە هەردوو لاوە لەسەر بوو، هەروەها لەسەر ڕاڕەوی داڵانەکە ئەندازیارەکە زۆر چاونەترسانە دوو ژووری بە پەنجەرەی جوانی شوشەبەند دروستکردووە و تایبەت بووە بە ژن و مێردی پارەدار و دەوڵەمەندەوە، کە بە رووی بەرهەمیوانێکدا دەکرایەوە بۆ پیاسە و گەشتکردن. خانچییەکە یان خاوەنەکەی ئەوەی بە شانازییەوە دەگێڕایەوە. ژوورەکان ئەوەیان دەسەلمان کە جێگای نیشتەجێبوونی خەڵکانی پایەدار و پاشایانەیە و ئەوەش گەمەیەکی گەورەیە و شوێنی پیاسە و

گەشتکردنیش لایەنێکی تری پێکەوتنی هونەری بیناسازیی بەرچاو دەنێت. یەکەم تاقیکردنەوە لە سەفەردا لە شێوەی ناوخۆیدا زۆر شتی وردە، یەکێکیان کە هەرگیز لەوەبەر بیرم لێنەکردۆتەوە، کاتێ وەك ئەورووپی گەیشتوینەتە قۆناغێك، ژوورەکەمان پاکراوەتەوە و فەرشی تێدا راخراوە و کورسی و مێزی تێدایە و هەروەها بەخێرایی چایی دەم دەکێشێت. بە دڵنیاییەوە نەمدەزانی کە لەم بۆنەیەدا دەبێ ژوورەکەی خۆم کسك بدەم، لەگەڵ ئەوەی دوای ئەوە فێربووم سێ لق گیا لەو ناوەدایە پێیدەوترێ کسك. هەروەها خانچیش ئاوت بۆ دێنێت، بەڵام ئەو شتومەکانەی پێمبوو نەدەکرا لە عارەبانەکەدا جێیبهێڵم، بۆیە ناچار بووم چەند جارێ بە قاڵدرمە تەنگەبەرەکاندا سەرو خوار بکەم و لە گۆڕەپانەکەوە بیهێنم بۆ سەرەوە بۆ ناو ژوورەکە. بارکراو بە راخەر، بەتانی، لێفە و جانتاکان و شتە پێچراوەکان، کە بەبێ یەکێ لەو شتانە مەحاڵە گەشتکردن لە رۆژهەڵاتدا. ئیدی هەستمکرد من زۆر بە خراپی پێویستم بە چاخواردنەوەیە، بۆ ئەو مەبەستەش دەبێ لەگەڵ سەماوەرەکەمدا بچمە خوارەوە، لە بیرەکە پڕی بکەم لە ئاو و پشکۆی گەشاوەش لای عەرەبانچیەکە بهێنم، کە بینیم نێرگەلەی دەکێشا. ئەو کارە کرا، دووبارە سەرکەوتمەوە سەرێ و دوای ماوەیەك پەرداخێك چا و هەندێ نانی وشکم خوارد. لەم ئاستەدا لەوانەیە عارەبانچیەکە ئەوەی بۆ دەرکەوتبێت و سەری سوڕمابێت لەوەی کە من دوای ئەو دابونەریتە نەکەوتوم و وەك ئەو گەشتیارانەی لە وڵاتێکی ترەوە دێن دەچن بۆ بازاڕ، من نەچووم. ئەوەش من گوێم نەداوەتێ، لە راستیدا بیرم لێنەکردۆتەوە. ئێستا خەریکە رۆژ ئاوادەبێت، هیچ خواردنێکم نییە تا شێویکەمەوە و بازاڕیش داخراوە و لەوەش ناخۆشتر، هیچ شتێیەك نییە، تەنانەت نانیش لە جاتاکاندا تا بەیانی و بۆ ماوەی دوانزە سەعات لەو چۆڵەدا. لەو کاتەدا من دەمتوانی بە تورکی شتێیەك بکەم، بەڵام لەپڕ عارەبانچیەکە بانگیکردم و بە شێوەیەکی بلیمەتیانە وتی من لە ئەلفەوە بۆ یا، کرمانجی دەزانم" Az kurmanji dazanam ". لەو کاتەوە واتایەکی نوێی پەیوەندیم دۆزییەوە، لەگەڵ ئەوەی دیالێکتی کرمانجیم باش نەدەزانی، ئەوەندەم دەزانی کە بەلای کەسانی ترەوە روون ئاشکرا بێت و لێم تێبگەن.

دواتر بۆم دەرکەوت کە پێشوازی لە راستەقینەی کوردەکە وەك هاوڕێیەکی دێرین بکەم، عارەبانچیەکەم، ئەوەی لە کاتێکدا شوێنی نیشتەنیمی ئاشکراکرد، هەمیشە هێما بۆ ئەوە دەکات کە لەگەڵ هاوڕێ گەشتیارەکەیدا لە رۆژهەڵات دابمەزرێت، ئەو یەکسەر وەك خەڵکی کوردستانی ئێران ناونووسی کردبووم. هەروەها ئەو پلە و پایەیەی وەك حاجیەکی کوردستانی کە پێمدرابوو، بەو ناونیشانەشەوە لەلایەن عارەبانچی هاوڕێمەوە بەبێ جیاوازی بە هەموویانی ناساندم.

# پیاوێکی بە ویژدان

لێرەدا ئەو دڵسۆزی خۆی وەك هاوڕێیەکی راستەقینە سەلماند، لەو بارەیەوە کە هەوڵیدا بێت و بازارِم پێشان بدا و بەر لە کاتی داخستنی بازارەکە هەندێ نان و خواردنی شێوکردنەوە پەیدا بکات. بازارەکە بچووك بوو، بەڵام خۆشبەختانە دووکانێکی خواردن هەبوو، کە تەنیا سێ جۆر برنجی پلاوی چەوری بۆ فرۆشتن دانابوو. منیش دوو قاپم لەوە داواکرد بۆمان بنێرێت بۆ کاروانسەراکە، کە کەم فرۆش بوو. چووینە نانەواخانەکەی گوندەکەوە، لەوێدا بۆم دەرکەوت ئەو کەڵکە زۆرەی حاجی بوونم، یەکەم وەك حاجی و دواتریش حاجیەکی غەریب. لە سەرەتاوە ئەو پیاوەی خەریك بوو دووکانەکەی دادەخست، بێتاقەت بوو لە خزمەتکردنمان، ئەوەی من دەیخوێنمەوە ئەو تەنە ماندوبوونەیە، وتی لەبەرئەوەی حاجیت، سییێودوویەکی کرد و ئیدی دەستیکرد بە هەڵدانی نان بۆ تەرازووەکەی. تا کێشی تەواو وەرگرێ، محەمەدی عارەبانچی تێبینی ئەوەی کرد کە من لە زۆر دوورەوە هاتووم، زانینی نە زمان و نە وڵات و نە کولتور. نانەواکە تێبینی ئەوەی کرد و بۆ ئەوەی پاداشتی چاکەیەك بە دەست بێنێت، بۆیە پارچەیەکی زیادەی هەڵدایە سەر نانەکان لە دیدێکی ئایینیەوە روانییە من، منیش خۆشبەختانە توانیم بە زمانی عەرەبی زۆر رازی بکەم. کە پرسیاری نرخەکەیان کرد، ئەو لە راستیدا تەواو نرخی خۆی پێوتین، بەبێ ئەوەی نامۆیی و ماندوێتی و لاوازی ئێمە بقۆزێتەوە و زیادمان پێبلێت. ئەوەش هەڵوێستێکی بێ وێنەیە و لە زۆر شوێن بەدیمکردووە، لە هەر شوێنێ کورد یان عەرەبی لێبێت، بەڵام تورك رەگەزێکی ترن لە هەڵسوکەوت و دابونەریتدا. شێو خواردنەکەم لە کاروانسەراکە چاوەڕێی دەکردم، منیش عارەبانچیەکەم بانگکرد تا هاوبەشیم لەگەڵدا بکات، لەبەرئەوەی دەزانم ئەو ئاستە سادەوساکارەی من تێیدا دەژیم لە ئاسودەیی و ئاستی کۆمەڵایەتیدا یەکسان بوو بە ئاستی عارەبانچیەکە، ئەگەر کەمتریش نەبوبێت. ئەویش بە خۆشحاڵییەوە داواکەمی پەسەندکرد و بەرامبەر یەك دانیشتین و بە دەست کەوتینە خواردنی ئەو شتانەی لەبەردەماندا بوون. تاقیکردنەوەیەکی تر لە ئێراندا بوو، فێری ئەوە بووم چۆن بە پارچەیەك نانەوە بە هۆی دوو پەنجەوە قاپێك شلە بەش بکەم یان پاروەو برنج بگلێنم بێ ئەوەی گوێ بە دەوروبەر بدەم. هەروەها شێوازی پێویستی دەستنوێژ هەڵگرتن و سوپاسگوزاری دوای نانخواردنم دەزانی. ئەمەی دواییان لە رێگاویاندا بەکار نایەت. بۆ پەیڕەوی ئایینی وەك کۆیلە لە کاروانی بیاباندا دەپاڕاینەوە و نوێژماندەکرد.

شێوخواردن تەواوبوو- ماوەی سێ دەقیقەی خایاند- جگەرەمان دەدا بە یەکتر و ئیدی ئەو دەرچوو بۆ ئەوەی چاودێری ئەسپەکانی بکات و منیش لە گۆشەیەکی ژوورەکەدا لەژێر پاڵتۆکەمدا خۆم کروشکە کردبوو، هەستمکرد بۆ جارێکی تر من گەڕاومەتەوە بۆ ئەو رۆژهەڵاتە بەخشندە و دڵسۆزەی کە لەوەبەر ناسیومە، چەند سەد میلێك نزیکی رۆژهەڵات.

رۆژی دوایی بەر لە رۆژهەڵاتن ئێمە هەستاین و کەوتینە رێ، رۆژ هەڵهاتن هەمان شەپۆلی رەنگی زەردی سادەی پێشان دەداین، لەگەڵ مەودای دووری گردەکاندا لە باکووری ئێمەوە. ئێمە رێڕەوی ئاساییمان بەناو بیاباندا وەرنەگرتبوو، کە وەك دەستورێك زیاتر بەرەو باکوور دەچووە پێشەوە بۆ (بیرەجیق)، ئەو شارەی قەڵایەك جیایدەکاتەوە کە لە جەنگی هێرشی خاچپەرستەکاندا بنیاتنراوە. رێگاکەمان بەرەو (مێمبیج) دەچووە پێشەوە، ئەو شارەی لەگەڵ زووریەی مێژووی کۆنی بیابانی سووریادا- (کەرخەمیش) هەمیشە جیایە. بەو خاکەدا تێدەپەڕین کە کشتوکاڵی نەتەوەی حیتیە مەزنەکەی بینیوە، کە دەڵێن پایتەختەکەی لە (کەرخەمیش) بووە، بەڵام چەند مێلێك لێرەوە، نزیکەی 3500 بەرلە زایین. تەمەنێك تەنیا لەلایەن بابلیەکان خۆیانەوە بەتوانایەکی بەرچاوەوە دەرکەوت، ئیدی لەو کاتەوە تا داگیرکردنی ئەم خاکە لە لایەن ئاشوورییەکانەوە، بەر لە 700 ساڵ پێش لە زایین، مەلیکی حیتیەکان فەرمانڕەوایی ئەو وڵاتە بە پیت و بەرەکەتەی کردووە، بەتایبەتی کەنارەکانی رووباری فوڕات کە هەندێ لە جەنگە مەزنەکانی جیهانی تێدا بەرپابووە.

حیتی، ئاشووری، یۆنانی و (پێرشانی) ئاشکانی، ئەوانە هەموویان بۆ سووریا جەنگیون و بەدەستیان هێناوە و لە دەستیشیان داوە، (مێمبیك- مێمبیج) کە پەرستگایەکی تێدابوو بۆ خوای (ئەتەرگاتیس) (کە لەناویادا زیاتر مایەوە)، هەروەها وەك شارێکی دەوڵەمەند مایەوە و بەدرێژایی ئەو سەدانە خۆڕاگربوو، تا لەلایەن بۆرەپیاوێکی رۆمانییەوە وێرانبوو، شوێنی کڕین و فرۆشتن بوو، کە شوێنی بەرزخوازی و سامان و پایەداری بوو، بەڵام لە کۆتاییدا هەر ئەوەش بەرەو وێرانەیی برد. ئەو بۆرەپیاوەش (مارکۆس لوسیوس کراسوس) بوو لە ساڵی 54 بەر لە زایین لە هێرشێکدا دژی پێرشانییەکان، چووە ناو نزرگە و پەرستگاکەوە و هەرچی کانزایەکی بەنرخی تێدابوو دەریکێشا و پاشان بێبەزەییانە ناچارکرا بە هەڵهاتن[2].

---

[2] راولینسون، پێرشیا، لاپەڕە. 152.

## مێمبیج

شارەکە هەرچۆنێك بێت وێران نەکرابوو، ئینجا لەلایەن (ئەنتۆنیۆس)ەوە دوای نزیکەی بیست ساڵ دەستی لێهەڵگیرا و رۆژی خۆشی بۆ وڵاتی پێرشا هەڵهات، پاش گەڕانەوەی بۆ جاری دووەمیش شەش مانگ دواتر گەڕایەوە بۆ پێرشا و ئیدی کەوتە دەستی رۆماوە.

ئەو ئێوارەیە گەشتینە گۆڕەپانی دیوارە روخاوەکان،[3] کۆمەڵە بەردی هەڵکۆڵراوی گەورە، شوێنەواری بینای دێرین.

لەسەر ترۆپکی گردێك ئێستا مزگەوتێکی بچووکە و ناوچەکە بە خەڵکانی چەرکەزی پڕبۆتەوە، کە جلوبەرگی قوزاقییان لەبەردایە و لەو شوێنەی ناو عەرەبەکانی دەورووبەریان تەنیان. لە هەموو لایەکەوە ئەوەی لە بینا کۆنەکان ماوەتەوە بەردی گەورەی زەبەلاح کە ناتوانرێت هەڵگیرێت .

لەوە دەچێت بەکارهێنانی سەرەکی ئەمڕۆ بۆ دیواری وشکە کەڵەکە بەدەوری کێڵگەی دانەوێڵەدا و کاتێ کە زۆر گەورە نەبێت بۆ گواستنەوەی، بۆ بیناکردنی خانوی نوێ لەناو گوندی وێرانە و چەپەڵدا، کە سێ ژووری پیسە، تەنیا ئەوەندە ماوەتەوە لە کاروانسەرایەك کە لەگەڵ ئاوازی دەورووبەرەکەدا گونجاوە. لێرەدا دەرووومان لێکرایەوە کە وایلێکردین بچین هەندێ خواردن لە باب بهێنین، خەڵکەکەی کەمێ گرژ و مۆن بوون و جگە لە هێلکە شتی تریان نەدەفرۆشت، کە نرخی شەش دانەی بەرامبەر بەهای پێنییەك دەوەستایەوە، ئاوەکەی زۆر پیس بوو، ئەوەی ئێمە تا رادەیەك قوڵتر بوو بە باشی (تەنیا لە دەرەوەی سەرچاوەیەکەوە ئاودەستێکی تایبەتی بۆندار بوو) کە نیوەی خەڵکی گوندەکە لەوێ ئاویان دەهێنا.

لەبەرئەوەی نە بازاڕ هەیە بۆی بچیت، هیچ نییە بیکەیت، هیچ نییە بیکڕی و بیخۆیت، کاتەکەم بە دانیشتن لەسەر پلیکانەی دەم دەرگاکەمدا بەسەربرد، مێشێکی زۆریش هەبوو، کە لە ژوورەکەدا هاوبەشیت بکەن و شەو و خەوتنیش زۆر بەخێربێت.

---

[3] گۆڕەپانی دیوارە روخاوەکان، (To a field of ruined walls) کە لە وەرگێڕانی عەرەبییەکەیدا بە هەڵە کراوە بە گۆڕەپانی بیرە داڕوخاوەکان (الی حقل فیه آبار خربة) لاپەڕە 52.

## بەشی سێیەم

# لە ڕووباری فوڕاتەوە بۆ دیجلە، ئێدێسا

## ئورفە و ئامەد (دیاربەکر)

لە (مێمبیك) لەو بڕوایەدام پاشماوەی پەرستگای (ئەتەرگاتیس) نەماوە، کە (کراسوس) وێرانیکرد، تەنانەت لە کەرخەمیشیش جگە لەو پەرستگا داخراوەی سەر تەپۆلکەکە شتێکی ئەوتۆ نەماوە، ئەویش تورکەکان دایانخستووە، بۆ پێشاندانی بانوخوای مەزن، کە لەوانەیە مەزنترین بانوخوای پەرستراوی سەردەمانی کۆن و ئەو کاتە بێت.

لە خوێندنەوەی مێژوودا لە خاکی کلدانەکاندا، سووریا، کەنعان، حیتییەکان و ئیسرائیل، فینیقیەکان و یونانەکان، هەمیشە لە زانستی ئەفسانەناسییاندا بانوخوای سەرکەوتن یان خۆشەویستی دەردەکەوێت، کارێکی بەچێژ دەبێت شوێن پێی ئەم بانوخوایە لەنێوان ئایینەکانی ڕۆژهەڵاتی کۆندا هەڵگرین. ڕەگەزی کلدانەکان، کە لە پێدەشتەکاندا لە دەم فوڕات و دیجلەدا نیشتەجێبوون، لە زۆر کۆنی دوور لە توانای زانستی ئێمە، لە سەردەمانی پێشوتردا بانوخوای (بەلیت) دانراوە و ئەوەش لە بانوخوای نەتەوانی ترەوەبووە، یان نزیکتر ناو و پەرستنی تر قوتبۆتەوە.

ئێستا دەزانرێت کە حیتییەکان نەتەوەیەکی بەهێزبوون، کە لە نزیکی ساڵەکانی 3700- 700[4] بەر لە زایین، خاکی سووریایان بەدەستەوە بووە، (بۆ مێژووی ئەوەش جیهان قەرزداری ئەو توێژینەوە دەگمەنەی پرۆفیسۆر سایس)ە، کاتێ ئاشوورییەکان بەسەریاندا سەرکەوتن، لە میانەی ئەو قۆناغەدا پەیوەندییان بە شارستانی بابلەوە کرد، ماوەیەکی دوور و درێژ بەر لەوەی سووریا وەك نەتەوە دەربکەوێت، لەوانەیە پەنایان بردبێتە بەر (بەلیت) یان عەشتار (هەمان بانوخوا) کە ناوەکەی گۆڕا بۆ (ئەتەرگاتیس)، پەرستنی (ئەتەرگاتیس) لەناو سەرجەمی میللەتانی کەنعان (سووریا)دا لەژێر ناوی (عەشتۆریت) یان عەشتار بڵاوبوو، وەك لە کتێبی پیرۆزی (بایبڵ- ئینجیل)دا دەیبینین.

---

[4] ڕاگوزین، ئاشوور، 84

## بەعل و عەشتار (ئاشتۆریت)

هەروەها ئەفسانەکانی کەنعانەکان بیرێکی بنەڕەتییان لەبارەی ناوەڕۆکی نێر و مێکانەوە لە بەعل و عەشتار داوە، کە ئێمە لە چیرۆکەکانی ئینجیلەوە شارەزای بووین و ئەو بیرەش لە بنەڕەتی بەبڕشتی و هێزەوە هاتووە، بەعل خوای هەموو بنەچەیەکی بژێوییە، بەپێی میللەتانی کەنعانەکان ئەو خوا بوو، دوای ئەوەی نەوەی ئیسرائیل ڕێیان وندەکرد، بۆیە لە زۆر کاتدا عەشتاروت بانوخوای دایکایەتی و خۆشەویستی و ئارەزووە، لەبەر پێداویستی جوتبوون لەگەڵیدا.

بەعل، یان مولوك، خوای رۆژ یان داگون، ئەوانە هەمووی ناوی هەمان خوایە، بەپێی تیرە و خەڵکە جیاوازەکان کە باوەڕیان پێیبووە. لەوانەشە نزیکترین هەستکردن بێت بۆ پەرستنی رۆژ بەجیا لە مانگ، کە دروشمی شەو و رۆژن، ئاگر و شێداری و گەرمی و ساردی، رووناکی و تاریکی، ژیان و مردن، وەکو دووانەخوا لەم دژە دیاردانەدا و بەکورتی هێماکانی بوون رەهایە.

بۆیە بۆمان دەرکەوت کە بانوخوای عەشتار لەلایەن فینیقیەکانەوە وەك ئەشتورت دەپەرسترا، هەروەها لەلایەن حیبتیەکانەوە وەك ئەتەرگاتیس و لەلایەن فەلەستینی و کەنعانیەکانەوە وەك دەرکەتۆ، بانوخوای ماسی (کە نمونە و دروشمی نیوەی ژن و نیوەی ماسی بوو، هەروەها خوای داگۆن ئەویش لە پیاو و ماسی بوو).

ئەوە بەو شێوەیە بووە کە شوێنی بەرز جێی بانوخوای ئاشەرە یان جێگای پیرۆزی و خواپەرستییە و بەرامبەری ئەوەش پێغەمبەرانی ئیسرائیل لەوێوە نێراون. بەم شێوەیە ئەلیاسمان بینی دژ بە کاهینانی بەعل نێراوە (بەرگە سووریەکەی، ئاگری خوا)، ئەوەی بەسەر خواکانیانەوە بانگکرا، لەو کاتەوە کە لە زانستی ئەفسانەناسی خۆیاندا ئەوەیان هەیە و پارێزگاریان لە بنەچەی یەکەمی ئاگر کردووە بۆ دەرکردنی توخمەکە. بەهەرحاڵ، عەشتار، یان هەرچونێك بێت یەکێ لە ناوەکانی کە ئێمە ئەوی پێ بانگدەکەین، رۆڵێکی زۆر گرنگی گێڕا لە مێژووی ئاسیای رۆژئاوادا لە خودی خوای رۆژ زیاتر. پەرستگا بۆ بانوخوا لەلایەن هەموو نەتەوەی خواپەرستەوە دامەزرێنرا و ئەویش هەموو شتێکی پاراست و دەستەڵاتی لەسەر ئەستێرەی ڤینۆسە، نیشانە و دروشمی دیاریکراوی هەیە. هێشتا تەنانەت لەناو ئاشوورییەکاندا، کە ناوەکەی لە میللەتانی دی بەرزتر دەنرخێنن، ئەو وەك دووکەسایەتی هاتە دنیاوە، ئەوەمان خوێندەوە کە پەرستگای لە نەینەوا و شوێنی تر لە ئەربیلا هەیە، ئەو شوێنەی بۆ چوار خوا ئامادەکراوە، ئێستا عەشتاری نەینەوا لە بنەچەدا بانوخوای خۆشەویستی و خۆشگوزەرانییە، کە فەرمانڕەوایی ئەستێرەی ڤینۆسی دەکرد، بەڵام ئەو لە جەنگدا

سەرکەوتنی دا بە ئەربیلا و بازوی جەنگاوەرانی بەهێزکرد. بەهەرحاڵ، ئەو ئایینێکی بەهێز و گرنگ بووە، کە چوار هەزار ساڵ لە جەنگدا بەردەوام بووە، لەو خەڵکانەی تێیدا دەرکەوتووە، گرنگ و پایەدار بووە و دیارنەماوە، ئەو میللەتانەی باسدەکرێن کەمێ هاوسۆز بوون لەگەڵ هەستی سروشتیدا، وەك فینیقییەکان و ئاشوورییەکان و حیتیەکان یان کلدانەکان، پەرستنی ئەم بانوخوایانە بەردەوام بوو بە داوای ملکەچی لە مەلیکە بەهێزەکانی حیتییەکان و کلدانەکان و ئاشوورییەکان و پاراستنی بابەتەکە لە کۆمەڵێك نەتەوەدا، گەورە و بچووکیان لە ئێرانەوە بۆ پێدەشتەکانی دەریای سپی ناوەڕاست. ئێستا پێمان دەڵێن، کە مەملەکەتی حیتیی درێژبۆتەوە بۆ ئایۆنیا و پەرستگا بۆ بانوخواکان لە ئەفیسوس و سیمرنا دامەزراوە، یونانییەکان وەك کۆلۆنیال هاتن بۆ ئێرە و وەك دەستورێك کارگوزار و یاوەری کاهینە ژنەکانیان دامەزراند، کە لە ئەفسانەی ئەمازۆنیدا دەبینرێت. نەك تەنیا هەر ئەوە، بەڵام بیروڕای (ئەتەرگاتیاس)یان وەرگرت و گونجاندیان، ناوێکی یونانیان لێنا، کە بەپێی ئەوە ناوبانگێکی گەورەتر و فرمانی پەرستنێکی گەورەتری بەدەست هێنا، کە لە ئەفسانەی یونانییە تەواو بێگەردەکاندا هەبووە. لێرەدا، لەم گوندی (میمبیك)ەی کە پێیدەوترا (هیرابۆلیس) لەمیانەی دەستەڵاتی یوناندا، یەکێ بووە لەو پەرستگا سەرەکیانەی لە رۆژانی دوای پەرستنیدا هەبوو (54 بەر لە زایین).

کاتێ ئەوە روویدا و حیتییەکان بۆ ماوەی 650 ساڵ بەرەو لەبیرچوونەوە رۆشتن، بەڵام بانوخوا و هەروەها پەرستگاکەشی، مەزنترین پەرستگای کەرخەمیش بوو، کە هێشتا بە پێوەیە. ئەوەی لەبارەی حیتییەکانەوە دەیزانین ئەوەیە ئێمە قەرزدارىانین، هەروەك لە سەرەوە ئاماژەی پێدراوە، بۆ پرۆفیسۆر ئی جی سەیس، ئەوەی بۆ یەکەم جار بڵاویکردەوە و هەموو جیهان و رۆژهەڵاتناسان و قوتابیانی سەرسامکرد، نەتەوەی مەزنی حیتیی لەگەڵ بوونیشیاندا تا ئەو رۆژە، دوو دەیە پێشتر تەواو نەناسرابوون. ئێمە ئێستا دەزانین کە ئیمپراتۆریای حیتی بۆ ماوەیەکی زۆر کە نزیکەی 3000 ساڵە بەردەوام بووە. تۆمارەکانی کلدانیەکان وەك نەتەوەیەك ناوی بردووە، لە ساڵی 3500 بەر لە زایین (بە نزیکی). وا دەردەکەوێت لە کەرخەمیش بووبن، بەڵام پێش ئەوەش لە شاخەکانی تۆرۆس و بەرزاییەکانی ئەرمینیا نیشتەجێبوون، ئیدی لەوێوە رەگەزێکی ئازای شاخاوی شۆڕبوونەوە بۆ پێدەشتەکانی کەنعان. ئەوان نەوەی هیسی کوڕی کەنعانن (جەنەسیس ئیکس 15) و کاتێ لە کەرخەمیش نیشتەجێبوون، لەوێ پەرستگایەکی گەورەیان بۆ (ئەتراگاتیس) دروستکرد (جەرابولوسی هاوچەرخ)، مەملەکەتەکەیان لە بسفۆڕوسەوە بۆ سنووری میسر درێژبۆتەوە، لەگەڵ

## حیتیەکان

ئەو فیرعەونانەی کە لە جەنگێکی دوورودرێژ و خوێناویدا جەنگیون. وەکو هەموو میللەتێك لە رۆژهەلاتدا، تەنانەت لەم رۆژگارەی ئەمرۆشماندا، لەوەدەچێ تیرە لە دەستووردا بوویێت، بەلام سەرۆکەکەیان مەلیکی کەرخەمیش بوو، لەگەلٚ ئەفسەری مەلیك لە کادیش لە باشووردا.

بەهەرحالٚ، لەوانەیە وەك وابوو تەمەن درێژبوو، بەر لە پەلەکردنی ئاشوورییەکان رووخا، بەلام رەگەزێکی لاو و هەروەها تا رادەیەك نوێ لە کلدان و بابلییەکان جیابووەوە و لە سالٚی 700 بەر لە زایین دوا مەلیکی حیتییەکان، ئەوەی بۆ ماوەیەك باجی دەدا بە سەرجۆن، دژی بەهێزترین هاوسێی راپەڕی، ژێرکەوت و ئەوەی لە ئیمپراتۆریای حیتییەکان مایەوە بەرەو لاوازی و لەناوچوون دەڕۆیشت، ئیدی وێرانبوو، هەروەها لەبیرچووەوە. لە کەرخەمیش، چەند سەدەیەك شوێنی پایتەختی ئیمپراتۆریای حیتییەکان و شاری سەرەکی پەرستگای ئەتەرگاتیس بووە، ئەوەی کە ئێستاکە ماوە تەنیا کۆمەلە گردێکی مەزنە. جەنگ دووبارە لە دژی ئەوەی کە مابوو بەرپا بووەوە، بەگوێرەی تورکەوە نیو سەدە لەوەبەر لەلایەن میسرییەکانەوە تێکشکێنران. ئەمرۆ گرنگی هەیە کە هێلٚی ئاسنی بەغدا وا نەخشەی بۆ کێشراوە کە بە رووبارەکەدا تەنیا بە گردەکەی کەرخەمیشدا دەپەڕێتەوە، کە رۆژێك لە رۆژان بە زمانی ئەلمانی لەبارەی گەورەیی ئەم شارەوە زانستی زیاتر وەردەگرین لەوەی کە ئەمرۆ هەیە.

بەیانی زوو میمبیکمان جێهێشت و لە رێگادا بۆم دەرکەوت کە لە کاتی شەودا چەند فارگۆنێکی تریان لەو شوێنە هەلگرتووە، بۆیە لە دواوە و لە پێشیشەوە دەنگیان دەهات و لار دەبوونەوە، دوو یان سیانی کەلوپەل و جانتای گەشتیارانی هەلگرتبوو، ئەوانی تریش گەشتیارانی تێدابوو، لە میمبیکەوە ولاتەکە بیابان و پاشان دەستدەکات بە پەیدابوونی بەرزاییەکان و لەوپەڕی باکوورەوە دەمانتوانی شاخەکانی کورد لە مەعمورەت ئەلعەزیز ببینین، کە لەم کاتی سالەدا بەفر دایپۆشیوە.

بۆ ماوەی چەند سەعاتێك بە خێراییەکی باش بەناو بەرزاییەکاندا دەڕۆیشتین، تا گەشتینە شوێنێك لە پڕ بە لێژاییەکدا بە خێرایی دەهاتە خوارەوە و وەکو پێچبکەینەوە بە ئانیشکی بەرزاییەکاندا، رووباری فورات لە داوێنمانەوە دەرکەوت، رووبارێکی تورەی بە پەلە و پانتاییەکی زۆر فراوان، بە رێگەیەکی مەترسیداری پێچاوپێچدا گەیشتینە کەنارە فروانەکانی پێشەوە. بۆ دۆزینەوەی نیو دەستە فارگۆن کە گەشتبوو، هەروەها لەو کاتەدا تیمێك لە میمبیکەوە نەخشەی ئەوەیان کێشابوو

## فورات

که دوانزه دانه به یەك ریز بێت، ئەسپەکان زینەکانیان لێکراوەتەوە و چاوەڕێی ئەوەن به بەلەمێك بیانپەڕێننەوە، که لەشێوەی پاپۆڕێکێدا بوو، له پێشەکەیەوە بەربوویووە و له ناوەڕاستدا لەتکرابوو، یەکێك سەولێکی زۆر درێژی به دەستەوە گرتبوو، دوو یا سێ کەسی تریش به سەوڵ پاڵیان دەنا. بەڵام بۆ پەڕینەوە کێشەکە تەنیا سەوڵ لێدان نییە، بەڵکو شوێنی لەنگەرگرتن یەك شوێن له هەر بەرێکەوە هەبوو، هەروەها تەوژم و شەپۆلی ئاوەکە پێویستی بەو جۆرە هێزە هەبوو تا کەڵەکەکە رابکێشێت بۆ ماوەی میلێك بەسەر شوێنی لەنگەرگرتندا له کەنارەکەی بەرامبەردا. ئینجا پاڵنان بەرەو لاکەی تر، هەمووان هەوڵیان دەدا کارێك بەناو رووبارەکەدا بکەن، هەروەها ئەگەر زۆر خێرا و بەهێزین، ئەوا لەوانەیە بگەنە ئەو شوێنەی که فارگۆنەکان چاوەڕوانیان دەکەن، ئەگەر کەمێکیش به دەنگیانەوە بێن بۆ خوارەوە، به دڵنیاییەوە ئەوە پەیوەندی بەوەوە نییە، بەڵام جارێکی تریش راکێشانەکە دەرکەوتەوە. پێویستە هەندێ فارگۆن بپەڕێنەوە و ئەوانەش ئەسپی تێدایە، که بەهێزی ئەوانەی لەوبەریشەوەن دوو یان سێ سەعاتێك دەخایەنێت.

کۆمەڵە زۆرەکەی گەشتیاران دواکەوتنێکیان لەبەر چاو بوو، که به دڵنیاییەوە روودەدات، ئەویش لەوەدا کورتکرایەوە، که لەسەر ئەوەی کێ له پێشەوە رێکبخرێت باشە.

بێبەختانە بۆمان دەرکەوت که نیوەی فارگۆنەکان لەلایەن بەڕێوەبەری پۆلیسی ئورفەوە گیرابوو، بۆ خۆیی و شتومەکەکانی و بۆ ژنەکەی و ئەوانەی لەو سەفەرەدا دوایکەوتون، ئیدی پێویست به پەلەپەل ناکات، هێرشیکردە سەر هەموو ئەوانەی باسی رێکخستنی پەڕینەوەیان دەکرد، به شمشێرەکەی هەڕەشەی دەکرد و بێ هیوای کردین لەو پێشبینیانە له رووی ئەودا، که پێویستە بەس بێت بۆ پێشکەشکردنی بڕێك له هەموو کاروبارێکی پێشینە.

سەرەتا هەرچی شتومەك و ژنەکان هەیە دەڕۆن، ئنجا ئەوانەی پارەی دەدەنێ له دوایەوە دەڕۆن، ئەویش بەپێی بڕی ئەوەی دەیدات بەرزدەبێتەوە. شۆفێرە تورك و ئەرمەنیەکان دەبینی تۆقیون له سەروفەساڵی پیسی و له هەلسوکەوتی، بەجۆرێ که تا ماوەیەك گەڕاونەتە دواوە و نەیاندەزانی پێشینە هەیە و له رێی ئەوەی که پارەیان دابوو نەیاندەزانی نۆرە هەیە، ئیدی دەستیانکرد به خواردنی نیوەڕۆخوانەکەیان و رازی بوون بەوەی که ئەو چی دەکات با بیکات. هەرچۆنێك بێت دوو فارگۆن پڕ بوو له مەسیحی ئورفە، لەگەڵ ئەوەی زۆر هەوڵماندا پارە به فیڕۆ نەدەین، بەڵام پارەم دا و دوای نیوەڕۆ دوورکەوتمەوە و شوێنێکم دەستکەوت.

## گوندێکی کوردنشین

ئەوەشی لە ئێمە مابووەوە، ڕێکخرا کە کێ لە پێشەوە بڕوات و ئەو سەعاتانەی چاوەڕوان بووین بە باشترین شێوە کاری بۆ بکەن، خۆمان ڕێکخستەوە بۆ ئەوەی خەوی ڕۆژهەڵاتی ئەو ماوەیەی کە وێستابووین پڕی بکەینەوە.

خەریك بوو ڕۆژ ئاوادەبوو، کە پەڕینەوە و خۆمان لە پانتاییەکی فراوانی دۆڵی ڕافیدەیندا بینییەوە. بە هەموو توانایەکەوە کە هەوڵی دابینکردنیمان دابوو گەیشتینە کاروانسەراکە، پڕ بوو لە ئەفەندی و شتومەکەکانیان و ئەو گەشتیارانەی کە دوایانکەوتون، کار بە نالەبارترین شێوە بەڕێوە دەڕوات. ئێمەش چووینە پێشەوە تا خۆوبەختانە شوێنێکمان بۆ نووستن دەستبکەوێت.

بە دەشتەکەدا وردە وردە پەڕینەوە و بە ناوچەیەکی بەرزاییدا لەبەر ڕووناکی مانگەشەودا بەرزبووینەوە، کاتێ شۆفێرەکە لە دوورەوە کۆمەڵە کوخێکی قوچەك بە چەشنی کەللە شەکری لە لاڕێکەدا بەرچاوکەوت، ئیدی ئێمەش وێستاین تا دانیشتوانەکەی ببینین. دوو پیاوی کەڵەگەت هاتنە دەرەوە، لە عەرەب دەچوون، بەڵام هەریەکەیان دەرزەنێك وشەی عەرەبی قسەیان نەدەکرد، چونکە کورد بوون. ئەوە وای لە منیش و لە سایەقەکەش کرد کە بمێنینەوە، لەبەرئەوەی کورد، لەگەڵ ئەوەی ناوبانگی خراپیان ڕۆشتووە، بەڵام زۆر لە ئەرمەن و تورك یان عەرەب میوانداریی باشتر دەکەن. لە کۆتاییدا، کاتێ ژمارەیەك منداڵ و کاروبەرخیان کردە دەرەوە، پێیان وتم کە باشترین ژوور دانراوە بۆ من تا بەکاری بهێنم. بە سێ پلە دابەزیم و بە ڕاڕەوێکی تەسکی تاریکدا ڕۆشتم و خۆم لە ژوورێکی بازنەییدا بینییەوە، کە بنمیچە شێوە قوچەکیە بەرزەکەی لە دوکەڵ و ڕەشی سوتاندنی چیلکە و چەوێڵدا دیارنەمابوو.

کوردەکان بەدەم نوکتە و گاڵتەوگەپی بەردەوام لەگەڵ یەکتردا و پاڵنان بە یەکەوە کەلوپەلەکانیان دەهێنایە ژوورەوە، ئیدی لە کۆتاییدا هەموو شتومەکەکانم هێنرایە ژوورەکەوە و ئینجا خۆیان پشویان دا. ژمارەی دانیشتوانی گوندی هاملێت دەگەیشتە 15 پیاو و ژن و لە ماوەی پێنج دەقیقەدا هەموویان لەسەر بەڕە خەتەکەی لای من کۆبوونەوە. یەکێکیان تورکی دەزانی و لەگەڵ مندا بەکاری هێنا، بەڵام کاتێ بە زمانی کوردی وەڵامم دایەوە، پێموتن زمانی تورکی تێناگەم، ئەوە تەواو شادمانی کردن و وەك برایەکی کورد بەخێرهاتنیان لێکردم، هەرچەندە لە خێڵی تریش بیت (لەناو ئەم میللەتەدا)، بەهەرحاڵ هاونیشتمانیت و دەبێ وەك میوان مامەڵەت لەگەڵ بکرێت. هەروەها ئەو خەڵکە سادە و ساکارانە بە دەستووری یاسای جوانی کۆنی کوردی میوانداریت

دەکەن. برێکی کەم شتومەکیان هەبوو، بەڵام بەو بۆنەیەوە باشترین مریشک سەردەبڕن و هێلکەشیان بە بڕی خواردنی 10 پیاو ئامادەکرد. هەموو یەکێکیان جگە لە ریش سپیەکەیان کە لەگەڵ ئێمەدا وەك خانەخوێ دانیشتووە، ئەوانی تر سەرقاڵی کارێکن، یەکێ ئاگری لە ناوەندی ژوورەکەدا دەکردەوە، کە تەواو بە دووکەڵ بێتاقەتی کردبووین، یەکێکی تر ئاوی دەهێنا بۆ دەست شۆردن-نەیاندەهێشت لەو رەشەبایەدا بچمە دەرەوە بۆ سەر کانیەکە، یەکێکیش ئاوی گەرم دەکرد بۆ چایی، لە هەمان کاتدا هاوەڵەکانیشی خەریکی سەربڕین و پاکردن و لێنانی مریشکەکە بوون. هێلکە کوڵاوە زیادەکانیان بۆ دانام بۆ رۆژی دوایی گەشتەکەمان. هەستم بە شەرمەزاری دەکرد، کە ئەو ئەرکەم خسبووە سەر ئەو خەڵکە سادە و ساکارانە، ئەوەشم دەزانی کە ئەگەر هەر هەوڵێك بدەم بۆ راستکردنەوەی ئەو هەڵەی فریودانەیان، ئەوا گومانم لێدەکەن.

چ هەستێك ئەکەن لە پیاوێك کە بۆ پەیوەندیکردنی نەك تەنیا لەگەڵ ئەوان، بەڵکو لە سەرتاپای هەموو سووریادا کوردی بەکارهێناوە؟ بەڵام بۆم دەرکەوت، بەهەرحاڵ، سوپاس و پێزانین ئەوان بە چاخواردنەوە و کێشانی جگەرەی باش دەربڕیدەبڕن، شتومەکی کەمالیات لای ئەوان نەناسراوە جگە بە ناو نەبێت، ئەوەش تەواو دوورە لە هامبەریی منەوە. شۆفێرە کولۆڵەکەش، کە زۆرجار مڕومۆچیەکەی دەبووە بابەتی پێکەنین، زیاتر خۆی دەرکەنار گرتبوو، ماوەی دابوو بەوەی کە ناکۆکی دەرنەبڕێت، لەگەڵ کوردەکاندا کارێکی ئەوتۆی نەدەکرد و لە دواجاردا چوو لەناو دەستوپێی وڵاخەکانیدا نووست. کورد وەك میللەتێك گیانی خۆشمەشرەفی و نوکتەبازیان تێدایە و حەزیان بە پێکەنین و رابواردن هەیە، بەڵام لەوەبەر لەم جۆرە رابواردنەم نەبینیوە، کۆڕ و دانیشتنەکە پڕ بوو لە پێکەنینێکی بەردەوام، لەگەڵ گیانی حەز بەشت زانین و تێبینی تایبەتی و سروشتی خۆتێهەڵقورتاندن لە هەموو شتێکدا و هەڵسوکەوتی گشتییان رەسەنە و پێچ و پەنای تێدا نیە وخواستیان باشە. لەوانەیە هێرشبکەنە سەر کەسانێك، لەوانە تورك کە نەفرەتیان لێدەکەن و کردویانن بە بابەتی گاڵتە و تەشقەڵەیەك کە هەر باس ناکرێت.

لە دەوروبەری سەعات دەدا، سەرۆکی گوندەکە کە پیاوێکی قۆز و تفەنگچی گوندەکە بوو، بە هەمووانی راگەیاند کە دەورم چۆڵبکەن و رێ بدەن من بنووم، ئەوانیش تفەنگەکانیان کردە شانیان و چوونە دەرەوە. من خەریك بووم خۆم ئامادە دەکرد بۆ نووستن، کە روانیم ژنێکی گەنج خۆی کرد بە ژووردا و بە چەند لقەدارێك کەوتە گسکدانی ژوورەکە. نائاسایی نەبوو دانیشتم و بە سەرسووڕمانەوە تێیبڕوانم، لە گۆشەیەکدا هەندێ پێخەفی دەرهێنا و لە تەنیشت پێخەفەکەی منەوە

رایخست، خەریك بوو هەست بەوە بکەم کە مەبەستی تەواو ئاشکرایە و دەیەوێت هاوبەشی ژوورەکەم لەگەڵدا بکات، بەڵام بە دەرکەوتنی یەکێ لە دۆستەکانی ئێوارە کۆڕەکە، بارودۆخەکە راستبووەوە. بینیمی دانیشتبووم، پرسی بۆ ناتوانی بنوویت؟ چونکە ئەو شتەی دەیبینیت شتێکی ئاساییە، لە وەڵامی پرسیارەکەدا ئەوە تێگەیشتم کە ئەو خاوەنی ماڵەکەیە و ژنەکەی گسکدەرەکەیە، ئەو لەگەڵ ئەوەشی خاوەنی گوندەکەیە، بەڵام تەنیا دوو ژووری نووستنی هەیە بۆیە بۆ شەوێك ئاساییە لەگەڵ مندا بنوون. ئەو شێوازە بەو شێوەیە کارێکی رۆشتووە و دەتوانێت ئەوە بکات، کە من ناتوانم و ئارەزووی ئەوەش ناکەم شتی وا بکەم، هیچ تێبینیەك بکەم کە ئەوە جۆرێکە لە دابونەریتی رووت. ئەو دەبینی زۆر هێمن و ئاساییە لە جێبەجێکردنی ئەو کارەدا، بە جورێك کە نەمدەتوانی کۆمێنتێکم لەسەر نەریتی باووباپیرانی پێشویان هەبێت و نەشمدەویست ئەوە بکەم. ئەوەندە تێگەیشتم کە ئەگەر تورك یا عەرەب بوومایە، داوام لێدەکرا کە لە عارەبانەکەدا بنووم، بەڵام بوونم وەك کورد و میوان، دەتوانم وەك ماڵی خۆم هاوبەشی ژوورەکەیان بکەم، پیاوە هەژارەکە تەنانەت شەرمەزاری دەربڕی لەوەی کە نەیتوانیوە بە ئەرکی میوانداری هەڵبستێت، بەڵام منیش ئەوپەڕی توانام بەکارهێنا بۆ ئەوەی کارەکە بۆ ئەو و ژنەکەی ئاسان بکەم و پێکەوە راکشاین و نووستین.

بەیانی زوو بەهۆی ژنەکەیەوە خەبەرم بووەوە، پیاوەکەی هێشتا لە خەودا بوو، ئەو بۆ خۆی شتە سوکەڵەکانی بەکێشکرد بۆ لای عارەبانەکە و ئینجا دوو سێیەك لە خەڵکی گوندەکە پەیدابوون و شتە سەنگینەکانیان بارکرد. دوای هەموو ئەوانە ئیدی سەرۆکی گوند دەرکەوت، کە دوورکەوتینە دەنگی خواحافیزی و ماڵئاوایی بەکوڵ هێشتا لە گوێکانمدا دەزرنگایەوە.

ئەوانە یەکەم کورد بوون بینیمن، پێشەنگی نەتەوەیەکی مەزن کە پانتایی 125000 میلیان لە ناوچە شاخاوییەکانی تورکیا و ئێران داپۆشیوە، ئەوانەی کە خێڵە پەرِ و تەریکەکانیان تەنیا چواردە رۆژ لە لەندەنەوە دوورن، بەلایەنی کەمەوە وەك هەر میللەتێکی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەناسرێن، هەرچەندە ئەوان یەکێکن لە ئازاترین و سەربەخۆترین و زۆر زیرەکەکانی ئەو ناوە، بەڵام بەر نەفرەتی خوێنڕشتن و پەڵەیەکی رەش کەوتون بەهۆی پەلاماردان و ئارەزووی دزی و تاڵانییەوە.

رێگەکە بۆ وێستگەی داهاتوومان بەناو دەشتاییەکی پڕ لە بەرزو نزمیدا دەڕۆیشت، کە ئەرمەن و کوردە نیشتەنیەکانی تیرەی (میلی) تێدا دەژیان. بەدرێژایی سەدان میل بەنێوان زەوییە کێڵراوەکاندا دەڕۆشتین، دانەوێڵە هێشتا سەرەتای بوو، کە لەسەر زەوی شەپۆلی سەوزی دەدا.

# چارمەلیك

لە باکورەوە بایەکی تیژ دەهات و پلەی گەرمای دابەزاند، ئەویش بەئاشکرا بەهۆی بەفری شاخەکانەوە بوو، لە دەورویەری سەر شانەکانیدا دەستیکردبوو بە کۆکردنەوەی پەڵە هەور، تا زەوی و کاروانیان لە ئاو هەڵکێشێت، بەڵام چەند رۆژێك دواتر لە راستیدا لە دوای نیوەڕۆیەك باران دایکرد، کاتێ خۆمان لە دەشتێکی دڵتەگی پڕ لە قوڕ و لیتەدا بینییەوە، تا ئاستی ئەوەی کە پێچکەی عارەبانەکە و قاچی ئەسپەکان نوقوم بووبوون. وێستگەکەمان (چارمەلیك) لە دوورەوە دیاربوو، دووریەك کە هەرگیز لە توانامانداا نەبوو کورتبکەینەوە، چونکە لیتە و قوڕ بە هەموو لایەکدا بڵاوبۆتەوە و خێراییمان نزیکەی نیو میل بوو لە سەعاتێکدا، لێزمەی باران بە هەموو ناوچەکەدا دەستپێکردبوو.

پیاو دەیتوانی بیانژمێرێت وەك لە بەرزاییەکانەوە دەهاتنە خوارەوە و ستنوی بارانی چڕ وتەڵخ کە لە ناوەندی هەورە رەشەکانەوە دائەبارێت بۆ ناو دەشتە نوقوم بووەکە، لەوەش ئەچێت گەڕابێتەوە بۆ چیاکان و هەوری چڕ و پڕی زۆر دەوری داون. بەهەرحاڵ، ئێمە لەگەڵ خۆرئاوابووندا گەیشتینە چارمەلیك و چووینە ژورێکی بچووکەوە، گوندێکی کوردیە و باسوخواستی ئەو ناوە تەنیا لەبارەی ئیبراهیم پاشای سەرۆکی ناوداری رێگر و دزەکانەوە بوو، ئەوەی ماوەیەکی دوور و درێژە لەم ناوچەیەدا جەردەیی دەکات. ئەو کەسێکی تەواو خراپ بوو، (ئەم یاخی بوونەشی بۆ تۆڵەسەندنەوەی ئەو خیانەتەی تورکەکان بوو، کە باوکیان بەو ئەنجامە ناخۆشە گەیاند) عەرەب و کورد پێکەوە حاشایان لێکردووە، کورد دڵنیان کە ئەو عەرەب بووە، عەرەبیش پێی دەڵێن کوردە. ئەوانەی پەیوەندیان پێوەکردووە بۆ دزی و جەردەیی لە هەموو چین و رەگەزێکن، ئەوانەش وەك تورك، ئەرمەن، کورد و عەرەب، هەمووش لەژێر فرمانی ئەوادا کاردەکەن، بەبێ جیاوازی ماڵی هەر تیرە و خەڵکانێکیان دەستبکەوێت بە تاڵانی دەیبەن و تەنانەت لەگەڵ تیرەکەی خۆشیدا دوژمنایەتی بەرپاکردووە، ئەویش کە تیرەی میلی کوردە. بەڵام وەك هەموو جەردەیەکی فێڵباز و ناکەس لەگەڵ دەستەڵاتدارانی تورکدا توانیویەتی سۆزی سوڵتان بۆ خۆی پەیدابکات و دەستەڵاتدارانی ناوچەکەش لە دەستگیرکردنیدا هەڵخەڵەتێنێ. بەزۆریی لە شاخەکانی نێوان سنووری دەشتەکانی میسۆپۆتامیا بەرەو باکوور خۆی حەشاردەدا، بەڵام هەروەها هێزێکیش بوو لە شاری ڤێران و حەڕان بەرەو باشوور، لە هەر شوێنێك بووایە خەڵکی دەترسان و لێی تۆقیبوون. تا تورکەکان بە شێوەیەکی دەستووری

خۆیان ڕێکخست و بە فێڵ کوشتیان و ئاگربارانیانکرد و پیاوەکانیشی هەر یەکەی بە لایەکدا هەڵهاتن. گوندنشینەکان لە چارەلیك لە بارەیەوە دەیانگێڕایەوە کە چۆن پیاوەکانی دوای کاروانیان دەکەوتن بۆ ناو گوندەکە و خۆیان لە باشترین ژووردا دادەمەزراند و داوای ژەمە خواردنێکیان دەکرد، پاش پشودان و سەبیلکێشانێك یان دوو، ئیدی دەهاتنە دەرەوە و بەبێ دەنگی شتومەکی کاروانیەکانیان دەنایە سەر عارەبانەکانی خۆیان و دەیانبرد بۆ نزیکترین مۆڵگەی خۆیان. زۆر کەس لە کاری تۆڵەسەندنەوە دەترسا- تۆڵەسەندنەوە وەك سوتاندن و تاڵانکردنی سەرتاپای گوندەکە- لەبەرئەوە کەس نەیدەتوانی ناڕەزایی دەربڕێت. تەنانەت ئەفسەران و بەرپرسانی تورکیش بەم چارەسەرە رازیبوون، دواجار لە بەرامبەری ئەم مەسەلەیەدا بیرێك هاتەوە یادم، کە چەوسانەوە و لێدانێکی باش باشترە لە نەفرەتی نەژادی. بەگشتی ئیبراهیم پاشا یەکێك بوو لە باشترین و سەرکەوتوترین کۆمەڵە کوردی تاڵانکەری زۆر بەهێز. تەنیا کۆمەڵەیەکی تر پێکهاتبوو بۆ مەبەستی راو و رووت و تۆڵەسەندنەوە، ئەویش هەمەوەند بوون، کە دواتر لە باشووری کوردستان دەنگوباسیانم بیست. بەیانی گوندەکەمان لە کەشێکی زۆر ساردا بەجێهێشت و کە خۆریش هەڵهات، ئێمەی لە سەرکەوتنێکی لەسەرخۆ لەناو دەربەند و لاڕێکانی کۆمەڵە چیایەکی مەزندا دۆزییەوە. لەم وڵاتەدا، ئێران، کە ئەوەندە زۆر زوڵمی لێدەکرێت، چەند سەد میلێك گەشتم بە کاروانی تێداکردووە، بەڵام دەبێ ئەوەش بڵێم: کە نالەبارترین ڕێگاویانی ئەو وڵاتە دڵتەنگە ڕێگا بەردڕێژەکانە لە بەراوردا بە ڕێگاکانی دەرەوەی تورکیا. لێرەدا، کاروانەکان بە ناوچەیەکی ئاسایی لە دەریا و پارێزی ئەستەنبوڵدا تێدەپەڕن، کە فڕەنسایی زمان هیچ پەیوەندیەکیان نییە بەسەریانەوە، ئەفەندیەکانی حەزیان بە خواردنەوەیە و هێما بۆ ئەو جۆرە شتانە دەکەن. لە کاتێکدا لە ئێران ڕێگای زۆر باش لە لایەن کۆمپانیای بیانییەوە بنیات نراوە، دەڵێن زۆرجار بە پێچەوانەی تورکیاوە بە گەرمی پێشوازی دەکەن. هەرچەند ئەندازیاری ئەورووپی ڕێگایەکی ساف و بێ گرێی بنیات نەناوە، فارس خۆشی بیرێکی تری نەبووە بۆ کەمکردنەوەی ئازار و ئەشکەنجەی ڕێبواران، ئەوەی لە دەستی هاتووە پاکردنەوەی ڕێگەویانەکە بوو لە بەرد و ڕێگە پردی پێ دروستکردووە. چەند سەعاتێکە ئێمە بە دۆڵەکاندا سەردەکەوین و دەخزاینە خوارەوە، دەنگە دەنگ و دارِمانی هەردوو لای ڕێگاکە و سەندوق و شتومەك لە هەموو جۆرێك بەو ناوەدا بڵاوبۆتەوە و ئەو شتانەی

# ئورفه

بچووك بوون یان خواردن بڵاودەبوونەوە، ئالێرەدا ددان بەخۆداگرتن كارێكی چاكە، خۆم و شۆفێرەكە یارمەتی پێچكەی عارەبانەكەمان دەدا بەوەی كە بەردی لەبەردەمدا دووربخەینەوە، یان یارمەتی وڵاخەكان بدەین تا لە سەرەوژوورکە و سەرەوخوارکەكاندا نەترازێن. ئەوە و كەمێك كشتوكاڵ لە ناوەندی بەردەكاندا هەبوو، كانیەك شوێنێكی بەرتەسكی لە هەموو دۆڵەكەدا سەوز كردبوو. ئیمەش خەریك بوو لە (ئورفه) نزیك دەبووینەوە، كە وێستگەی پشودانی داهاتوومانە، خانوی ئەشكەوتیی شێوە كۆن، كە ئێستا چۆڵە و كەسی تێدا ناژی، بەردی هەڵكۆڵراو لێرە و لەوێ كەوتبوون. لە دەشتێكی تەختا، بە پانی دوو میل پاشماوەی بینایەكی چوارگۆشە، لە شێوەی سەردەمی بەر لە ئیسلامدا هەبوو، لە كاتێكدا خانوی گڵێن ئەو شكۆیەی نییە لە بەراوردا بەوەی ئەم سەردەمە. بەهەرحاڵ، تەنگوچەڵەمەكەمان لەپڕ كۆتایی هات و لە رێیەكی خراپ و نالەبارەوە خۆمان لەسەر رێگایەك بینییەوە، كە بە شێوەیەكی باش دروستكرابوو، هەروەها بەردەوام بوو تا گەشتینە (ئورفه). ئیدی بەو شێوەیە، كە بە بڕوای من لە سووریادا ئەمە تەنیا رێگایە دەكرێت، ئەوەش لە ئەنجامی ئەو پرۆژە سەربازی و بازرگانییەوەیە كە تا دیاریەكر دەچێت. چەند میلێك بۆ باكووری رۆژهەڵاتی ئورفە هەوڵ و تەقەللا كۆتایی پێهات. جارێ لە سەرو ئەوەوە، ئەوەی بینمان نەدەكرا چارەنوسمان بێت، هەرچەند من لەوە تەواو دڵنیام، كە شۆفێرەكە ئەوەی وت: گوایە دەربەند و رێڕەوەكان بۆ عارەبانەی چەرخەدار سەختە. لە رێگەدا چاومانكەوت بە چەند موسڵمانێك كە لەوپەڕی گۆشەیەكی ئاسیاوە چووبوون بۆ مەكە، پیاوێكی پیر كە جلوبەرگەكەی خۆراسانی هێنایەوە یادم، كە لە رۆژهەڵاتی ئێرانە، لەسەر گردەكە بە هەنگاوی خێرا پێمان گەیشتەوە، بە زمانی فارسی لێم پرسی لە كوێوە هاتووە، ئیدی تێگەیشتم كە ئەو لە حەج بووە و لە مەكەوە بە پێ رۆشتن گەڕاوەتەوە و بەرەو بوخارا دەچێت. گەشتەكەی وەك خۆی باسیدەكرد، ساڵێكی خایاندبوو، لەو كاتەوە لە شاری زێدی خۆی دەستی پێكردووە، هەمان كات ساڵی دواتر دەگاتەوە هەمان شوێن. سەرو سیمای هەر لە پەنجا ساڵ یان زیاتر دەچوو، بەڵام لاوازی و ماندووبوونی ئەو رێگا دوور و درێژەی پێوە دیار نەبوو، ئەو رۆژە بیست میلی بە سەر شاخدا بڕیبوو، كە لەوە دەچوو تازە دەستی بە رۆشتن كردبێت. لە لایەكی رێگاكەدا، كە لە ئورفە نزیك بووینەوە، لەوێدا رێگاكە زۆر نالەبار بوو، كەمێ لە پردە كۆنەكە مابووەوە كە لە رێگا سەرەكیەكەوە دەچوو بۆ رۆژئاوا لە

ئێدێسا، هەر وەك لە سەردەمی ڕۆژانی بەر لە مەسیحی بە ئورفە دەناسرا. بە درێژایی ڕێگای پەرستگاکە کە لە بەردی چوارگۆشە بوو، سوپای ڕۆمان و پارسەکان لەو ڕۆژانەی مرۆڤی ئەو ناوە خواکانی ڤینۆس و عەشتاریان دەپەرست لێرەوە تێپەڕیون.

ئورفە کەوتۆتە داوێنی ئەو زنجیرە مەزنەوە، لەسەر چەند گردۆڵکەیەك ڕاوەستاوە و ماڵی حاکمەکەی لەسەر شێوازی فرەنسی بیناکراوە، سروشتی کۆنی شارەکە تەواو ئاشکرایە، ڕەشاییەکی زۆر بە دیوارە گەورەکانەوەیە، کە لە هەموو شوێنێکەوە دیارە و شێوازی ئەو پردەی بە ناوەڕاستی شارەکەدا درێژدەبێتەوە، گردەکانی قەڵاکە و ئەو بینایانەی کە بەو بەردە ڕەشانە دروستکراوە، شتێیەك لەبارەی مێژووی ئێدێساوە دەدرکێنن. هەروەها لەسەر ئەو گردانەی لەسەرو بەردە دابڕاوە زەردە کاڵەکانەوەن، تەماشای خوارەوە بکەیت، چەم و شیوی بێ سنوور و خانوی سەردەمی کۆن، کە لەم سەردەمەدا لەلایەن چەند خێزانێکی ئاسایی کوردەوە بەکاردەهێنرێن. لە کاروانسەرایەکی گەورەدا[5] لە کەناری ئەو دۆڵەدا لاماندا کە لەسەرەوە باسمانکرد، ژوورێکم لەو ریزە ژوورە هەڵبژارد، کە لەسەربانێکی فراواندا بوو، دەکرا لێوەی بڕوانیتە هەموو شوێنێکی گردە شێوە کورە هەنگیەکان، یان کۆمەڵە خانوەکەی کە گەڕەکی ئەرمەنیەکانیان پێکهانیبوو. پێچەوانەی دابونەریت ژوورەکەی لەسەر سەربان دەکرایەوە، رووکارەکەی پەنجەرەی بێ شوشە بوو، دەیڕوانی بەسەر شەقام و قاوەخانەکەدا، ئەمەی لەگەڵدا نەبوو، بەڵام لە لاکەی تری کاروانسەراکەوە خرابووە سەر ژووری قاوەخانەکە. بەدرێژایی کەنارەکە، لەسەر شێوازی پلەپلە، درەختەکان کەپری پوشی سێبەرگر بوون. بەدرێژایی هێڵی ڕێگاکە بە نێوانی قاوەخانە و دیوارەکانی کاروانسەراکەدا هەراجخانەی شارەکەیە، کە هەموو بەیانیەك دەکرێتەوە، هەموو شتێك کە بتوانی بەخەیاڵدا بێت لەوێدا دەفرۆشرا، لە ساچمەیەکەوە بۆ ئەسپێك. ئەو شتانە لە لایەن میوانەکانی ناو قاوەخانەکەوە مەزاد دەکران، کاتێ ئەو بەناویاندا تێدەپەڕی و هاواری دوا نرخی دەکرد،کە لە زۆر لایەنەوە نەگەشتبووە نرخی خۆی، ئەسپەکە، یان هەرچی شتێك بێت دەیدایەوە بەخاوەنی و دەڕۆیشت، ئیدی بۆ بەیانی ئاژەڵێکی تری بە هەرزان پەیدا دەکرد.

هەموو شارەکانی ئەم ئیمپراتۆریایە لەهەمان بارودۆخدایە، نیوەی دانیشتوانی سەر شەقامەکان و لە نۆ بەش، بەشێکی هەموو قاوەخانەکان و سەرگۆشەکان ئەفەندیە و لە بەرگی فەرمیدایە، کە

[5]- لە وەرگێڕانی عەرەبیەکەدا کاروانسەرای بە (قافلە) داناوە،کە راستیەکەی خان یان وەك خۆی کاروانسەرا شوێنی لادان وحەوانەوە و پشوی کاروانیە (We drew up at a large caravanserai)

بەهیچ جۆرێ لەوەناچێت ئەرك و فەرمانێ جێبەجێبکەن. لەراستیدا، پێیان وتبووم کە لە ئورفە زیاتر لە شارەکانی تر لەم جۆرە (تەیرانە) یان خەڵکە نالەبارانەیان هەیە. خۆشبەختانە، ئەوانە هۆی نائارامی نەبوون بۆ من، چونکە پێشوتر شتێکم لەبارەیانەوە دەزانی، ئەم ناوچانە بۆ ئەوان شوێنێکی باشە تا بتوانن چەند قرۆشێك لە کەسێکی گەشتیار وەرگرن، یان بسێنن.

بە گوێرەی دانیشتوانەوە، جگە لە دیاردەی هێزی تورك تێیدا، پێکهاتووە لە کورد و عەرەب و ژمارەیەکی زۆر لە ئەرمەنی. کوردەکان لە باکورەوە هاتوون، زووریەیان لە شاخەکانی مەعمورەتول عەزیز، عەرەبەکانیش لە پانتاییەکانی میسۆپۆتامیاوە هاتوون و لەوانەشە داوای ئەوە بکەن کە ئەوان دانیشتوانی رەسەنی ناوچەکەن. زمانی شارەکە کوردی و عەرەبیە، هەموو لایەك لە کوردی تیدەگەن، بۆیە تا ئاستێك خۆی سەپاندووە بەسەر دانیشتوانە دەرەکی و بێگانەکاندا، وەك ئەوەی کە لە هەموو شوێنێکی تریش وایە و زمانی کۆن لەناودەچێ و لە بارودۆخێکی تایبەتیدا زمانی تر شوێنی دەگرێتە.

شارەکە، شارێکی گەورە نییە، بەڵام بازاڕەکەی زۆر جەنجاڵە و شوێنەکانی میری هەمیشە پڕە لە خەڵکی. گۆڕەپانێکی لێیە کە ژمارەیەك درەختی تێدایە و شوێنەواری هەندێ خانوی کۆنی تێدایە، هەندێکی لە ئێستادا بەکاردەهێنرێت و ئەوانی تریش دیواری تازەی بۆ بیناکراوەتەوە. لەژێر گردەکاندا دەتوانی (چاڵاوەکەی ئیبراهیم) ببینیت، ئەو بۆچوونەی کە ئیبراهیم لەو ناوچەیەدا رۆڵی هەبوویێت زۆر بڵاوە. ئاوێکی زۆر هەیە، دیمەنی سروشتی جوان لەو دەوروبەرەدا و سروشتی دڵگیری گردەکان. هەروەها پێیان وتم کە لە ناوچەیەکی ئەو دەوروبەرەدا باخچەیەکی جوان هەیە.

ئەمە یەکێکە لەو شوێنانەی کە مرۆڤ لە تورکیای ئاسیاییدا زۆرجار لەو جۆرە دەبینێت، کە دەکرێ ژیان لەو ناوچە جوان و رازاوەیەدا لە ئاسایش و ئارامیدا بێت، ئەگەر تورك فەرمانڕەوایی ناڕەوایان نەبێت.

ئورفە یان ئێدێسا، هەروەك رۆمانەکان ناویان دەبرد، لە سەردەمی ئاشوورییەکاندا لەسەر سنووری ئاشووری مەزن و خاکی نایری بووە، کە ئەو بەرزاییانەی باکوورە و ئێستا بە ناوی بەشی رۆژئاوای کوردستانەوە دەناسرێت، ناوەکەی تا سەردەمی داگیرکردنی رۆمانەکانیش وەك شارێك دەرنەکەوتبوو، کاتێ بیستمان پایتەختی وڵاتی (ئۆسرهۆنە-Osrhoene) کە مەلیکەکەی هەمیشە بانگدەکرا بە (ئەبگاروس) بە پێی بۆچوونی رۆمانیەکان ئەوە ناوێکی سامییە. خەڵکەکەی عەرەب بوون و ئێدێسا کاتێ پایتەخت بوو، خاڵێکی لەوپەڕی باکووری وڵاتەکەوە پێکدەهێنا.

## ئێدێسا

لە هەمان کاتدا وڵاتەکە لەسەر ڕێڕەوی میسۆپۆتامیا بووە و هەمیشە لە ئاستی سنووردا بوو لە نێوان ڕۆمان و پارسادا، لەگەڵ عەرەب و میللەتە شاخاویەکانی وەك ئەرمەن، یان کورد، هەروەها ئەوە نەزانراوە کە کورد ئەوەندە دوور بڵاوبووبێتەوە بەرەو ڕۆژئاوا، جگە لەوەش بابەتی تورەکردنی هەموو دراوسێکانیشی بووە لە جەنگدا و لە زۆر بۆنە و بارودۆخدا ڕۆڵی ناپاکی بینیوە.

دوای وێرانبوونی ئیمپراتۆریای ئەسکەندەر، لە دەوروبەری سەدەی سێیەمی بەر لە زایین، میسۆپۆتامیا کەوتە ژێر دەستی ئەمیرەکانی سلوقیەکانەوە و هەر کە لاوازبوون، بەشی باکووری وڵاتەکەیان بەر لە هاتنە پێشەوەی ڕۆمانەکان رووخاند. لە ساڵی 65 پێش زایین (پۆم. پەی- pom.pey)ی مەلیکی ئێدێسا، پەیمانێکی لەگەڵ ئەبگاروسی مەلیکی میللەتی ئۆسرهسۆن بەست و پەسەندی مسکێنێتی راستەقینەی کرد ئەگەر فەرمیش نەبێت. 10 ساڵ دواتر، کراسۆس هەروەك لە سەرەوە ناومان هێناوە، هێرشەکەی دژی هێزە هەڵچووەکەی پارسا کرد و لە لایەن ئەبگاروسەوە هەڵخەڵەتێنرا و شەرمەزارکرا دوای ئەوەی دووچاری هەڵوێستێکی مەترسیدارکرا. دواتر ئێدێسا بوو بە هاوپەیمان لەگەڵ پارسا، بەو هۆیەوە خۆی پاراست لە وێرانکاری شەڕ و داگیرکردن. دوای سەدەیەك، ئیمپراتۆریای پارساکانمان (باشکان) بینی پرسی خەلافەت چۆن هەڵیوەشاندەوە. میردادی ئەمیری باشکانەکان، لەسەر پێشنیاری ڕۆم توانی وڵاتەکەی بە زەبری شمشێر لە گۆداز بسەنێتەوە. لە ڕێگەدا بەلای ئێدێسادا تێدەپەڕی، ئێستا ئەبگاروس ئامادەیە بۆ دووبەرەکی نانەوە و پاشان ئاهەنگ و جەژنی ئەوە، خستیە سەر ڕێگا، چونکە دەزانێت لە کارەساتێکدا کۆتایی پێدێت، بۆچوونەکەی ئەو بە تەواوی دڵنیایە لە تێشکاندنی دوژمن لە ئەربیلدا.

دوای کۆچی دوایی ئەم پاشا فرە بەهرەیە، ئیدی تا ساڵی 115ز کەمتر لەبارەی ئێدێساوە دەبیسترا، کاتێ تراجانی ئیمپراتۆر خۆی تێدا دامەزراند، خۆی ئامادەکرد بۆ داگیرکردنی باشکان (پارسا). ئێدێسا شوێنێکی گونجاوبوو بۆ ئەو هەنگاوە، هەروەها ئاسان بوو لە ڕێی حەڵەبەوە بە دەریای سپی ناوەڕاستدا بیگاتێ و ڕێگاکە رابەری بکات لە سووریاوە بۆ ڕۆژهەڵات. خەریکی ئامادەکردنی سوپاکەی بوو، بەرەو باشوور ڕێکیخستن، بەڵام لەکاتێکدا لە باشووری میسۆپۆتامیادا تێکشکا، ئەبگاروس راپەڕی و هەلی قۆستەوە لە ئامادەنەبوونی تراجان، بە خێرایی یاخی بوو، هەروەها ئۆردووی ڕۆمانەکانی دەرکرد، کە لە قەڵاکەدا دامەزرابوون و ئەوانەی هێشتا لەسەر دیواری شورا و دیوارەکانی لای شارەکەوە راوەستابوون. لە تۆڵەکردنەوەی ئەو هەوڵی سەربەخۆییەدا، لە ساڵی

داهاتوودا- 116ز (لوسیوس کوایتوس) که جەنەراڵێکی رۆمانی بوو، شوێنەکەی داگیرکرد و سوتاندی. لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە جارێکی تر لەبارەی ئێدێساوە دەبیستینەوە، بەر لەوەی نوقمبێت لەو بێ سەروبەرییەی کە رمانی هێزی رۆمانەکانی لە میسۆپۆتامیادا بەدوادا هات. لە یەکێ لە هەوڵەکانی ئەو دواییەی رۆما دواجار لە ساڵی 197ز پارساکانیان (باشکان) تێکشاند، سەڤەروس، ئەوەی کە لە فرەنساوە هاتووە بۆ هەوڵدانی ئەوەی ناوچەکەیان لێ بسێنێتەوە، کە (ئەدیساش لەو ناوچانەیە) لەو دواییەدا لەلایەن (ڤۆڵگاسێسی پێنجەم)ەوە کە پارساییە (باشکانییە) لە رێگەی خۆیدا بەرەوە رۆژهەلات داگیرکرابوو، هەروەها ئەبگاروسی فەرمانڕەوا، کە هەمیشە ئامادەیە خۆی بگۆڕی بە بەرپرس و دەستەلاتدار، ئیدی بەبێ چەندوچون هاتە پێشەوە و کوڕەکانی وەك بارمتە دایە دەست رۆمانەکان.

شایانی باسە کە ئێدێسا، دوای ئەو سەدان کێشە و ناکۆکیەی نێوان ئیمپراتۆریا مەزنەکان، کە بەرز و نزمی و شالاوی ئاشووری و فارسی و یۆنانی و (باشکانی- پارسایی) و رۆمانی و عەرەبی بینیوە، رامالڕاوە و هاتوچۆی پێدا کراوە، ئیدی ناچاربووە کە رۆمی و رەگەزی یۆنانی تێدا بوو، کە رەگەزی دووەم بەشێکی گرنگ بوو تێیدا، کاتێ مەسیحیەت دەستی بە بلاوکردنەوە کرد، بەناو ئێدێسادا چوون بۆ ئەنتاکیە ئاسانتر بوو بۆ سەرەك قەشەکان لەو رۆژە سەرەتاییانەی زوودا بۆ گەشتکردن بەرەو ئەوێ، بەو جۆرە لە ئەنجامی ئەو هەوڵ و کۆششەدا کۆلیجەکەیان لەو کاتە زووەدا گۆڕی. لەگەڵ ئەوەی گومانی ئەوە دەکرا، کە یۆنانیەکی زۆر لەم کۆلیجەدا هەبوو، پێمان وترا، کە ئەوە کلدانیەکان بوون دایانمەزراند و وایان لێکرد کە ناوبانگ بەو فراوانیە دەربکات و بەتایبەتی لە رووی زانستی زانیاری پزیشکییەوە. بێگومان زمانەکانی کلدانی و یۆنانی و عەرەبی لەو کۆلیجەدا قسەی پێدەکرا، بە دڵنیاییەوە قوتابی عەرەبیش لەو کۆلیجەدا هەبوو، کە لە دانیشتوانی رەسەنی خاکی مەکە و مەدینە بوون و پەیوەندییان بە پیرۆزانی سەرەتای ئیسلامەوە هەبوو، لەوانەش ئەبوبەکر. ئەم قوتابخانە ناودارە لەلایەن (زینۆی ئاسووریەوە)[6] هەلوەشایەوە و ئەو کلدانیانەی بڕوابوونیان بە خۆیان وننەکردبوو گوێزرانەوە بۆ سوسە- susa لە خوزستان لە باشووری رۆژئاوای ئێران، هەروەها مژدەدەرە ناودارەکانی کلدانەکانیان نارد بۆ ولاتی چین. لە 1124ز بوو بە بەهێزترین قەلای شوێنکەوتووانی حەسەن سەباح، ئیسماعیلیەکان یان خاچپەرستە پیاوکوژە ناودارەکان و کاتێ بۆ هەمیشە دەریانپەڕاندنە دەرەوە و ژمارەیەکی زۆر لە ئێدێسا کوژران، یان وەك ئەوەی لەو کاتەدا

---

[6] لایارد- Layard نتفیاقە، بەرگی یەکەم، لاپەڕە 249، ن. هەمبولت، کوزموس، بەرگی دووەم، بەشی پێنجەم، د.

پێیدەوترا ئورفە و ئیدی لە مێژووی گشتی میسۆپۆتامیادا ئاستێکی ئاسایی وەرگرتووە. تا ئەو کاتەی ناوبانگی شەڕی پەیداکرد، ئەویش بەهۆی ڕەشەکوژی ئەرمەنەکانەوە بە هاندانی تورك. لە ئورفە ئاشناییم لەگەڵ سێ جۆر کەسایەتیدا پەیدا کرد و نمونەیان لە ئەنجامی ئەو تێکشانی ڕەگەز و توخم و هەمەجۆرییە لە پاشماوەی ئەوەی لە ڕۆژئاوای ئاسیادا بەرپابووە. دوو جار تا سێ جار لە ڕێگەکەمدا لە حەڵەبەوە تێبینی ئەوەم کرد، کە سێ گەشتیار لە واگۆنەکەی تەنیشتمان بوون، لە ئورفەش بینیمنەوە، چونکە ژوورێکیان لە تەنیشت ئەوەی منەوە گرتبوو. شێوازیان سەرنجڕاکێشبوو، بەتەمەنترینیان سەرۆکی کۆمەڵەکە لە پیاوێکی شەرخواز دەچوو، لوتێکی قۆقزی گەورە و دەمێکی زل، کە لە سوچێکەوە کرابۆوە و دوو ددانەکەی کە مابووی دەرکەوتبوو. عەمامەیەك لە سەردا و پاڵتۆیەکی کۆن و شەرواڵێکی تورکی، کە تا بلێی دەڵب و فش و لە قولەپێدا تەسك بوو، ئەوە شێوی جلوبەرگی بوو. ئەوەی تەنیشتی برادەرێکی ڕەشتاڵە بوو، لە کورد دەچوو، بەڵام قۆشمەچێتی لەناو چاوە بچکۆلەکانیدا شەپۆلی دەدا، مێزەرەکەشی کوردی بوو، هەروەها خۆی وەکو خەڵکی باکوور گۆڕیبوو، کڵاوێکی نیمچە تەشتی کردبووە سەری و بە پارچە قوماشێکی شین دەوری گرتبوو، کە ئەوە مێزەری خەڵکانی ئەو ناوچانەیە و دەبوت ئەم شێوە سەیرە زیاتر لەناو کلدانیە شاخاویەکاندا باوە و دەستەسرێ لە سەریان دەپێچن. هەر ئەوەندەیە، لەجیاتی عەمامەی ئاسایی، ئەو، ئەو پارچە قوماشەی سێ یان چوار جار لە سەری پێچاوە و بە بەنێکی بەهێز بەستوویەتی و هەروەها کۆت و شەرواڵی فراوانی لەبەرکردووە، کە لە موو دروستکراوە. لە ڕاستیدا لە دیدی شارەزاییەوە ئەو وەك کوردی ناوچەی ئەرزڕۆم دەردەکەوت. سێیەمیشیان زۆر لەوانی تر جیاواز بوو، قەڵەو و سمر و قژ رووتاوە کە روخساری لەژێر ئەو فێستە سوورەی سەریدا لە مانگ دەچوو. لە شێوەی چاکەتێکدا بەرگێکی پۆشیوە، تا خوار کەمەری هاتبوو، کە لە حەریری شینی چڵکن دروستکرابوو، هەروەها شەرواڵێك کە لەسەرەوە فشەڵ و لە داوێنەوە تەسك، شایستەی پێکەنینە. ئەو پیاوە سەیر و سەمەرانە کاتێ لەناو واگۆنەکەی خۆیاندا بوون، بەشی زۆری کاتەکەیان بە قسەکردن بەسەربرد بە ئاوازی زمانی گەرگۆڕیان، کە نە منیش و نە عارەبانچیەکەش تێنەدەگەیشتین.

ئێستا و دواتر بە کوردی گۆرانییان دەوت، یان شیعرێکی خواروخێچیان بە تورکی دەخوێندەوە. وتووێژی نێوانیان بە عەرەبی و بە کوردی بوو، کە دووانیان بە یەکسانی باش قسەیان پێدەکردن، بەڵام ئەو پیاوەی ناوەڕاست، کە لە کورد دەچوو، تەنیا بەو زمانەوە وێستا بوو، واتە هەر بە کوردی

دەدوا. لە شەودا، ئێستا لە کاروانسەراکەدا، هەلی ئەوەم هەبوو، کە گوێ لەو کۆمەڵە بگرم و گوێم لێبوو بە کوردی کرمانجی، عەرەبی و تورکی دەمەتەقێیاندەکرد، هەروەها بەو زارەی نێوان خۆیان، کە ژمارەیەکی باش وشەی کوردی تێدابوو. ئاشکرایە ئەوە شتێکی سەیرە، بەڵام بۆ بەیانی ناسیاویم لەگەڵ ئەو یەکەیان پەیداکرد کە تەواو بە کوردم دەزانی، دەچووە دڵەوە و بە کوردی قسەمان دەکرد، ئیدی بۆم دەرکەوت و عارەبانچیەکەش دڵنیایکردم، کە حاجیەکی کوردی باشوورە. ئێستا زانیم کە ئەوانە لە مەکەوە گەڕاونەتەوە و خەڵکی (سەرت)ن، کە شارۆچکەیەکی بچووکە لە باشووری دەریاچەی وان. هەر زوو نهێنی ئەو زارەم بۆ دەرکەوت، کە لە ناوخۆیاندا قسەیان پێدەکرد، سەرگوزەشتەی کلدانیەکانی ورمێ و دیلمانی ئێرانم بیرکەوتەوە، کە لەبارەی (گاڤارنای) دەیانگێڕایەوە، کە بەناو شاخەکانی کوردەکاندا تێپەڕیون، گاڤارنای بەخۆیان دەوت کە مەسیحین، بەڵام لەوە دەچوو ئەوان لە گاڤارنای هەڵهاتبن، کە موسڵمانن.

لێکدانەوەی بەسەرهاتی گاڤارنا بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە:

ناوچەی سەرت، یان (بەرد) ناوچەیەکە لە کوردستان، یەکێکە لەو ناوچانەی، کە لە زۆر گۆشە و کەنارەوە ناتوانیت بگەیتە ئەو وڵاتە شاخاوییە، لەوێدا، کلدان و ئاسوورییەکانی تێدابوو، کە لەبەر خێڵە کۆچەریەکانی تەتەرەکان لە سەرەتای سەدەی پانزەیەمدا هەڵهاتبوون و لەناو خێڵە کوردەکاندا پەنایان درابوون. لەوێدا لەناو شیو و دۆڵە دڵگیرەکانی سەرتدا نیشتەجێبوون و زۆریان لەناو کوردەکاندا بوون بە موسڵمان. ئەوانی تریش بەرلەوەی خوێنڕێژی لە نێوان هاوڕەگەزانیاندا بەرپابێت لە سەرت هەڵهاتن، کە وردە وردە ئەو هەڵچوون و ئازایەتیە لە کوردەکانەوە فێربوون، چونکە ئەو هەڵوێستە لە پێشینانیان لە شار و دەشتەکاندا نەبینراوە و زیاتریش پاڵیپێوەنان بۆ ناو شاخەکان. لەم دواییەدا گوندی (خوسراڤا- خوسراوا) دامەزرا، کە ئێستا شارێکی گەورەیە، لەسەردەمی هەڵهاتنی کلدانەوە، یان سەرهەڵدانیان لە دۆڵەکانی سەرت، لە دەوروبەری 1780ز ناونرا نیکۆلای.

ئەم روونکردنەوەیەی من لێردا لە بارەی دەستەڵاتی دانیشتوانی خوسراواوە دامناوە، وەك خۆی بەجێیدەهێڵم و بەبێ سەرنجێك، بەهەرحاڵ، شاری سەلماسی هاوسێ، لە سەردەمی پێش ئیسلامەوە سەرۆکی قەشەکانی کلدانی لێبوو، بێگومان ژمارەیەکی زۆر کلدان لەو ناوەدا بوون، بەڵام ژنیان لە ئەرمەنەکان لەو ناوچەیەدا نەهێناوە. زمانی ئەو ئاسوورییانە، کە زۆرجار پێیدەوترێ (سریانی نوێ، یان ئارامی) ماوەتەوە و قسەی پێدەکرێت، لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا بە زمانی مەسیحیەکان

دەناسرێت، لەناو بەشێکی گەورەی موسڵمانەکانی دانیشتوانی دەشتاییەکانی سەرت، کە لەگەڵ ئەوەی بە خۆشیان دەڵێین کورد، بەڵام لە بنەچەدا کلدانین. وەکو دووان لە ناسیاوە نوێکانم، پیرەکەیان و گەنجەکەیان. هاوڕێ تایبەتیەکەم، لەگەڵ ئەوەی کە زارەکەشی دەزانی و لە گوندی شاخەوە هاتووە و لەگەڵ ئەوەشدا زۆر شتی تریش ئەوەی دەسەلمان کە کوردە، ئەویش لە روخسار و ئاکاریا دەبینرا. بووین بە دوو هاوڕێی زۆر باشی یەکتری و زۆر هاتوچۆی بازاڕی ئورفەمان پێکەوە کرد، گاڵتە و گەپی بە یەکێ لەو چوار زمانە هەمیشە لەسەر زمانی بوو، کە دڵنیایکردبوو لە هەموو شوێنێکدا پێشوازی لێدەکرێ. مەیلم لەگەڵ جگەرەی کوردیدا نوێ بووەوە، کە وامدەزانی جۆرێکی دەگمەنە. بێگومان بە فرمانی پێداویستی شێوازەکە بەرەوپێش چوو، بەرهەمهێنانی توتن لە کوردستاندا هەرگیز ناکرێ لە جگەرەی ئاساییدا بپێچرێتەوە. لە جیاتی ئەوەی بیپەستنەوە و بە شێداری بیپارێزن و ئینجا گەڵاکە بگەنەوە، کورد وشکی دەکاتەوە و هەڵیدەوڵێت تا ورد دەبێت، کە ئەوە بۆ جگەرەکێشی سەرەتایی کارێکی ئاسان نییە جگەرەی لێ بپێچێتەوە. دواجار جۆرە کاغەزێکی تایبەتیان پەیداکرد، کە هەلی کاری بۆ سەدان ژن لە کارگەکانی دیاربەکر و موسڵدا رەخساند.

کاغەزەکەی لە کاغەزی ئاسایی جگەرە ئەستورتر و رەقتربوو، دوو ئەوەندەش درێژتربوو، هەروەها لەو پاکەتەی کە تێیدا ریزکراون لە بۆری ئاو دەچن. پەڕە کاغەزێکی ئەستوور کە یەك گرێ پانتاییەکەیەتی ئەیپێچنەوە و لە سەری لای خوارەوە تەسکی دەکەنەوە و لە سەرەکەی تردوە توتنی تێدەکرێت و هەڵیدەتەکێنن تا توتنەکە بنیشێت، دوای ئەو کارە ئیدی لێواری کاغەزەکە بۆ ناوەوە دەشکێنرێتەوە تا پارێزگاری لە ناوەخنەکەی بکات. گەورەترین خەوشی ئەم جۆرە جگەرەیە ئەوەیە، کە توتنەکەی تەواو وشکە و وردە، لە کاتی کێشانیدا بەیەکەوە نانوسێن، لەبەرئەوە بەردەوام پریشکی ئاگری لێ بەردەبێتەوە. لێرە لە ئورفە شتێکی تر دەکێشن، ئەوەش دەزانم کە دەبێ لە ئەنجامدا لەگەڵی رابێم، من نیازم وایە جۆرە جگەرەیەکی شیاو بکرم، تا بتوانم زیاتر لەسەری بەردەوام بم. بۆیە سەرو خوارم پشکنی بۆ بەرهەمی (رەجیە)ی تورکی و لە ئەنجامدا دەرزەنێك پاکەتم پەیداکرد، ئەوەش هاوڕێ کوردەکەمی زۆر سەرسامکرد، ئەمەش تەنیا شتێکە کە نرخەکەی دیاریکراوە و هیچ سەواو مامەڵەی نییە، هەروەها لەبەراوردا لەگەڵ جگەرەی خۆماڵیدا تەواو گرانە. ئەوانەی کە من کڕیومە بیست جگەرەی بە سێ پێنسە — هێشتا دوو ئەوەندە یان سێ ئەوەندەی نرخی جگەرەی کوردییە. کڕینی ئەم شتە گرانبەهایە لەناو ناسیاوەکانمدا نازناوێکی

ئەفەندی پێبەخشیم و ئەو نازناوە لێم نەبووەوە تا چوومە ناو سنوورە شاخاویەکانی ئێرانەوە. دوو ڕۆژ لە ئورفە ماینەوە و ناسیاوە تازەکانی خەڵکی سەرتیش زیاتر مانەوە، هەروەها لە دەرچووندا خوداحافیزیم لێکردن تا دیاربەکر، لەوێش دووبارە یەکترمان بینییەوە. ڕێگای دیاربەکر لە ئورفەوە بە ناوەندی چیاکانا تێدەپەڕێت، کاراجا لە باشووری ڕۆژهەڵات و زنجیرە بەرزەکانی کوردستان بەرەو باکووری ڕۆژئاوا، کە سەردەمانێك بەرودوا لەلایەن ڕۆمانەکانەوە پێیان دەوترا (ماسیوس) و (نیفاتیس). لە زۆر شوێندا شوێن پێکان یەکێکیان دەیبردین بۆ نزیك ڕووباری فوڕات و ژمارەیەك دۆڵ دەبڕێت و بەرەوخوار بەناو ئاودڕەکاندا شۆڕدەبێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی وڵاتەکە بەدرێژایی ڕێگاکە بەرزایی زۆر گەورەیە، بەناویدا باو بارانێك دێت، کە بەخێراییەکی تیژڕەو و ساردییەکی جەرگبڕ. لەوبڕوایەدام ڕێگاویان لەنێوان (سەڤەریك) و دیاربەکردا، لە دیسەمبەر/کانونی یەکەمەوە بۆ فێبریوەری/ شوبات مەحاڵە، بە دڵنیاییەوە کاتێ لە نیسانێکی زوودا ئێمە بەوێدا تێپەڕین، پەڵە بەفرێکی زۆر کەوتبوو، کە زۆر دوورنەبوو. ئەو دیمەنە هێجگار زۆرە، هەمیشە دڵتەنگە، هەرچەند ئاو چنگدەکەوێت لە هەر یەکێ لەو کەلەبەرانەی لەو دەشتودەرە فراوانەدا هەیە، لەگەڵ ئەوەی کە خاکەکەشی تەواو بەپیت و بەرەکەتە، بەڵام نەفرەتی تورك لەسەر خاکەکەیەتی. لە ماوەیەکدا، زیاتر بەلای باکوردا، مرومۆچە، شوێنی کۆمەڵگای شاخەکانی کوردستان، لەم کاتی ساڵەدا، کە لەژێر تارمایی هەوری ڕەشدا خۆی حەشارداوە. بەرلەوە و لەدوای ئەوەی دەشتە بێ سنوورەکان وردە وردە بەرەو ڕۆژهەڵات بەرزدەبوونەوە، تا لە بەرزترین خاڵدا کەسێك سەیری خوارەوە بکات لەسەر بیابانەکە هەستێکی سەیر شەپۆل دەدات لە وێرانە و کاولکاری تەواودا، لە باو باران و بەفر نەپارێزراوە، هەروەها لە فراوانی بێدەنگیدا وەك مەرگ لە زیندانیەکی هەمیشەییدا. ئەم دەشت و چیاییانە هەر لە سەرەتاوە سنووری سروشتی و رامیاری خاکەکانی باشوور و باکوور بووە. ئەو کۆمەڵە چیا بەرز و تاریکەی لەسەر باکورە- پێویستە پێبووترێ (نیفاتەس)، لەو ڕۆژانەوە ناوە گشتیەکەی خۆی ونکردووە- ناوی تیری لە دیجلە ناوە.[7] لەودیو دیواری شاراوەی سەر خاکی پڕ لە نهێنی ئاپریەکان، کە پاشایانی ئاشووری مەزنتر لە هەر یەکێ لە نەوەکانی خۆیان، سەرکەوتوبوون لە زاڵبوون بەسەریاندا، یان بە پێویستیان دەزانی کە جارجارە تەمێیان بکەن. گەورەترین شتێك کە شانازی مەلیکەکانی ئاشووری بوون لە سەردەمانی پێشوودا،

---

[7] ناوی دیجلە کە لە مێژوونوسی ڕۆژئاواییان وەرگرتووە، لە وشەیەکی میدییەوە وەرگیراوە (تایگریس) و لە زمانەکانی فارسی هاوچەرخ و کوردیدا بە تیر ناودەبرێت.

# ڕێگاوبانی تورکیا

ئەوە بوو کە خاکی ئایرەیەکانیان داگیرکردووە و زاڵبوون بەسەر مەلیکە گچکەکانیدا. دوای ئەوەش، خاکی ئایرە پێیدەوترا (گۆردینە) واتە کوردیان یان کوردەکان، ئەزیاد و نەکەم، ئەو ڕاستییەی پشتگیری داوای کوردەکان دەکات لەوەی کە ئەم خاکە بە خاکی خۆی بزانێت، ئەوەیەکە لە لەدایکبووی یەکەم ئارییەوە لەو کاتەوە لە ناوەندی ئاسیاوە هاتۆتە ناو خەڵکی ڕۆژئاواوە. لێرەدا داگیرکەرانی ڕۆم و پارساییەکان(باشکان) و یونانیەکان گەڕانەوە و جارێکی تر بەرەنگاری دەشتی کاکی بەکاکی بەرزونزمی ناوچەکە بوونەوە. لاکانی ئەو شاخە تاریك و پەستانە تێکشکانی سوپای هەموو نەتەوە مەزنەکانی ڕۆژهەڵاتیان بینیووە، ئەوە جگە لە ئاشوور، بینیونی کە بۆ زۆر دوور بەرەو باشوور و ڕۆژئاوە کشاونەتەوە و بێ هیوا بوون لە دەربازبوون بە وڵاتی (گۆردیینە) دڕەکان، کە ئەمڕۆ کوردەکانی ئەوەیان ناکرێ بڵێین دڕندەن. سەیر ئەوەیە ئەم نەتەوە خۆڕاگرە، کە ناوەکەی لەپاڵ شۆڕش و ئازایەتی و گیانی یاخی بووندا دێت، کەچی هەرگیز ئاستی لە پاڵ ئەو نەتەوانەدا نەبووە کە هەرگیز سەری بۆ شۆڕ نەکردوون. ئەوانە لە میدەکان نین، وەك ئێمە وامان هەستدەکرد لەوان بن، لە مێژووشدا بە پەرۆشەوە مافی ئەوەیان نەبووە ئەوە بڵێن، بەهەرحاڵ ئەو کوردە ڕۆژئاواییانە ئەوەیان نەکردووە، وەك هەمیشە ماونەتەوە و نابەزن و نابەزن، شانازی بەخۆیانەوە دەکەن و ملکەچ نین، ئەوان دواکەوتوی کێشەی نێوان خۆیانن و ئەو دەوڵەتانە دەبوغزێنن کە بەناو فرمانڕەواییان دەکەن. ئەوان لەناو شاخەکانیان و بە زمانە کۆنەکەیانەوە دڵنیان لە مانەوەی خۆیان، هەرگیز واز لە پێکەوەژیان ناهێنن و پێویستە ڕۆژئاواش ئەوەندە نەیانخاتە ژێر فشارەوە. لێرەدا دەرچوون لە سنووری بابەتەکە هیوادارم ڕێپێدراوبێت، ئەویش بەهۆی نەبوونی ئەو وردەکاریانەی شایانی تۆمارکردنە لەبارەی ڕێگەکەوە لە ئورفەوە بۆ دیاربەکر. جگە لەوەی لە نیوەی یەکەمدا بۆ ماوەی دوو ڕۆژ باسی بلیمەتە شەیتانیەکەی چەند ئەندازیارێکی تورکیم بۆ کردن، کە چەند تەختە بەردێکیان بەو ناوەدا بڵاوکردۆتەوە و ناویان ناوە ڕێگا، هەروەها بە ئەستووریی سێ پێ قوڕیان کردۆتە ناو خاکێکی زۆنگاوەوە و ئەویشیان ناوناوە ڕێگا، ئەو جۆرە ڕێگایە شایانی لێدوان نییە. هەروەها تەنیا یەك وێستگا هەیە کە پەیوەندی بەو ڕێگایەوە بێت، ئەویش (سوڤرێك)ە. بەگەڕانەوەم بۆ تێبینیە تۆمارکراوەکان، هەستم بە دوو شت کرد کە سەرنجیانڕاکێشام، کاتێ کە لە شارۆچکە پیسوپۆخڵەکانی ئەم دەشتە نزیك بوومەوە. یەکێکیان ئەو بینا چوارگۆشە سپییە بوو، لەگەڵ ڕیزە پەنجەرەی شوشەبەند بە چواردەوریدا، داڵانێك لە دەرگای پێشەوەیدا هەبوو، هەروەها

بەیداخێکی تورکیشی بەسەرەوە بوو. ئەوە ماڵی بەرپرسی حوکومەت بوو، وەکو نمونەیەکی ئەندازیاری ئەورووپی کراوە، دوورەپەرێز، لەو چواردەورە بچووکەی کە گرنگیەکی هەڵبەستی پێداوە، ساردوسڕیی لێدەردەپەڕی، تەنگ و چۆڵ و تا ئەوپەڕی ناجۆربوو لەو دیمەنە فراوانە لە گرد و دەشتی ئەو ناوە. دووەمیش گردەکەیە، کە بە چەشنی گردەکەی ناو حەڵەب، ماڵی پارێزگار و بە درێژای بیست سەدە لەوەبەر فرمانڕەوایان لەوێدا دایاننناوە، بۆ توانا و بۆ راستی، کە وڵات لەوانەیە هەناسەی شادمانی هەڵکێشت، کاتێ دەستی بەهێز لە رابردووی مەزندا لە کاردا بووە و لەم رۆژگارەدا بە کەم دێتە بەر چاو.

سوڤرێکی هاوچەرخ شارێکی مامناوەندیە و خانووەکانی لە یەك نهۆمە و بە بەردی رەش دروستکراون، دانیشتوانەکەی بریتیە لە کورد و ئەرمەنی، کە بە بڕوای من ئەو دوو رەگەزە هەمیشە نێوانێکی نارێکیان هەیە. هیچ شەقامێکی تێدانییە، کە ئێمە بیزانین، کوخەکان پێکەوە کۆبوونەتەوە و کۆڵانەکان بە پیس و چەپەڵی جێهێشتووە. گەشتیاران بە ناچاری دەبێ لە کاروانسەرا وێرانەکەدا بمێنێتەوە، کە خۆشبەختانە لە دەرەوەی شارەکەدایە و دەرگای حەوشەکەی بەسەر بیابانەکەدا دەڕوانێت. خەڵکەکەی تا بڵێی گرژومۆن و رەفتار ناشیرینن و لەگەڵ قەوارەی شارەکەشدا کەچی شتێکی ئەوتۆی بۆ کڕین تێدا دەستناکەوێت. کاتێ گەیشتینە ئەوێ بە ئاسایی هەموو شەکرەکەم تەواو بووبوو، هەروەها، ژوورەکەم بەسەر ژنێکی عەرەبی بەساڵاچوودا بەجێهێشت کە لە گۆشەیەکدا لە دەرەوە بینیم، ئیدی چووم بۆ گەڕان. یەکەم پرسیار لەو ئەرمەنییەی کە دەرگاوان بوو، ئەوە بوو ئایا دوکان لەم ناوەدا هەیە. ئیدی کەوتمە ناو ئەو قوڕەوە و دواجار دوکانێکم پەیداکرد. کوشکێکی کراوە بوو- کە لە رۆژهەڵاتدا دوکانەکانیان لەو جۆرەیە- ئەوەی پێویستم بوو لە چاوتروکانێکدا سێ شت بوو، کوڕێکی بچکۆلەش لەگەڵ تانجییەکدا گەمەیان دەکرد. لە پشتی رەفە لێژەکانەوە، کیسەیەك بەردی لێبوو، لەم ناوانەدا پێیدەڵێن پەنیر، هەرچەند پەنیری ساڵی رابردووە زۆر بەتام و چێژە و تازەکەی بێزی لێدەکرێتەوە. دوو دەسك پیاز و چەند بۆکسێك شقارتەم کڕی و ئیدی بازاڕییەکە تەواو بوو. پانتۆڵەکەم هەڵکرد و بەناو کۆڵانەکەدا بەرەو ژوور رۆشتم، منداڵانی ئەرمەن خۆیان لە قوڕی ناو کۆڵانەکە هەڵکێشا بوو، کە ململانێی مافی تێپەڕینیان لەگەڵ کوردە چەکدارەکان دەکرد، لە کۆتایدا لە دەوروبەری مزگەوتێك خۆم بینییەوە و مەلاکە ئامبازم بوو، لەبارەی ئایینمەوە پرسیاری کرد و وەڵامەکەی وەرگرتەوە "موسڵمان"، هێشتا بە گومان بوو، بۆیە داوایکرد بۆی دووبارە بکەمەوە، کە بۆ دڵنیایی ئەو ئەوەشم کرد و وەك

ڕێ پێشاندەرێك بەكارم هێنا و بە یارمەتی ئەو دوكانێكی شێوەی ئەوەی پێشوم دۆزییەوە، كە خاوەنەكەی زیاتر كارامە بوو، دەركەوت نەك هەر شەكری بە نرخێكی خەیاڵی دەفرۆشت، بەڵكو چا و جگەرەشی هەبوو. هەروەها نانیشم پەیداكرد، بەڵام لە ڕێی نێت باشیی و بەزەیی مەلاكەوە بەم حاجییە غەریبەدا، بردمی بۆ ماڵی كەسێك كە بە تەندور لە زەویدا نانیان دەكرد و دە نانی بە دوو پێنس بۆ كڕیم. خۆشبەختانە ئاوی خواردنەوە لە حەوشەی كاروانسەراكەدا هەبوو، كە دەڕژایە حەوزێكی دیوار روخاوەوە. هەمووی ژنانی كورد بوو دەهاتن بۆ سەر ئاوەكە، منیش سەعاتێكم بە دانیشتن لەسەر پلیكانەی دەرگاكەدا بەسەربرد و چاوم بۆ كیژێكی ناشیرین دەگێڕا و هیچم نەبینی. بۆ بەیانی دووچاری كێشەیەكی گەورە بووین، كابرای ئەرمەنیی خاوەنی شوێنەكە داوای مەجیدییەكی (3س. 4د.) لە عارەبانچییەكە دەكرد بۆ ئالیكی وڵاخەكە و ژوورەكەی من كە بەدرێژایی شەو ئاو بەسەرمدا دەهاتەخوارەوە. یەك سەعاتمان لەم كێشەیەدا لەبەر دەرگاكە بەسەربرد. نیو دەرزەن ئەرمەنی خۆیان بە سەرو گەردنی ئەسپەكاندا هەڵواسیبوو، كاتێ ئێمە هەوڵمان دەدا لە دەنگە دەنگ و هاواری خاوەن شوێنەكە رزگارمان بێت. دواجار ناچاربووین ئەو پارەیە بدەین، یا لەوی بمێنینەوە، هەروەها تەنیا یەك شت دڵخۆشكەرە، ئەویش ئەوە بوو كە پارچەیەك پێنج قرۆشی قەڵبمان دایە لە جیاتی لیرەیەك. ئیدی دووركەوتینەوە، نەفرەتمان بەگشتی لە مەسیحی و وەسەنی دەكرد و ئەرمەنیش بەتایبەتی. بۆ ڕۆژی دوایی دەشتە بەرزەكانمان بەناو بیابانی گەرمدا بەرەو دیاربەكر بڕی. هەر كە نزیك بووینەوە، دیوارە رەشەكان لەسەرو ئاسۆوە بەرزبوونەتەوە و جارجارەش كەلەبەرێك دەبینرا كە ڕووباری دیجلەی لێوە دەردەكەوت، هەروەها ڕووی بەردە رەنگ زەردەكان لەبەرامبەر رەنگی تاریكی دەشتەكەدا پێشان دەدات. نزیك بوونەوە لە ڕۆژئاواوە، دیاربەكر نە جوانە و نە سەرنجڕاكێشەرە. لە ناوەندی بیابانێكی گەورە و هەروەها ڕووبارێكدا، كە بە بەردەكانی كەنارەكە شاراوەتەوە، دیاربەكر وەك قەڵایەك لە بەردی رەش دەردەكەوێت، بەبێ سەوزایی یان دارودرەخت. دیمەنی زیاتر باری سەرنجی نوێت دەداتێت لەبەرامبەر دیدی یەكەمدا، لە داوێن و خاكی كەنار ڕووبارەكەدا پڕ لە باغ و باخچەی رازاوەیە، كە لەم مانگی نیسانەدا بەرگی ئاڵووالایان پۆشیوە و چرۆ و گەڵاو گوڵی نوێیان دەركردووە. ئەو چاو هەڵخەڵەتانەی بەسەر ئەم شارەدا دێت ئەوەیە، سەیری سەرەوە بكە و بەرەوخوار بۆ ڕووبارەكە بڕوانە، شتێكی ئاساییە كە لە ڕۆژئاواوە بەدی ناكرێت چونكە دید بەرەنگاری تیشكی خۆر دەبێتەوە، وەك وای لێكردین نەیبینین. عەرەبانچییەكەم پێیوتم كە پاسپۆرتەكەم ئامادەبكەم، چونكە دڵنیایكردم لەوەی

# كێشەی پاسپۆرت

کە ناهێڵن بە دەروازەی دیوارەکاندا تێپەڕین ئەگەر بەڵگەنامە پێشان نەدەین. بۆیە منیش پاسپۆرتەکەم دۆزییەوە و ئامادەمکرد- ئەو بەڵگەنامەی تاوانبارییە، بەیانی ئینگلیزی بوون و لەدایکبووی بریتانیا و مەسیحێتیم دەکات. لە ناوەوە دەستمکرد بە تەتەڵە و بێزنگی ئەوەی کە چۆن حاجیەکی کورد دەستبکات بە پرسیارکردن لە عارەبانچیەکە، کە تا ئێستا زۆر دەربڕینی ئیسلامی و باوەڕی پاکم بەکارهێناوە، لەگەڵ ئەوەی وەك گەشتیارێکی ئاسیایی خۆم دەرخستووە، کە دەمزانی سوێندی بە ئیسلامیەکەم دەخوارد. تەنیا ئەوەش نا، بەڵکو پۆلیسیش هەرگیز بەدڵنیاییەوە باوەڕناکات کە من ئەورووپی بم، ئەویش بەهۆی شێواز و ئەو تەنیا زمانی کوردیەی کە دەیزانم، بەڵگەی دڵنیاکەری ئەگەری ئاوایە. ئەوە ئەوەنیە کە من لێیدەترسم ئەگەر بیدۆزنەوە، بەڵام لەوە دەترسم تۆمەتبارم بکەن بەوەی کە پاسپۆرتی کەسێکی ترم دزیوە، کە ئەوەش تاوانێکی زۆر گەورەو گرانە. پاسپۆرتی ئینگلیزی پەیامنێرانی ئەورووپی تۆزێ یارمەتیمدەدا لەناو ئەو خەڵکەدا کە بە دەگمەن ئەورووپی لەم ناوەدا دەبینرێن، ئەوە کەسانی ئینگلیز هەر زۆر دەگمەنە لە سەردەمانی رابردووەوە و هەرگیز لەم شێوە خۆشاردنەوەی منیشدا نەبووە. هەروەها کەشوهەواش شتێکی کرد بۆ خۆشاردنەوەم، لە راستیدا من بەهۆی خۆر و هەواوە رەش داگەڕابووم، ریشێکی رەش کە نۆ رۆژ بوو نەتاشرابوو، سەرسنگ داقلیشاو بەهۆی کەم دوگمەیی کراسەکەوە. هەروەها پانتۆڵەکەم قوڕاوی و دڕاوە و پاڵتۆیەکی هاودامانم بە چەشنی کەوای تورکی لەبەردایە، کە تۆزێ لە بەرگی ئەورووپی دەچێت. هیچ شتێکی تر نەبوو بیکەم، بەهەرحاڵ، کەس ناتوانێت لە دەرەوە لەو دەشتەدا بمێنێتەوە و ناشتوانێ بێ ئەوەی بیبینن بچێتە ژوورەوە، ئیدی ئێمە لە دەرەوەی دەروازەکەی ناو دیوارە گەورەکان لە خاڵی پشکنینی پۆلیسداین و بەرپرسێك داوای پاسپۆرتەکەی منی کرد. منیش دامێ و هەناسەی خۆم گرت. عارەبانچیەکە کە ئەم کارەی بۆ هەزار جار بینیوە و هیچ گرنگیەکی پێنەداوە و هەڵی قۆزتەوە و دابەزی بۆ کڕینی هەندێ جگەرە لە دوکانێکی نزیك. ئەفەندیەکە، کە مەدەنیەکی نائاسایی بوو، لەو بارودۆخەی ئەودا، لێیپرسیم لە کوێوە هاتووم و بە کام رێگادا و بۆ کوێ دەچم. ئەوەی بیست کە بەرەو موسڵ دەچم، لەوە دەچوو گرنگی پێنەدات، بەڵام دەفتەرێکی بەریاخەڵی دەرهێنا و ئامادەبوو بۆ تێبینی نووسینی تەواوی پاسپۆرتەکەم، هەستمکرد پاسپۆرتەکەی سەرەوخوار گرتووە و هەندێ نیشانەی لە دەفتەرەکەیدا دانا کە

نەدەخوێنرایەوە، ئیدی زانیم هیچ هونەرێك لە پاسپۆرت پشکنینی ئەستەنبوڵدا نییە تا تاوان بنێتە پاڵم، چونکە ئەو تەواو نەخوێندەوار بوو.

ناوەکەمی پرسی و هێشتا ئەگەری مەترسی هەیە، ناوەکەی خۆم زۆر بە گرانی بۆ دووبارەکردەوە، کە ئەو بە (عەلی سۆن) وەریگێڕا، دوای ئەوە هەموو کاروبارەکان ئاسایی بوو، چونکە وای دادەنێت کە حاجی بووم، کە عارەبانچیەکە ویستی دڵنیابێت و منیش پێموت کە لەژێر سایەی بریتانیادام و لە راستیدا لە ئێران لەدایکبووم، ئەو زانیاریانەم دا بە عارەبانچیەکە، بەم جۆرە بە شێوەیەکی پڕ رەوشتەوە رۆژەکەمان بەسەربرد.

# بەشی چوارەم
## بە دیجلەدا بەرەوخوار بۆ موسڵ

دیاربەکر لە یەکەم بینینیدا شتێکی ناوێزە و سەیری تێدا بەدی دەکەیت، کە شارێکی تا بڵێی خاوێن و گەش، جەنجاڵ، لەگەڵ شەقامە نائاساییەکانی کە لە ڕۆژهەڵاتدا چاوەڕێ ناکرێت، بازاڕێکی زۆری هەیە، هەرچەند وەك شارەکانی تری ڕۆژهەڵات، سەریان نەگیراوە، بەڵام زووربەی دوکانی بێ جامخانە بەڕیز لە ڕێگاکاندایە. دوو ڕێگای سەرەکی، شارەکە بە گۆشەیەکی وێستاو دەبڕێت، لەگەڵ دەروازەیەك لە هەر سەرێکیەوە و هەموو لایەکی بە دیواری بەرز دەورەدراوە، کە لە (بازلت) دروستکراوە و لەم شێوەیەی ئێستایدا لەلایەن (جەستیەیان)ەوە بیناکراوە. لەوە دەچێت دانیشتوانەکەی بەشی زۆری کورد بێت، مرۆڤی شاخاوی بە لەشولاری گەورەوە، لە باکوور و ڕۆژهەڵاتەوە، لەگەڵ کڵاوبۆرگەی لبادی قوچ، وەکو ئەو فارسە کۆنانەی لە پەیکەرتاشیەکانی ساسانیەکاندا هەیە، هەروەها چاکەتی فەروو لە پێستی مەڕ، کە توکەکەی رووی بۆ دەرەوەیە و کەوشی سوور بە شیوەیەکی جوان جلوبەرگەکەی ڕازاندۆتەوە. دیمەنی شەڕەنگێزی کورد کە هەمیشە دەنوێنێت، ناسکی ئێسکی روخساری و هەنگاوی درێژ، دەیکاتە مرۆڤی شاخاوی، کە لە ئاسایش و هێمنیدا دەڕوات، ئەگەر شەقامێکی جەنجاڵ بوو، ئەوا دەستی لەسەر تفەنگەکەی و خەنجەرەکەیەتی. لە کاروانسەرایەکی دوو نهۆمیدا، لە نزیك دەروازەی باکوورەوە دابەزین، شوێنێکی خاوێن و بەرفراوان، لایەکی پەنجەرەی شوشەبەندە و یەك، یان دوو کورسی و مێزێکی تێدایە. ئەمە بۆ حاجیە کوردەکان نەبوو، بەهەرحاڵ منیش بە سادە و ساکاری ژوورێکی سەرەوەم وەرگرت، سوپاسگوزارم کە پەنجەرەیەکی تێدایە و دەتوانم ئەفەندی لە حەوشەکەدا ببینم، کاتێ دەچێت بۆ ژوورە ئەوروپیانەکەی. لەناو ژوورەکەدا بەڕەکەم ڕاخست و پێخەفەکەش بە سەریدا، (لایەنێکی نایابی تری ئەم وڵاتە ئەوەیە کە ناوفەرشی نهۆمەکان لە قوڕە)، ئیدی شوێن عارەبانچیەکە کەوتم، تا لە قاوەخانەیەك پیاڵەیەك چایی بخۆینەوە و دووچاری سەرئێشەی پرسیاری ئەو خەڵکە نەناسراوە بین.

قاوەخانەکە وەکو کایەن، یان گەنجینەی دانەوێڵە وابوو، شوێنێکی گەورە و ڕەشداگەڕاو بە دوکەڵی نێرگەلە، کە لە ژمارە نەدەهات و برێ قەنەفەی پانی تێدا دانرابوو، بۆ دانیشتن ئەوەندە بەرزبوو کە بە ئاستەم قاچێك دەگەیشتە سەر زەوی. بەهەرحاڵ ئەوە بۆ ئەوە دروستکراوە کە بە چوارمەشقی لەسەری دابنیشیت.

# پزیشکی دوپشك

شوێنەکە زۆر جەنجاڵ بوو، ئێمە دەبووایە خۆمان بخزانایە بەینی دووانەوە تا شوێنی خۆمان دەکردەوە، من خۆم لە تەنیشت پیاوێکی ئایینیەوە بینیەوە، کەسێکی زەرد لە عەبایەکی هاوداماندا، کە نیشانەی پیاوی ئایینیە و عەمامەیەکی سەوز، ئەویش نیشانەی سەید بوونیەتی، یان لە نەوەی پێغەمبەرە. کە دەچیتە ژوورەوە دەبێ سڵاو بکەیت و زۆر بە ئەدەبەوە بڵێیت (سەلامون عەلەیکم)، دانیشتووەکانیش بەرلەوەی ئێمە دابنیشین بە دەنگێکی ئاوازدار وەڵام دەدەنەوە و دەڵێن (وە عەلەیکومە سەلام). ئیدی زۆر بە پەلە یەکەم پرسیار هات. "لە کوێوە هاتویت؟ بۆ کوێ دەچیت؟ چ نەتەوەیەکی؟ بۆ دەچی بۆ سەفەر؟ " منیش وەڵامەکەم بەپێی ریزی پرسیارەکە رێکخستبوو" لە حەڵەبەوە بۆ کوردستانی ئێران، موسڵمانی شیعەم، دەگەڕێمەوە بۆ وڵاتی خۆم". ئەوەم بە زمانی کوردی وت، چونکە کابرا تورکی نەدەزانی، کە کەمتر بڵاوبوو، ئێمە بۆ رۆژهەڵاتی دوور چووین. خۆی عەرەب بوو، دانیشتوانی موسڵ، لە ناوچەیەکی ئیسلامیەوە، کە زانست و ئاین لە یەك جیانابنەوە، قوتابی ئایینی دەبێتە پزیشك و پارێزەر و دادپرس. ئەو پیاوە ئایینیە کەمێ پارێزەری دەکرد و جۆرێ لە رزق و رۆزی لەرێی چارەسەری کێشە و ناکۆکیەکانەوە پەیدا دەکرد. بۆیە کاری دەرمانکردن و چارەسەرکردنی پێوەدانی دووپشکیشی بۆ خۆی زیاد کردبوو، بەهۆی ئەو رۆنەوە دەیکرد، کە لە دووپشکی رەشی دەردەهێنا. دەمەتەقێ لە بارەی ئەو زانستەوە بوو، قوتویەکی جگەرەی دروستکردبوو، یاری بە سەرقاپەکەی دەکرد، وەك یەکێ بیەوێت قسەکانی تەواوبێت پێش ئەوەی جگەرەیەك پێبکات. وتووێژی لەبارەی دووپشکەوە تەواوکرد و بەکەمتەرخەمیەوە قوتوەکەی کردەوە، بۆ پێشاندانی دوو دووپشکی گەورە کە لەناو قوتوەکەدا قاچە شاخیەکانیان لە قەراغی تەنەکەی قوتوەکە گیرکردبوو. یەکێکیانی هێنایە دەرەوە، گوێی نەدا بەوەی کە بە تورەییەوە دەدا بە پەنجەیەوە، لێیگەڕا برِوات بەسەر قوڵیدا، هەڵیگرتەوە و خستیەوە ناو قوتوەکە، زەردەخەیەکی بە رومدا کرد، بە دەمێکی بێ ددان و شەڕەنگێزییەوە، ئیدی لە کورسیەکەوە خۆی خزانە خوارەوە و قاوەخانەکەی بەجێهێشت. عارەبانچیەکەم سەیری ئەو دیمەنەی دەکرد، ئەو پیاوەکەی باش دەناسی، وتی: ساڵانێکە لە دیاربەکر ئەو کارە دەکات، هەمیشە دووپشکی رەشی باش، دانەی دەکڕێت بە چوار پێنس و 10 دڵۆپ لە رۆنەکەی دەداتەوە بە یەك مەجیدی.

## دیاربەکر

ئەو کارە دەگمەنەی لەگەڵ دوویشکی زیندودا دەیکرد لەوانەیە لە ئەنجامی پیشەوەرییەوە فێریبووبێ، کاتێ دوویشک راودەکات، بە مەقەستێك چزووەکەی لای کلکیەوە دەقرتێنێت، زۆر گورجوگۆڵ بوو، هەست و سۆزی لە قوڵایی دڵەوە لە هەوای دیاربەکردا، کە سەرسامی دەکرد.

کاتی بەهارێکی نوێ هاتووە و پلەی گەرما لە پلەیەکی مامناوەندیدایە، کە مرۆڤ لە باشترین بارودۆخیدا لە تەختاییەکانی میسۆپۆتامیادا هەستی پێدەکات، کە بە پەلە ژیان دەڕوا و بەهێزترین کەس لاواز دەکات لە میانەی وەرزی هاوینی دوورودرێژدا. قاوەخانەکە جەنجاڵ و سەرقاڵ بوو، کوردەکان لە شاخە بەفراویەکانیانەوە بۆ کڕینی جلوبەرگی هاوینە هاتونەتە خوارەوە، ئەرمەنیەکانیش کە دەسترەنگینەکانی ناو دیاربەکر بوون، خۆشحاڵ بوون بە ماوەی بەرگری و حەسانەوە لەو دەستدرێژییەی کە هەمیشە لە ئارادایە. شەقامی فراوانی شارەکە، کە رێ بە هەتاو و شنەی با دەدات، سازگارییەك لەم وەرزەدا دەبەخشێت، کە زۆر لە شارۆچکەکانی تر ئەمەی نیە، چونکە سەرەتای بوون بە بەردی قوڕی زستانە لە کۆڵانە تاریکەکانیاندا. نزیکترین هەڵم قۆستەوە تا لە دەروازەی بەشی باکورەوە بچمە دەرەوە، کە لە دەرگای کاروانسەراکەوە چەند مەترێك دووربوو، بۆ گەڕان و بینینی بەردە ناوێزەکانی ناو دیوارەکە و ئەو بەردانەی وێنەی پەلەوەر و گیانداری دڕندەی تێدا کراوە، لە پاشماوەی ئەو دیوارەی بەدەوری شارەکەدایە لە چەرخی پێش سەردەمی مەسیحەوە کراوە.

بەڵام لەگەڵ هەموو ئەو بەڵگە گرنگانەدا، لەگەڵ گۆڕانی تاوەرەکانی کەنیسە کۆنەکە بە منارە، زەنگەکانی کە بۆ پەرستنی فەلەیی لەکاتی بانگەکەیاندا بەکاردەهێنرا، ئێستا گۆڕا بە شوێنی بانگدان بۆ خواپەرستی، رۆمانەکان دواتر حوکمی زیاتریان لە شارەکانی تری رۆژهەڵات کردووە و مەسیحییەت لەم ناوەدا بڵاوبووە، تا ئیسلام لەسەر شانی عەرەبەکانەوە لە باشوورەوە گواستراوەتەوە بۆ ئێرە و ئەوانیان بەدەرناوە و دەستیانگرتووە بەسەریاندا، لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا، دیاربەکر کەمتر لە تۆمارگە کۆنەکاندا دەرکەوتووە لەچاو زۆری ئەو گوند و گردانەی ئەمڕۆ بەڵایاندا دەڕۆن بێ ئەوەی کەس تێبینییان بکات. هەموو ئەو میللەتانەی بەم خاکەدا تێپەڕیون، بۆی جەنگاون و بوونەتە خاوەنی. ئاشوورییەکان ئەوەیان دەزانی ئەوە بە ناو نییە، هەرچەند ئەگەر ئەوە هەبوویێت، ئەوا یەك خاڵی سەرسنووری ئیمپراتۆریای عوسمانی بووە. ئەرمەن و فارس و باشکانیەکان و رۆمانەکان لەسەری جەنگاون، بەڵام تۆمارکراوەکان کەمێکمان لەو بارەیەوە

پێدەڵێن. لە سەردەمی مەسیحیەکاندا سەرکردەیەکی فارس بە ناوی کاواد (ساسانی) بە کردەوە لە 507 زایینیدا وێرانیکرد و لە 1124دا حەوت سەد کەس خافلکوژ، یان لە تایەفەی ئیسماعیلیەکان رەشەکوژکران. لە 1056دا کەوتە ژێر دەستەڵاتی تورکەوە، کاتێ توغروڵ بێگ کە لە نەوەی سەلجوقیەکانی پێشووە داگیریکرد. نە لەسەر رێی سەرەکی نێوان سووریا و بابل بوو، نە لەسەر رێگەی ئەورووپا بۆ ئێران، خانەخوێ داگیرکەرەکان و دوژمن بەزێنەکان دوور دەڕۆشت بۆ باشوور و شاری ئامەدیان لە گۆشەکەی خۆیدا بەجێدەهێشت، کە لە دەنگ و هەرای شەڕدا دەلەرزی و هەندێ جاریش وێران دەبوو. تیگران، یەکێکە لە گەورەترین مەلیکی باشکانە ئەرمەنیەکان، ئەو شوێنەی گرت کاتێ (گۆردینی) بۆ ئامادەکرد لەسەر سنوورەکانی باشووری و تا ئێستاش هەر لەوێدان، هەروەها کەمێ بەرەو باکووری ئەو شوێنە پایتەختێکی دروستکرد و گوێی نەدا بە گرنگیەکەی. شارەکەی ئێستا، وەك روونکرایەوە، چوار دەروازەی لە دیوارە زەبەلاحەکانیدا هەیە، بەڵام تورکەکان لە دیواری باکوریدا دەرگاکەیان گۆڕی بە دەرگایەکی بچووك و ناونرا (یەنجی قاپو- دەرگای نوێ)، هەروەها حاکمی تورك تاوانێکی کرد بەوەی مۆنۆمێنتێکی بۆ بتپەرستەکان کرد، بەوەش هەوڵیدا کە بنەڕەتی هەڵتەکێنێت، کە نە ئەو و نە ئەوانەی پێش ئەویش ناتوانن شێوەی ئەوە بکەنەوە و بەوەش سەرکەوتوبوو لە ناشیرینکردنی بەشێك لە دیواری باکووری. وێرانکردنی مۆنۆمێنتێکی ئاوا، بەهەرحاڵ سەلماندنی کارێکی زۆر گەورەیە بە مانای تێکدەر و وێرانکاری، ئیدی ئەو بێدەسەڵاتە و بە رێی هیچ و پوچی خۆیدا رۆشت. ژمارەیەکی کەم لە کەنیسەی کۆن هێشتا ماون، لەبەرئەوەی من لە بەرگی کەسایەتیەکی موسڵماندام، بۆیە قەدەغەیە تەماشایان بکەم. دانیشتوانی هاوچەرخ، جگە لە کوردەکان و عەرەبەکانی موسڵ، بریتیە لە مەسیحیەکان، کە جۆری زۆرتریان لە شارە ئاسیاویەکانی تری تورکیادا هەیە. ئەرمەنەکان زۆرینەن و هەموویان بەشێکی گەورە پێکدەهێنن کە سەرقاڵن بە بەرهەمهێنانی دەفری مسین، کە دیاریەکر پێی ناودارە. یۆنانیشی لێیە، کە پاشماوەی فرمانڕەوایی رۆمەکانە و دابەشبوون بەسەر سێ یان چوار تیرەدا، سریانی، یان مەسیحیە عەرەبەکان، کە خۆیان بەچاکی دەزانن وایان پێبڵێن، هەندێك کە سەر بە کەنیسەی سریانین و ئەوانی تریش سەر بە کەنیسەی کاسۆلیکن. هەروەها کلدانیشی تێدایە، ئەوەی کە جەخت لەسەر شکۆ و پایەی بڵندیان دەکەنەوە، بەوەی نەوەی نەبوخەزنەسرن، هەرچەند ئەوە (هەرگیز نەسەلمێنراوە)، هەروەها ئاشووریەکانی ئەم دواییە، کە قسەکردنیان بە زارێکی کۆنە و زیاتر لە زمانی نوسینە هەڵکۆڵراوەکان دەچێت وەك لە زمانی تر.

## مەسیحیە رەسەنەکە

ڕۆمانە کاسۆلیکەکان لەناو هەموو تیرەکاندا زیاتر سەرقاڵن، بە شێوەیەکی بەرچاو لەناو ئەرمەنەکان و کلدانەکانی ئەوێدا و ژمارەیەك لە هەردووکیان کە ئەمەکداریان بۆ پاپا هەیە. هەموو تیرەیەك- و کەس ناتوانێ بڵێ چەند لەوێدایە- هەندێ دڵنیان لەوەی کە ڕزگاریی تایبەتیان بەندە بە نەمانی هەموو تیرەکانی ترەوە و قین و بوغز بەجارێ ناوەندی ئەم مەسیحییانەی داپۆشیوە و بەسەر زووربەی جۆرەکانی مەسیحیدا هاتووە، کە وای لێکردون بەدرێژای سەردەمەکە نەفرەت لە ئیسلام بکەن. بێبەختانە مەسیحی ئاسیایی وەك دەستورێکی گشتی خەڵکانێکی زۆر ناپەسەندن و لە زۆربەی موسڵمانە ڕەگەزپەرستەکان زیاتر ڕەگەزپەرستترن، وەك هونەری پێکهاتە گەواهی ئەوە نیە کە لە شوێنێکی تر ئەوە هەبێت (مەگەر بە دەگمەن)، ئەم هەڵوێستە بەرامبەر براکانی لە ئایندا و لە مەزهەبە جیاوازەکاندا دەتوانرێ تەنیا بە ناپاکی وەسف بکرێت. ئەوە لەوانەیە بە گومڕایی دابنرێت، ئەگەر بەیانی شتێك بکەم، بەڵام دەبێ ددان بەوەدا بنرێ کە لەناو گەورەترین بەشی خەڵکی ڕۆژئاوای ئاسیادا، ئیسلام بە باشترین کەس دادەنرێ لە بەراورد لەگەڵ مەسیحیەکاندا. میزاژی ڕەگەزی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەرووی بەرژەوەندیەوەیە. ئەو نموونانەی کە مەسیحی دەخاتە پێشەنگیەوە، بەژنێکی باریکەلەی هەیە لەسەر بینای ئەو سروشتە کە تینووە بۆ مادە و هێڵی پانی ڕێپێدراو لە ژیانی ڕۆژانە بە بڕوای ڕۆژئاوایی لەگەڵ ناجۆری میزاژیدا کۆکە کە هەوڵدەدات یاسا و فرمان دیاری بکات، کە بڕیاری شێوەی هەستان و دانیشتنی بدات، لە خواردن و نوستن و بەر لە ئاهەنگگێڕانێ کە دیوارێکی بەرزکردۆتەوە لە دابینکردن و بەدەستهێنانی تا ڕادەیەك نموونەیی دنیایی. ڕۆحی بەرز و ڕۆحی ڕەوان لەلایەن مەسیحێتەوە زۆر دوورە و لەسەرو ئەم عەقڵی مادییەوەیە، نموونەی بەرزی تەمومژاوی و ناحاڵی بوون ناتوانێ دەستبگرێت بەسەر پێویستیەکانی ژیاندا و تا ڕادەیەك چاوچنۆکی نەبەزیو لە سروشتی ڕەگەزایەتیە. بۆیە لەناوچوونی بنەمای گیانی و واتایی دەبینین و سەری بڵند و نیشانەی ئایینەکانیان، لە خەباتێکدا لە پێناوی سەرکردەیی هەندێ لە قەشەکانیان لایەنێکی ونکردووە و لەبارەی خاڵەکانی ڕێباز و باوەڕی ئایینیەوە کە کۆمەڵگای مەسیحی لەتویەت کردووە. ئیسلام مادییە و نموونەی بەرزی بەهێز و سادەیە، لەناو هەموو ئەوانەدا یەك ڕابەری بوونی هەیە و بۆتە هۆی ئەوەی هەموو دەتوانن ڕێزی بگرن. یەك خوا، یەك پێغەمبەر، یەك کیتاب، هەریەکە پەیوەندیەکی هۆشمەندانەی بەوی ترەوە هەیە، یەك ڕێبازی سادە و بەهێز لەبەردەم دیدی ڕاستەوخۆی خۆی بۆ یەکتایی، ڕابەرێك،

پێغەمبەرێك كە لەگەڵ زۆر و ستەمدا سازاوە و لە رۆحی رەگەزایەتی كۆن تێدەگات، یاسا و پەیام بۆ هەموو شتێك، كە ئەوەیە بیروباوەڕێك كە عەقڵی عەرەبی وەك دیاردەیەك دەیبینێ، ئەگەر ئەم جۆرە دەربڕینانە رێپێدراو بێت، یاسا بۆ هەمووان و پاداشتیش بەپێی وابەستەیی تەواوی تاكەوە بە رێنمایی شەریعەتە دیاریكراوەكانە. زۆر لە مرۆڤ داواناكات لە ژیانی رۆژانەیاندا، بەڵام دەبێ پابەند بێت پێوەی- وەك هەموو ئەوانەی رۆژهەڵات دەزانن پێویستە بزانن- لەگەڵ نهێنییەكان و هێزی نادیاردا ژیانی دەگوزەرێت كاتێ بیەوێ و دەبینێ هەمیشە ئامادەیە بۆ قوربانیدان. ئازار و چەوساندنەوە بێگومان مەسیحیەكانی كردووە بە تەڵەكەباز، بێ باوەڕ و زۆرجار ئەو چەردە سیفاتە ناپەسەندانەی لەبارەیانەوە بڵاودەبێتەوە كە موسڵمانەكان هاوبەش نین تێیدا. بەتەنیا لەنێوان ئەم تیرە مەسیحییانەدا، كلدانەكانی باكوور، كە شانازیكردنیان بە رەگەزایەتی و زمانەوە، كارێكی وای كردووە كە ئەوان بەرزتر دابنرێن لە ئەرمەنیەكان و سریانیەكان و یۆنانیەكان و ئەمانیش لە خوارەوە، ئەوەی هەمیشە لە دەروونیاندا زیندووە، هەستی نەژادیی فرمانڕەواییە كە ئەوانی لێوە هەڵقوڵاون، كە زۆر پاراستونی لە بچووكی سوكایەتی، هەروەها بۆتە بەشێكی جیاكەرەوە لە سروشتی مەسیحیەكانی تردا. چەوسانەوەی مەسیحیەكان- ئەوەی كە زۆرجار دیاربەكرد شانۆ بووە بۆی- سۆزی هەموو میللەتەكانی تری هەژاندووە و ئەوەش راستەقینەیە، ئەوان هەر لەسەر مەسیحیەتی خۆیان لەناو هەموو كوشتن و بڕینێكدا بەردەوام بوون، كە لە قینی توركەوە هەڵدەقوڵا و قوربانیەكەشیان داوە. من دەڵێم قوربانیان داوە، لەبەرئەوەی لەناو جیهانی تاواندا لە كوردستانی رۆژئاوایی و باكووری میسۆپۆتامیا، ئەوە بابەتێكی هاوبەشە بۆ دەمەتەقێیەك لە قاوەخانەكاندا، كە سوڵتان و حوكومەت چەندیان داوە بە شەڕخوازان لە شارەكاندا بۆ ئەوەی بەو كارە ناپەسەندانە هەستن، هەروەها ئاغا كوردەكان چەندیان داوە بە دەسەڵات، تا رێبدرێن بەبێ بەرهەڵستی كۆتایی بەو خوێنڕشتنەی نێوان ئەوان و ئەرمەنیەكان لە دیاربەكر و شارە ئەرمەنیەكانی تردا بهێنن. سێبەری ترس و تۆقاندنێكی زۆر باڵی كێشا بەسەر شارۆچكەی پڕ لە ئارامی و ئاسایشدا. كەس هەرگیز نازانێ كەی توركەكان رێ دەدات بەو بەشە بەرەڵایەی دانیشتوانی موسڵمان بۆ كوشتن و بڕین، یان دەنێرێ بۆ داوێنی چیاكان بەدوای ئەو كوردە دڕندانەی كە مەسیحیەكان و موسڵمانەكانیان وەك یەك تۆقاندووە. مەحاڵە تێبینی ئەو یاسا جیهانیە نەكرابێت، كە دەیسەپێنێ بەسەر لاوازدا تا بەشێوەی بەهێز هەڵسوكەوت بكات، وەك چالاكیەكی خۆپاراستن. مەسیحیەكانی دیاربەكر و ناوچە دوورەكان پەنایان بردبووە بەر جلوبەرگی شارە موسڵمانەكان، كە چاكەتێكی

هاودامان و پشتێن و کڵاوبۆرگەیەك کە بە دەستەسرێکی شینباو دەوری گیرابوو، کاریگەری هەبوو تا رادەی ئەوەی خەڵکی تازە هاتوو لەسەرەتاوە نەیاندەتوانی لە یەکیان جیابکەنەوە، پاش ماوەیەك فێری وردە جیاوازی دەبێت لە رێکخستنی سەروپێچەکەیاندا. هەروەها لە موسڵیش، مەسیحیەکان و موسڵمانی عەرەب بە شێوەیەکی ئاشکرا جیاواز نین، جگە لەو شوێنانەی فێستەکەی پێشویان لەسەردا مابێت، هەروەها لە باشوور و کوردستانی ئێران، کورد و کلدانەکان وەك یەك جلوبەرگ دەپۆشن و کلدانەکان کوردیەکی تەواو قسەدەکەن و بەختیارن بە پەیوەندی نێوانیان، بە ئاسایی لەگەڵ دراوسێ دڕندەکەیاندا لە بارودۆخێکی گونجاودان، کە هیچ نەفرەتێك لەمان ناکەن، وەك لە ئەرمەنە غەدارەکانی دەکەن.

لە دیاربەکرەوە بە ئامانجی ئەوەی گەشتێك بەرەوخوار بە دیجلەدا بۆ موسڵ بە کەڵەك بکەم، یان قەیاغێ کە بریتیە لە پێستە و ستوونەکانی. کەمێ لە ئەوروپیەکان ئەم شێوازی گەشتە بە خۆش دەزانن و بە ئاسایی ئەوان نیوەی کەڵەکەکە بەکرێ دەگرن، خێمەی تێدا هەڵدەدەن یان کوشك و خواردن لێنەر و خزمەتچی هەڵدەگرن و گەشت بەشێوەیەکی هێمن دەکەن، ئیدی جگە لە سەرسامی بە دیمەنەکان و وێنەگرتن زیاتر شتێکی دی سەرقاڵیان ناکات. لە کەسایەتی مندا لەوەدەچێ مەحاڵە بەو شێوە شکۆدارە بڕۆم، بۆیە دەگەڕام بۆ کەڵەکێك باری بارکردبێت، کە لەوانەیە ڕێم بدەن لەسەری دابنیشم و تەماشای دەوروبەر بکەم. بەهەرحاڵ، دوای هەموو شت دەبێ خێمە هەبێت، کە بەم شێوەیە هاتە پێشەوە:

ڕۆژێك لە کاروانسەراکەدا نانی نیوەڕۆم دەخوارد، کە بریتی بوو لە نانی وشك و کاهو، کاتێ پیاوێکی بەساڵاچوو لە بەرگێکی درێژ و پەستەکێکی خوری کوردی باشوور هاتە ژوورەکەمەوە و هاتنەژوورەوە و سڵاوی کرد و دانیشت و رازی بوو بەوەی فەرمووم لێکرد بەشداری ژەمە خواردنەکەم بکات. خۆی پێناسانم وەك (حاجی والی) دانیشتوی هەولێر لەسەر سنووری رۆژئاوای کوردستان، بابا کورد، لە حەڤدەیەمین زیارەتی بۆ مەکە گەڕاوەتەوە. ئەویش وەك من هەوڵدەدات بچێت بۆ موسڵ و هاتووە هەواڵی ئەوەی هێناوە کە کەڵەکەکە ئامادەیە و لەوەش زیاتر راخەر و دارەکانی هەیە بۆ ئەفەندیەك دروستکراوە، ئیدی دەتوانێ سەفەر بکات و کە لەوانەیە بە مەجیدیەك یان زیاتر بیکرێیە. پیرە پیاو کەمێ فارسی دەزانی و لەگەڵ ئەوەشدا زمانی کوردی نەتەوەیی خۆی، هەروەها بە تورکی و عەرەبیش دەدواین.

## هاوڕێیەکی سەفەر

هەر بەوەی هاوبەشی خواردنەکەی کردم، دڵنیا بووم و سوور بووم لەسەر ئەوەی کە دەبێ ببمە شەریکی لە پەڕینەوەماندا بۆ موسڵ، کە لە هەڵسوکەوتیدا داهاتوویەکم بەدی دەکرد. ڕەفتارێکی دیکتاتۆریانەی چاوەڕوان نەکراوی هەبوو، کە دڵ و دەروونێکی باشی هەیە لەگەڵ پێچوپەنادا و ئەو حەڤدە جار چوونەی بۆ مەکە بەکاردەهێنا بۆ ڕێزگرتنی، ڕانەهاتبوو لەسەر ئەوەی لە هەر داوایەك کە ئەو دەیکرد دەستبنرێت بە ڕوویەوە.

لەبەرئەوە کاتێ کە پێشنیاری بۆ کردم و بە موسا بانگی کردم و بە ناونیشانی "کوڕی ئازیزی خۆم" ئێمە دەبێ لە هەموو تێچوونێکدا وەك یەك بەشدارین، منیش پەسەندمکرد. هێشتا ئەوانەمان تەواو نەکردبوو چووە دەرەوە، دواتر بە شتومەکەکانیەوە گەڕایەوە و هەندێ زین و جانتا و کیسەیەکی بچووك خەڵوز و سەماوەرێکی تەنەکە و پاکەتێك نامە و کاغەز کە دای بە من، چونکە لە گیرفانی پاڵتۆکەی مندا زیاتر پارێزراو دەبوو، لەبەرئەوەی کراسە هاودامانە ڕۆژهەڵاتیەکەی خۆی گیرفانی نەبوو، بەڵام دوو جزدان بەلاتەنیشتەکانیدا هەڵواسرابوون و دەبوو هەر شتێکی بەهاداری پێبووایە بیخاتە سەر سنگی. خاوەنی کەڵەکەکە ئیدی دەرکەوت لەگەڵ دەرگاوانە ئەرمەنیەکە بۆ شایەتی لە مامەڵە و ڕێکەوتنەکەدا، خاوەن کەڵەکەکە کوردێکی ریوەلە و لاواز، باڵایەکی ڕێکوپێکی حەوت پێیی هەبوو، زەبەلاحێکی ڕەنگ و ڕوو پەڕیو، کە لەسەر زەوی بە چیچکانەوە دابنیشتایە، بە باڵای مرۆڤێکی ئاسایی دەبوو. لە قسەکردندا زمانی دەیگرت و شێوەی تاکە چاوێکی دڕندانەی دەیکرد بە زەلامێکی شێوە تۆقێنەر. ڕێکەوتن لەگەڵیدا زۆر ئاسان بوو، ئیدی بە شەش مەجیدی دەستی پێکرد بۆ گواستنەوەمان بۆ موسڵ و ڕێشمان پێدەدرێت کە خێمە بەکاربێنین، کە لە کۆتایی گەشتەکەدا دەبێتەماڵی ئەو. ئێمەش پێنج مەجیدیمان بۆ دانا و نیوەی نرخی خێمەکەشمان لە موسڵ بداتەوە. لە کۆتاییدا و دوای ئەوەی جگەرەیەکی زۆرمان بەدەم مامەڵەوە کێشا و دوای ئەوەی سێ جار هەستا بڕوات و تا نیوەی پلیکانەکان دەچوو لەبەرئەوەی نەرمی لە ئێمەدا نەدەبینی، ئیدی لەگەڵ ئەرمەنیەکەدا وەك ناوبژیوانێك ڕێکەوتین بە دوو مەجیدی بۆ هەر یەکەمان و خێمەکەش ماڵی کوردەکە بێت. کەڵەکەکە بەیانی دەستپێدەکات و ئێمەش پێویستە خۆمان و ئەو شتانەی پێمانە بگوێزینەوە بۆ دەرەوەی شار بۆ ئەو شوێنەی کە پردە بەردینەکە چەند میلێك لە خوار دیاربەکرەوە بەسەر ڕووبارەکەدا دەپەڕێتەوە. لە هەمان کاتدا ئێمە دەبێ خواردن بۆ چەند ڕۆژێك بکڕین، گەشتەکە ئەگەر دووچاری کێشە نەبین، پێنج ڕۆژ دەخایەنێت،

بەڵام ئەگەر هەوای بەهێز هەڵبکات، یان بارانێکی زۆر ببارێت، ئێمە دەبێ بۆ دوانزە رۆژ، یان ماوەیەکی درێژتریش خۆمان ئامادەبکەین. لەبەرئەوە چووین بۆ بازاڕ، یەکەم بۆ نانەواخانە، یەك کیسەی پڕ لەواشەی ئەستوورمان داواکرد، کە لە دەوری نیوەڕۆدا کراوە و لایەکی نیوە براوە، ئەوەش وەك ئەوەی پێیدەوترا فرنی، نانەکەی لە خراپ بوون دەپاراست. ئینجا بۆ کڕینی شەکر، بۆ ئەم کارە پێویستی بە زانستی ئەورووپی هەیە وەك حاجی والی پێیدەوت توانا لەسەر خوێندنەوەی پیتی لاتینی پێویستە، چونکە دوکاندەرە ئەرمەنیەکان هەوڵیان دەدا بە شەکری ئینگلیزی هەندێ بەرهەمی خراپی نەمساویمان پێ بفرۆشن و سەرسامی ئەو و شادمانی حاجی والی تا رادەیەك یەکسان بوو، کاتێ کە ساختەکاریەکەم لە رێی مارکەکەیەوە خوێندەوە. بۆ کڕینی هەر شتێك سەرئێشەی لەدوابوو. ئەگەر هەر خۆم بوومایە نەمدەتوانی ئارام بگرم تا فرۆشیارەکە بگەیەنمە هەرزانترین نرخ و بۆ هەر شتێك هەشت پێنسم لە نرخی خۆی زیاتر دەدا، بەڵام پیرە حاجی والی شتی وای نییە. ئەو نرخی هەموو شتێکی دەزانی، لە هەموو شارێك، لە مەدینەی منەوەرەوە بۆ بەغدا، ئیدی قوڕ بەسەر ئەو مەسیحییەی سوێندی درۆی لەسەر نرخێکی درۆ بخواردایە. لە کۆتایدا، بەهەرحاڵ، لە راستیدا کاری شت کڕینمان تەواوبوو، کە وەك لە بیرم بێت، بەم شێوەیەی لای خوارەوە بوو: هەر یەکە کیسەیەك خەڵوز و کیسەیەك نان، 10 پاوەند برنج، پاوەنێك چا، سێ کەللە شەکر و شەش کەوچکی چا (پیوتەر)، حەوت پاوەند کەرەی خۆماڵی و چەردەیەك نیسك و ماش و سێ شریت بامیەی وشککراوە، کەمێ سەوزە، بیبەر و خوێ و هەندێ میوەی وشککراو. ئەوانەمان هەڵگرد بۆ کاروانسەراکە، خستمانە ژێر کیسە و جانتاکانی کە هەڵمانگرتبوون. بۆ کڕینی ئەو شتانە ماوەی لە سەعات نۆی بەیانیەوە بۆ نزیکەی خۆرئاوای خایاند، هەروەها بەقەدەر دانیشتنی پەرلەمانێك قسە و وتووێژی تێدا کراوە. شتە کڕاوەکانمان قایمکرد و پێچامانەوە تا ئامادەبێ بۆ بەیانی. ئیدی چووینە دەرەوە بۆ ئەوەی بۆ دواجار چاوێ بە دیاربەکردا بگێڕین، بەڵام پیرە پیاو بێزار لە بازاڕ، سەرسامی کردم بە داوایەك، بە پێچەوانەی ئەوەی پێشبینی بکەی لە کەسانێك کە بە ئاسایی کەمێ دەربارەی لایەنی سروشتی و جوانی ئەو جیهانەی تێیدا دەژین دەربڕێت.

قوڵی گرتم و وتی: کوڕی خۆم موسا، دوای خەباتی ئەمڕۆمان، با بڕۆین بۆ دەرەوەی دەروازەکە بۆ شوێنێکی بێدەنگ لەنێوان درەختەکانی سەر کەنارەکە، ئیدی دەتوانین لەوێ دابنیشین و تەماشای دیمەنی پانویەرین بکەین.

بۆیە بەوپەڕی ڕێزەوە پەسەندمکرد و ملی ڕێمان بەرەو دەروازەکە گرت و بەلای ڕاستدا پێچمانکردەوە و بەلای قوتابخانەیەکی سەربازیی ناخۆشدا تێپەڕین و گەیشتینە سەر ئەو تاشەبەردانەی بەسەر دیجلەدا دەیڕوانی. کەمێ شۆڕبووینەوە بە تولەڕێگەکەدا و کۆمەڵێك درەختمان لەسەر کەنارە تەسکەکە بینی، کە دوورە دید بوو لەو کەسانەی بەلای سەرەوەدا تێدەپەڕین، ئێمە دەمانتوانی تەماشای بەرەوباکوور بکەین، بەناو دەشتانیەکەدا و بۆ چیا هەمیشە تاریکەکانی کوردستان.

پیرە پیاو بۆ ماوەیەکی درێژ بەبێدەنگی دانیشت، بەڵام دواجار هەستی خۆی دەربڕی بە الله و ئەکبەرێکی دوورودرێژ. ئینجا هێمای بۆ کردم بۆ جوانی شەپۆلێکی گەورە و خێرا، کە ڕەنگی زەردیی کەنارەکەی گرتبوو، لەگەڵ سەوزی کاڵی درەختەکانی دارستانەکە، کە لەگەڵ ساڵێکی نوێی ژیان دوور لە داوێنی ئێمەوە.

دیسانەوە بە بێدەنگی دانیشتەوە و بە چاوە بچووکەکانەوە لە چیا دوورەکان ڕامابوو، کاتێ کە کەوتەوە قسەکردن، گیانی کوردێك و شاخەوانێك بوو، وشەی گرانی بە زارەکەی خۆی دەردەپەڕان: ئەڵڵا، ئەڵڵا، ئەڵڵا! ئەو، دابەشناکرێت، شکۆمەندی ئەو بە ئاشکرا لەبەر چاومانە و بەخشندەیی ئەو لە دڵ و مێشکماندایە. کوڕی من هێشتا، بیرناکەیتەوە ئەو شاخانە- کە بەسەریاندا لاشە دەسووڕێتەوە، لە کاتێکدا ڕۆح، لەو بەرزەوە لە دیدێکی نادیارەوە لە ناوەندی بێگەردییەوە وەك گۆڕەپانی بەفر[8]، کە لە بەرزەوە درێژدەبێتەوە— ئەوانە شاکاری ئەون. بەڕاستی، ئەم شاخە بەهێزانە لێرەدا گەورەترین کاری ئەون، بەڵام هێشتا لە زیخ و چەوێکی سەر کەنارەکان زیاتر نین لەچاو کارەکانیدا لە بەهەشتدا، بڕوانە ئەو کارە، چۆن ئەوە هەبووە. ئێمە کێین شانازی بە هێزێکەوە دەکەین، کە ئەو پێیبەخشیوین، کێ دەیباتەوە دوای ئەو چوار ڕۆژەی قۆناغی گواستنەوەمان، بڕوانە ئەو دیوارانەی شار، مەزنێکی ناو ئێمە دروستیکردووە، ڕۆژێ دێ دەڕوخێن دەبنە پارچە پارچەی بچووکی لە ژمارە نەهاتو لە دیدی ئەودا، هێشتا بەردەکان کە دەستکارێکی ئەوە، هەمیشە پایەدارە، بەرگەگرە، تەنانەت وەك ئەو چیایانە. هەروەها کاتێ کە دیوارەکان ڕۆچوون، یەکێکی تر، نیشانەی بەرزخوازی خۆی لەگەڵ پاشماوە و وێرانەی کەسانی تر بینایدەکاتەوە، پێویستە هەمان ئەو

---

[8] ئەو ئەو وشانەی بەکارهێنا (ساف و سپی وەکی وەفرەکە لصمر)، واتە ساف و سپی وەکو بەفرەکەی سەرەوە. (ئەم پەراوێزە لە وەرگێڕانە عەرەبیەکەدا بەیان نەکراوە- مینە.)

بەردانە بەکاریێنێتەوە، بە یادی بیناسازی پێشوی دیوارەکان. "ئای! کە ئەو دروستکەری بەردەکەی بیرچووە کە هەمیشەییە و دەمێنێت و ئەم شاخانەی کە بەرگەدەگرن". پیرە پیاوەکە بەهێمنی دەدوا، بەو شێوەیەی ئەو دەدوا، چاوە شینەکانی کزدەکرد و دەنگی دەلەرزی- بەڕاستی لەم جیهانەدا شتی ناوێزە هەیە، کەسایەتی دووگانە، لەناو کوڕانی ڕۆژهەلاتدا کە کەس هەرگیز چاوەڕێی ناکات. ئەم پیرە پیاوە، کە تەمەنی ژیانی خۆی لە کارویپشەیەکدا بەسەربردووە کە دەبێ وەك دوو ڕوویەك گاڵتەی پێبکرێت- چونکە ئەو دەلاڵی حاجی بردن بوو بۆ مەکە، کاتێ کە زیادی لە ناشارەزاکان دەسەند، ئەوە بلیمەتییەکی ساختەکاری بوو، کەچی هێشتا خاڵێك لەناو دڵە پیرەکەیدا هەبوو، ئەو شیعرەی لە سینەی ئاریاییدا هێشتا لەبۆسەدایە و سەرچاوەی گرتووە، کە هەموو شت دەگەڕێتەوە بۆ توانا و دەسەلاتی بێ پایانی ئەوەی موسڵمانان دەیپەرستێت. زۆرجار لەناو فارسەکاندا ئەم جۆرە کەسایەتیە دووگانانەم پێشهاتووە، پیاوێکی وریا و ڕەق، کە خەریکی تەڵەکەبازی و فریودانی خەڵکی بووە و تەنانەت تاوانیش، بە مەبەستی چاوچنۆکی، هەروەها بێزی لە هەڵماڵینی هەستی خۆی دەکردەوە، جاریێ خۆی وەکو ئەوە دەبینی کە خەڵکانی تر دەیانبینی، جارجارەش لە پاکترین زمانی شیعر و سۆزدەربڕین لەبارەی جوانترین سۆزەوە و جارێکی تریش دەکەوتە سەر زەوی.

چیا، هەمیشە هەر چیایە، بەری دیدی پیرە پیاوم ڕاگرت، شتێیەکی دڵفرێن لەبارەیانەوە هەیە، کە پێویست ناکات کورد بیت، یان فارس، تا بتوانی بەدەستی بهێنیت. ئاسەوارە مردووەکانی سەردەمی کۆنی شاخی سەهۆڵین و جۆش و خرۆشی بورکانەکان، کیشوەرەکان بەهۆی کارەساتەکانەوە دابەشبوون، کە بەشێوەیەکی ڕاست و ڕەوان لە تەختایی دەشتە فراوانەکانەوە بەرزبوونەوە، دەستبەسەراگرتنێکی باش بەسەر هەموو ئەوانەی کاریگەرییان لە هەر یەکێکدا هەیە و ئارەزووی زیندو لەگەڵ چوونە ناو نهێنیەکانی دۆڵە قوڵەکانەوە و جیهان لە سەرە سپیەکانیانەوە تەماشاکە.

لە ڕاستیدا، دیاربەکر لە لێژاییەکی سەرتەخت دەچێت لەسەر خاکەکانی چوار ئیمپراتۆریا کۆنەکە- ئاشووری بۆ باشوور، ئەرمینیا بۆ باکوور، ماد بۆ ڕۆژهەلات و ڕۆم بۆ ڕۆژئاوا، لەوانەیە زۆر تێڕامانی لەسەر بێت، کە کات ڕێبدات بۆ تێڕامان لەنێوان شۆڕشی بەردەوام و ئازار و ئەشکەنجەیەك کە ئەوی پارچە پارچە کردووە.

## ئامادەکاری بۆ دەرچوون

خۆرئاوا، کە مانای داخستنی دەروازەکانە، ناچاریکردین بە گەڕانەوە، هەر کە چووینە ناو دەروازەکەوە، حاجی خو و رەوشتی خۆی لەبیرچووەوە و دەستیکردەوە بە باسی گەشتەکە، لەبارەی نرخی شتە جۆربەجۆرەکانمانەوە، لەبارەی بێویژدانی ئەرمەنەکانەوە و سەندنی باجی زۆرەملی تورك، کە نرخی هەموو شتێکی بەرزکردۆتەوە.

بۆ بەیانی زوو راپەڕین و لەکاتێکدا من چوومە درەوە بۆ سەر شەقامەکە بۆ پەیداکردنی کۆڵهەڵگرێك، حاجی خۆی بە رێکخستنی شتەکانەوە سەرقاڵ کردبوو بۆ بارکردن. کوردێکی بەهێزم لەبەر مزگەوتەکەدا پەیداکرد، ریکەوتین کە شتەکانمان بۆ هەڵگرێت بە پێنج قورۆش- پیاسترە و هەروەها کۆڵەکەمان دا بە کۆڵیا لەگەڵ سندوقێك و کیسەی زینەکە، ئەوەی لەسەر خۆمان بوو پێخەفەکانمان بوو. ئەوەی ماوە دەبێ خۆمان هەڵیگرین، بەگوێرەی حاجیەوە چەند بتوانێ کەمتر سەرفبکات، رێی پێنەدەدام بۆ بەفیڕۆدانی عانەیەك کە بتوانێ پاشەکەوتی بکات. هەندێ کاتیشمان بەسەربرد بۆ رازیکردنی ئەرمەنیەکەی خاوەنی کاروانسەراکە، کە دوو (شیلینگ) بەس بوو بۆ کرێی پێنج شەوی ژوورێك، بەڵام یەك جاریش ئەوەی کرد، یارمەتی ئەوەی داین بارەکەی دا بە کۆڵماندا و چووینە دەرەوە. کۆڵەکەی حاجی بریتی بوو لە کیسەیەك خەڵوز و جانتایەك کە برنج و هەندێ وردەواڵا، لەکاتێکدا من نانەکەم هەڵگرت و ئەو کیسانەشم بەخۆمدا هەڵواسی کە چا و کەللە شەکر و هەرچی هەیە و نییە بارمکرد و مەقەڵییەك خەڵوزیشم هەڵگرت، کە بەر هەر گۆشەیەکی تیژ دەکەوت پارچەیەکم لێبەردەبووەوە. بەدرێژایی هەموو دیاربەکر تەکانمان دەدا، بۆ دەروازەی باشووری کە یەکەم ئامانجمان بوو، هەروەها تا ئەو کاتە من قەوارەی شوێنەکەم نەدەزانی. رێگا راستەوخۆکە لەوە دەچوو تا هەتاهەتایە هەر درێژبێتەوە و بەڵام دەروازەکە ( لە دەروازەی وینچەڵسی بۆ هۆڕەکانی رۆمنەی دەچوو) لە کۆتاییدا دەرکەوت و بە فرمانی هەندێ چاودێریی خوایییەوە پۆلیس بوو سەغڵەت نەبووین. خۆر بە خێراییەك هەڵهات کە هەمیشە لە رۆژهەڵاتدا بەو شێوەیەیە، کە من دڵنیام لە شوێنی تر زیاتر خێراترە و ئێمەش عارەقمان لێ دەتکا و لەژێر کۆڵەکەماندا چەماوینەتەوە و رێدەکەین. کۆڵ هەڵگرەکە لەگەڵ ئەو جۆرە هێزەی ئەودا، ئێمەی جێهێشتووە و بەو شێوە نەگۆڕە رێکردنەی ئەو بەزووی لەناو درەختەکاندا دیارنەما، کە بە سنووری رێگا پێچاو پێچەکەدا بوون. حاجی لێرەدا هەناسەیەکی دا و دەبووایە پشومان بدایە، بەڵام بەلایەنی کەمەوە کە دەگەینە کەناری رووبارەکە و کۆڵەکەمان فرێبەینە خوارەوە بۆ سەر هەندێ

کیسە قەیسی کە دەچوو بۆ موسڵ. ئێمە ئێستا کە گەیشتوینەتە سەر کەڵەکەکە، لێکدانەوەی هونەری دروستکردنی بلیمەتانەی ئەم ئامێرە پێویستە. بەکورتی دووسەد پێستەی بزنی فووتێکراو بە شێوەی 10×20 ڕێکخراوە بە چەند دارێکی سنەوبەرەوە بەستراون. بەسەر ئەمانەشدا دیسانەوە حەوت یان هەشت لقە سنەوبەری تر کە لە حەوت ئینج زیاتر ئەستوور نەبوون بە باری پانی دانراون و لەسەر ئەمانەشەوە بۆ پێکهێنانی سەر پاپۆڕەکە، تەبەقە بالە دانراوە. لەنێوان جووتێ لەم بالانەدا سەبەتەی کاری تێدا چەسپێنراوە، کە ڕاگرە سەوڵێکی سەختی تێدایە. جوتێ ڕامالە ئاوی گەورە لەسەر ئەوە دەسوڕێتەوە و سەوڵ لێدەر لەسەر بالەیەك ڕادەوەستێ و نیمچە پردێك لە لقەدار بۆ ریزەکەی ئەوبەر دروستدەکات و بەپێوە سەوڵ لێدەدات. لەژێر ڕامالەئاوەکانەوە شوێنێك بە بەتاڵی هەمیشە بەناو کەڵەکەکەدا جێدەهێڵن، لەوێوە پێستە فوکراوەکان لەناو دارە ڕایەڵەکراوکانەوە دیارە. کەڵەکەکە، لەشێوە و دروستکردنیدا ناکرێ بۆ پێشەوە پاڵی پێوەبنرێت و هۆی بوونی سەوڵێش تەنیا بۆ پێچکردنەوەیە و کە بەهۆیەوە کەڵەکەکە بەرەو تەوژمی ڕاست دەبات و هەروەها بۆ ڕاکێشانەوەی لە مەترسی ئەو تاوێرە بەردانەی کە لەڕێی لێشاوەکەدان و زۆرجار مەترسیدارە، لە ڕووباری سەرودا لەنێوانی دیاربەکر و موسڵدا، بەتایبەتی لەکاتی وەرزی بەهاردا بەشەو چوونە بەرەوە کارێکی مەحاڵە، لەلاکەی بە تەوژم دەڕوات، کە بە دەوری بەردەکانی سەر کەنارەکەدا ڕایدەماڵێت بەخێرایی غاردانی ئەسپێك ئەگەر بڕوات ئەوا بێبەختانە کەڵەکەکە دووچاری تێکشکاندن دەکات.

هەروەها با، بەشێوەیەکی سروشتی هێزێکی پاڵپێوەنەری گەورەی لەسەر کەڵەکەکە هەیە، کە ڕایدەکێشێ، بەڵام سێ ئینج لە ئاو و هێزەکەی زۆرە بۆ سەوڵەکان تا بەرەنگاری بێتەوە، بۆیە زۆرجار ناچاردەبێ بوەستێت. کاتێ ئێمە گەیشتین، کۆڵهەڵگرە کوردەکان خەریکی بارکردنی شتەکان بوون و قەیسیە وشککراوەکان و برنج، زووربەی لە دەوروبەری نزیك ئورفەوە بوو. دەستەی کەڵەکەکە سەرقاڵی فووتێکردنەوەی پێستە فشبووەوەکان بوون بەهۆی بۆرییەکەوە کە دەیانکرد بە قاچی پێستەکەدا. چادرەکەمان یان وەك عەرەب پێیدەڵێت خێمە، کەوتبووە نێوانی دوو دیواری فەردەکانەوە و چووینە ژوورەوە، بینیمان ناوفەرشەکەی تەختەیە و لەسەر لقە درەختەکانە کە کەڵەکەکەیان پێکهێناوە. دوو گەشتیاری ترمان لەگەڵ بوو، یەکێکیان عەرەبێکی بازرگانی موسڵ بوو، پیاوێکی زۆر ئایینی و خواپەرست، کە هەموو کاتەکەی بە جگەرەکێشان و هاواری خواوە بەسەربرد.

## هاوڕێ گەشتیارەکان

ئەوی تریان لە خووڕەوشتدا پێچەوانەی ئەم بوو، سەربازێك کە ماوەی سەربازییەکەی تەواوببوو، لاوێکی بیست و سێ ساڵان، کە لە هێڵی شەمەندەفەری حیجازییەوە گەڕابووەوە، یەکێ بوو لە سەربازی پاسەوانی پۆلیس لە کەرکوکی شوێنی زێدی خۆی. دەم بۆگەن، کفرکەر، دز، بێ پارە و پول، چاوەڕێی ئەوەی لە ئێمە دەکرد چاومان لێبپێت، ئەو جۆرێ بوو لەوەی تورك چی بەسەردێ کاتێ لە سوپادا لە قاڵب دەدرێ بۆ ئاستی دڕندەیی. دەستەی کەڵەکەکە بریتی بوون لە دوو کورد و چەند پیاوێك لە تیرەی زازا، کە لە سەر شاخە بەرزەکانی دەوروبەری دۆڵی دیجلەی سەرو و سەرچاوەکانیدا دەژیان. ئەو خەڵکانە لە شێوە و رەوشتدا تاڕادەیەك لە هەموو کوردەکانی تر جیاوازن. پیاوانی باڵا کورتن، شەرمن، هەڵچوونی بە پەلە، زۆر توند و تیژن و کارگەرێکی باشن، دیالێکتێك قسە دەکەن، کە کوردیە و شێوەی لەوەدەچێ زۆر سەرو سەدەکانی کۆن بێت. لەوانەیە کە ئەوانە نەوەی راستەوخۆی ئەو تیرە شاخاویانە بن، کە ئاشوورییەکان کێشەی زۆریان لە کۆنترۆڵکردنیاندا هەبووە و باشکانەکان و رۆمانەکانیش لە سەردەمی دوایدا هەرگیز زاڵ نەبوون بەسەریاندا. لە باڵادا، هێمای کڵاوی لباد و پێڵاوی پەنجە درێژ، کە هێشتا پارێزگاری لە بەشێکی ئەو جلوبەرگانە دەکەن، کە ئاشناییان لە پەیکەرەکانی ئەرمەنیە شاخاویەکانی باشووریە.

خاوەنی کەڵەکەکەمان بە یەکێ لە وریاترین پیاوانی دەریایی دەناسرێت، لەگەڵ کەشوهەوای نالەبار کە دوایکەوتووە و ئەو توانای خۆی پێشانداوە بۆ ئەو ناو و ناوبانگە. ئێمە لە کەنار دەریاکەوە لە سەعات دەی ئەم بەیانیەوە لە بەندەرەکە کشاینەوە، خۆرەتاو و شنەی بایەکیش لە باکوورەوە هەردوکیان پێکەوە یارمەتی بەرەوپێشچوون و پارێزگاریکردنی ئەو پلەی گەرمایە دەدەن، کە لە ئاستی حەوانەوەیەکی بێوێنەدایە. لەژێر سێبەری ئەم بارودۆخەدا، کەشوهەوایەکی باش و رووبارێکی فراوان کە بە خێراییەکی نەگۆڕ کاردەکات، بێ ئاوی تەنکاو و لێژایی زۆر، لەوانەیە رێگەیەك بۆ گەشتکردن نەبێ کە لە کەڵەك خۆشتربێت. وەك لەبەرچاوگرتنێك، کەڵەك بەهێواشی دەسوڕێتەوە و دیمەنی هەموو لاکان لەبەرچاو دەگرێت. ئاسانی و ئاسودەیی لەبارەی هەموو شتێکەوە تێدایە، کە تەنیا گەشتیاری تازە لە رێگاوە دەتوانێت پێیبزانێت. زۆری ئاوی سارد و خاوێن پێشەنگی شادمانی گەشتەکەیە، کە پێچەوانەیە لەگەڵ کێشەی هەمیشە ئامادەی رێگاوباندا، لەگەڵ ئاودا لە زۆر جاردا دەگمەنە و کە دەستیش بکەوێت هەمیشە تەنیا لەسەر حسابی کاری دەستیە.

## ژەمەکانی خواردن لە گەشتەکەدا

تەپوتۆز و پیسایی و درێژی ڕێگە و قۆناغە بێزارکەرەکان، کێشەی بارکردن و داگرتن و گەڕان بەدوای خواردندا لە بازاڕە نادیارەکاندا، کاتێ یەکێك لە ماندوێتیدا مردبێت، هەڵسان لە خەو ماوەیەکی کورت بەر لە بەرەبەیان، ئەمانە هەمووی بەسەرچوو، ئەوەی کە هەیە بیکەین ئەوەیە لەسەر بالەکان- فەردەکان ڕاکشێ و هەناسەی قوڵی حەسانەوە هەڵکێشە، کە دەکاتە تەمەڵیەکی رووت و چێژوەرگرتن لە دیمەنەکە. بۆ ماوەی دوو ڕۆژە لەنێوان کەنارە تەختەکاندا سەرئاو کەوتوین، بەلای هەندێ گوندا تێپەڕین، کە هەمووی کوردن. لە شەودا خۆمان ڕێکخستەوە و هەندێ چیلکەوچەوێڵمان گردکردەوە و ئاگرمان کردەوە و برنجێکمان لێنا.

حاجی و من وەکو گەشتیاری پلە یەك دانرابووین و خاوەنی خەیمە بووین و لەسەر خواردنی لێنراو دەژیاین. ئەوانی تر تەنیا نانی وشك و پەنیریان هەبوو، کە بەش بەشیان کردووە تا بەرگەی کۆتایی بگرێت. وەك دابونەریتی گشتیی ئیسلام و کوردیش بەتایبەتی، داوای هاوڕێیەتی و برایەتی دەکات لەنێوان هەموو گەشتیارەکاندا، ئێمە هەموو شەوێك میوانداریی گەشتیارەکان و دەستەی کەڵەکەکەمان بۆ ژەمی شێوکردنی خۆمان دەکرد.

ئیدی جیاوازی چینایەتی و پۆلێنکردن لەهەر خاکێکدا لەم سەرزەمینەدا خۆی دەردەخات، جا ئەو جیاوازییە بەهۆی پەروەردەوە دروستبووبێ، یان هەڵوێست، یان پارەداریی، ئەوە هەر لە یەکەم ئێوارەوە دەرکەوت. خەریکی شۆردنەوە و پاکردنەوەی برنجەکە بووم، کولاندم و پلاوێکم لێنا، کردمانە ناو ئەو تەنیا قاپەی هەمانبوو، کە سەرقاپێکی گەورەی مسی مەنجەڵێك بوو. داوامان کرد هاوبەشیمان بکەن، بەڵام ئامادە نەبوون بە هیچ جۆرێ کە بێنە پێشەوە و هاوبەشی بکەن. تاقمی کەڵەکەکە، بەهەرحاڵ، زۆر شەرمنبوون و بەڵگەیەکی دڵنیایی بێ بەهای خۆیان هێنایەوە، کە لەدوایدا ناندەخۆن. بازرگانە عەرەبەکە، هەروەها، خۆی بە چەند دەستەواژەیەکی بەئەدەبەوە خەریك کردبوو، بەڵام ناچاربوو لە کۆتاییدا بێتەپێشەوە. سەربازەکە پێویستی بە هاندان نەبوو، دانیشت و دەستیپێکرد بێ ئەوەی چاوەڕێی ئێمە بکات دەستمان دەربێنین و بیبەین بۆ قاپەکە، کردەوەیەکی ناپەسەندی ناشیرین، بەڵام بە چەند هۆیەکەوە هەردوو عەرەب و کورد، کە زۆر حەزیان لە چارەی نەبوو، جنێویان پێدا و خەریك بوو لێیبدەن، وتیان کە ئەو هاوشانی ئەمان نییە و دەبێ چاوەڕێ بکات و دواتر نانبخوات. بۆیە، بە ئەدەبێکی زۆر خراپەوە دەستی کێشایەوە و بە گرژومۆنیەوە

دەستیکرد بە جگەرەکێشان. خواردنی بەلەزەت، یارمەتی ئەوە دەدا کە جۆرێ بەزەیت بە پاشماوەکەیدا بێتەوە، نەمانی کۆمەڵێك خواردنی لێنراو بۆ ژەمێك لەنێوانی هەموو خەڵکانی رێگا و ئاودا لە رۆژهەڵات، هەرگیز پاشماوەی نییە و قاپ شۆردنەکەشی ئەگەر یەك قاپیش بێت هەمیشە لە لایەن دەستەی کارگەرەوە دەشۆردرێت. بەیانی و پاش نیوەڕۆ، چایمان لێناو بەسەر خەڵکانی ناو کەڵەکەکەدا دابەشمانکرد، ئەوەی لە پێشەوە نۆرەیەتی و دوای ئەوە بە پلەیەکی نزمتر دێ. یەکەم خۆم، بۆ ئەوەی هەموویان ناونیشانی ئەفەندیان پێداوم، لەسەر حسابی پاڵتۆ و فێست و وەك ئۆرۆستۆکراتیەك لە کۆمەڵەکەدا تەماشا دەکرام، ئینجا حاجی والی هاوڕێم، دوای ئەو عەرەبەکە، دوای ئەوەی بە رێکوپێکی سێ کوپەکەمان خواردەوە و تاقمەکەش دوو پەرداخیان وەرگرت، هەروەها سەربازەکەش دوای هەمووان بەشەکەی خۆی وەرگرت. لە رۆژی سێیەمدا، شاخێکی گەورە لە بەردەمماندا دەستیکرد بە بەرزبوونەوە، درێژدەبۆوە بۆ ناو رێڕەوی رووبارەکە دوور بۆ رۆژهەڵات و رۆژئاوا. لە شەوی دووەمدا لە گوندێکی کوردەکاندا خۆمان بەستەوە بەر لە گەیشتنمان بە هەندێ تاوێرە بەردی بەرز کە پاسەوانی گۆلە جوانەکانن، کە دواتر ئێمە پێیدا تێدەپەڕین، لێرەدا بەختەکەمان گۆڕا، یەکەم زانیمان کە بەشێك لە خێڵە کوردەکانی ئەو شاخانەی ئێمە دەمانتوانی لەپێشەوە بیانبینین یاخی بوون، کارەساتێکی تەواو ئاساییە و بۆ دەرخستنی پێکۆڵی دەسەڵاتی خۆیان تەقەیان لەوانە دەکرد کە بە رووبارەکەدا تێدەپەڕین. ئەوەش بە دڵنیاییەوە سەرچاوەی نائارامی بوو، بەڵام پێشبینی مەترسیەك هەندێ جار بە نارەحەتی ئێستا بچووك دەبێتەوە. لەژێر بارانێکدا کە لە خۆرئاوابووندا دایکرد، هەموو شتێکمان لەبارەی دز و یاخیبووەکانەوە بیرچووەوە. زریانێکی بەهێز هەڵیکرد، لەگەڵ لێزمەی بارانێکی بەخوڕ، کە لە خێمەکەشەوە دایدەدا، هەڕەشەی ئەوەی دەکرد هەمووی پێکەوە بەرێ بۆ دوور. تاقمە کوردەکەش، کە دەترسان کەڵەکەکە لەژێر رەحمەتی باوبۆراندا جێبهێڵن، کە بەو شێوەیەی ئێستا لەوانەیە بیدات بەسەر داروبەردا و تێکیبشکێنێت، دەبووایە لەسەر کەڵەکەکە بنوستنایە و لەبەرئەو سەرما تیژە خوسابوونەوە و بەو جلوبەرگە تەنکانەوە راکشابوون و هەوڵیان دەدا بنوون. ئێمەش لە خێمەکەدا زۆر لەوە باشتر نەبووین، هەموو پێخەفەکانمان نوقم بوو بوو، لێفەی لۆکە چەند سەعاتێکی دەوێ تا وشك دەبێتەوە، برنج و خەڵوزەکەمان بەرودوابوون بە تڵپە و قوڕ. شەپۆلەکان لە گۆمەکەوە دەرژانە سەر خامەکەی سەرمان و لەوێوە بە روخسار و پشت ملماندا دەهاتە خوارەوە. گۆماوەکان بوو بوو بە داپۆشەرمان و لەناویا نوقم بووین.

## کەشی زریاناوی

نە جلوبەرگەکانمان لەوە زیاتر هەڵدەمژێت و نە پێخەفەکانیشمان، دواجار وەك بەدبەختەکانی دەرەوەمان لێهات، جەستەمان کەوتە لەرزین و هەرچیمان لە خۆمان پێچابوو وەك سارغی ئیسفنجی لێهاتبوو. لە تاریکیەکی بێ تروسکەدا دەبووایە بەسەر بالە قەیسەکاندا بچووینایەتە دەرەوە، لە شەربەتاو و خوسانەوەی قەیسیەکان هەڵدەخزاین، بۆ پاراستنی ماڵە لاوازەکەمان: هەموو چەند ساتێك شوێنێکی نوێ دەبوو بدۆزرایەتەوە بۆ شتە بەنرخەکانی وەك شقارتە، کە ئەو شوێنە نوێیەش بەردەوام دەگۆڕا چونکە بەهۆی بارانی توندەوە بەردەوام تەڕ دەبوو. بەیانی کۆمەکێکی ئەوتۆی نەکردین و لە راستیدا بارودۆخی ئێمەی نالەبارتر کرد، ئەگەر لە گوندەکەدا بمانایەتەوە دەمانتوانی ماڵەکان وەك پەناگایەك بەکاربهێنین. بە گاڵتەکردنی ئەو گۆڕانکاریانە لە کەشوهەوادا، لەگەڵ هەڵهاتنی رۆژدا بایەکە وەستا و وێڕای بارانیش شۆڕبووینەوە. سەعاتێك بەناو شەپۆلدا، کە لەنێوانی گردەکان و ئەو تاوێرە بەردانەی هەمیشە بەرزدەبێتەوە تەسك بووەوە، با دیسانەوە بەرەوخواربووەوە و ئێمەش خۆمان بە گوریسێك بەستەوە لە کەنارەکەدا لەژێر رۆخانەکەوە و ئیدی بەوە خۆمان دابڕی لە هەلی پەناگایەك. بۆ سێ رۆژ و سێ شەو باران و با بوو، تەنانەت نانەکەشمان کە تەنیا شتێك بوو بۆ خواردن، خوسابۆوە. حاجی دووچاری رۆماتیزم بووە و میزاژی ئەوەندە تێکچووبوو، کە من بە ناچاری چووم لەسەر فەردەکانی دەرەوە و دوو شەو لەسەر قەیسی نوستم، خۆم بە شتی تەڕ و خوساو دادەپۆشی، کە تەنیا بایان گلدەدایەوە، بەڵام ساردیەکەی کەڵکی نەیەشتبوو. بەیانی رۆژی چوارەم، هەرچۆنێ بێت، رۆژێکی خۆشە و لە ماوەی نیو سەعاتدا هەورەکە گەواڵە گەواڵە بوو، باکەش بەرەو سەرەوە رۆشت و بەخێراییەکی بەرچاوەوە دەکشا، بەڵام لەژێرەوە رووبارەکە بە رەنگی شینەوە بە نێوان تاوێرە بەردەکاندا دەڕوات، ئێستا دووسەد پێی باش بەرزە و لەو گەرمیەی پێشوازیمان دەکات هەڵمان لێ هەڵدەستێت و ئێستا دەبینین چۆن ئەو سێ رۆژە بارودۆخەکەی گۆڕی. پێوانەی دوو پێ سەوڵەکە لەژێر ئاودایە، رووبارەکەش، لێرەوە بە رێڕەوێکی تەسکدا بەناو شاخەکاندا درێژدەبێتەوە، کە لە هەموو کاتێکی تر تەسکتربوو، بەخێراییەکی ئاشکرا بەو درێژاییە بەتەنیا دەکشا. کەشتیوانە ئازا و نەبەردەکەمان لێیدەربازبوو، ئێمەش دەستمانکرد بە پێشبڕکێ بە درێژی دەورەیەکی بەرچاو لێرەدا. راستە رووبارەکان رێك و کورتن و هەمان شێوەی رەنگی بەرامبەری کەنارەکەیان هەبوو، کە نەدەکرا پێچەکە ببینیت، زۆرجار کەمترە لە گۆشەیەکی راست- تاکو رێکی سەری خۆی. گردە زۆر گەورەکان لەپشتی لێژاییە

نزمەکانەوە بەرزدەبوونەوە، کە بە درەخت داپۆشراوە و لەسەرو هەمووشیانەوە ئێمە دەتوانین لوتکە سەر بە بەفرەکان ببینین. لەم دۆڵە کێویانەدا، لە جوانی بەهاری سەوز، جوانییەکی بێ وێنە کە وەسف ناکرێ، هەستمانکرد_ وەك لە هەموو کاریگەریەکی ئێمەی تێدابوو- بەڵام تویژاڵێك بەدرێژایی رووبارە مەزنەکە راماڵین. لە هەموو بەرودوایەکی شەپۆلەکەدا، بەرەو کەنارە دوورەکە دەچێتە پێشەوە، دەوری رادەمالێ و هاژەی دێت بەناو بەردە ناو بۆشەکاندا و هەموو دەستەکان پەلاماری سەولەکان دەدەن بۆ ئەوەی کەڵەکەکە بپارێزن لەوەی بەسەریاندا بڕوات و پارچە پارچە ببێت. هەندێ جار رووبارەکە لەنێوان خالّەکاندا تەسکدەبێتەوە، یان بەسەر بەردە نوقمبووەکاندا بەناویەکدا دەڕوات، لە شەپۆلە هەڵئاوساوە بەرزەکاندا دەشکێتەوە و خێرایی شەپۆلەکە دووچەندانە دەبێتەوە. لێرەوە ئیدی شارەزایمان خرۆشێکی گەورەتری پێدابن بۆ رابەریکردنی کەڵەکەکە بۆ ناوەندێکی تەواوی یەکگرتنەوەی کەنارەکانی شەپۆلەکان و تێتەقان بەناویاندا بە خێراییەکی زۆر بۆ پەلەکردن لەسەر ئەو هەرایەی لەوێدا کۆبۆتەوە. کەڵەکەکە بەرزونزمی دەکرد، بناغەکەی ئەوەندە توندتۆڵ نەبوو تا رێگری لەو بەرزونزمیە بکات، شەپۆل دەیهێنا بەسەرماندا، خۆمان و شتومەکەکانمان، هەروەها جلوبەرگە نیوە وشکبۆوەکانمانی لە ئاو هەڵکێشابوو، لە کاتێکدا کە کەڵەکەکە زۆر خراپ درزی بردبوو. لەو جۆرە بارە نالەبارانەدا حاجی و بازرگانە عەرەبەکە دەستیان بە بەشێکی بەهێزەوە دەگرت و لە ناخەوە هاواریان دەکرد (یا رەبی سەهل یا رەبی) واتە (خوایە کۆمەك خوایە) هەروەها کە دەریازیش دەبووین بە هەمان گیان و گەرموگوڕییەوە سوپازگوزارییان دەکرد. هەر کە چووینە پێشەوە، ئیدی گرد و دۆڵەکان بەرزتر و لێژتر دەبوونەوە، لەوە دەچوو سەرکەوتن بەسەریدا مەحاڵ بێت، چونکە دەبێتە هۆی گێژبوون. لێرە و لەوێ شوێنێکی تەسك دەبینرێت، کە شەپۆلی پێچخواردوو بەدەوریا کۆدەبێتەوە و لەسەر هەریەکە لەو شوێنانە گوندێکی بچووکی کوردنشین هەیە، خانوی پیاوە سەرکارەکە بە باشی لە بەرد دروستکراوە، لەگەڵ بورجێك وەك روانگە کە لە خاکێکی کەمێ بەرزتردا کراوە. جارێ یان دووجار تەقەکرا، بەڵام خێراییەکەمان لەوە زیاتر دووریخستینەوە لە گەیشتن بە راوچییەکان، نزیکەی پێش ئەوەی بتوانن تفەنگەکانیان سەرلەنوێ دابگرنەوە. دیمەنی ئەم شاخە مەزنانە و ئەم لێژگاییە جێگیرانە، ئەوەندە ئاسانە بۆ تێگەیشتن لەوەی کە سوپاکانی دەستەلاتە کۆنەکانی میسۆپۆتامیا و لە رەوتیاندا هەمیشە رێگەی ئاسانی دەشتی رۆژئاوایی وەرگرتووە و ئەم شاخانەی جێهێشتووە بۆ خێڵەکانی کە لێرەدا نیشتەجێن لەوکاتەوە کە ئاسیای ناوەڕاست ئۆردی ئارییەکانی لێکردنە دەرەوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی

بەر لە مێژوو، بۆ خەڵکانی جیهانی رۆژئاوایی. پاشنیوەڕۆیەك، کاتێ لە دڵگیرترین کەشوهەوادا بووین، پێچمانکردەوە بۆ دوورەدەستیەك و لەپڕ یەکێ لە جوانترین دیمەنەکان هاتە پێشمان و دیجلەی رازاندبووەوە. کەناری لای راستی رووبارەکە بەرزبووەوە لە شێوەی سەرەوژوورکەیەکی ستونی بۆ بەرزیەکی زۆر و بەهۆی ئەو تاشە بەردانەی کە زۆر بەرز نەبوون بەرەنگاری شەپۆلێکی فراوان دەبووەوە، بەڵام خانوچەکەکانی ئەشکەوتەکەش لە پورەی هەنگ دەچوون. لێژاییەکەی دەستی راست (کە لە ئەنجامی دابڕانی لایەکی شاخەکەوە بەهۆی ئاوی رووبارەکەوە پەیدا بووە) لە شوێنێکدا شکاوە و دیسانەوە بەردەوام دەبێتەوە، دۆڵەکە- بەڵام چەند یاردێ لەوبەرەوە- دادەبەزێ بۆ کەناری ئاوەکە. لەسەر لوتکەی ئەو بەشە بەردەوامەی کە ئێمە دەتوانین لێیەوە شارێکی گەورە ببینین، ئەوەندە ئاستێکی بەرزە کە قەوارەی مرۆڤ بچووك دەردەکەوێت. لە پشتی هەموویەوە، لای شاخەکانەوە بە لێژاییەکی توندا بەرزبوونەتەوە، لەنێوان گەرووەکان و دۆڵەکاندا دەتوانرێ هێشتا گاشەبەرد و لوتکە کاولەکان ببینرێت. لە گوندەکەدا یان شارۆچکەکەدا دوو یان سێ بورجی باریك و درێژ بەرزبوونەتەوە، لە قەوارەی دووکەڵکێشی کارگەیەکدا، زیاتر باریك و بەرزە لەو شوێنەوە کە لەسەری وێستاوە. بەڵام لە هەمووی گرنگتر شۆستەکانی پردە هێجگار گەورەکەیە، کە لە خاڵێکی داوێنی لێژاییەکەوە هەڵدەقوڵێت، یان روونتر بڵێین لە خاڵێکی سەر لێژاییەکەی دەگاتە دەریاچەی پێشەوە، رووبەرێك درێژدەبێتەوە بۆ لێژاییەکەی بەرامبەر، بەربەستی دیجلە زیاتر لە باشووردا دەکات، لەچاو هەر پردێکی بەردین کە هەیە. لێرەدا جۆگەیەکی فراوان و قوڵە و پایە بەهێزەکانی بورجی سەرو و سێبەری تێپەڕیوو بەلای کەڵەکی وێرانەدا، باسی کۆڵنەدان و ئامادەکاریی خەڵکانی رابردو و کۆچکردو و بە بەراورد لە چۆنیەتیەکانی عوسمانیەکان دەکات. لە هەردوو لاوە لە کەناری لای چەپەوە یان رۆژهەڵات، لەوێدا کە کەنەڵانەکە تا دەهات نزم دەبووەوە بۆ کەناری دەریاکە و لە رۆژئاوادا، کە لەوێدا پەنگدەخواتەوە و کەنارە بەپیتەکانی پێشەوە جێدێڵێت و رووەکانی ئانگاوتە دەبێت لەگەڵ خانوەکانی ئەشکەوتەکە و بەردە قەڵاییەکان کە بەیەکەوە نوساون. ژووری سەیر لەلاکەی رووبارەکەوە کراوەتەوە، تەواو ترسناکە، دەڕوانێت بەرەوخوار بەسەر جۆگاکەدا و ئەوەش تەنیا یەك رووی نزیکیە لە رێگەی پێگەیشتن دەردەخات و چوونە ناو ئاویش بە بەردایە. لە گوندەکەی سەرەوە پلیکانە بە شێوەی پێچاوپێچ بۆ خوارەوە بە کەنەڵانەکەدا براوە بۆ ئەو شوێنەی رووبارەکە دەگاتە دیواری بەردی و رەقەنیەکان.

## حەسەن کێف

ئەم شوێنە نایابە، دوور لە ڕێڕەوی هەر ڕێگەیەکە، تەنانەت لە کاریگەری لاوازی تورکی شاخەکانی دەورویەریشی دوورخستۆتەوە، ئەویش پێدەوترێ حسن کێف.[9]

ناوەکەی ناوێکی نوێیە و وەك شتێکی کۆن دەیگێڕنەوە بۆ ئەوەی حەسەن کێف کە ڕێگرێکی کورد بووە و لەم ناوەدا خۆی قایمکردووە، چونکە ناوچەکە پێویستی بە سیپە و حەشارگەی دروستکراو نییە، لێرەوە هێرشی کردۆتە سەر هەموو ئەوانەی چوون بۆ سەر ڕووبارەکە. زووربەی خەڵك دەڵێن پردەکە ڕۆمانییە و بەڵام شارەزایانی دواتر لەوانەی کە بیردۆزی باشتریان بۆ دەوڵەت داڕیکرد، کە ئەوە ڤینیتیانە، پاشماوەی ڕێگا کۆنەکەیە بۆ ڕۆژهەڵات. لە ڕاستیدا لەو بڕوایەدام هەروەها لە شارۆچکەکەدا ئاسەواری ڤینیتیایان دۆزیبێتەوە، لەوێدا کە ئاسەوارەکانی تێدایە. لەوانەیە کە ڤینیتیان ناوبانگی مێژوویی شوێنەکەی زانیبێت بەرلەوەی خۆیان بێنە ناوچەکەوە. هەروەها دانیشتوانیشی لەوانەیە هەمیشە هەر کورد بووبن، ئەرمەنیەکانیش کە لەوێن پێش قەڵاچۆکردنی ئەرمەنیەکان کۆچیان کردووە. ئێستا کوردەکان جارێکی تریش شوێنیان بۆ خۆیان هەیە و لەژێر سایەی حوکومەتێکی گەندەڵ و بێ توانای ئەمڕۆدا ناوبانگی کۆنی خۆی گەڕانەوە. لێرەدا هەروەها هەندێ ئیزیدی هەن، کە کەسانێکی خاوەن ڕۆحی سادە و سافن، لەبری ئەوەی هەوڵ بدەن خۆشەویستی خوای مەزن بەدەست بهێنن، کەچی هێزی شەڕ و زیاتر لە تواناکان لەم ژیانەدا و هەوڵدان بۆ ڕەزامەندی شەیتان کاردەکەن، کە ئەوەش لەوانەیە لە هەمان شتەوە هاتبێت کە کاریگەرە لەسەر ژیانی ڕۆژانەیان.

ئێمە لێرەدا ناوەستین، بەڵکو ڕێمان بەخۆمان دا زیاتر تێپەڕین، بەرەوخوار بۆ فراوانیەك کە لە داوێنی چیاکاندا هەیە و لەگەڵ داهاتنی تاریکیدا کەڵەکەکەمان لەوێدا بەستەوە، کە ڕووبارەکە بەشێوەیەکی گەورە فراوان دەبێت و بەشێوەیەکی تیژ بەرەو لای ڕاست پێچدەکاتەوە.[10]

---

[9] - بەداخەوە ئەم ئەفسانەیە لەوەدا کەموکوڕی هەیە کە لە خونجەکردنی پیتەکانی حەسەندا بە هەڵەدا چووە، چونکە ئەوە ئەو ناوە نییە کە لە وڵاتانی ئیسلامیدا خەڵکی بەکاریان هێناوە و لەگەڵی ڕاهاتون، بەڵکو وشەیەکی عەرەبییە و بە مانای قەڵا دێت یان قەڵای بەردین بە مانا کۆنەکەی، ئەوەش لە گەردانکردنی وشەکەدا دەبێ ئەوە بزانین کە پیتی دووەم (س) نییە، بەڵکو (ص)ە و وشەی حەسەن دەبێت بە (حصن).

[10] ناوە کۆنە عەرەبیەکەی شوێنەکە (رەئس ئەلقەول)ە و لەسەدەی یانزەیەمین و دوانزەیەمین لەژێردەستی دەوڵەتی ماردینیدا بوو. کە لە 1263دا دەستبەرداری بوون بۆ یەکێ لە تیرە کوردیەکان بەناوی ئالی ئەیوب (تیرەی سەلاحەدین، ناودار لە جەنگی خەچەکاندا) کە ئەم تیرەیە خۆشی پەیوەندی بە تیرەی هەکاری مەزنەوە هەبوو کە لەم ناوچانەدا نیشتەجێبوون، ئەو شوێنە بەدەست بنەماڵە و نەوەکانیەوە بوو لەوکاتەوە. لەوانەشە مێژووی بوونی قەڵاکە بۆ زۆر کۆنتر بگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەڵێن ئالی ئەیوب بینایانکردووە.

جارێکی تر لە شەودا باران دایکردەوە، جارێکی تر خۆمان و جلوبەرگەکانمان لە ئاو هەڵکێشرایەوە. شتومەکەکان ئاوێکی زۆریان هەڵمژی، کە کەڵەکەکە لەوە دەچوو نوقم بووبێت. لە سەرەتادا پێستەکان نیوەی ئاو بوو، کە دەبووایە بەهۆی شێوە کەوچکێکی چەرمینەوە بەردەوام ئاوەڕشێن بکرانایە، تا بەرگری لە وشکبوونەوە و قڵیشاندنیان بکرایە، بەڵام لەمیانەی دوو ڕۆژی رابردوودا لە ئاودا بە دەرەوە نەبوون و تەنانەت ئێستا مژانە دارەکانیش دیارنین. قەیسیەکانیش لە بارانی یەکەمەوە نوقمی ئاو بوون، هەڵئاوساون و قەڵەو بوون، یەک ڕۆژ هەتاو دیوی دەرەوەی کیسەکانی وشک کردۆتەوە و بۆنێکی ناخۆشیان لێدێت. ئێستا هەموو شتێک سەرلەنوێ پڕبۆتەوە لە ئاو و بەو بۆنەیەوە هەوایەکی سارد هەڵیکرد، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە بەرەبەیان نزیکی شاخەکان بووینەوە کە تازە بەفر داپۆشیبوون. لە سەعاتی دووەمی ڕۆژدا لەنگەری کەڵەکەکەمان هەڵکرد و پاڵمان پێوەنا تا بچینەوە ناو دەریاچەکە، لەو پەلە پەلی خێراییانەی کە تەوژمی شەپۆلەکان دەیشکاندەوە بەسەرماندا. ئێرە (بوهتان سو)ە، گەورەترین جۆگایەکە کە دەچێت تا دیجلەی تەواو پێکبهێنێت و دەچێتە ناو شوێنێکی فراوانەوە، دورگەیەک لەنێوان هەندێ کردۆڵکەی بەرزدا. بە درێژی میلێک یان لەو دەوروبەرەدا بەگەیشتنی بە ڕووبارەکە بەدرێژاییەکی فراوان و قوڵدا دەکشێت، ئینجا ناچار دەبێت کە ئەو تەنیا دەربازگەیە وەرگرێت بەناو ڕێڕەوێکی تەسکدا، کە لەناوەندی ئەوێدا خێرایی دووچاری سەرەکێژە دەبێت. ئێمە نزیکی پێچەکە بووینەوە، ژمارەیەک کورد دەرکەوتن، بە دۆڵەکەدا ڕایاندەکردە خوارەوە بۆ ڕووبارەکە و هەر کە نزیک بوونەوە دەستیانکرد بە تەقەکردن بەسەر ئێمەدا، بەر هیچ نەکەوتن تەنیا باڵەیەک یان دوو باڵە نەبێت، بەڵام سەرنجیان زیاتر بەلای کۆمەڵێکی تردا دەچوو، کە لە بەرزییەوە دیاربوون، بە خرۆشەوە شاپڵێتەیەکی بریسکەدار بەرەو هێرشبەرەکانی ئێمە دەهات. زۆر بەداخەوە ئێمە لە بارودۆخی ئەوەدا نەبووین تا بوەستین و تەماشای گۆڕانکاریەکان بکەین، بەڵام کە پێچمانکردەوە بینیمان شەڕەکە بەخێراییەکی سەیر لە بەرەوپێشچووندایە. من زۆر شادانبووم کە بەخت هاوەڵی سەفەرمان بوو. لەوە دەچوو دەستەی کەڵەکەکە وا هەست بکەن کە شتێکی زۆر ئاساییە، هەرگیز لە سەوڵلێدان نەوەستان، لە ڕاستیدا ئەوەش مەحاڵ بوو لەو ڕێڕەوە پڕ بەردەڵانەدا واز لە دابینکردنی کەڵەکەکە بێنی.

## جەزیرەی ئیبن عومەر

حاجی و عەرەبەکەش هەروەها لە کاتێکدا کە زۆر بە وریاییەوە دەچوونە پشتی بالەکانەوە بۆ خۆپاراستن، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوایە هەر زوو خۆمان لەو مەترسییە دووربگرتایە، کە زۆر ناخۆش بوو، بەڵام تەنیا خوێنی کورد قوڵپی ئەدا لای پیرەی بەساڵاچوو کە بیری دەکردەوە لەوەی تفەنگێکی دەستناکەوێت تا وەڵامیان بداتەوە.

لەگەڵ یەکەم تەقەدا سەربازە تورکەکە دیارنەما، دوای ئەوەی خۆی ترنجانبووە بەینی کیسە قەیسیەکان و مژانە دارەکانەوە، کە پەیدابووەوە سەرتاپای باڵای قوڕ و تەڕی بوو. ئەو ڕۆژە لەوە زیاتر نەدەڕۆیشتین، ئەویش لەبەر باران و ئەو زریانەی دووبارە هەڵیکردەوە و دەبوایە کەڵەکەکە ببەستینەوە، بەڵام بەیانی باش بوو، لەگەڵ ئەوەی کە بارودۆخی کەڵەکەکە نائارام بوو، کە لەژێرەوە شەپۆلی دەدا و ئێمەش سووربووین لەسەر ڕۆشتن تا جزیرە، کە شارۆچکەیەکی بچووکە لە داوێنی چیاکاندا و بەگەیشتنمان بۆ ئەوێ هەموو دەقیقەیەك زیاتر قوڵ دەبوو، تا کەمێ دوای نیوەڕۆ تەواو نوقم بوو. لێرەدا تاقمی کەڵەکەکەمان گۆڕا و دووانی تر کاریان گرتە دەست، کاروباری گۆڕینی تاقمەکە بەوە دەستیپێکرد کە دەبێ ئاماری هەموو شتێك لەسەر کەڵەکەکە بکرێت، هەروەها گەشتیارەکانیش، کاتێ کەسێکی تازە کارەکە لە ئەستۆ دەگرێت، سەیری دەوروبەر دەکات و لەویرپوایەدایە هەموو شتە پێویستیەکان چارەسەربکات، یان شتومەك و گەشتیارەکانیش ڕێکبخاتەوە وەك دەگونجێت. کاتی بە فیڕۆ نەدەدا و چووە ناو ئاوە ساردەکەوەو پێستە فشبووەکانی ڕاکێشایە دەرەوە و فویکردە ئەوانی ترەوە و خراپەکانی گۆڕی و تا خۆرئاوبون هەمووی ڕکێخستەوە. دەبوو بەیانی دەستپێبکەینەوە، بەڵام جارێکی تریش باری نالەباری کەشوهەوا بەسەردا هاتەوە و خراپتر لە جاران و هەموو شتێکی ڕاماڵی بۆ ناو ئاوەکە و ئێمەی بە سەڵتە زەلامی لە کەنار ڕووبارەکەدا جێهێشت و ئیدی چووینە ناو کونی دیوارە داڕوخاوەکانی قەڵا کۆنەکەوە. جەزیرە، یان جەزیرەی ئیبن عومەر، جارێ لە جاران گرنگ بووە، بەڵام ئێستا گوندێکی گەورە و پیسوپۆخڵی داڕوخاوە، لەلایەن عەرەب و کورد و تورك و مەسیحیە هەمەجۆرەکانەوە ئاوەدانە. ئەوەی کە گەواهی گرنگیەکەی دەدات بوونی هەندێ لە کەسانی پۆلیسە و ئێمەش هەر زوو هەستمان بە بوونیان کرد. کاتێ سەرەتا گەیشتین، هەر چۆن کەموکوڕیمان لە هەندێ پێویستیدا هەبوو، چووم بۆ بازاڕ بەدوایدا بگەڕێم، کە شتی باش و بە بڕی باش هەبوو بە بەراورد لەگەڵ قەوارەی شوێنەکەدا، هەروەها گەرماوی گشتیشی تێدا بوو، هەر کە لوتم بردە ناوەوە و هەڵهاتم.

بازاڕەکە گوریسیان دەفرۆشت (کە لەلای خۆیان بازاڕەکە بەوە ناودارە) و هەروەها خورما، پەنیری وشك، میوەی وشککراوە و کشمیش و شتومەکی هێنراوی ئاسایی. خورمام دەویست، لەبیرمە و کاتێکی سەیر بوو دەستتبکەوێت، دانیشتوانەکەی زۆربەی کوردن، باوەڕیان نەدەکرد جگە لە تورك شتێکی تر بم، فێستەکەی سەرم و پاڵتۆی درێژ لە بیری ئەوانەدا پەیوەندە بەو رەگەزەی کە پانتۆڵ و چاکەت لە هەمان قوماشی نایاب دروستدەکەن، هەروەها کراس و یەلەکیش. ئەوەندەم تورکی پێبوو کە ئێستا قسەی پێبکەم، بەڵام کوردیەکە زۆر بە ئاسانتر بە دەما هات، هەر کە گەیشتمە یەکەم دوکان، کە خورمام بینی دانرابوو بۆ فرۆشتن، بە کوردی هەواڵی نرخەکەیم پرسی و وەڵامەکەی بە تورکی درایەوە. هێماکردنی نرخەکە بڕوام پێکرد کە ئامادەبم بیدەم، دڵنیاییم لەوەوە وەرگرت کە بە تورکی وتی، لەگەڵ ئەو دڵنیاییەشدا بەبێ شانازی، کە قسەکەر ئەو زمانەش دەزانێت.

"زۆر باشە"، وتم، "بەڵام نازانم"

"چۆن؟ تەنیا هەر عەرەبی دەزانی؟"

"نەء عەرەبی نازانم، تۆ دەبێ کوردی بزانیت."

"لە کوێوە هاتویت؟"

"دیاربەکر و حەڵەب و شارەکانی رۆژئاوا"

"عەرەبیش نازانی؟"

"نەء ناشمەوێ قسەی پێبکەم ئەگەر لەگەڵ کوردا قسەبکەم."

" کەواتە تۆ دەبێ کورد بیت، بەڵام زمانەکەت وەك ئەوەی ئێمە نییە، وڵاتەکەت لە کوێیە؟"

" وڵاتەکەم ئەوەیە کە تۆ نەتبینیوە- ئێران"

" ئێران" بە سەرسوڕمانێکەوە و هاواری کرد بۆ دراوسێکەی، "ئەمە ئێرانیە!"

ژمارەیەك لە دەوری کۆبوونەوە، بە تاسەوە دەیانویست من ببینن، لەبەرئەوەی ئەوە راستیەکی سەیرە کە لە هیچ شوێنێك بە درێژایی رووباری دیجلە لەسەرو بەغداوە ئێرانی تێدانییە و هەرگیز نەهاتون و زۆرترین خەڵکانی نامۆ لەم گۆشەیەی دەرەوەی رێگایەدا لە یونانەوەیە.

هەر دەستبەجێ کۆمەڵێکی گچکەی لەدەور کۆبووەوە و خورماکڕینەکەی منی پشتگوێ نا، بە دڵ بردمی بۆ قاوەخانەکە و بۆ ماوەی سەعاتێ یان دوو سەعات لەوێ هێشتمیانەوە و سەرقاڵیانکردم بە وەڵامی پرسیارەکانیانەوە لەبارەی ئێرانەوە و کەمێ شارەزایی لەبارەی جەزیرەوە.

## گۆڕینی دەستەی سەرکەڵەکە

لەو جیاکەرەوە سەرەکیانەی هەیبوو، بەپێی بۆچوونی ئەوان ئەو پردەی کە بەسەر رووبارەکەدا تەنیا لە وەرزی هاویندا مەودای پەڕینەوە دەدا و ئەو گردەی کە گەمێ و کەڵەکەکان لە داوێنیا لەنگەر دەگرن، دەڵێن کەوتۆتە باکووری رێگاکە بۆ ئارارات.[11] ئیدی لە دواییدا دەربازبووم و خورما و حەبلەکەم کڕی، دەگەڕامەوە بۆ کەڵەکەکە، کاتێ چاوم کەوت بە بەلەمەوانەکەی ئەم دواییەمان، کە بۆم دەگەڕا تا خواحافیزیم لێبکات، لەبەرئەوەی بەپێ دەگەڕایەوە بۆ دیاربەکر. من پێشنیاری ئەوەم کرد کە چەقۆ بچووکەکەی بەریاخەڵی بدەمێ، بەڵام ئەو بینی کە شتێکی هاو بەهای پێنیە، بەڵام لە بەرامبەر ئەو چۆرەکە شیرینەی پێیدام، رازی بوو بە چنگێ خورما. ئەو رۆژانەی پێنج رۆژی ئیشکردنی پرماندوێتی تازە وەرگرتبوو، کە پێویستی بە شارەزایی و لێهاتوویی و راستوڕەوانی هەبوو، بە دوو شلن، شتێکی سەیر نییە خەڵکی بۆ خستنەکار کوردیان لە عەرەب و تورکی تەوەزەل و نالێهاتوو پێ باشترە. رۆژی سێیەم ریزێکی زیاتر لە پێستە لەگەڵ سێ مژانەداری تر خرایە سەر کەڵەکەکە و نیو سەعات بەرلەوەی دەبوو دەستپێبکەین، هەشت سەرباز لە فەوجێکی تورکیەوە لە خەرپوتەوە بە هێواشی هاتنە ناو کەڵەکەکەوە، لە کاپتنی کەڵەکەکەیان دا، چونکە ئەو ناڕازی بوو، ئەو بوونەوەرانە، بە هەڵسوکەوت و ترسنۆکی و درندەییەکانی دواتریانەوە، وا بێتاقەتیانکردین تا رادەی ئەوەی کە گەلۆری و ناپەسەندیان بووە هۆی ئەوەی کە گەشتینە ئاستی ئەوەی دەبووایە هەموو بچووینایەتە دەرەوە و لە جەزیرەوە بە پێ رۆشتن بچووینایە بۆ موسڵ. بەهەرحاڵ، هەوڵماندا رازییانبکەین لەو شوێنانەدا دابنیشن کە نابێتە هۆی تێدانی هاوسەنگی کەڵەکەکە، کاتێ لەسەر دیوارە روخاوەکەی سەرەوە دوو کەس کە بەرگی سەربازیان لەبەردابوو دەرکەوتن و سێیەمیش کە هات بۆ سەر کەڵەکەکە بێباکانە وتی پۆلیس بانگتان دەکەن.

---

[11] - بە کردەوە گومانی تێدا نییە کە چیرۆکی گەشتی کەشتیەکان زۆر ورد نییە بەو شێوەیە لە یونانەوە و هەندێ لەو سەرگوزەشتانەی تر تێیناگەیت لە تۆمارگەکانی جولەکەکانەوە. سێر ولیام ویلکۆکس ئەوەی سەلماندووە، ئەوەی کە کاری لە رارەوە ئاوییە کۆنەکان لە دۆڵی رافیدەیندا کردووە و بەم نزیکانە ناودار دەبێت، بە کردەوە ئەوەی سەلماندووە کە زریانەکەی نوح لە وەرزێکی تایبەتیدا بووە، کە هەموو دەشتە تەختەکانی خوار دیجلە و فوراتی داپۆشیوە، ئەوەش ئەو شوێنەیە کە ئێستا هەموو ساڵێك ژێر ئاو دەکەوێت. ئارارات کە کەشتیەکەی نوحی لەسەر نیشتەوە ئوری کلدانەکان بووە، دەکەوێتە سەر شاخێك کە لە پاشماوەی ئاو و لافاوەوە پەیدابوو لە وەرزەکانی ژێر ئاوکەوتن بەچەشنی زەریایەکی بێ سنوور بەرزاییەکی بەرچاوی تێدا دەرکەوت. لەسەرو ئەوەشەوە و بەتەواوی بەریەرچی تواناى گەشت بۆ ئارارات دەداتەوە و ئەوەش راستیە کە بۆ ماوەی هەزار ساڵە ئەو با بەهێزە لە وەرزی بەهاردا لەلای باکورەوە دێت، دەبووایە نوحی لە باشووردا گلبایەتەوە، تەنانەت ئەگەر بتوانین ئەو راستیەش پشتگوێ بنێین کە تەوژمی ئاو بۆ باشوور بەرەو دووروگەی فارسیە، هێچیش نەڵێین لە هەموو چیا بەرزەکانی کوردستان و ئەرمینیا لەنێوان کلدان و ئاراراتدا.

## کێشەی زیاتری پاسپۆرت

حاجی، عەرەبە بازرگانەکە، سەربازەکە و خۆم بە دیوارەکەدا سەرکەوتین و بە روویەکی گرژەوە فەرمانیدا کە پاسپۆرتەکان دەرکەن. لەگەڵ ئەوانی تری نەبوو، چونکە ئەوان پاسپۆرتیان نەبوو، بەڵام پاسپۆرتەکەی من ئامادەبوو، دامێ، هیوای ئەوەمان دەخوازت بە چەشنی دیاریەکر ئەمەش بە ئاسانی تێپەڕێت. کەچی وانەبوو، پۆلیسەکە هەموو شتێکی خوێندەوە و ئینجا بەتوندی رووی کرد بەلای منەوە و ئاگاداریکردم کە من پەساپۆرتی گەشتیاری ئینگلیزم دزیووە، منێك کە بە ئاشکرا رۆژهەڵاتیم، یان بۆ گەشتکردن بەم شێوەیە، ئەم جلوبەرگە، ئەو ئاشناییە لەگەڵ کورد.
بێهودە من نارەزایم دەربڕی و ئەویش ناوەکەمی خواست، بەتوڕەییەوە گوێم لە دەنگی حاجی بوو، وتی هەر ئێستا گەیشتووە. "ئەمە موسا ئەفەندییە پیاوێکی خانەدانی ئێرانییە و گەواهی ئەوەی بۆ دەدەم، هاوڕێ و هاوەڵێکی زۆر باشە، دۆستایەتی خۆشە و موسڵمانێکی خواپەرستە." پۆلیسەکە پاسپۆرتەکەی بە هەوایەکی سەرکەوتوانەوە پێچایەوە و بە دوو پیاوەکەی وت کە من ببەن بۆ پۆلیسخانە. بیرێکی کوتوپڕ یارمەتی بارودۆخەکەی دا.

"من لەژێر چاودێریی بەریتانیدام،"هاوارم کرد"، بەخەرە ئەستۆی خۆتەوە، سوپاس بۆ خوا قونسوڵمان لە موسڵ هەیە، کە چاوەڕێم دەکات، ئەگەر من نەگەیشتم، مەگەر شەیتان جەزاکەی بدات."

خۆشبەختانە پاسپۆرتەکەم بەیانی خۆیەتی بریتانی پشتگیری دەکرد.

"ئینجا چۆن دەبێت" پۆلیسەکە وتی، کە هەرگیز گومانی لە موسڵمان بوونی من نەبوو" تۆ ناوەکەت ناوێکی موسڵمانانە نییە؟ و زیاتر وەك پرۆتستانتێك دەردەکەوێت، کە هەموومان دەزانین جۆرێکە لە مەسیحی؟"

بلۆفێکی لاواز پاراستمی، لەوانەشە ئەوان باوەڕیشان بە راستی وردەکاری نووسراوەکەی ناوی نەکردبێت.

" بەڵام بەگوێرەی ناوەکەوە،" وتم" یاسای ئینگلیزی تەنیا نازناو دەناسێتەوە، ئەگەر تۆ خەڵکی موسڵ بیت، بۆ هەرکوێ بچیت بانگت ناکەن موسڵاوی؟ تۆ لەنێوان خەڵکانی غەریبدا موسڵاوی ناناسیت؟ منیش ئاوا بە (تیل سۆن) دیاریکراوە، کە شوێنی ژیانمە. هەروەها حاجیش دڵنیایکردنەوە کە من ئێرانیم، بۆچی، ئەوە بە تەواوی راستیە، خۆ هەزاران ئێرانی نییە لەژێر سایەی بریتانیدا لەدایك بوویێت؟ خوا دەزانێ بۆ ئەو کاتبە ئەرمەنیە کافرە لە نوسینگەی پاسپۆرت

لە ئەستەمبوڵ کردومی بە پرۆتستانت، جگە لەوەی کە بینیومی من لەژێر چاودێریی ئینگلیزدام بۆیە هەستی کردووە وەك هەموو نەتەوەی ئینگلیز منیش پرۆتستانتم و دەبێ هەروەها منیش سەر بە هەمان مەزهەب بم."

سەرۆکی پۆلیس هەموو ئەو شتانەی سەیر دەهاتە پێش چاو، بەڵام یارمەتیەکی چاوەڕواننەکراوم لەلایەن ئەفسەرێکیەوە پێگەیشت، کە لەوە دەچوو لە ئەستەمبوڵ بوویێت و وەك راستی زانێك جەختی لەسەر ئەوە دەکرد کە دابونەریت و یاسای ئینگلیزی زۆر باش شارەزایە، هەروەها ئەوەی کە من وتومە زۆر نزیکە لە راستیەوە، ئیدی هێرشبەرەکان بێدەنگ بوون و هێشتا یەك لێدانی زیاتر ماوە و بەئاشکرا تەواو کارتی بردنەوەیە.

"کەواتە ئەگەر تۆ بە تەواوی ئینگلیز بیت،" بە ئاسایی وتی،" پاسپۆرتە ئینگلیزیەکەتمان بۆ دەربێنە."

منیش پێشانم دان، لەناوەندی خامۆشیەکدا کە ئەو بەڵگەنامە سەیر و شێوە سامدارە رزگاری کردم.

بەبێ ئەوەی یەك وشە بڵێت، ئەسکەرە تورکیەکەی دایەوە دەستم و ئێستا هەستی سەرکەوتنم دووچەندانەیە، بۆ سەلماندنی زمان شاردنەوەکەش شێوازێك بوو پێکمهانی بوو کە زۆر نمونەیی بوو، هەروەها لە هەمان کاتدا کۆمەڵێکی جیاوازی شەرخواز و تورك لە دەورم بوون، کە ئەو سەرسەریانە ناتوانن سەرانەم لێبسێنن، کە تاکە خواستی بنەڕەتی پۆلیسە.

نیوسەعات دواتر، حاجی و بازرگانە عەرەبەکە گەڕانەوە، نەفرەتیان لە تورك دەکرد، پیرە پیاو پاسپۆرتی هەبووە، کە سی و پێنج ساڵ لەوەبەر لەرۆژگاری سوڵتان عەبدولعەزیزدا سەربازی تەواوکردووە و پێیان داوە، کەچی زۆریان لێکردووە تا مەجیدیەك جەزا بدات چونکە زۆر کۆنە.

عەرەبەکەش بەڵگەیەکی هاوشێوەی هەبوو، هەروەها هەمان بڕە جەزای دابوو، لەگەڵ هەستی بارسوکیەکی مەزندا، کە تەنانەت لەوانەشە بوونی ئەو هەشت سەربازەی ناومان جۆرە چەوسانەوەیەك بێت، بەڵام گوێمان پێنەدان و گەشتەکەمان بۆ موسڵ دەستپێکرد.

لێرەدا چەردەیەك وشە لەبارەی جەزیرەوە پێویستە بوترێت. ماوەیەکی دوورودرێژ لەلایەن رۆمانەکانەوە داگیرکرابوو، کە قەڵاکەیان بیناکرد، بەڵام پێش ئەوە ئاستەکەی لە دەم چوونە ناو سیستمی چیاکانی ماسیوس گرنگیەکی وەك پاسەوانگایەکی شاری نەینەوای هەبوو، لە سەردەمی

ئاشووریەکانەوە، ئەو گرنگییەی هەبوو، کە تا ئەم سەردەمەش پارێزگاری لێکراوە، کاتێ کە دەستەڵاتی تورك لەناوی برد.

"میهرداتس"ی چارەڕەشی خۆدەرخەر لە ساڵی 49 زایندا بێرەدا تێپەڕی، تراجانی ئیمپراتۆر، لە رێگای خۆیدا بەرەو باشوور، دوای سەدەیەك کردی بە گەنجینەی ئەو دارو تەختانەی لە چیاکاندا دەیبڕییەوە، بۆ دروستکردنی کەشتیەکان، بۆ داگیرکردنی وڵاتی بابل، ئینجا کەوتە دەستی ئاشکانەکانەوە. پێمان وتراوە کە زۆر ئازاریان بەدەست کوردە شاخاویەکانەوە چەشتووە و دواتر زۆر شەڕی خوێناوی تێدا بەرپابووە. بۆماوەی چەند ساڵێك لەلایەن خانە کوردە مەزنەکانی تیرەی هەکارییەوە داگیر و فرمانڕەوایی کراوە، هەروەها ناوەندی کلدانەکان بووە کاتێ فەرمانڕەواییان لەوێ کردووە. لە جیهانی ئەدەبی رۆژهەڵاتیدا ئاستەکەی وەك زێدی ئیبن ئەسیری مێژوونووسی مەزنی عەرەب دیاریدەکات، کە لەوێدا لە 1230دا لەدایکبووە. ئەمڕۆ دانیشتوانێکی تێکەڵی هەیە و ناوبانگی تەڵەکەبازی و خیانەت و ئاژاوەگێڕییان دەرکردووە.

لێرەدا دەشتێکی فراوان دەستپێدەکات، کە جارجارە لەلایەن گردۆڵکەکانەوە دادەبڕێ، تا لە دوایدا لەداوێنی زنجیرەکانی سنجارەوە لە باشووری موسڵدا دادەبەزێ بۆ ئاستی نزمی دەشتی میسۆپۆتامیا، کە تەنانەت گردێکیشی پێشنایەت و راستەوخۆ درێژدەبێتەوە بۆ دوورگەی فارسی.

تێپەڕبوون بە جەزیرەدا بە ئاسایی لە وەرزی بەهاردا تەنیا دوو رۆژە، بەڵام ئێمە لەوەدا ئەوەندە بەختەوەر نەبووین. کەڵەکەکەمان زۆر قورس بوو بۆ سەوڵلێدان و هەروەها رووبەرێکی فراوانی هەبوو بۆ با و ئەمڕۆش دوای ئەوەی جەزیرەمان جێهێشت، سروەیەکی بەهێز بەپێچەوانەی کەنارەکەوە راپێچیدەکردین. ئێمە لەگەڵ ئەو خۆکێشانە تۆقێنەرەدا بە دارو درەختەکاندا، هەندێ لە پێستەکان تەقین، لە راستیدا زیانێکی ئەوتۆ روویندا. ئەوەش بەسبوو، بەتایبەتی بۆ سەرباز. پێکەوە هاواریان لـێ بەرزبووەوە و نەفرەتیان لە رووبار و رەشەبا دەکرد، کەڵەکەکەیان بەرەو قەراغەکە دەبرد، لەگەڵ ئەوەی قەراغەکە تەنیا پێنج پێ دەبوو ئێمەش بە خێراییەکی زۆر دەرۆشتین و خۆمان نەگرتەوە بۆیە بازیاندایە دەرەوە و هەرچی پاڵتۆ و پێڵاوەکان و خواردنەکانیان هەبوون لێیان بەجێما.

لەنگەری گرت:

دوو یان سێ کەسیان نزیك بوون، لە نوقومبوون رزگاریان بوو، ئەوانی تر هەموویان کەوتنە ناو ئاوە تەزیوەکەوە. تەکانمان دەدا بەرەو ژوور، هەوڵیاندەدا پێمان بگەنەوە، هاواریان لێدەکردین کە

بووەستین، ئەوەندە بێ ئەقڵ بوون وایاندەزانی کە بەقسەیان دەکەین، بەڵام بەو خێرایی و پەلەیەی کە دەڕۆیشتین، بڕوایان هێنا کە پێمان ناگەنەوە و بێچارە لەو چۆڵەدا هەر جنێویان دەدا و کفریان دەکرد. ئێمەش بەری ئەو هەڵهاتنەمان بەسەلامەتی نەچنییەوە، گۆشەیەکی کەڵەکەکە زۆر بە خراپی شکا و لەناوچوونی هەندێ لە پێستەکان بووە هۆی ئەوەی بەشێکی گەورەی لە ئاوەکەدا نوقوم بێت. لەسەرو ئەوەشەوە، قایشی سەوڵەکە لە شوێنی خۆی دەرچووبوو، کە کاری سەوڵلێدانی زۆر دژوارتر دەکرد. لە هەموو ئەوانەش خراپتر، تەوژمی ئاوەکە زۆر خێراتر بوو، نەمانتوانی شوێنێك بدۆزینەوە کە ئاوەکەی مەنگ بێت تا ڕێمان بدات لەنگەربگرین. تا ڕۆژئاوابوون دەبوو بەردەوام بین، کاتێ لێشاوێکی خۆشبەختانە ڕاپێچیکردین و ئێمەش ساویلکانە بەرەنگاری دەبووینەوە و ئەویش بردنی بۆ پێچێك کە ئاوەکەی زۆر ئارام و ڕاوەستاو بوو، هەروەها پێچی پێکردبووینەوە بۆ کەناری ڕووبارەکە کە بەرامبەر ئەو لایەی سەربازەکان لێی هەڵدەهاتن. هەموو شەوەکەمان بە چاکردنەوە بەسەربرد و هاوبەشی ئیشکردن و گواستنەوەی شتەکان و کیسە قەیسیەکانمان دەکرد لەناو ئاوەکەوە بۆ وشکانی کە لە ئاودا وەك ئیسفنجیان لێهاتبوو. لەبەرەبەیاندا ماندوو بووین، بەڵام گەشبین بەوەی کە دەمەو عەسری ئەو ڕۆژە بە سەلامەتی دەگەینە موسڵ، ئیدی دەستمانپێکرد، بەڵام لێشاوێکی لاوەکی بەهێز و خێرا شاڵاوی بۆ هانین و دامانی بە قەد بەردێکدا، کە بەرامبەر لێشاوەکە دەجەنگا و شکاندی، بەهێزێك هات بەسەر خێمەکە و سەماوەری ئاو گەرمکردن بۆ چالێنان و پیاڵە و ژێرپیاڵە و تاوەیەکی بچکۆلەی هەڵدایە ناو لێشاوەکەوە، بالەیەکیش- فەردەیەك خلۆربۆوە بۆ ناو ئاوەکە، ئینجا سندوقی پێستە سەرەکیەکان تەقی و دوورکەوتەوە، دەستەکە دارەکان لەتوپەت بوون و ئێمەی دوورخستەوە بەجۆرێ کە بەرگری نەدەکرا و بە واتای وشە بەرەو خنکاندنە. کارمەندانی کەڵەکەکە و خەڵکەکە سەرقاڵی هەوڵی ڕزگارکردنی شتومەکەکانن، کە خەریك بوو دەکەوتنە ناو ئاوەکەوە، سەوڵلێدان مەحاڵ بوو، چونکە سەوڵەکان زیانیان پێگەیشتبوو، تەنیا دەمانتوانی دانیشین و چاوەڕێی تێکشانێکی تر بین، کە دڵنیابووین دێت و تەمەنای ئەوەمان دەکرد کە لە تەنکاوێکدا بێت. ئیدی بە بیرماندا هات بە هۆی حەبلێکەوە خۆمان بەرەو کەنارەکە بەرین، کە ماوەی پەنجا یاردێك دەبوو.

هێزی کەسێك یان دوو کەس بێگومان بەس نییە، بۆیە هەرسێکمان، کارمەندانی کەڵەکەکە و خۆم، خۆمان ڕووتکردەوە و بە گوریسەکەوە دابەزینە سەر قەراغی کەڵەکەکە بۆ ناو ئاوەکە، لەگەڵ ئەوەی ناڕەزایی لەسەر ئەو کارەی من لە حاجییەوە پەیدابوو، کە لەوبڕوایەدا بوو ئەوە شایانی ئەفەندی

نییە و تەنانەت سەرسامە لەوەی چۆن کەسێك چاوەڕێی کاری وەها بێت لە پیاوێکی ئاوا، کە خۆی بخاتە مەترسییەکی ئاواوە. هەرچۆنێك بوو سەرکەوتین لە بەدەستهێنانی جێ پێیەك نزیکە 10 یارد لە گوێ رووبارەکە لەگەڵ ئەوەی بەدرێژی رایدەکێشاین، لە ئەنجامدا کەڵەکەکەمان راکێشا و بەستمانەوە. هەموو رۆژەکە گشتمان کارماندەکرد، کەلوپەلەکانمان لە کەڵەکەکە دادەگرت، چاکماندەکرد و بارماندەکردنەوە، ئەوەی کۆسپیان بۆ دەسازاندین ئەو سەربازانە بوون، کە لەپڕ پەیدابوون و یارمەتیان نەدەداین و خەریك بوو لە کەڵەکەوانەکەش بدەن، ئەگەر ئێمە نەکەوتینایەتە بەینیانەوە. لە دواجاردا تاوانباریانکردین بە دزینی پێڵاوەکەیان، کە کەوتبووە ناو ئاوەکەوە، ئەوان بە جنێودان هاتبوون لەناوخۆیاندا، ئیدی دڵنیامانکردن کە ئێمە تا سێ رۆژی تر سەرقاڵی خۆڕێکخستنەوەین، ئەوانیش بە دەم نەفرەتکردنەوە بەرەو موسڵ رۆشتن.

بۆ رۆژی دوایی ئێمەش گەیشتینە موسڵ، بە سەغڵەتیەکی تەواو بێزارەوە، کەڵەکەکەمان ژێرئاو کەوتبوو، دوای سەعاتێك یان دوو سەعات لە روانینی دیمەنی یەکەم باخچەی موسڵ، ئیدی شۆڕبووینەوە و بەلای سەرچاوەی کبریت و شورا کۆنەکەی شارەکەدا تێپەڕین، روومانکردە شوێنێکی لێژ لەسەر ئەو پردەی کە لەبەرد و بەلەم پێکهاتبوو، کۆڵهەڵگرێکمان بانگکرد و من و حاجی چووین بۆ خانێك لەناو بازاڕدا.

لە دیاربەکرەوە رێگاکەمان دوانزە رۆژی خایاند.



باب ئەلتۆپ و بازاڕی ئۆچان، موسڵ بەشێوە

# بەشی پێنجەم

# موسڵ

# شاری ئاسووریان و ئیزیدیەکان

لەو بڕوایەدام ئەوەی لەبارەی موسڵەوە دەینووسین دەبێ شتێکی گونجاو و دروست بێت، بۆ ئەوەی بەسەربەخۆیی بگەڕێین بەدوای چەرخی کۆنی نەینەوادا، بەڵام زۆر لەبارەی ئەم بابەتەوە نووسراوە، بەتایبەتی لەو سەردەمەوە، کە (Layard- لایارد) بۆ یەکەم جار پەردەی لەسەر بەرزاییەکانی هەڵماڵی و زۆر بە باشی نووسراوە، لەبەرئەوە هەر هەوڵێکی تر لەو ئاستەدا لەوە زیاتر ئامانج ناپێکێت. ئەوەندە بەسە کە بڵێین: لەبارەی موسڵەوە، شارێکی هاوچەرخە، بەرامبەر نەینەوای دێرین راوەستاوە، لەو کاتەوە کە پایتەختی ئاشوورییەکان بووە، پاشماوەی نەینەوای کۆن و نوێیە، لەکاتێکدا لە نزیکیەوە (کالح، ئاشوور، حەزەر و خورساباد (دار شاروکین))، کە لەلایەن ئەڵمانیە چوست و چالاکەکانەوە پشکنینی بۆ کراوە، کە ساڵانە بە وێنەوە بڵاویدەکەنەوە و بە شێوەیەکی نایاب ئامار بۆ کارەکانیان کراوە.

خەڵکی موسڵ لەم ڕۆژانەدا مزگەوتەکەی (نەبی یونس) یونس پێغەمبەر و منارەکەی پێشانی گەشتیاران دەدەن، کە لە سەردەمی ئیسلامدا موسڵمانان بینایانکردووە و شوێنەکەیان بە نەینەوا دیاریکردووە.

مەسیحی و جولەکە و موسڵمان وەك یەك رێز لە نزرگەکەی دەگرن، هەرچەند دوانەکەی پێشەوە (واتە مەسیحی و جولەکە) هەرگیز رێیان پێنادرێ بچنە ژوورەوە. هەمووان بڕوایان بە چیرۆکێکی کاریگەر هەیە لەگەڵ ئیمانێکی کوێرانە، کە گومانبەرانی هاوچەرخ دەبزوێنێ.

بێبەختانە لەم ڕۆژگارەدا ئاسان نییە موعجیزەکان شیبکرێنەوە، تا باوەڕ بە ماسییەکەی یونس بهێنیت، کە بە وشکانیدا خۆی خزاندووە، یان وەك (رایزەر) [12] هێمای ئەوە دەکات کە دەبێ ماسییەکی بلیمەت بوو بێت، 20000 میل مەلەی کردبێت لە ماوەی سێ شەو و سێ ڕۆژدا "بەلایەنی کەمەوە ئەو ژیرانە تێبینی دەکات" بەتایبەتی بەپێی کتێبە پیرۆزەکانی ئامادەکراوە، دەڵێت: لەوانەشە سرهۆش کرابێت، وەك لە ئەمریکا وای پێدەڵێن.

---

[12] - دەیڤد رایزەر، قەدیر بۆ هندستان.

## یونس پێغەمبەر

ئینجیل، لەگەڵ ئەو خۆپاراستنە تەمومژاویەشدا، هەمیشە واز لە چیرۆکی خۆش ناهێنێت، دەڵێت یونس لە (تارشیش)ەوە دەرکەوتووە. ئێستا تارشیش ناوێکی فینیقیە بۆ ئیسپانیا، ئەوە دەقاودەق تەنیا ئاڕاستەیەکە کە یونس نەیویستووە بەناو بیابانێکی پڕ مەینەتیدا بۆ نەینەوا هەڵبێت. پێمان ناڵێت کاتێ زریانەکە هەڵیکرد، چەند دووربوون، بەڵام لەوە دەچێت هۆیەك نەبوویێت کە بۆچی دەبێ وای دابنێین ئەوە بە خێرایی روویداوە و پاڵی بە کەشتیەکەوە ناوە بۆ دواوە بۆ سەر کەناری سووریا، کاتێ لەوانەیە یونس لەوێدا دابەزیبێت، ئەگەر ئێمە بتوانین مەسەلەی ماسیەکە پشتگوێ بنێین. بەدڵنیاییەوە ماسی بێبەختانە بەزەبرە و سەیرە یونس پێغەمبەری بۆ ماوەی سێ رۆژ هەڵگرتووە بۆ خاڵێك لە نەینەوا، کە (فرازەر) تەنیا وەك مەترسیەك لە کتێبەکەیدا باسی دەکات. هەروەها دیجلە لەسەرو تکریتەوە زۆر بە زەحمەت ئەوەندە قوڵە، تەنانەت بۆ سەگەماسی (کوسە-شارك) و بڕێك میل بەرەو بەغدا. بەهەرحاڵ، شیکردنەوەیەك باشە وەك ئەوەی ئینجیلی مێژوو. ئەوە گونجاوەترە وادابنێین کە یونس، جارێکی تر دوای ئەوەی کەشتیەکەی ژێرئاو کەوت، خۆی لە سووریادا بینییەوە، ئیدی ملی رێی گرت بەرەو نەینەوا، ئەو گەشتە، بیست رۆژ بۆ چل رۆژی پێچووە. بەڵام لێرەدا، ئەگەر بیردۆزەکەی پێشومان پەسەند بێت، ئێمە بەرەنگاری شاکارێکی بەرجەستەی تری گەشتەکە دەبینەوە، چونکە (نەینەوا شارێکی مەزنە و گەشتەکەی سێ رۆژ دەخایەنێت)، کە ئەوەش مانای ئەوە دەدات، نەینەوا سێ رۆژ لەو شوێنەوە دوور بووە کە ماسیەکە یونس پێغەمبەری هەڵهێناوەتەوە. بەڵام ئەوە راستیەکی سەرنجڕاکێشەرە کە هێما دەکات بۆ گەورەیی شاری ناوبراو، بۆیە دەڵێم: بە یەك هەناسە لەگەڵ مەودادا لە شوێنێکەوە، ئەمەش پشتگیری بیردۆزێك دەکات کە بەهەموو ملکەچییەکەوە، ئەوەی پێشووە. ئەوانەی شارەزای رۆژهەڵات نین چاوەڕێی ئەوە ناکرێت کە بزانێت لەم ناوەندەدا بە وشتر و هێستر گەشت دەکرێت و یەکەی سەفەر (یەك رۆژە) ومیل و قۆناغ بوونی نییە و فرسەخ فارسییە و پێوانەی عەرەبی نییە و رۆژێکیش واتە دووری نزیکەی بیست میل. روون نییە بڵێیت- سەردەمێك کە دێتەوە یاد بەناوی شارێکەوە کەچی خاکێکی کشتوکاڵی لەدەورە- "نەینەوا شارێکی مەزنی شەست میلیە (لەبەرچاوە)" بۆ نمونە، لەگەڵ ئەوەی زەویوزارێکی ئاوداری لە دەور بووە، ئەمرۆ بیابانی لماوی بێ

ناوە. ئەم برگەیەی کە دێت بەشێوەیەکی روون دەخوێنرێتەوە: "[13] یونس بە گەشتێکی یەك رۆژی هاتۆتە ناو شارەکەوە." بۆم دەرکەوت لە ناوچەی کشتوکاڵییەوە هاتۆتە شارەکەوە و رۆژی دوایی گەیشتووەتە ناوەندی شارەکە. ئەگەر، وەك پێمان وتراوە، یونس دوو رۆژ دوور بووە لە نەینەواوە کاتێ پێشبینی کردووە و هاواری کردووە "هێشتا چل رۆژی ماوە..." و هەروەها، دەبێ بەرئەنجامەکە پشتگیری لە دەنگێکی بەرزی یونس بکات، یان پەیامنێرێك بەر لەو وتەکەی ئەمی لەپێشەوە گەیاندبێت، یان بە مسۆگەری بە واتای وشە دەبێتە کەسێکی نەزان لە (بیاباندا هاوار دەکات). بەهەرحاڵ، ئەگەر گریمان ئەو بە رۆژێك بەناو کێڵگە و زەویە کشتوکاڵیەکاندا هاتبێت، ئەوا بۆ بەیانی رۆژی دووەم دەگەیشتە شارەکە و هاوارەکەشی دەگەشتە گوێی خەڵکانی شارەکە.[14]

دیاردەیەکی ناوێزە لە سەرجەمی کارەکاندا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لە هیچ مۆنۆمێنت و ئاسەوارەکانی ئاشووریەکاندا ناوی یونس نەهاتووە، کە بە دڵنیاییەوە لەلایەن مێژوونوسە بە ویژدانەکانەوە هەوڵی بۆ دراوە، فەرمانڕەوایانی ئاشوور ئەگەر ئەو گرنگییەیان پێش مەلیکی نەینەوا بەدەست هێنابێت وەك ئەوەی لە چیرۆکەکەدا پێمان وتراوە. ئەو پێغەمبەرە لێهاتووە، کە بە کارە جوانەکانی لە نەینەوادا، لەلایەن خەڵکی موسڵەوە رێزێکی تەواوی لێگیراوە. لە ساڵانی 800 پێش زایین لە شێوەی سەرگوزەشتەدا لە تەورات و ئینجیل و قورئاندا وەك یەك باسی کراوە، ئەم مزگەوتەی ئێستای بۆ بیناکراوە. خەڵکی موسڵ، بەتایبەتی مەسیحیەکان شانازی بە شارەکەیان و سەدە کۆنەکانی دەوروبەریەوە دەکەن. مەسیحیەکان خۆیان بە نەوەی فرمانڕەوا مەزنەکانی ئاشووری دادەنێن، وای دادەنێن کە بەرگەی ئەو چەوسانەوەیان گرتووە لە پەیوەندیان لەگەڵ رەشڕوتی ئەرمەنیەکان، کە من لەو بڕوایەدام کەسێ ئەو دوو رەسەنایەتیەی ئاسیبێ حەسودی پێ نەبردون.

---

[13] - یونس ئایەتی سێیەم.

[14] - پرۆفیسۆر راگۆزین، لە کتێبە نایابەکەیدا لەبارەی مێژووی ئاشووریا، لێکدانەوەیەکی گونجاو بۆ (ماسی)یەکە بەیاد دەکات، کە ئەگەر پەسەند بکرێت، ئەوا بەتەواوی لەو بوونەوەرە نالەبارە رزگار دەبێت.

-" ئەم ئەفسانەیە کە بەربەستێکە لە رێی خوێندنەوەیەکی هۆشیارانە بۆ هەموو کتێبەکە، کە پێشتر بەشێوەیەکی ناچاوەنوار لە نادیاری ئەو مەسەلەیە تا ئەمڕۆ، کە ئاشووریەکان ناوی ئەو شارە مەزنەیان ناوناوە نەینەوا و ئەوەش نزیکە لە وشەی (نونو) کە بە زمانی ئاشووری واتە ماسی. ئەوەش پەیوەندە بەو ماسییەی یونسەوەیە، نەك شارەکە خۆی ناونرابێت شاری ماسی یان حەوزی ماسی. کۆنترین هێما بۆ پێشکەشکردنی ناوەکە لە نوسینەکەدا، کە تێکەڵەیەك لە هەندێ داو و سنگ کە بەئاشکرا رۆڵی ماسی دەبینن لەناو حەوزێکدا، ئەو ماسیە گەورەیەی کە یونسی قووت دابوو پێچەوانەی ئەو شاری ماسیە نیە، هەروەها دەبێ بەدڵنیاییەوە بەشێوەیەك تەواو ئەو مەترسیە دووچاری بوویێت تا رێی بدات کە هاواری رزگاربوون بکات."

# موسڵ

موسڵ خۆی و لەسەر بەرزاییەکانی و بەچواردەوریدا جەنجاڵە، شارێکی پیسوپۆخڵە و بەناویەکدا چووە، لەلای گەشتیاری تازە هاتوو، بۆگەنی تێبینیکراوی لە پلە و ئاستی سەدەکانی رابردووی کەم ناکاتەوە.

لەبیرمە یەك تێبینی زۆر دڵخۆشکەر لە کارە رێکخراوەکانی شارەوانی، کە جۆرێ لە حەوزێکی لە یەکێ لە شەقامە سەرەکیەکاندا دروستکردبوو، پیسایی و ئاوەڕۆگەی زێرابەکانی دەهاتەوە سەر. سەردەمانی دێرین موسڵ نەیدەتوانی بانگەشەی ئەوە لەناو ئەو شارە زۆرانەدا بکات، بەڵام تەنیا لە سەردەمی ئیسلامدا موسڵ گرنگی پەیداکردووە و ئاستێکی لە راگرتنی ئابووری میسۆپۆتامیادا هەیە.

مێژوونووس و جوگرافیزانی فارسی (حاجی زین العابدین شیروانی) لەم تێبینییەی لای خوارەوەدا لەبارەی موسڵەوە، لە کارەکەیدا بەناوی (بوستان سیاحەت) واتە باخچەی گەشتوگوزار، لاپەڕە 569، بۆچوونێکی بڵاو باسدەکات و دەڵێت یەکەم کەسێك کە موسڵی بیناکردوە ناوی (زوید بن سۆدە) بووە و بە فارسی پێدەوترێ ئەردەشێر. ئیدی دوای هاتنی ئیسلام عەرەبەکانی تیرەی حەمیر هێرشیان بۆ کردووە و داگیریانکردووە، هەروەها شورایەکیان لە بەرد بۆ بیناکردووە و ئاویان بۆ راکێشاوە و باخچەیان تێدا رواندووە.

وەك شارێکی عەرەبی، ئەوەی شانازی پێوە دەکات ئەوەیە، کە هیچ بەڵگەیەکی تۆمارکراو نییە بڵێت کەوتۆتە ژێر دەستی فارسەوە، ئەوەش راستیە و وەك ئاشکرایە گومانی تێدانییە. بەڵام دەبێ ئەوەشمان لە یادبێت کە کاتێ فارس ئەم خاکەیان داگیرکردووە، موسڵیش لە ئاستێکی گرنگی کەمتردا بووە. ئەمڕۆ بێ بەزەییترین زەمکەر ناتوانێ ئەوە بڵێت، لەگەڵ ئەوەی پیسوپۆخڵە، بازاڕەکانی بێفەڕە، کەشوهەوای ناسازە و لەگەڵ تورکیشدا، بەڵام شوێنێکی زۆر گرنگە و دانیشتوانی زۆرە، ژمارەیان بەپێی سەرژمێرییەکی باوەڕپێکراوی ئەم دواییە 90.000 کەسە. ئەگەر مەبەست لە نووسینی ئەم کتێبە بۆ قسەکردن بێ لەبارەی بازرگانییەوە، ئەوا بێگومان دەبێ باسی پیشەی پێستە و باسی کاغەزی جگەرە و دارتاشەکانی و بیناسازەکانی بکرێت. مەسیحیەکانیش مافی خۆیانە کە دەڵێن ئەوەی پەیوەندە بە بازرگانییەوە لە هەوڵ و کۆششی ئەمانە و بە تەنیا رەنجی ئەمانە. لێرەدا لەناو هەموو شارەکانی سووریا و میسۆپۆتامیادا مەسیحیەکان سەربەستی

زیاتریان هەیە و کەمتر دەچەوسێنەوە لەچاو ئەو دانیشتوانانەی تر کە ناچارکراون لە تەك موسڵماناندا پێکەوە بژین.

ئەوان خۆیان ئەوە وەك لایەنێکی گەش دەبینن کە موسڵمان و مەسیحیەکان هاوشێوەن لە سۆز و زمانی ئاخاوتنیاندا کە عەرەبییە و لەسەرو ئەوەشەوە پەیوەندی هاوشارییان هەیە، کە زۆرجار ئەو پەیوەندییە زۆر بەهێزە و یەکێکە لە دیاردەکانی شار و شارۆچکە دەرکەنارەکانی رۆژهەڵات. بەهەرحاڵ، ئەوەی ئەو بارودۆخەی هێناوەتە ئاراوە، ئەو بەربەستەیە لە دەستدرێژی کە لە ئەنجامی قاتوقڕی مەسیحیەکان لە ماوەی دوو سەدەی رابردودا روویداوە و ئێستا کەڵکی لێوەردەگرن. ئەوان ئەوە دڵنیادەکەنەوە کە تورك جارێ لە جارەکان هەوڵیانداوە ئەو موسڵمانانەی لەو دەوروبەرە دەژین هانیانداون تا بچنە شارەکەوە و مەسیحیەکانیان رەشەکوژ کردووە. هەروەها ئەوپەری هەوڵیان داوە تا موسڵمانەکانی دانیشتوی شارەکەش هانبدەن یارمەتی ئەو کۆمەڵکوژییە بدەن، بەڵام ئەوەی هەوڵیان بۆ دەدا نەهاتەدی، ئەوانیش ئاگاداریانکردنەوە کە هەر هەوڵێك لەو شێوەیە وا لە موسڵمانەکان دەکات هاوشانی مەسیحیەکان رابووەستن.

لەم رۆژگارەی ئەمڕۆدا کاتێ موسڵ زۆر بە رێکوپێکی پارێزراوە، کوشتن و بڕینی شەقامەکانی جگە لە رووداوی هەفتانە زیاتر، هیچی تر نییە، شوێنەکە پڕە لە تورك، کە کاروباری شارەکەیان بەدەستەوەیە، کوردی نەیار و رەوەندی عەرەب نە بەبێ رێزییان و نە بەمەترسی تفەنگە هەمیشە ئامادەکانیانەوە ناتوانن لە شکۆ و هەیبەتیان کەمبکەنەوە. زمانی شوێنەکە عەرەبییە، بەڵام تورکیش هەروەکو کوردی تێدەگەن، لەوێوە بۆ کوردستان دوور نییە، هەندێ جار بینینی خەڵکانی عەشایەر لە بازاڕدا هێمای نزیکی خێڵەکان لە شارەکەوە دەکات. حوکومەتی خراپ و بەردەوامی نەبوونی ئاسایش لە وڵاتدا کاریگەری تەواویان هەیە لەسەر خەڵکی لە بەربەستی هەوڵدانیان بۆ بینای هەمیشەیی، لە ئەنجامی ئەوەوە هەموو بازاڕەکان و مزگەوت و کاروانسەراکان داڕماو و داڕوخاون، لە راستیدا، موسڵ وەك شارێکی پیسوپۆخڵ لە لێواری وێرانەدا دێتە بەرچاوی غەریبان. یەکێك بۆ چەند چرکەیەك بچێتە دەرەوەی شارەکە، کە چەند هانگاوێکە بۆ بیابانی میسۆپۆتامیا، موسڵ لەوێدا بنکەی گرتووە، تەپۆلکەیەك لە بیاباندا، هەروەها لە میانەی ئەوەی پێی ناودار بووە لەنێو خەڵکانی رۆژئاوادا، موسڵ شارێکە لە چۆڵەوانییەکی کاکی بەکاکیدا لە خاك نراوە. بۆ نزیکبوونەوە لێی لە هەر لایەکەوە جگە لە دیاریەکر بە رووباردا، دەبێ چەند رۆژێك بە رێگای بیابانی بێ ئاودا رێ ببڕێت.

# شەڕێك

تەنیا بەلای باشووری ڕۆژهەڵاتدا خاکەکەی بەپیتە و مرۆڤ لەوە دەگات کە بۆچی ئیمپراتۆریای ئاشووری لەوێدا دامەزراوە. ئەمڕۆ چیای زاگرۆسی دوور و کوردە نامۆ و تۆقێنەرەکان بەربەستێکی زەفەر پێنەبردو پێکدەهێنن، منیش بەو مەبەستە بۆ لای ئەوان دەچووم.

خستیانینە ژوورێکی سەرەوەی کاروانسەرایەك پێیدەوترا حەمەد ئۆدو، لەبەرئەوەی هاوڕێین، هەر هیچ نەبێ تا هەولێر، بۆیە بڕیارە بەردەوام بین لە گەشتەکەماندا پێکەوە. بەڵام حاجی کوڕی مامەکەی دۆزییەوە و بردیەوە بۆ ماڵەوە، ناچار هەر کەس حسابی خۆی دا و جیابووینەوە، پیرە پیاو لە میانەی گەشتەکەماندا سۆزێکی زۆری هەبوو بەرامبەرم. وتی، "من هەرگیز کوڕم نەبووە"، "چونکە هەرگیز ژنم نەهێناوە، ژن کێشە و بەڵای پێوەیە" بەڵام ئێستا من پیرم، دەزانم ئەگەر کوڕم هەبووایە چی دەبوو، ئیدی گەردنم کەچە لەبەردەم چارەنوسێکدا کە خۆم پێچەوانەی بڕیاری یاسای کردگارەوە بڕیارم بۆ داوە" تۆزێ گریا و پاشان باوەشی پێداکردم و ڕۆشت. بە تەنیا لە ژوورە بەردینەکەدا مامەوە، دەبێ کاروانچیەك بدۆزمەوە تا بمبات بۆ سلێمانی، هەرچۆن لە ڕۆژهەڵاتدا قاوەخانە شوێنی گشتیە و منیش چووم بۆ ئەوێ تا چاوبگێڕم بۆ قەتارچییەك وەك تورکەکان بە خاوەن هێستر دەڵێن، کەچی خۆم بینییەوە لە سیاسەتی ناخۆدا نوقمبووم. پەیوەندیکردنم پێیانەوە پێداویستی هێسترێکە و کۆتایی بە چیرۆکەکە هانی و لەوانەشە ئەوە لێرەدا بێتە ئەنجام. لە موسڵدا ژمارەیەك لە خەڵکی سلێمانی هەیە کە لە بازرگانیدا کاردەکەن، لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانەشی کە هەر بۆ خۆشی لە ڕۆژهەڵاتدا حەزیان بە گەشت و گەڕانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر. هەروەها سەربازێکی زۆری لێیە کە هەموو هەستەکانیان مردووە و هیچ ڕێزێکیان نییە لە هەڵسوکەوتیاندا و نەفرەتی شوێنەکەن و پیسیان کردووە. شەڕ و ئاژاوەیەك بەرپابوو، بەهۆی دەستدرێژی کردنی سەربازێکی سەرخۆش لە ژنێکی کوردی خەڵکی سلێمانی، هەروەك خوێنی کورد ئەگەر ناڕەواش بێت و خەڵکی سلێمانی بێت قوڵپ دەدا و دەکوڵێت و خەڵکێکی زۆری موسڵ کوژران. یاسا سەرەتاییەکانی ئەم ناوچانە خوێنڕشتن بە شتێکی گرنگی خۆیانی دادەنێن، بۆیە ئەوە بەسە کە ئەو دوو شارە لە دوژمنایەتیدا بۆ ساڵانێکی دوور و درێژ بهێڵێتەوە. هاووڵاتیەکی موسڵ ناوێرێ بچێ بۆ سلێمانی و بەهەمان شێوە هاووڵاتی سلێمانیش ناتوانێ لە موسڵ خۆی پیشان بدات، هەرچۆنێك بێت لەناو شارەکەدا پارێزراوترە، بێجگە لە بارودۆخی هەڵچون و توڕەبوون و شەڕنانەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو بەربەستەش هەیە هێشا ئازادی نەبوو، چونکە تیرەیەکی کوردی بەناوی هەمەوەند بە

تەواوی پەیوەندی هاتوچۆی لەسەر ڕێگای سلێمانی بڕیبوو، هەر ڕێبوارێ بەوێدا تێپەڕێ کوژراوە و روتکراوەتەوە. هەر لەبەرئەو هۆیەیە کە نەهێستر و نەقەتارچی دەستناکەوێت و دەبێ دووچاری گرێیانی مانەوەبێت لە موسڵدا بۆ ماوەیەکی دیارینەکراو. لەبەرئەوە نەمدەتوانی وازبێنم و هەرچۆنێ بێت دەبێ ڕێـیەکی تر بدۆزمەوە بۆ گەیشتنم بە سلێمانی. دوو ڕۆژم بەبێ ئیشوکار بەڕێکرد و کاتەکە لە ژوورەکەم و لە قاوەخانەدا بەسەردەچوو. لەبارەی خواردنەوە بۆ من زۆر سادەبوو بە خورمای نایاب و ئەو قەیاغی گامێشەی کە لە بازاڕدا هەبوو، ئەوە و لەگەڵ نانی خەپلە، دەژیام و لەوەش باشترم نەدەخواست. بۆ ڕۆژی سێیەم سێ یان چوار تورکومانی دانیشتوی کەرکوك پەیدابوون، هەوڵیان دەدا هێستریان لێبەکرێ بگرم بۆ ئەو ناوچەیە، کە نیوەی ڕێـیە بۆ سلێمانی. بە قەڵافەت و تێکسمڕاو لە کورد دەچوون و زمانی کوردیشیان زۆر بە باشی دەزانی، بە دوورودرێژی باسی مەترسی ڕێگاکانی تریان کرد و وتیان مەحاڵە لە کۆی سنجاقەوە بچی بۆ سلێمانی، کە من بەهیوای ئەوە بووم لەوێوە بڕۆم. ئەوان نەیاندەگەیاندمە سلێمانی، بەڵام بەڵێنیاندا هێسترێکم بۆ پەیدابکەن ئەگەر هەبوو، ئەوەش بەگوێرەی ئەوانەوە ڕێکەوتنێکی سەلامەت بوو، منیش پەسەندم کرد. بەڵام بڕیارمدا تۆزێ زیاتر چاوەڕوان بم، بیرمدەکردەوە بەڵکو کاروانی شتومەك گواستنەوە پەیدابێ و ڕازیبن بە درێژایی ڕێگاکە بچم لەگەڵیان. تەواو ددانم بەخۆمدا گرت، بەڵام وەك پێشبینیمدەکرد وا پێشنەهات. ئیدی پاش نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، لە گەڕانەوەمدا لە قاوەخانەکەوە، کەسێك کە روخساری پەژارەی لێدەباری بانگیکردم، هەروەها سمر و هەیکەلی لە خەڵکی سلێمانی و لە قەتارچی دەچوو. لەوە دەچوو بازرگانێکی لە سلێمانیەوە هێنابێ بۆ ئەوێ، کە خۆی دووچاری سەرزەنشتێکی زۆری خەڵکی موسڵ کردبوو، کە بەرامبەر خەڵکی سلێمانی هەیانە. کاکی قەتارچی لە هیچ مەترسییەکدا نەبوو، هەرچۆنێك بێ ئەو بێتاقەت بوو لە مانەوەی لە موسڵدا، چونکە هەموو جۆرە بازرگانیەك لەنێوان ئەو دوو شوێنەدا ڕاگیراوەو ئەو بەتەمای هیچ بارە شتومەکێك نییە، ئەو شتانە گەیاندویەتە ئەو ئالۆزی بیرو بۆچوونە، بۆیە ڕازی بوو سەفەرێکی شەش ڕۆژی بە چوار مەجیدی دەست پێبکات، کە دەکاتە (13 شلینگ و 4 پەنس). ئیدی مەجیدیەکم پێشەکی پێدا و مۆرکردنی ڕێکەوتنەکەشمان پیاڵە چایی بوو لە قاوەخانەکە. تورکومانەکان هەندێ سەغڵەت بوون کاتێ دەنگۆی ئەم مامەڵە و ڕێکەوتنەیان بیست و چاوەڕێی ڕوودانی جۆرەها کارەسات بوون، بەتایبەتی رووتکردنەوە و کوشتن و بڕین لەلایەن هەمەوەندەکانەوە، کە سوێندیان دەخوارد کەس ناتوانێ بە ناوچەی ئەواندا تێپەڕبێت. لەگەڵ

ئەوەشدا لە ڕۆژی دوایدا پاش نیوەڕۆ دەستمانپێکرد. هێسترەکە لەبەری ئەوبەری ڕووبارەکەوە بوو، لەبەرئەوە کۆڵهەڵگرەکان دەبوو کەلوپەلەکان بەسەر پردە گەمێکاندا بگوێزنەوە و بەردەوام بەسەر بەردی کەناری ڕووبارەکە بۆ لاکەی تر، کە شتێکی زۆری لێکۆبوو بووەوە و چاوەڕێی هێستر بوون بۆ کەرکوك و کۆی سنجاق.

هێسترەکە لە نزیك سەعات چواری پاش نیوەڕۆ دەرکەوت و دەستمانپێکرد. شتەکانم لەگەڵ دوو سەندوقدا بارکرا و بەملاولادا شۆڕبوونەوە و بەسەریدا ڕاخەرێ ڕاخرا و هەمووی بە قایشێکی درێژ بەسترایەوە، منیش سەرکەوتمە سەر لوتکەی قیتو ڕەپ و جارێکی تر چێژی دانیشتنم لەسەر ڕاخەرێکی نیو یاردی لێژدا تاقیکردەوە، کە لە میانەیدا هەموو دەستگیرەکانی زینەکە خۆیان دەرخست. لەسەر ئەم جۆرە جێگەیە مرۆڤ زۆر جار دەبێ بۆ ماوەی 12 سەعات دابنیشێت و لەبەر بێ تاقیکردنەوە لەوبارەیەوە مەسەلەی هامبەری و خۆڕاگرتن لەسەر شتەکان زۆر جار دەبێتە هۆی کوتران و شین و مۆربوونەوەی لاڕان و ژێری مرۆڤ. سەرم سوڕمابوو، لەجیاتی ئەوەی ڕوویکەینە باشووری ڕۆژهەڵات، کەچی بەرەو باکوور دەستمان بە ڕۆشتن کرد، بەڵام بۆم دەرکەوت کە بۆ شوێنێکی باش دەچین تا شەو تێیدا بمێنینەوە. بۆ ماوەی سەعاتێ یان نزیکەی سەعاتێ بەناو جۆرێ لە دارستاندا ڕۆیشتین و دواجار، گەیشتینە دەشتایەکی بچووك کە گیای بەرز و سەوزی تێدا ڕوابوو، کەلوپەلەکانمان داگرت و هێسترەکان بران بۆ سەرئاو، کۆمەڵەکەی ئێمە بچووك بوو، هەروەها هەمووی خەڵکی سلێمانی بوون، تەنیا یەك قەتارچی نەبێ کە خەڵکی هەڵەبجە بوو، ئەو شوێنەی بڕیارە دواتر بۆی بچم.

قەتارچیەکە خۆی ناوی ڕەشید بوو، یارمەتیدەرێکی هەبوو، پیاوێکی بەساڵاچووی توند و تیژ، لەلای خۆیەوە شانازی بە سەرچڵیی لاوێتیەوە دەکرد. هەروەها دوو گەشتیاری تریشمان لەگەڵدا بوو، خزمەتکار بوون و پاڵتۆی ڕەنگ سەوزی هاودامانیان پۆشیوە و شەرواڵێکی شێوە هەرمێیی دەرەلنگ تەسك وبەشی سەرەوەی دەڵب و فراوان بوو، کە لە جۆرێ لە فرۆشیاری دەستگێڕێ دەچوون.

ئەوانەی ئەم دواییە بەتوندی ئامۆژگاریانکردم بەوەی لە فێست پۆشین دوورکەومەوە و بیگۆڕم بە کڵاو و مشکی، شتومەکی پێویستیان پێدام بۆ ئەوەی مێزەرێك ببەستم.

## سلێمانیەکان

لەوە دەچوو فێستی رەنگ سوور لەسەرکردن ئاشکرایە کە من خالی مەترسی بووم لەسەر خۆم و ئەوانی تریش، کوردەکان قینیان لە هەموو ئەو شتانەیە کە پەیوەندە بە تورکەوە، ئەو هێما نالەبارە هۆکارێکە بۆ دەستنیشانکردن.

تەنانەت ئەو پالتۆیەی من لەبەرمکردبوو بابەتی سەرزەنشتکردن بوو، بەلام گەیشتینە شوێنێك، کە ئەگەر کەسێ تورك نەبێت، ئیدی (عەیب) یان هەڵە نییە هەرچیەکی پۆشیبێ، بەلام دابونەریتەکە دەبێ رێی پێدابێت. پۆشاکی سلێمانی ناتوانرێت بە ناوەندێکی کوردی دابنرێت، هەرچەندە ئەوانەی دەیپۆشن بەخۆیان دەڵێن کورد، لەگەڵ ئەوەی دواتر راستی زیاتر بەدیاردەدات. ئەوەش باوە کە جۆرێ قوماشی لۆکەی حەڵەبی بۆ پۆشاك بەکاردێنن، کە پێیدەوترێ (شەیتان بەیزی) واتە (دێوە سپی)، هەروەها پۆشاکی سلێمانیان بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە: شەرواڵێکی هاودامانی لۆکەی سپی، تا قاچەکانی زۆر دەڵبە، بەلام وردە وردە تەسك دەبێتەوە تا قولەپێکان، لەوێشدا بەتوندی پێوەی دەنوسێت. گۆرەوی ناپۆشرێت، بەلام پێلاوی چەرمی سوور لەپێ دەکەن، کە لای پەنجەکەڵەی قاچەوە لوتەکەی هەڵگەڕاوەتەوە بۆ خالێك. هەروەها زۆربەیان لە دواوە پارچەیەکی پێوەیە کە چەند ئینجێك درێژ دەبێت. کراسی ژێرەوە بە هەمان بڕ لۆکەی سپی کە درێژبۆتەوە بۆ سەر سێبەنە و لای ملەوە قولفێکی لە لۆکە بۆ کراوە و بە قۆپچەیەك دادەخرێت. قۆڵەکان بەهەرحاڵ، جۆرێکە لە قۆڵی فەقیانەدار کە شۆڕبۆتەوە بۆ سەر زەوی و بەکاردێت بۆ پاراستنی پارە و نووسراوی بەهادار تێیدا و هەروەها بۆ وشککردنەوەی ئاو و ئارەقی روخسار و لوت پاکردنەوە دوای فنگێکی بەهێز بەهۆی پەنجەوە. بەسەر ئەم جلوبەرگانەدا کەوایەکی هاودامان لە قوماشی لۆکە لەبەردەکرێ کە لە پێشەوە کراوەیە و درێژبۆتەوە تا پاژنەی پێکان، بەهۆی پشتێنەوە یان قایشەوە هێنراوەتەوە یەك و بەستراوە. قۆڵی ئەو جۆرە کراسانە لە مەچەکەوە تا نزیك ئانیشك کراوەیە، کە یارمەتی ئاسانکاری قۆڵ هەڵماڵین دەدا، کاتێ پێویست بکات دەتوانێ تا سەرو بازوی هەڵیبماڵێ و بیبەستێت. ئەگەر کەشوهەوا سارد بوو، یەلەکێکی، یان پەستەکێکی بێ قۆڵی بەرگنی ئەستوور دەپۆشن و عەبایەك لە خوریی وشتر دروستکراوە و هەموو کەسانێك هەیانە کە لە ئاستێکدا بن. چینەکانی خوارتر عەبایەکی قوماشی تەنکی رەنگ خۆڵەمێشی، یان زەرد دەپۆشن. سەرومێزەر چەند دەستەسرێکی شین و سپی ئەپێچرێت لەدەوری کلاوێك، کە لە پارچە قوماشێکی رەش و سپی لۆکەیە و نەخش و نیگاری تێدا چنراوە.

## نەینەوا

سەرومێزەر تا رادەیەکی بەرچاو هێمای تایبەتی خێڵە جیاوازەکانی کورد دەکەن، خەنجەری بەرپشتێنیش تەواوکەری جلوبەرگی شارنشینەکانە. ئەوە شێوازی بەرگپۆشینی خەڵکی سلێمانی و هەروەها خێڵی هەمەوەند و جاف و خێڵەکانی تری ئەوپەڕی باشوورە. کە جلوبەرگە جوانەکەی پێشینەیان ناوەتە لاوە.

جلوبەرگی کوردی رەسەن، ئەوەیە کە دواتر باسی لێوە دەکەین و تەواو جیاوازە. جلوبەرگەکەم، بەهەرحاڵ، هەرچۆنێك بوو شتێکی دەگەیاند، بۆیە قەتارچیەکە هات، تێبینیەکی زۆر شیاو و بەجێی کرد، ئەویش ئەوە بوو کە غەریبێك داب و نەریتی وڵاتێکی نوێ پەیڕەوی بکات، دەستبەجێ ئەو ئاستە دەدۆڕێنێت کە لەلایەن ئەو کەسانەی لە رێگا بینیونی و بۆی دانراوە، کە تێبینیەکی تەواو راستە.

بەر لە رۆژئاوابوون چایی ئامادە بوو، پیاڵەی بچکۆلە دابەشدەکرا و نان و خورماکەمان خستە سەر دەسرۆکەیەکی هاوبەش و ئێوارە شێومانکردەوە، ئیدی خۆمان پێچایەوە بەو پاڵتۆیانەی پێمان بوو، لە سێبەری نەینەوای دێریندا بۆ نوستن راکشاین، کەسێ لەوانەی هاودەنگم بوون نەیاندەزانی ئێمە لەژێر دیواری کۆشکەکەی سەنحاریبداین. کە بەرامبەر موسڵە و پاشماوەی دوو شاری مەزنە. دێرینترینیان لەناو هەموو کۆشکی شارەکاندا ئاشوورە، شاری تیگلاز پلەسەر، ئەوەی کە لە تەوراتدا زۆر جار ناوی بە تێکدەری گەورەی بەنی ئیسرائیل هاتووە، کە 1100 ساڵ بەر لە زایین فرمانڕەوایی کردووە. پاشماوەی ئەوەیە کە ئێستا بە قەڵای شەرقات ناودەبرێ و کەوتۆتە بەری رۆژئاوای رووباری دیجلەوە بە ماوەیەك لە داوێنی موسڵەوەیە.

لەوەش بەرەوخوارتر، لەو شوێنەی زابی گەورە تێکەڵ بە دیجلە دەبێت، شوێنەواری نەمرودە، یان قەڵای نیمرود[15] شاری پاشایەتی ئاشوورنازیپالە، ئەوەی فەرمانڕەوایی ئاشووریای دەکرد لە 884-860 بەر لە زایین، هەروەها ئەوەی بە چەشنی زۆربەی مەلیکەکانی ئاشوور هێرشەکانی درێژبووەوە بۆ کەناری دەریای سپی ناوەڕاست. بۆ باکوور و باکووری رۆژهەڵاتی موسڵ، شوێنەکە پێیدەوترێت خۆرساباد، کە ناوێکی کوردیە و بە واتای (شوێنی ورچ) دێت، یاخود لە واتای خوسرەوئابادەوە هاتووە (شوێنی نشتەجێی خوسرەو)، بەڵام لە جیهانی ئاشووریاندا بە (دار شاروکین) ناسراوە، کۆشکی سارگۆن- سەرجۆنی فەرمانڕەوای مەزن، ئەوەی جولەکەکانی راماڵی بۆ ناو ئیمپراتۆریای

---

[15] قەڵا لە 1300 بەر لە زاین، لەلایەن شەلمانسەری یەکەمەوە بنیات نراوە.

ئاشووری و خستنیه ناو حله و خاپوری رووباری گۆزان و شارەکانی میدەکان، واتە لەناو ئەو بەشی رۆژئاواییەی کە ناسراوە بە ئاشووری راستەقینە، رووباری (هابور) ئێستا بە خاپور ناودەبرێت و یەکێکە لە لقەکانی رووباری فورات لە ناوەندی باکووری میسۆپۆتامیادا. لە شارە ناودارەکانی ئاشووریەکان کە هێشتا ماونەتەوە، ئەربیلا کە دواتری لەبارەیەوە دەدوێین و نەینەواش لەوانەیە لە هەمووبان ناودارتر بن. ئەوەش بەشێکی کەوتۆتە سەر ئەو بەرزاییەی کە گۆڕی یونسی لەسەرە و لە کۆیونجیکەوە میلێك یان دوو میل زیاتر بەرەو باکورە، لەو شوێنەی ئێمە لاماندا وە لێی. ئەمەی دوایـیان نەینەوای کۆنە، لێرەدا لە 700 بەر لە زایین، سەنحارب کۆشکێکی بۆ خۆی لە شارە کۆنەکەدا لەسەر شێوەی پێشینەکانی بنیاتنا. هەروەها بەشێك لە ژیانی خۆی لە جەنگدا لەگەڵ جولەکە بەسەربرد، ئەو فرمانی خۆبەدەستەوەدانی قودسی دەرکرد و ئابلۆقەیدا و ئەوپەڕی هەوڵیدا بۆ ملکەچکردنی جولەکە و بەنی ئیسرائیل، تا کاتێکی کە نەخۆشیی تاعون پاشەکشەی پێکرد، ئەو راستیەش لەلایەن ئەشعیاوە تۆمارکراوە. لە سووریاوە بۆ ئێران، لە ئەرمینیاوە بۆ دوورگەی فارسی و بە چەشنی باوباپیرانی لە جەنگدا بووە و لە هەر خاکێکدا یاخی بوون هەبوویێت لەوێ جەنگیوە و تا لە ئەنجامدا دەگەڕێتەوە بۆ کۆشکەکەی خۆی لە نەینەوا و پاشان بەدەستی کوڕەکانی دەکوژرێت. ئەسەرحەدونی چوارەم کوڕ و پەسەندترین ڕۆڵەی لە 681 بەر لە زایین، جێگەی گرتەوە و لە 670 بەر لە زایین، کۆشکی نەینەوای نوێی دەستپێکرد، گردی یونس پێغەمبەر لە لاکەی تری دۆڵی کەوسەرە، کە پاش نیوەڕۆ بەلایدا تێپەڕین، ئەویش لەو رۆژانەوە هەیە. لەم گردانە، چواریان بەشێکی هەڵکەنراوە، سامانێکی زانیاری ورد و هەڵکۆڵراوی شکۆمەندی بنیاتناوە، هێشتا زۆر قەوارەی تر لەوێدا کەوتووە و وەك ئێستای ئەربیلا، کە ئەویش زۆر کۆن و دێرینە وەك هەر یەکە لەوانە دەستی لێنەدراوە. بۆ بەیانی داهاتو زوو هەڵسایین و وڵاخەکانمان بارکرد و بەرەو باشوور کەوتینەڕێ. یەکەم، جارێکی تر بە دۆڵی کەوسەری مێژوویدا تێپەڕینەوە و بەژێر سێبەری گردی نەبی یونسدا بەلای گوندێکی گەورەدا تێپەڕین، دەشتێکی پان و بەرینمان پێشهات و چووینە ناو خاکی تەواوی ئیمپراتۆریای ئاشووری کۆنەوە. بەلای چەپماندا کۆمەڵە گردێکی نزمە و لە قەدپاڵیاندا گوندێکی زۆری لێیە، کۆمەڵە خانوی قوڕی دڵتەنگ، کە نیوەیان لەناو زەویدایە. بەڵام بریتیە لە دوو رەگەزایەتی ئەوانەی مێژوویان پڕە لە شتی سەرنجڕاکێش.

# ئیزیدیەکان

لەو پانتاییەدا موسڵمان ناژی، بەڵکو کلدانی و ئیزیدی دەژین، ئیزیدی (شەیتان پەرستەکانن) ئەوانەی لەگەڵ پەرەستنی مەفیستۆفیلیس (شەیتانی گەورە)دا، گرنگیشیان دەدا بە نەریتەکانی سەمیرامیس، قەشە یان کەشیشێکی ژنی خێڵی ئالۆشاوی کە ئەندامانی سێسکی دەپەرستن.

بەو پێیە ئیزیدیەکان دەبێ کەسایەتی خۆیان لەو تۆمەت و بوختانانەی رابردوو پاکەنەوە، کە بەبێ هیچ هۆیەك جگە لە قین و بوغزی موسڵمانان و رەخنەگرانی مەسیحی زیاتر نییە، کە ئەوانەیان خراوەتە پاڵ بۆ سوکایەتی کردن بە کەسایەتی و رەوشتیان، نەك بۆ ئەوەی رۆشناییەك بخەنە بەردەم خوێندەواران بەگشتی.

ئیزیدیەکان لە کاتێکدا کە بڕوایان بە خوایەك هەیە، بەڵام بە هێزی شەیتان ناوی دەهێنن، یان هەر وشەیەك کە لەسەر بنەمای کاری خراپ دامەزرابێت، بۆنەکانیان هەمیشە نازاراوییە، کاتێ کە ناتوانن ناوی شەیتان تێپەڕێنن، لەبەرئەوە ناوی مەلیك تاوس[16] بەکاردەهێنن، یان مەلەك ئەلکوت (گەورەی فریشتەکان). ئەوان لەو بڕوایەدان شەیتان گەورەی گشت فریشتەکانە و بەشێوەیەکی کاتی سزا دراوە، بەڵام لە ئەنجامدا دەگەڕێتەوە.[17]

لەدوای شەیتانەوە هەریەکە لە جبرائیل، میکائیل، رۆفائیل، ئیزرائیل، دێدرائیل، ئیسرافیل و شەمکیل دێن و ئەوانە حەوت فریشتە بەهێزەکەن، کە لە کاروباری جیهاندا هەموو توانا و دەستەڵاتێکیان هەیە.

ئیزیدیەکان هیچ کامێك لە نووسراوە پیرۆزەکانی ئایینە جیاوازەکان نانێنە لاوە، بەڵام لە هەمان کاتدا بڕوای تەواویان بە پەیمانە کۆنەکە هەیە (واتە بەرگە کۆنەکەی ئینجیل)، هەروەها بەرگە نوێکەی ئینجیل و قورئانیش وەك نووسراوی پیرۆز شایستەی رێزگرتنن. مەسیح وەك فریشتە دادەنێن و بە خاچکردنی ناپەسەندە[18]، و محەمەد و ئیبراهیم و باوباپیرانیان دادەنێن بە پێغەمبەر و لەسەرو ئەوەشەوە، چاوەڕوانی دەرکەوتنی هەریەکە لە مەسیح و ئیمامی مەهدین. ناوی خێڵ و

---

[16] - لایارد - Layard شێوەی باڵندەیەك دەهێنێت، کە بەپێی دابونەریتی ناوخۆی ناوچەکە بەڵگەیە بۆ بت پەرستی، بەڵام نە ئەو و نە هیچ گەشتیارێك توانیویانە ئەو بۆچوونە بەدی بکەن و لەوەش زیاتر نازانن کە بەکارهێنراوە و نێردراوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، چونکە( پەلەوەرێکی بچوك بووە) پەیامی گرنگی باڵادەستانی ئاینەکەیان پیاناردووە.

[17] - بە ئەسایی ئەمە بیردۆزێکی پەسەندە، بەڵام تفلیسی ئیزیدیەکان، بەهەرحاڵ دواتر بە شێوەیەکی دی باسی دەکەن، هێما بۆ ئەوە دەکەن دوای ئەوەی شەیتان فرمێسکێکی تەواوی پڕ بە حەوت پاپۆڕ هەڵڕشت بۆ کوژانەوەی حەوت دۆزەخ لەو حەوت هەزار ساڵەی دەربەدەرییەیدا، ئێستا گەڕێنراوەتەوە بۆ ئاسمان. ئایا دەتوانین وای دابنێین کە ئەم رووداوە گرنگە لە 1839دا روویداوە، کاتێ لەیارد بیردۆزەکەی راگەیاند لە تێکستەکەدا.

[18] - لێرەدا پەیڕەوییان لە رێڕەوەکانی موسلمانان کردووە، بڕوانە قورئان 156/4 (وما قتلوه وما صلبوه ولكن شبه لهم).

دەستەئاینیەکە لە بنەچەدا گومانی لێدەکرێت، بەڵام لایارد- Layard بۆ ئەو بیردۆزە دەچێت، کە دەیبەستێتەوە بە وشەیەکی کۆنی فارسییەوە بە واتای خوا،[19] بیردۆزەکەش لەلایەن موسڵمانە شیعەکانەوە پێشکەشکراوە، گوایە ئیزیدی کوڕەری ئیمامی حسین دروستیکردوون،[20] بێگومان ئەوان داکۆکی لە ئیزیدی ناکەن، تەنیا لە پێناوی ناشرینکردنی ناو و ناوبانگیاندا ئەوەیان خستۆتە روو. بنەچەی راستی بنەماڵەکە بە تەواوی نادیارە، هەروەها سروشتی ئەو تێکەڵاویە بەو شێوە ناوێزەیە، ئەو جۆرە بیروباوەڕە گرانەی بەدیهێناوە.

کتێبی ئاویستای زەردەشت لە سەدەی شەشی پێش زایین، ناوی تیرە و تاقمێکی شەیتانپەرستی هێناوە و زەردەشت خودی خۆی هێرشدەکاتە سەر میللەتێکی هاوشێوە لە باکووری ئێراندا. لە باوەڕی هاوچەرخی ئیزیدیەکاندا، چەند هێمایەکی دیار دەبەستنەوە لەگەڵ ئەو باوەڕە کۆنەی لە ئاوێستادا باسی لێوەکراوە، کە لە چەرخەکانی بەر لە زاییندا لەناو میللەتاندا جۆرێ لە سروشتپەرستی هەبووە. بەڵام دوای ئەوە هەروەها بەڵگەکانی تر ئەوەش دەگەیەنن، کە رۆژپەرستیی کلدانی کۆن و بابلیەکان، رۆژ پایەداردەکەن و دەیپەرستن. پێیدەڵێن شێخ شەمس، مانگ و شێخی سین، بەرانبەر شەماش و سین لە ئەفسانە کۆنەکاندا.

دابونەریتیشیان بەگوێرەی بیروباوەڕەکەیانەوە هەمان نمایشی سەرنجڕاکێشەر دەکات. (تەعمید) و خەتەنە دەکەن و رۆژ و مانگ پیرۆز رادەگرن، و تێکستە ئیسلامیەکان لەسەر گۆڕەکانیان هەڵدەکۆڵن و کەڵك لە بەرگی نوێی ئینجیل وەردەگرن و رێ بە هێنانی چەند ژنێك دەدەن و شەراب خواردنەوە رێی پێدراوە و هەندێ گۆشت حەرام کراوە. ئەوە تێکەڵەیەکە لە کولتوری زەردەشت و ئاشووری- بابلیەکان و خواپەرستی ئیسلامی و مەسیحیەکان، کە هیچ تیرە و خێڵێکی تر پەیڕەوی ناکات. لە رەنگی شین خۆیان بەدوور دەگرن و هەرگیز لە جلوبەرگ و ناو ماڵ و خانوەکانیاندا بەکاری ناهێنن. ناوەند و شوێنی نیشتەجێی ئەم خەڵکە لە نزیك موسڵە، لەوێ، لەناو دۆڵێك لەنێوان بەرزاییەکانی کورد- دا، کە پێغەمبەری پیرۆزی ئیزیدیەکان (شێخ ئادی) لێنێژراوە، ئەوەی کە چەند مێژوویەکی جیاواز بۆ ژیانەکەی دانراوە و دەوترێ لە سەدەی نۆیەم و سەدەی یانزیەمدا ژیاوە.

---

[19]- یەزد، یەزدان.

[20]- یان، کە یەزید دەبێتە ئەندامێکی بەرێوبەری تیرەکە.

تا ئێستاش زۆر بەکەمی لەبارەی شێخ ئادییەوە دەزانرێت، هەروەها مێژووی بوونی بە جیاواز باسدەکرێت و پێناسەی کەسی هێمای هیچ ناکات، جگە لە بیردۆزێکی خۆماڵی کە دەگەڕێتەوە بۆ چەند ساڵێك لەوەبەر، پەیوەندی نێوان ئەو و عودەی، گیانی باووباپیرانی مردووە (کە لە ئاینی رۆمانی کۆندا بە خوا دادەنرێن). بەو پێوانەیە تا ئێستا دەبێ بەوە رازیبین، کە لە سەرچاوە فارسیەکاندا هاتووە، یەکێك بووە لە خەلیفەکانی مەروانی، ئەوەش هەڵەیەکە و دەبێ هەڵوێستەی لەسەر بکرێت. لەگەڵ ئەوەشدا، من وا هەستدەکەم، ئەو روونکردنەوەی دوایی لەوانەیە پەسەندبکرێت، ئەنجامی بەدواداچوونی کارە ئیسلامیەکانە لە لایەن نوسەرانێکەوە کە ئەو بەباشی بیستونی. لەمەوە نووسەر زانیاری وەرگرتووە، کە شێخ ئادی کوڕی (موسافر ول زاهید) لە خێزانێکی ئومەیەی دانیشتوی بەعلەبەك لە سووریا بووە. لە سەروەختی مەرواندا (سەرەتای سەدەی هەشتەم) ئەو گواستراوەتەوە بۆ موسڵ[21] و لە شارۆچکەیەکی خێڵێکی مەزنی کورد بەناوی هەکاریەوە نیشتەجێبووە، لەوێ پیرۆزی و پیاوچاکیەکەی بۆتە هۆی بەدەستهێنانی وەدووکەوتوانی زۆر لەناو ئەو خەڵکەی لەوێ نیشتەجێبوون. لە سەروەختی ئاوارەییدا کۆچی دوایی کرد و لە دۆڵێکدا بەناوی (لاش)[22] نێژراوە، کە بەکوردی واتە (شوێنی لاشە)، لەوانەشە ئەو ناوە دوای ناشتنی ئەو لەوێ نرابێت. چوار پلەوپایە لە قەشایەتی ئاینی ئیزیدیدا هەیە، ئەوانەش: پیر، شێخ، قەوال و فەقیر. یەکەمیان، وشەیەکی هاوبەشی کوردی و فارسییە و واتای بەساڵاچووان، یان پیاوی پیرۆز، کەسانێکی زۆر بەرێز و دوورەپەرێزن. شێخ (رابەر، سەرکردە) قەشە نیشتەنیەکان دەبینن، لەکاتێکدا قەوال (وتەبێژان) کە گەڕۆکن و چاوەڕێی ئەوەیان لێدەکرێت کە لە بۆنە و جەژنەکانی ئاینەکەیاندا گۆرانی بڵێن و سەمابکەن. دوا پلەش فەقیرە واتە (هەژار، ملکەچ) ئەرکە خزمەتگوزاریەکان جێبەجێدەکەن لە خزمەت مەزارەکەی شێخ ئادیدا لەو دۆڵەی بەو ناوەوەیە لە نزیك موسڵ. ئەو زمانەی قسەی پێدەکەن دیالێکتێکی کوردیە، بەڵام زمانی عەرەبی بەکاردەهێنن بۆ دروشم و سرودە ئاینیەکانیان. برێکی زۆر تەمومژ لە دەوروبەری بنەچە و رەگەزیان هەیە و وەك خوێندنەوە و نووسین لەناویاندا تاوانە، هیچ بەڵگەیەکی نووسراو نیە لەو رووەوە یارمەتی بدات. لایارد - Layard وا هەستدەکات کە بە رەگەز کلدانی بن، کە پەنایان بردۆتە بەر زۆربەی ئاینەکان

---

[21]- لە ئەسڵەکەدا نوسراوە (وە ئەنتەقەلە بیل موسڵ) (ترایق ول حەقایق).

[22]- کە لە موسڵ بووم بەدواداچوونم کرد بەتایبەتی لەبارەی ئەو شوێنەوە، کە پێیدەوترا (کێوی لاشە) یان شاخی جەنازە. پیاوێکی ئاینی موسڵمانی موسڵ زانیاری دامێ، کە شێخ ئادی بە دڵنیاییەوە لێرەدا نێژراوە و هەندێ لە موسڵمانان رێز لە گۆڕەکەی دەگرن و هەوڵی ئەوە دەدەن کە شوێنەکە بەدوور بگرن لەوەی کە پەیوەند بێت بە ئیزیدیەکانەوە.

و شتێکی زۆریان وەرگرتووە، بۆیە لەبارەی بیروباوەڕی تایبەتیانەوە کەوتونەتە ئەو گێژاوەوە. هەر لەسەرەتای دەرکەوتنیاندا وەك یەك لەلایەن موسڵمان و مەسیحیەوە جێی نەفرەت و قین بوون و هەمیشە لەگەڵ دراوسێکانیاندا لە دوژمنایەتی و ناکۆکیدا ژیاون. سەردەمانێك هێزێکی زۆریان پێکەوە ناوە و دوژمنانیان سەغڵەتکردووە، بەڵام سەرکردەیەکی کورد سەرکەوتووە بەسەریاندا و هێزەکەیانی قەڵاچۆکردووە. ئیدی لەو کاتەوە لێرە و لەوێ لەناو مەسیحیەکان و کوردەکاندا دەژین، ژمارەیەکی بەرچاو تا ئێستاش لەسەر ئەو کۆمەڵە بەرزاییانەی سنجار نیشتەجێن، کە درێژبۆتەوە بۆ لای رۆژئاوای موسڵ، هەروەها لە قەوقاس و نزیك تفلیس و بایەزیدیش هەن. لەسەردەمی (لایارد- Layard) ەوە ئازار و ئەشکەنجەکی زۆریان بەدەست تورك و کورد و کلدانەکانەوە چەشتووە، لەم سەروەختەشدا لە بارودۆخێکی زۆر نالەبار و هەژاری و نەبوونیدا دەژین، جگە لەو راستیەی کە رەنگی شین ناپۆشن. دەشتوانرێ لە دانیشتوانی کورد و تورکمان و کلدانەکان و ئەوانەی لە ناویاندا دەژین جیابکرێنەوە، بێجگە لەو تۆزە نیشانانەی کە زکماکە و یا شوێنی ژیانیان لەو خاکەی تێیدا دەژین لەوانەیە بناسرێنەوە. باشووری ئەو کۆمەڵە گردە بوو، کە رۆژی دووەم ئێمە بەلایدا لە موسڵ چووینە دەرەوە و بە پشتی رووباری خەزەردا، کە ئێستا نەماوە، ئەو رووبارەی ئێمە لێی پەڕینەوە، بەرەو رۆژهەڵات دەکشێ بەگوێرەی پەڕینەوەکەی بەیانیمان، هەروەها تێیدا دووچاری کێشە و سەغڵەتی بووین، هێسترەکان چەند جارێ لەترییاندەدا و مەترسی لەسەر سواربووان دووچەندانە بوو. رووباری ناوبراو لقێکی زابی سەرو بوو، لەو شوێنەوە دەرژایە ناوی کە ئێمە لێیوەی تێپەڕین، لە راستیدا، پەڕینەوەکەمان کە بەرەو رووباری زابی سەرو بوو، دەکەوێنە خاڵێکی زەوییەکەوە لە نێوان دوو رووباردا و پانیەکەی چەند میلێکی کەمە، لە دەوروبەری پاش نیوەڕۆدا گەیشتینە کەنارە بەرزەکانی ئەم رووبارە مێژووییە و لە هەمان کاتدا باران دەباری و ئیدی رێگەی خۆمان لە تولە رێیەك بەناو بەردەڵانێکدا دۆزیەوە، بۆیە بارەکانمان لە شوێنێکدا کە 10 پێ پان دەبوو داگرت و خۆمان لە ژێر تاشە بەردەکاندا حەشاردا. سەرتاسەری رووبارەکە دەشتێکی پانمان لە پارێزگایەکی کۆندا بینی، کە لەلای پارسیەکان و مادەکانەوە بە ئەدیابین ناسراوە، دوای ئەوەش هەر ناودارە و لە هەموو زەویەکانی ناوچەی ئاشوور بە پیتترە، بەتایبەتی ئاشووریا خۆی، لەم کاتی ساڵەدا فەرشێکی سەوزی راخراو بوو. لە داوێنمانەوە رووبارێکی بەهارەیە، بەدەوری بەردەکاندا بڵاوبۆتەوە و بۆ سەرچاوە دەگەڕێت، ئێمە لەوێوە دەمانتوانی لوتکە سپی پۆشەکانی کوردستان لەنێوان تەمومژی هەورە چڕەکانەوە بەدیبکەین. لەوبەرەوە گوندی زەیلانە، لقی خێڵێکی

ناوێزەی کوردی تێدا دەژی، کە بەرگی عەرەبیان پۆشیوە. دابونەیت و شێوازی قسەکردنیان زۆر تەواو دەشتەکی بوو، لێرەدا، لەهەمان شوێندا سوپای ئاشووریەکان و فارس و ڕۆمان پەڕیونەتەوە و ڕێگا کۆنەکەی نێوان نەینەوا و ئەربیلیان دروستکردووە، کە شاری پیرۆزی ئاشووریەکانە و بەو ڕێگایەدا پاشا سەرکەتوەکانی ئەو نەتەوە مەزنە دەگەڕانەوە بۆ بە ئەنجامگەیاندنی قوربانی و ستایشی (ئەو- Her) بانوخواوەندی سەرکەوتن لە ئەربیل.

لەسەر ئەم ڕێگا دێرینە بوارێکی سادەمان وەرگرتووە و بەچەشنی زۆربەی پێشینانمان لە کەشتیەکەدا لای لافاوەکەوە وەستا. لەسەردەمانی ئێمەدا کەشتی بچووك لە توێکڵی درەخت دەکرا، وەك ئەوانەی لە رووباری فوراتدان و گەشتیاران دەپەڕێننەوە، بەڵام کە ئێمە گەیشتین، خەریکی بارکردنی بوون لەگەڵ هەندێ گوێدرێژ، خاوەنەکەشی لەو زریانەدا نیازی نەبوو پەڕینەوەیەکی تر بکات، بەڵام بەو شێوەیە کاردەکەن. لەژێر بەردەکەمەوە بانگێکم لێکرا، لە لایەن گەورەی شوێنەکەوە، کەسێك لەتوێی عەبایەکی توکنی سپیدا. بە زمانی تورکی و عەرەبی هەوڵی لەگەڵدا دام، بۆ ماوەیەك باسی پێشینەمان دەکرد، لەو میانەیەدا پێیوتم کە لافاو یان لێشاو، زریان یان هێدی، کەشتی هەبێ یان نەبێ، گوندەکە دەبێ ساڵانە 600 لیرە وەك باجی ئەوەی پەیدایکردووە بیدات بە دەوڵەتی موسڵ. لەسەرو ئەوەشەوە، بۆچی هاووڵاتی زۆر جار نایانەوێت کاربکەن، چونکە بێکەڵکە دەستکەوتی نییە و سەرباز بەدوایانەوەن، لە ئاکامی ئەوەدا نرخ بۆ گەشتیاران دوو ئەوەندە، یان چوار ئەوەندەیە، لەوەبەر نرخی کرێی گوێدرێژێك یەك شلن و هەشت پەنس بووە، کرێی هێستریش سێ شلنە. لەوە ناچێت ئەو شتانە کورد بگرێتەوە، لە شێوازی بوونیان ئەوانە وەك شەیتانی دڕندە کاردەکەن، فەرمان و پێچ و پەنا و هونەر بەرفراوان لەگەڵ هاوار و پێکەنیندا، لەگەڵ ئەوەشی پێیان دەڵێن کورد، کەچی شێوەی رەگەزی جیاشیان تێدایە، من وا هەستدەکەم عەرەبی بەهێزیشیان تێکەڵاو بووبێت.

کۆمەڵێك چیلکەو چەوێڵمان کۆکردەوە و بەدەوری ئاگرێکی بڵسەداردا گردبووینەوە، هەڵئەلەرزین، خۆرئاوابوون باوبارانی لەگەڵ خۆیدا هانی، بەجورێك کە هەر زوو تاریك داهات، لە کەنارەکەدا هێسترەکانمان بەستەوە و ئێمەش خۆمان بەو شتانە داپۆشی کە پێمان بوو، ئیدی لەسەر زەویە تەڕەکە بۆ نوستن ڕاکشاین. هەر بەین نا بەینێك یەکێکمان لەپڕ هەڵئەسا و سەیریدەکرد کونی لوتی گیراوە و هەناسەی بۆ نادرێت، یان بۆ پارێزگاریکردن لە بەتانی یان پاڵتۆکەی لە پێشێلکردنی لە زەویدا لەلایەن هاوسێ بۆگەنەکانیەوە.

## بەشی شەشەم

## رووبارەکانی زاب، شارستانیی ئاشوور و ئەدیابین، ئەربیلا و کەرکوک

بەپێی نەخشەیەك کە رووبەری تەواوی وڵاتەکە لەگەڵ سنووری سروشتی لە هەموو لایەکەوە پیشاندەدات، کە دیجلە رۆژئاوای پێکدەهێنێ. لە سەرچاوەکانی ترەوە، دوو رووباری زابی بچووك و گەورە، بە گۆشەیەك دەکشێت تا دەگاتە کۆمەڵەی زاگرۆس، کە لەگەڵ دیجلەدا هاورێکە، چوارەم سنوور دروستدەکات، لەناو ئەم سنوورەدا زەوییەك هەیە، بەشێکی دەشتە و بەشێکی گردۆڵکەیە، تەواو ئاودێرە و کەشوهەوایەکی خۆشی هەیە و تابلێی بەپیتە و ئەمە ئاشووری تەواوە و پاشایەتی دواتر و شاری ئەدیابینە، کە سنووری رۆژهەڵاتی شاخەکانی زاگرۆسە، پەناگای ئەوسان، وەك ئێستا، خەڵکێکی دەشتەکی زۆر و بەجارێ شێوەیەکی سامناکی پێکهێناوە، تەنانەت بۆ پاشاکانی ئاشووریش.

رووباری باکوریی، کە ئێمە لە پارێزیدا هەڵماندابوو، زابی گەورەیە، لای رۆمانەکان بە لیکۆس ناسراوە، نزیکیەکەی لە پایتەختی ئاشوورەوە (کالە لە دەمیدا بوو) لە سەردەمانی ئاشووردا لە شوێنێکی پارێزراودا هێشتبوویەوە، لە ساڵی 128 بەر لە زایین، یەکەم پێکدادانی مەزن لەسەر کەنارەکانی تۆمارکراوە، کاتێ کە ئاشووریەکان تەنیا یادەوەری بوون. لەو شوێنەی ئێمە هەڵماندابوو، (ئاندەیتس)ی سەرلەشکری سوپایەکی (فراڤارتیش) پادشای ئاشکانی، لە بەرزاییەکانی میدەوە (زاگرۆس) هاتەخوارەوە و بەرەنگاری (ئانتیۆکوس)ی پاشای ناوداری سووریا بووەوە. لێرەدا شەڕێکی بێبەزییانە بەرپابوو، بە شکاندنی ئەندەیتس کۆتایی هات و ئەنتیۆکوس مۆنومێنتێکی بۆ سەرکەوتنەکەی لەو شوێنەدا دانا، بۆ یادەوەری شکاندنی ئاشکانی بەهێز.

زابی بچووك، رووبارێکی گچکەیە، بەدرێژایی یەك رۆژ رێکردن بە دەشتایدا، ناوبانگێکی زۆری لە جەنگ و لە مێژوودا بەدەستهێناوە. (تەغلەس فلاسەری یەکەم) لە 1100 بەر لەزایین، ئەوە لە لولەکە ناودارەکەدا بەیاندەکات، کە لە ئاشووردا دۆزراوەتەوە:

# زابی بچووك

" 42 دەوڵەت پێکەوە و ئەمیرەکانیان لە پشتی زابی بچووکەوە، لە ناوچە دارستانیە دوورە دەستەکانەوە لە سنوورەکانی خاکی (خەتێ)،[23] لەودیوی فوراتەوە و بۆناو دەریای سەروی رۆژئاوا،[24] دەستم دەرۆشت لە سەرەتای فرمانرەوایەوە بۆ ساڵی پێنجەم.[25] "

لە ساڵی 52 زاییندا، لە سەردەمی ناکۆکی نێوان ئاشکانەکان و رۆمان، (ڤۆلگاش)ی پادشای ئاشکانی، هێرشێکی کردە سەر (ئازاتاس)ی پادشای لقێکی ئادیابێن (وڵاتی نێوان دوو رووبار)، بەڵام دوای ئەوەی لەسەر زابی خواروو هەڵیاندا، کوتوپڕ بانکرایەوە تا بگەڕێتەوە بۆ باشوور، بەهۆی ئەو یاخیبوونانەوە لەوێ لە شارەکاندا کە بەرپابوو.

لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو جەنگانەی کە لەسەرو هەموو رووداوە ناودارەکانەوە، زابی بچووکی پێ ناودارتر بووە، بریتین لە جەنگی نێوان هێزەکانی خۆراسانی ئەبوموسلیم و عەباسیەکان و ئەوانەی نێوان عەبدوڵڵای کوڕی مەروان لە ساڵی 749 زاییندا، هەروەها لەنێوان خۆراسانیەکان و مەروان خۆیدا ساڵی 750 زایینی، پێنج مانگ دواتر، کە لە هەردوو جەنگەکاندا، مەروان دۆڕاندی، کە دوا خەلیفەکانی هێڵی درێژی ئەمەوییە.

گرنگی ئەم جەنگە سەربازییە لە ئاستێکی بەرزدایە، وەك هەر یەکێ لە شەرە مێژوویەکانی رۆژهەڵاتی هاوچەرخ، بە قازانجی ئەو سەرکەوتنە یەکلاکەرەوانە، خەلافەتی عەرەبی لەوپەری دەستەڵاتیدا کۆتایی هات و گۆڕا بە زنجیرەیەکی فارسی، لە بنەماڵەی عەباسیی خۆراسان لە رۆژهەڵاتی ئێران. لەوانەیە ئەوە راستبێت کە دەوترێ (قادسییە) و (نەهاوەند) لە کەناری زاب تۆڵەیان سەندەوە، دەستەڵاتدارێکی مەزن دەڵێت، هێما بەو جەنگەی 110 ساڵ لەوەبەر، کاتێ ئێرانی زەردەشتی لەبەردەمی عەرەبدا کە بڕوای ئایینی نوێی محەمەدییان هەبوو، نەوەکانیان لەسەردەمانی خۆیاندا توانیان سەرپەرشتی ئەو فارسانە بکەن، کە نەزانی و گومڕایی و دڕندەییان ناوی (عەجەم)، واتە بەربەر یان دڕندەیان لێنابوون.

لە شوێنەکەمانەوە لەسەر زابی گەورەوە یەك رۆژ رۆشتن بوو (10-12سەعات) بەسواری بۆ ئەربیلا یان ئەربیل، هەروەها شێوازی نوێشی هەیە،[26] هەر زوو لە رووبارەکە پەڕینەوە و لە رۆژئاوابووندا

---

[23]- هیتیەکان.

[24]- دەریای سپی ناوەڕاست.

[25]- بڕوانە ئاشووریای راکۆزین، ل 57.

# ئەربیل

گەیشتین، ئاستی شارەکە لە چاڵاییەکی نزمدا لە داوێنی کۆمەڵە بەرزاییەکدایە، لە پشتەوە زنجیرەیەك تا زاگرۆس بەرزدەبۆوە، لە ئەنجامی ئەوەدا ناتوانرێ لە دەشتێکی لێژدا ببینرێت، ئەگەر ئەو تەپۆلکە گەورەیە نەبێت کە پاشماوە نێژراوەکەی شاری خوای عەشتاری تێدایە.

پاشنیوەڕۆیەکی دیاریکراو گەیشتین، ڕۆژێکی نمونەیی بەهار بوو، لە دەشتەکەدا نمەبارانێك لێیداین، بەڵام کە نزیکبووینەوە لە چیاکان، چووینە ناو ناوچەیەکەوە، کە هەورە چەماخە و بروسکە و زریان بوو. یەکەم دیمەنی هەولێر سەرنجڕاکێشەر بوو. هەورە چڕەکان بەدرێژایی ڕێ بەسەر چیاکاندا دەڕۆیشت، لێوەی باران بەسەر پەردەی خۆڵەمێشی دیمەنەکەدا دەهاتەخوارەوە، تیشك و بروسکەی جوانی هەورە چەماخە بەرد و تاوێرەکانی چیاکانی لە نێوان تەمومژی هەورەکانەوە پێشاندەدا و پەلکەزێڕینە هەولێدەدا ببێتە تاقی سەر دیمەنەکە. ئێمە لەنێوان شڵەژانی تاوەبارانەکاندا بۆ دیمەنێکی شارەکە دەگەڕاین، کاتێ هەورێکی چڕ و ملوانکەی بارانەکەی تێپەڕی، پەڵە هەتاوێکی گەرۆکی لەدواوە جێهێشت و وەك پەردەیەك کە پیابخشێت لەگەڵ بریسکە و درەوشانەوەی هەورە چەماخەدا، ڕوپۆشی لەبەردەم هەولێردا هەڵماڵی و سورێکی گەشاوە و بڵێسە سەندو لەناو خۆرەتاوەکەدا، گردێکی سەیروسەمەرە و پڕنهێنیمان بەرچاوکەوت، لە پشتەوە و لەلاتەنیشتەوە بەهۆی هەورە ڕەشەکان و ڕەهێڵەی بارانەوە بۆ چرکەساتێك بینیمان، ئیدی سەرتاپای نوقمی زریان بوو. هەورەکە بە چەشنی دوکەڵکی چڕ دادەبەزیە خوارەوە و گردەکەی دەشاردەوە و دەنگی هەورەچەماخە خۆی دەکرد بەناویا و تیشك و روناکیەکی لە هەمان کاتدا دەنەخشان و هەموو ئەو توخمانە شتێکی گرنگیان بۆ یادەوەری ئەو خواوەندە مەزنەی هەمووان دروستدەکرد، کە عەشتاری ئەربیلایە.

کاتەکەمان بۆ بینینی شارە گچکەکە گونجاو بوو بە ڕۆژی ڕووناك، ئێستا هیچ هێمایەکی دێرینی پێوە دیارنییە، بێجگە لە هەندێ پاشماوەی ئیسلامی نەبێت، هەموو ئەو شتانەی پەیوەندە بە ئاشوورەوە لەناو قەڵا مەزنەکەیدا پارێزراوە، کە حاکمێکی تورکی هاوچەرخ بنیاتیناوە، بەرزی گردەکە لەبەرچاوگیراو بوو، زۆر بەرز دەیروانی بەسەر خانووە بەرزەکاندا، گردێکی ئەوەندە گەورەیە، تەنانەت وەك سروشتکرد دەنوێنێت، کەس باوەڕناکات کە ئەوە دەستکردی مرۆڤ بێت، ئێمە لە هیچ

---

[26]- کوردەکان پێیدەڵێن هەوریل و زۆرجاریش هەولێر.

شوێنی تر کۆشکەکانی ئاشووریەکانمان نەبینیوە.
لێرەدا پەرستگا مەزنەکەی لێیە کە ماوەی هەزار ساڵ و بگرە زیاتریشە کڕنوشی ڕێز و ستایشی لەلایەن هەموو نەژادەکان و پادشاکانەوە بۆ دەبرێت، هەموو هۆیەك هەیە بۆ باوەڕهێنان بەوەی کە ئەو رازاندنەوە و ئارایشتە لێرەدا هەیە بێ وێنەیە، تەنانەت لە هیچ شوێنێکی ئاسیادا. کاتێ کە گەیشتین باران دایکرد و بە تاریکی کەوتینە ناو کۆلانە تارێکەکانی شارێکی نوێی رۆژهەڵاتیەوە و لەسەر بەرزاییەکە خانێکی پەرپوتم دۆزییەوە، ژورێکی شێدارم بۆ کەلوپەلەکانم پەیداکرد، کە نیوەی ئاو بوو.
لەوێدا کە هیچ شتێك تەنانەت دار و تەختەش دەستنەدەکەوت، ئەو شەوەم بە چاو و نانی وشك و چەند دەنکە خورمایەکەوە بەسەربرد و لەناو ئاودا نوستم، هاوڕێکانم لە تاریکیدا لەیەك دابڕاین و لە شوێنی تر پەناگایان دەسکەوت. ئێرە سنووری رۆژئاوای کوردستانی باشوورییە و هەولێر بە کوردە بابانیەکان ئاوەدان کراوەتەوە، کە تیرەکی نشیتەجێن، بە زاری موکریانی دەدوێن[27] و لە تورکیش تێدەگەن، یان راستر بڵێین تورکومانی، بۆ ئاڵتون کۆپری و کەرکوکی شاری تورکمانەکان، زۆر دوورنییە. لە بەشی دەیەمی گەشتی پەیدابووندا 8-12 ئەوە دەخوێنینەوە: "کوش نەوەی نەمرود، کە دەستیکرد بەوەی ببێت بە قارەمانترین کەسێك لەسەر زەوی. راوچیەکی قارەمان بوو لەبەردەم خواوەندا، بۆچی وەك دەڵێت، تەنانەت وەك نەمرود راوچیەکی قارەمانە لەبەردەم خواوەندا، سەرەتای پاشایەتیەکەی بابل بوو، ئێرخ و ئەکەد و کاڵنە لە خاکی شینار‌دا. دەرەوەی ئەو خاکە بەرەو ئاشوور دەچێت و نەینەوای بنیاتنا و شاری رەهۆبۆت و کالا و رێسەن لەنێوان نەینەوا و کالادا، هەمان شێوە شاری مەزنن."
ئێستا مێژوو دروستکردنی شارە ئاشووریەکان بەلایەنی کەمەوە دەگەڕێتەوە بۆ 1800 ساڵ بەر لە زایین، ئایەتەکانی 11-12 ی ئینجیل هێما بۆ ناوچەیەکی بچووك دەکات لە ئاشووری راستەقینەدا لەگەڵ سێ شاری کالا و نەینەوا و ئەربیلا، لە میانەی هەموو سەردەمانی فرمانڕەوایی ئاشووریەکان، ئەربیلا پەیوەندی بە پایتەختی پاشایەتیەوە هەبووە، بەو شێوەیەی کە کانتربیری هەیبوو بە لەندەنەوە لە مێژووی ئینگلیزدا، هەمیشە پایتەختی ئایینی بووە، گرنگی لەبرەودابووە، بۆیە لەناو ئاشووردا پاشا هەمیشە لە قەشەکانی ئایینی ئاشوور بووە. عەشتار خواوەندی بەعلەی سەردەمی زووی کلدانەکانە و دواتر مەزارەکەی گواستراوەتەوە بۆ باکور، کاتێ ئاشوور بوونی

27- لە کۆندا یەکێك بوون لە بنەماڵە زۆر ناودارەکان و بەهێزەکانی باشووری کوردستان.

سەربەخۆیی هەبوو، لەوانەیە ئەربیلا (ناوی ئەربائیلۆ) واتە چوار خواوەندی بۆ هەڵبژێرابێت، لەوانەیە مەزاری هەندێ بووبێ و ئینجا خواوەندی ئەو کاتە. بەجۆرێ کە ئەربیل تا ئەمڕۆ بەلایەنی کەمەوە سێ هەزار ساڵ تەمەنیەتی و دووەم نیشنگەی خواوەندی عەشتاربووە، ئەوەی کە لە بەشی دووەمدا هێمای بۆ کراوە. ئەو زیندوێتیەی لەو ڕۆژەوە پاراستویەتی تا ئەمڕۆش لە هیچ قۆناغێکدا لە دەستی نەداوە، لەبەرئەوە شایانی یادکردنەوەیە، هەر هیچ نەبێ جارێك بەلایەنی کەمەوە لەمیانەی دەستەڵاتی هەموو یەکێ لەو دەوڵەتانەی کە دوای ئاشووری فرمانڕەواییانکردووە، ماد، پێرشا، گریك، ئاشکان، رۆمان، ئەرمەنیەکان، رۆمان جارێکی تر، پێرشا و عەرەب. هەندێ تێبینی کراوە، بەپێی سەردەم ئەوە پیشاندەدات.

ئاشوورنازیپاڵ لە 884 پێش زایین، کە پاشایەك بوو خزمەتێکی گەورەی بە شارەکە کرد، پێیدەوت: (شاری خۆم)، لە سەردەمێکدا مەلیکێکی دیلکرد، کە دژی ئەو هەستابوو، هەر بە زیندویەتی پێستەکەی گوری و بە دیواری شارەکەدا هەڵیواسی. سەنحاریب، پاشای مەزن، ناودارترینی هەموو پادشاکانی ئاشوور بوو، لە 692 پێش زایین، چوو بۆ زیارەتی عەشتار بۆ دوعاکردن، کە لە شەڕی دژ بە بابلدا سەرکەوتوبێت. بە دەنگیەوە هات. بەڵام ئەسەرحەدونی کوڕی دوای 24 ساڵ لە چیاکانی باکورەوە دەڕۆیشت خەریکی هێرشێك بوو بۆ تۆڵەکردنەوەی کوشتنی باوکی، دەڵێن پەیوەندی بە خواوەندی عەشتارەوە کردووە، کە لە نزرگەکەیەوە نامەیەکی لە ئەربیلاوە بۆ هاتووە بە پشتگیریکردن و دڵنیایی سەرکەوتنی.[28]

چەند ساڵێك دواتر، لە 656 پێش زایین، ئاشوورنازیپاڵ (سەرداناپاڵەس) ئامادەی نەبەرد بوو دژی ئیلام (عەرەبستانی نوێ لە باشووری رۆژئاوای ئێران) و مەزارگایەکی مەزنی لەوێ کرد، تا نوێژیکەن بۆ نیشانەیەك لە خواوەندەوە، کە ئەویش نیشانەکەی پێ بەخشی، ئیدی ئەو پەرستگایە بوو بە پیرۆزترین دانە لە ئاشووردا.

پادشای داگیرکەر (تەومان) تێکشکێنرا و ژمارەیەکی زۆر لە دیلەکانی بە شێوەیەکی بێبەزەییانە راپێچکران بۆ ئەربیل، بەشێوەیەکی دڕندانە دواتر هەر بە زیندویەتی پێستیان گورون.

لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا لە 608 پێش زایین، جەنگی نەینەوا لە ئەنجامدا ئیمپراتۆریای مەزنی سەرنگونکرد و مادەکان دەستیانگرت بەسەریدا، ئەربیلا کەوتە ژێر دەستەڵاتیانەوە.

---

[28]- بڕوانە Ragozin's Assyria, p,161.

# ئەدیابین

پیرۆزی شارەکە پێویستە بیمەیەکی دیاریکراوی هەبێت لەبەرامبەر تالآنی و وێرانکاریدا. ئەوە خۆشبەختانە بۆ ماوەی 80 ساڵی دواتر پاراستی، کاتێ داریوش لەوێ پاشایەکی بچووکی خەڵکی (ساگارشا)ی هەڵواسی. تاکو ئەلێکساندەر لەگەڵ لەشکرەکەیدا ئاسیای داگیرکرد، ئەو هەر لە ئارامیدا مابووەوە، بەڵام لە 331 پێش زایین، شەڕێکی گەورە لەوێ، کردی بە شارێکی یونانی.

بەهەرحاڵ، ئەوەبوو، 80 ساڵ دوای ئەوەی کە ئارسەیسی یەکەم، رزگارکەر و بنیاتنەری ئیمپراتۆریای مەزنی ئاشکانی، ئادیابنی داگیرکرد و پیرۆزی ئەربیلای بەدەستهێنا، لەبەرئەو جیاوازیەی کە دەبێتە شوێنی ئاشتنی پاشاکانی ئاشکانی. یۆنان و دواتریش پاشاکانی سووریا لە سەردەمانی دوایی خەلافەتی ئەسکەندەردا بوو، هەڵبەتە لەبەرئەو پیرۆزییە تەواوەی کە ناوچەکە هەیەتی وای لە ئاشکانیەکان کردووە کە لەپێناویدا بجەنگن، بەڵام تا نزیکەی ساڵی 136 پێش زایین نەبوو، (ئایا میهرداد)، پاشای ئاشکانی سەرکەوت بەسەر دوا دانەیاندا و بووە خاوەنی وڵاتی ئەوسای ئەدیابینەکانی ئاشووری کۆن، ناوچەکە کەوتە ژێر فرمانڕەوایی ئاشکانەکان، پاشایەکی بێ نرخ، یان (ڤیتاکس)دەیبرد بەڕێوە.

ئەرمینیا لە ساڵی 83 پێش زایین، لەژێر فرمانی تیگرانی یەکەمدا بوو، شازادەی فرمانڕەوا، ئەوەی بۆ ماوەیەك بەهرەمەند بوو بە دەستەڵاتێکی گەورە، خاوەنی ئەربیلا و ئادیابین بوو، بەڵام دوای 10 ساڵ لە لایەن رۆمان و ئاشکانەکانەوە کرایە دەرەوە، کە پێکەوە دژی ئەم یاخی و لەخۆباییە کۆبوونەوە، لەژێر فرمانی رۆمان و رۆمان- ئاشکانی ناوچەی ئادیابین لەبرەودا بوو، ناوچەکە لەبەرئەوەی دەوڵەمەند بوو، هەمیشە چاوی رۆمانەکانی لەسەر بوو، بۆ ئەوەی بەتەواوی دەست بەسەر خۆی و پایتەختەکەیدا بگرن.

لە ساڵی 49 زاییندا، میهردات، شازادەی ئاشکانی لە هەندەران لە رۆم، لەلایەن ئاشکانەکانەوە بانگهێشکرا بۆ ئەوەی گۆدارزی ستەمکار دەربەڕێنێت، لە نەینەواوە بەرەو ئەربیل دەرچوو بۆ ئەوەی بەرەنگاری داگیرکەرەکە بێتەوە، بە هاندانی (ئازاتس)ی وەفاداری پاشای ئادیابین، ئەو بەرەنگاری گۆدارز بووەوە لە نزیك ئەربیلا و دوای شەڕێکی دوور و درێژ تێکشکێنرا، لە سەرەتاوە بڕیاریدا هەڵبێت بەهۆی ئەوەی ئازاتس و هاورێ بێوەفاکانی تری بەرامبەری کردیان.

دوای سیانزە ساڵ، لە 62 زایینی، تیگرانی پێنجەم، پاشای ئەرمینیا، کە لەلایەن (ئیمپراتۆر نیرۆ)وە دانرابوو، دەوڵەمەندی ئادیابین سەرنجیڕاکێشابوو، بۆیە کە پاشای ئاشکانی (ڤۆلۆگاسێس)ی

یەکەم لەوێ نەبوو، هەوڵیدا داگیریبکات، بێبەختانە خەڵکی دوچاری ئازار و ئەشکەنجەیەکی زۆر کرد، کە سکاڵایان نارد بۆ (ڤۆلۆگاسێس) و هەڕەشەی ئەوەیان دەکرد بۆ ئەوەی ئاشتی بۆ خۆیان بەرقەرارکەن، ملکەچ دەبن بۆ رۆم. پادشای ئاشکانی بە پەلە و بێ دواکەوتن وەڵامی ناردەوە و فرمانی جەنگی دژی ئەرمینیا و رۆم دەرکرد و (مانوباز)ی پاشای ئادیابینی دیاریکرد، کە سەرکردەی سوپایەك بکات، کە تیگرانی دەرکرد و وڵاتەکەشی داگیرکرد.

لەم کاتەوە ئادیابین بوون بە بڕبڕەی ناکۆکی تا پێرشا هەستا و وەك یەك دای بەسەر ئاشکانی و رۆمانەکاندا، بۆ بەدیهێنانەوەی ئیمپراتۆریای ئاری بۆ جارێکی دی.

لە 115 زایینیدا ئیمپراتۆر تراجان ولایەتەکەی داگیرکرد، کە پاڵەوانانە بەرەنگاریی کرد، بەڵام (هادریان)ی خەلیفەی لەتوانایدا نەبوو راگیریبکات، دوای دوو ساڵ رادەستیکرد، سەڤەروس، یەکێ لە مەزنەکانی ئەو دواییەی رۆمانەکان بوو، ئارەزووی ئەوەی دەکرد کە تۆڵە لە ئادیابینەکان بکاتەوە، ئەوانەی کە گەورەترین کێشەیان بۆ دروستکردبوو بەهۆی یارمەتی ئەوانەی دژی ئەم هەڵسابوون، وڵاتەکەی داگیرکرد، بەڵام (ڤۆلۆگاسێس) لە 196 زایینی ئەوی کردە دەرەوە. (سەڤەروس)، بەهەرحاڵ، ساڵێ یان دوو ساڵ دواتر دوا هەوڵیدا و ئەم جارەیان ئادیابینی خستە سەر ئیمپراتۆریای رۆمان، ئیدی مافی ئەوەی هەبوو کە نازناوی (ئادیابینسوس)ی پێبدرێت، کە لە 193 زایینی بەر لە کاتی خۆی دەستی بەسەردا گرت.

ئەربیل لەژێر فرمانی رۆماندا بەهۆی یەك (کارکولس)ەوە دوچاری نەگبەتی و سەغڵەتی و پێشێلکاری بووەوە، کە لە هێرشکردنە سەر بابل لە 216 زایینی گەڕایەوە، ئاشکانەکانی تێکشکاند و شوێنی پاشایی تێکومەکاندا و لاشەکانی راکێشانە دەرەوە و لە دوورەوە فڕێیدان.

ئەوە بەو جۆرە، بەڵام 10 ساڵ زیاتر لەژێر فرمانی بێگانەی ستەمکاردا، بۆ ئەردەشێری فارسی، بنەماڵەی فرمانڕەوا ساسانیەکان رزگاریانکرد، هەموو رۆمان و ئاشکانی لەوێ و لە زۆر خاکی تر دەرپەڕاندە دەرەوە.

لە سایەی فرمانی ئەو پاشا رۆشنبیرە هاوچەرخەی فارسی زەردەشتیەوە، مەسیحیەکان پێشکەوتنێکی گەورەیان بە دەستهێنا لە رووی پاراستنەوە، ئادیابینیش لە 500 زایینیدا، ئارامگای قەشەکانی مەسیحی بوو، لەگەڵ موسڵ و ئەربیلیشدا، کە پەرستگای عەشتاری لێیە، دوای ئەوەی بۆ دوو هەزار ساڵە دەپەرسترێت، کەچی زۆر بە خێرایی ناوبانگی خراپی زڕا.

لە سەدەی حەوتەمدا، ئاپۆرایەك لە بیرتەسك و دڕندەكانی عەرەب كولتووری پێرشایان دوورخستەوە، كە زۆر بە خێرایی ڕەنگ دەگرن لەگەڵ مەسیحیەتدا و ئەربیلا و ئادیابین كەوتنە ناو ئەو قولاییانەوە، كە زۆر لە شارە گەورەكان و ناوچەكانی تێدا نوقم بووە. بەهەرحاڵ، ئەربیلا ئەوەندە گرنگ بوو تا وەك یەكێ لە شارە گەورەكان ناو ببرێت، كە لەلایەن مەغۆلە دڕندەكانی هۆلاكۆ خانەوە لە سەدەی سیانزەیەمدا داگیر و وێرانكراوە. خۆشبەختانە پاشماوەی پەرستگاكەی عەشتار و شارە كۆنەكە لەژێر خاكدا داپۆشرابوو، ئەو كاتە سپێرابوون بەوە، لە ئەنجامدا سروشت دەبووایە پارێزگاری لێبكردایە بۆ پشكنینی ڕۆژئاواییەكان، لە چنگی پڕ لە وەیشومەی مرۆڤ، كە نە ڕێز لە مۆنۆمێنتی خوا و نە لە مۆنۆمێنتی مرۆڤ دەگرێت.

لە میانەی سەدەكاندا كوردەكان، كە زۆر لە میللەتانیان كردۆتە دەرەوە، شارەكەیان داگیركردووە، كە هێشتا شارێكی زۆر گرنگی ناوچەكە بوو، هەروەها زمانی كوردی ئەوەندە بەهێزە، بەهەرحاڵ، لە زۆر لەو شوێنانەی خەڵكەكەشی هەمان ڕەگەز نەبوون بەزۆر زمانەكە ڕەنگیدایەوە لەناویاندا و هەروەك سلێمانی كە خەڵكەكەی تێكەڵەیە ئێستا بەخۆیان دەڵێن كورد.

وەك ئەوەی كە لە شەوەزەنگا چووینە ناو ئەربیلەوە و لە بەرەبەیانیەكی تاریكیشدا بەجێمان هێشت، مەودای ئەوەم نەبوو لایەنی هاوچەرخی ببینم، بەڵام ئەو گردەی كە چەند میلێكیش لێی دووركەوتبووینەوە لە دەشتێكی تەختا هەر بەدیدەكرا. لە سەعات چواری بەیانیەوە دەستمانكرد بە ڕۆشتن، لە پاشنیوەڕۆیەكی درەنگدا گەیشتینە ئاڵتون كۆپری.

لەم شارۆچكەیەوە بۆ باكور، دەشتەكە گردۆلكەی نزمی لێدەردەكەوێت، لەم كاتی ساڵەدا دۆڵەكان پارچەیەكن لە گوڵ و گوڵزار، بەڵام باران جارێكی تر ڕێی پێگرتینەوە، بۆیە لە باخچە جوانەكان تێپەڕین بۆ دەرەوەی شارۆچكە گچكەكە. لێرەدا زابی خواروو لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا دەشتە دەبڕێت، سنووری ئاشووری ڕاستەقینە و ئادیابینی ئەم دواییە دەكێشێت. ئاڵتون كۆپری، بەبێ هیچ مێژوویەكی دیاریكراو دەكەوێتە سەر دورگەیەك لەنێوان دوو لقی ڕووبارەكە. لە باكورەوە بە پردێكی درێژدا دەچیتە ناوەوە لەگەڵ پێچكردنەوە بەلای ناوەندا وەك ئانیشكێك. گەیشتن بە دەمی چوونەژوورەوە، یەكێك لە كونێكی دیوارەكەوە دێتە دەرەوە و هێسترەكان دەبژێرێ و پسولەیەك دەدا لەبەرامبەر باجی وەرگیراودا، كە ئەو پسولەیە ڕێ بە گەشتیار دەدات بەسەر پردەكەدا بڕوات بۆ بەشی باشوور بێ ئەوەی پارەی زیاتر بدات. ناوچەكە بێ ئەندازە بەجوانی لەسەر دورگەكەی ڕاوەستاوە، دیواری خانووەكان لەژێرەوە بە بەرد بیناكراوە، كە شێوەیەكی توندتۆڵی دەداتێ.

# بەرەنگاربوونی ئێرانیەك

یەك شەقامی دوور و درێژ بەناو شارەکەدا دەڕوات، کە لەناو عەرەبەکاندا بە رووبار و لە بەغداش بە گونتارا (قەنتەرە) رۆشتووە، واتە (پردەکە).

بازارێکی بچووکی تیایە، نیوەی باری درێژیی شارەکەی گرتۆتەوە، کە شوێنی داوە بە قاوەخانە و چایخانە لە خوارەوە. ئینجا سەربازگەکان دێت، کە زۆر جار چەند سەربازێکی تێدایە و لەکۆتاییەکەشدا نوسینگەی تەلەگرافی لێیە، کە کەسێك دەتوانێ لەوێوە بچێت بۆ چایخانەیەکی گەورەتر و پیادەڕەو بۆ سەر پردەکەی کە ناوی (پردی زێڕین) یان ئالتون کۆپری لە شوێنەکە نراوە.

دەبوایە ناوی (پردی گابڵ) (واتە جەمالۆن)ی لێبنرایە زیاتر شیاوتر دەبوو، بۆ چوونە سەری یان دابەزینی مەحاڵە، ئەسپ و هێستری بارکراو دەبێ زۆر بە وریای پاڵی پێوەبنرێت و ڕێنمایی بکرێن لە لێژگایە خلیسکەکاندا.

وەك نمونەیەکی ئازایانەی تاقیکردنەوە لە پردا شێوەکارێکی زۆر بەرزە و شێوەکەی نائاساییە، دەبێ زۆر سەرنجی بیناسازەکەی راکێشابێت کە ناوی (پردی زێڕ)ی لێناوە، کە لاوازترینە و بەردەکانی نەسازاون و گەچ و قسڵیان لەنێواندا نییە. دواتر زۆر شتی ترم لەبارەی شوێنەکەوە دۆزییەوە، بەڵام لەم دەرفەتەدا راستەوخۆ بەوێدا تێپەڕین و رەهێڵەی باران هاتەخوارەوە بەسەر بارەکاندا لە گۆڕەپانێك لەنێوان هەندێ خانودا لە کەناری باشووریی رووبارەکە. هاوەڵەکانم بۆ حەوانەوە چوونە چاخانەیەکی بچکۆلەی نزیك ئەو ناوە و منیش ژوورێکم لە گۆشەیەکی گۆڕەپانەکە پەیداکرد کە لەلایەن دەروێشێکەوە بەکاردەهێنرا و کاری جۆلایی دەکرد، کە لەم هەرێمەدا کارێکی نەناسراوە. ئەم ژوورەی ئەو پەسەندیکرد کە پێکەوە تێیدا بژین ئامۆژگاری لەبارەوە کردم کە زۆر نزیکی دەرگاکە دانەنیشم، چونکە جارجارە دەکەوێتە خوارەوە. هەروەك من لە ناوشار بووم و سەرویەستێکی کوردانەم لەسەردابوو، کە باران تەڕی کردبوو، هەروەها زۆر سەنگین ببوو، بۆیە ناچار گۆڕیم بە فێستەکە، ئەوەش نازناوی (ئەفەندی) لەلایەن دەروێشەوە پێدام، بەڵام پێش ئەوە یان (برا) یان (ئازیزەکەم) بوو، لەسەرو ئەوەشەوە ئەو خۆی بە منەوە سەرقاڵکردبوو، بە کوردی لێیپرسیم کە بۆ کوێ دەچم. لەدوایدا ئەو لەناو هەناسەی دوکەڵی ئاگرێکدا راوەستابوو، بە زەردەخەنەوە بە زمانی فارسی کەوتە دوان. چونکە وشەیەك یان دوو وشەی فارسی گوێ لێبوو کە بەکارم هێنابوو لە کوردیەکەدا. بە گوێ لێبوونی لە فارسیەکەم شارەزایی لە زمانەکاندا دەرکەوت و

سوور بوو لەسەر ئەوەی کە من شیرازیم و بۆ ئەو دڵنیابوونەشی وشەی (ئەفەندی) گۆڕی بە (ئاغا) کە لە زمانی فارسیدا شێوەی ڕێزە لە قسەکردندا. نە ئەوانەی خستە ناو وردەکاری مەسەلەکانەوە، هەستا و دەستەکانی خستە ناو دەستی خۆیەوە و هەردوو لا ڕومەتی ماچکردم و هاواریکرد، (بە حەقی ئەمیرول موئمینین چەشمم ڕەوشەن شود ڤە ڕوزگارم بێ غوربەت خوش !) واتە (بە حەقی ئەمیر المونمینین [29] چاوەکانم ڕۆشن بوونەوە و ڕۆژیشم لەم غوربەتەدا گەشایەوە).

هەرگیز بەو شێوە ڕوونە پەیم بە واتای ئەو وتە کوردیە نەبردووە کە دەڵێت: فارسی شیرینترین زوبانە، یان شیرازی، " وشەی فارسی لە خاکی غەریبیدا باشترە لە خواردنەوەی ئاو لە بیاباندا."

دوای چەند هەفتەیەك لە عەرەبی ڕەق و ناشیرینی و ڕەقوتەقی تورکی، کوردی و فارسی هات وەك دەنگی هاوڕێیەك لەناو دوژمنەکاندا. دەروێشەکەم خەڵکی نەیشاپورە، کە زێدی عومەر خەیامە، لەوێوە بەپێ چووە بۆ مەکە و هەرچەند ئیستا سێ ساڵە، بەڵام هێشتا نەگەڕاوەتەوە، دەیەوێ وردە وردە بۆی بشێلێت، بە سەنعاتەکەشی ژیانی ڕۆژانەی دابینکردووە، ئیدی ئێستا ڕێم پێنادات جگە لە جگەرە پێکردن هیچی تر بۆ خۆم بکەم، ناردمی بۆ چایخانە و خۆشی خەریکی گسکدانی ژوورەکە و چا لێنان و هێلکە کوڵاندن بوو، هەروەها هەندێ کەشك و نانیشی هەبوو.

ئیدی چوومە دەرەوە و چوومە ناو شوێنێکی بچووکەوە کە دەرزەنێك خەڵك لەسەر کورسی بەرز دانیشتبوون، شوێنێك بەهۆی فێستەکەمەوە بۆم چۆڵکرا، من نا وەك کورد، بەڵکو بەهۆی فێستەکەوەیە، بۆم دەرکەوت کە هاوڕێکانم لەبارەی منەوە قسەیان کردبوو، منیان وەك فارسێکی شیرازی ناونووس کردبوو، بە ناوی غلام حسەین، کە تورك هەرگیز بۆی ناگیرێت، بانگیان دەکردم حسەین غلام ئەفەندی یان حسەین ئەفەندی. هاوڕێیانی گەشتەکەم دەبێ شوێن و حاڵ و ئەحواڵی منیان بڵاوکردبێتەوە. چایان بۆ هێنام و کوردێك لە تەنیشتمەوە هەستا و مێزێکی بچووکی لەبەردەمی قەتارچیەکەوە هێناو پیاڵەکەی منی خستە سەر. ئەوە کولتوورە لە تورکیا و ئاسیا و هەروەها ئەوروپاش، بۆ سڵاوکردن لە یەکێك کە تازە هاتووە دەوترێ (مەرحەبا)، لەهەمان کاتدا دەسیش بەرز دەکرێتەوە بۆ چاوەکان.[30] وەك باوە، لەگەڵ ئەوەی کردەوەیەکی ڕێز نواندنە، ئەوەش زۆر ڕاستە، کە گرنگیدانە بە کەسێکی تازە ناسیاو، بە ژمارەی ئەو (مەرحەبا)یانەی کەسی غەریب لێیدەکرێت، بڕیاری ئاستی ئەو کەسەش دەدا لەو کۆمەڵەدا، بەو بۆنەیەوە هەر هەموویان لەگەڵ

---

[29] - بڕاکەی عەلی، تەنیا لە لایەن شیعە و موسڵمانانی فارسەوە واژە دەکرێت. (امیر المؤمنین).

[30] - ئەم کارە کورتکراوەیەکە لە ئاوێتە شەپۆل، کە وەك دیارە بە لابردنی تەپوتۆزی خەیاڵاوی، دەخرێتە سەر دەم، چاوەکان و سەر.

دوو تورکیش کە بەرگی فەرمیان لەبەردا بوو، سلاویان لێکردم، منیش وەڵامی هەموویانم بە شێوەی باو دایەوە، دەستم دەخستە سەر ناوچەوانم بەرامبەر هەر یەکەیان، بەڵام تەنیا بۆ دوو تورکەکە بە دەنگی بیستراو وەڵامم بە (مەرهەبا ئەفەندم) دایەوە.

بۆم دەرکەوت کە کوردەکەی دراوسێم کەمێ فارسی دەزانی و لە تاران و کاشان بووە. ئەو خۆی وەکو کوردێکی موکریانی ناساند، خەڵکی سەوج بلاق بوو، (سابلاخ- مەهاباد- وەرگێڕ) پایتەختی موکریان، داخی هەڵنەکێشا کە چارەنووس لە خاکی تورکیادا هێشتویەتیەوە و بووە بە پینەچی. منیش لێرەدا هەستمکرد پەیوەندیەکی هەستیاری لای مەسیحی و کوردەکانی هەموو ناوچەکانی کوردستانی باشووری هەرێمی رۆژهەڵاتی تورکیا وەك یەك هەیە، ئەویش ئەوەیە کە لایەنگیری فرمان و دابونەریتی فارسین و بێزارن لە هەموو شتێکی تورکی، لەناو کوردەکاندا ئەو هەستە شێوەیەکی زۆر بەهێزی وەرگرتووە، کە وای لە زۆریان کردووە هەوڵبدەن بۆ ئەوەی خۆیان فێری زمانی فارسی بکەن و لە هەموو مامەڵەیەکدا کە پێویستی بە نووسینە بەکاری دەهێنن، هەروەها ئەگەر ناچار نەبن تورکی بەکارناهێنن.

نیوەی ئەوانەی لە قاوەخانەکەدا بوون تورکومان بوون، دانیشتوی ئاڵتون کۆپری، کە یەکێکە لەو شارانەی لە سەردەمی سوڵتانەکانی سەلجوقیدا لە سەدەکانی ناوەڕاستدا دامەزراوە و میللەتێکی باشن و شانازی بە رەگەزی خۆیانەوە دەکەن. وا پێشان نادەن کە زۆر هاوسۆزبن لەگەڵ تورکی عوسمانیدا، ئەوانەی کە ئەمان وەك بۆرەپیاو تەماشا دەکەن و قینیان لێیانە بەهۆی ئەو هەموو هەڵە بێ سنوورەی لە تورکیدا دەیکەن. زمانە تایبەتەکەیان هەمان زمانە، کە ئازەربیجان لە ئێران بەکاری دەهێنن و پێیدەڵێن تورکومان و شێوەیەکی رەقە، بە قورسی لە قورگدا گۆ دەکرێت وەك شێوازە تورکیە رەسەنەکە. دوای خواردنەوەی یەك دوو پیاڵە چا، هەستام و چوومەوە بۆ لای دەروێشەکەم، کە بینیم لەودیوی سەماوەرە تەنەکەکەمەوە دانیشتبوو، چا ئامادەیە، ژوور گسکدراوە، چەند کولێرەیەکی پەیداکردووە، قاپێکی گەورە پڕی لە دۆیە، کە بە تورکی (عەیران)ی پێدەوترێ، کە شیری مەیو تێکەڵە لەگەڵ ئاودا.

کە چوومە ژوورەوە وەك نەریتی فارسی هەستایە سەر پێ و دەستەکانی لە پێش خۆیەوە خستبووە سەریەك، دانەنیشت تا من لەسەر بەرە خەتەختەکەم جێگیربوو و داواشم لەو کرد کە دابنیشێت.

خاوەن هێسترەکەم و قادر دەرکەوتن، کە یەکێکە لەهاوڕێکانی سەفەرم، هەردووکیان کوردن. لەسەر

پلیکانەی بەر دەرگاکە دانیشتن و لەبەر ڕووناکی مۆمێك چامان دەخواردەوە. ئەو دووانە گوێیان لە من و دەروێش دەگرت، کە بە فارسی دەمەتەقێمان دەکرد، ئاشنای کردین بە سەروایەك (چەند دێڕە شعرێك) کە هەرگیز لە هەموو کوردستاندا وەرنەگیراوە.

"لاوزە لاوزە عەرەبیە

تورکی هونەرە

فارسی شەکەرە

کوردی گوزی کەرە"

شیعرە بێسەروبەرەکە واتە: " عەرەبی زمانی ئاوازە و تورکی زمانی هونەرە، فارسی وەکو شەکرە و کوردیش ناخۆشە.[31]

دەروێش و خۆم زۆر سەرقاڵی یادەوەریەکانی ئێران بووین و زیادەڕەویمان تێدا کرد، بەجۆرێ کە تەواو بیرمان چووبووەوە کە دوو کوردەکە لەوێن. دەمەتەقێکەمان ئەوەندەی خایان کە مۆمێك لەسەر دیوارە قوڕەکە توایەوە و گەیشتە کۆتایی و دەروێش لەبەر ڕۆشنایی ئاگری چیلکەوچەوێڵ جێگاکەی ڕاخست و چووینە جێگاوە، لەگەڵ دەنگی ئەو شتانەی کە ئەو لەژێر پاڵتۆکەوە دەیخوێند تا خەوی لێکەوت، زۆربەی بریتی بوون لە " بیسم الله الرحمانی الرحیم، الحمدولله رەبل عالەمین الرحمان الرحیم."

بۆ بەیانی لە خەو هەڵیساندم بە هێمنی ئەیدا بە گوێمدا و بانگی دەکردم (ئاغا، ئاغا!)، بۆ بە ئاگاهێنانەوەی خەڵکی نوستو بەشێوەیەکی جوان شێوازێکە لەناو ئێرانیاندا باوە.

هێشتا بەرەبەیان بوو، کە ئێمە بە ڕێگا دووردودرێژە بەردینەکەدا خۆمان دەخشاند بۆ دەرەوەی ئاڵتون کۆپری بەرەو کەرکوك. سێ ڕێگا لەنێوانی دوو شوێندا هەیە و بارودۆخی وڵاتەکە دەیسەپێنێت کە کاروانەکە کامیان بگرێتەبەر. لەم کاتەدا درێژەکەیان وەردەگرین، بەرەو لای چەپمان ڕۆژهەڵاتە و ناوچەی هەمەوەندی تێدایە، بە دڵنیاییەوە دوورە، بەڵام لەوێدا تاقمی کورد دەردەچن بۆ پەلاماردان. بە پێچکردنەوە بەلای ڕاستدا، نزیکەی 10 میلێك لە دەرەوەی ئاڵتون کۆپری، ئێمە دەبێ بەناو زنجیرەیەك گردۆڵکەی نزمدا تێپەڕین، کە بەنێوان دوو شوێندا دەڕوات و خۆمانی لەپاڵدا بپارێزین لەلای چەپمانەوە کە چووین بۆ باشووری کەرکوك. ئەمانە تا ڕادەیەك دوا کۆمەڵەن، کە بەرز و بەرزتر دەبێتەوە تا بەرزاییەکانی کوردستان نزیك دەبێتەوە، پاسەوانانی زنجیرەی زاگرۆس، کە

---

[31] وەرگێڕانی فارسییەکەی دوا دێڕ بەم جۆرەیە: (کوردی گوزی خەر نەست).

خۆی شوورایە بۆ زەویە بەرزاییەکانی ئێران. بەدرێژایی هەموو ئەم ڕێگایە، تا گردەکانمان خستە نێوان خۆمان و ڕۆژهەڵاتەوە، دەمانتوانی زۆر لە دوورەوە لوتکە بەفرپۆشەکانی ڕەواندوز ببینین، کە لەسەر خاکی ئێرانە. بەناو کۆمەڵەکەدا ڕێگەیەکمان دۆزییەوە، کە لە 500 پێ زیاتر بەرز نیە و بە شوێنێکی دابڕاوی داوێنەکاندا دەچێتە دەرەوە، کە لەوێدا چەند کوردێك مەڕیان دەلەوەڕاند و کەمێ خوارتر هەندێ عەرەب جۆی سەوزیان دەدرویەوە، کە زەرد دەبوون و دەسوتان ئەگەر بۆ ماوەیەکی درێژتر لێیگەڕانایە. چونکە ئێرە هەرێمێکی گەرمە، کەرکوك وەك بەغدا لەسەر هەمان دەشتە و بەدەست کەشوهەوای ناهەموارەوە دەناڵێنێ، لە میانەی چەند مانگێکیساڵدا بایەکی گەرمی سوتێنەر هەڵدەکات. بە تەواوبوونی ئەو گردانەش چووینە دەرەوە بۆ بیابانێکی تەخت کە دوور دەکشا بەرەو ڕۆژئاوا بۆ ڕووباری دیجلە و زیاتریش بۆ فوڕات و دیسانەوە زیاتر بۆ سووریا، ئاستێکی مردو دێت، کە بای گەرمی هاوین لەسەری هەڵدەکات، یان لەو شوێنەی بای بەهارێکی درەنگ کپ دەبێت و گەرمی پەیدا دەبێت و لە کاولەیەکی بێ سێبەردا ئەتبرژێنێت. لە کەرکوکەوە چوار سەعات، ئەو باخانەی کە وەك هێڵێکی تاریك لەسەر ئاسۆ دیارە، بەلای شوێنەواری کاروانسەرایەکدا تێپەڕین، کە هاوڵاتیەکی کەرکوکی بەسواری کەرێکەوە، دڵنیایکردمەوە لەوەی کە پاشماوەی خانێکە لەلایەن شاە عەباسی فارسەوە 300 ساڵ لەوەبەر بنیاتنراوە. لە هەندێ شوێندا بەدرێژایی ڕێگاکە گەنم ڕوواوە، بەڵام تابورێ لە کوللەی ڕەشی بچووك ڕێگاکەیان داپۆشی بوو، لەگەڵ ملیونەهاش قونەکەرەکانیان، کە وێرانکاریان دەهێنا بەسەر لاسکە ناسك و تازە پێگەیشتوەکانی دەغڵەکاندا. لەسەرو ئەوەشەوە، ئێمە سەغڵەت بووین بە بینینی هەندێ دەواری ڕەش، شوێنی ژیانی دەشتەکی و دڵنیا نەبووین لەو دوو ئەسپ سوارەی لە پێچێکی دەشتەکەدا دەرکەوتن. بە شێوە و جلوبەرگیان کورد بوون، بەڵام بەدرێژایی ڕێگا بەردەوام بە عەرەبی دەدوان، کە لەوانەیە بۆ شاردنەوەی دیالێکتەکەیان بێت. لە هەمان کاتدا لەوەش دەترساین کە هەمەوەند دەرچن، یەك دوویەك لە ئێمەش تفەنگی ساچمەیان پێبوو، بەڵام یان گویان لێبوو یان هێماکەیان بینیوە کە لە گردەکانەوە دەپەڕینەوە، بۆیە کوتوپڕ غاریان بە ئەسپەکانیان کرد و لەناو بەرزاییەکاندا دیارنەمان. ئێمە تەواو لە کەرکوك نزیك بووبووینەوە، ڕێگەیەکی کورت و یەکێکی درێژ هەبوو، کە چووینە دوو ڕیانەکەوە، عەرەبێکیش، کە لە ئاڵتون کۆپریەوە بە ڕێگا کورتەکەدا هاتبوو، پێیوتین ئەو دوو ئەسپ سوارە چەتە بوون، ئەو بەیانیە لەناو گردەکاندا کاروانێکیان تاڵان و ڕوتکردۆتەوە.

# گەیشتن بە کەرکوک

لەوە دەچوو ئەوە تیمێك بوویێت لە هەمەوەندەوە دەرچوون بۆ پشکنین، رۆژێك لە رێگا درێژەکەدا و رۆژێکی دی لەسەر رێگا کورتەکە، ئێمەش بەخت یارمان بووە کە ئەمڕۆ بە رێگا درێژەکەدا هاتوین، کاتێ ئەوان لە شوێنێکی تر سەرقاڵ بوون. کەرکوك، کە دەکەوێتە کۆتایی ئەو زنجیرەیەوە، دەرناکەوێت تا تەواو لێی نزیك نەبیتەوە، بۆ پێداویستیم ناچاربووم زۆریکەم تا بەلای سەرچاوەیەکی ئاودا برۆین، بەناو رووبارەکەدا دەرۆشتم کە (نیوەی ساڵ وشکە) و تەواو شاراوەیە بەهۆی گردۆلکەکانی دەوروبەریەوە، جگە لە لای رۆژهەلاتەوە کە خاکەکە وردە وردە لێژە بەرەو ئەوێ، کەرکوك گردێك، یان قەلایەك لەناوەندیدایە، کە بەشێکی شارەکەی لەسەر بیناکراوە، ئەوی تریشی لە دەوروبەری باشوور جێگیر بوون. چووینە ناو گوندێکی تەریکەوە، بەناو باخەکاندا تێپەڕین بۆ پاسگایەکی گەورە کە جێگای نیشنگە بوو، ئینجا بەلای ریزێك قاوەخانەدا رۆشتین کە پڕ بوو لە خەلکی بێکارە و خەلکێکی نیزامی. بەسەر پردە بەردینە درێژەکە و پێچکردنەوە بەلای راستدا نوقمدەبووی لە پەستی و دلتەنگی کەوانەیەکی کورتی بازاڕێکی سەیری بەرز و پاندا، دیسانەوە بۆ دەرەوە شەقامێکی جەنجالی درێژی خاوێن و کاروانسەرای نوێ. ئەمە لەوەدەچێ لە شارەکانی میسۆپۆتامیا خانی زۆرتری تێدابێت، ئەوەش لە سروشتی ئاوێتەوەیە، کۆڕەپانێکە ئەستەبڵ بەدەوریدا و دەشتوانی باشترین شوێنی مانەوەت هەبێ، لە کاتێکدا ژوورەکە لە سێ لاوە نزیکە، نهۆمی سەرەوە هەردوو جۆر لە گەشتیارانی کاتی و نیشتەجێکانی تێدایە، کە غەریبن و بێ ماڵ و ژنن. دەروازەی هاتنەژوورەوەی ئەم کاروانسەرایە لەنێوانی دوو قاوەخانەی گەورەدایە، لە بەشی پشتەوە گۆڕەپانێکی هەیە و لەسەر ئەو دالانە دووردرێژەی ئۆفیسی شارەوانی و بریکاری ئامێری درومانی مارکەی سینگەری تێدایە، کە پێداویستیەکە دەگاتە دوورترین شوێنی کوردستان.

ئەو ئۆفیسانە بە رووی تەلارێکدا دەکرێنەوە کە راستەوخۆ دەچێتەوە تەنیشت ژووری گەشتیارەکان.

کەرکوك بە تورکومان و میوە و نەوتی خاو بەناوبانگە، هەمووشیان زۆرن. شارەکە دەبێ بەلای کەمەوە 15000 کەس دانیشتوانەکەی بێت، یەکێکە لەو شارە سێ شێوە زمانەی سنووری کوردستان، کە تورکی و عەرەبی و کوردی لەلایەن هەموو کەسێکەوە قسەی پێدەکرێت، تورکی و کوردی زیاتر لە بازاڕدا بەکاردەهێنرێت. خۆی شارێکی تورکومانیە، بۆ باشوور و رۆژئاوا عەرەبی دەشتەکین و بۆ رۆژهەلاتی ولاتەکە کوردە هەمەوەندەکانن. دەستەلاتی تورکی لێرە زۆر بە روونی دیارە. نزیکی لە بەغداوە (حەوت رۆژ رێگەیە) و دانیشتوانەکەی کە بە تورکی قسەدەکەن،

ژمارەیەکی زۆر لە لاوەکانیان لە قوتابخانە سەربازیەکانن، کە دوای ئەوەی پەروەردەیەکی ناتەواویان دەکەن، بە بێکارەیی و تەمەڵ و تەوەزەل دەریاندەچێنن و ناتوانن بەبێ بەرگە فەرمیەکانیان ژیان بەسەربەرن. لەئەنجامدا هەموویان جۆرێ لە پۆست وەردەگرن، بروسکە، پۆلیس یان گومرگ، یاخود پەیوەندی دەکەن بە ریزەکانی سوپای یەدەکی سەربەخۆوە (ئەفسەر) و دەگەڕێنەوە بۆ شارەکەی خۆیان و بۆ پەیوەندیکردن بە چایخانەکانەوە و پەیداکردنی قوتی ژیانیان بەهۆی ئەو ئاستی فەرمیەی هەیانە بە زۆرەملی و چەوسانەوەوە. لە ئەنجامی ئەوەدا کەرکوك پڕە لە بەرگی فەرمی کە بریتیە لە گەندوگوی شارەکە، ئەو دڕندانە زۆرجار سەرخۆش و شەڕانین و ژیانی شوێنەکە تێکدەدەن و هەموو کارێکی سوکایەتی دەکەن بۆ پەیداکردنی قوتی ژیانیان، چونکە بە ئاسایی هیچ موچەیەك وەرناگرن، لەگەڵ ئەوەشدا پۆلیسێکی زۆریش هەیە، من هەستم بە سەغڵەتی نەدەکرد، لەوانەیە جەنجاڵی ئەو ئاوێتە و تێکەڵاوییەی بازاڕی کەرکوك وا لە خەڵکی غەریب بکات دیار نەبێت و زۆر گرنگی پێنەدرێت.

ئەندازیاری بیناسازیی شوێنەکە عەرەبی پەتیە، شێوازی ئێرانی کاریگەری بەرچاوی هەیە لەسەر بەغدا و موسڵ و دیاربەکر و زۆر شاری تری میسۆپۆتامیا و سووریا، کە لێرە ڕەچاوناکرێت. توندوتۆڵی بیناسازی بەبەردی ڕەق هیچ جوانیەکی تێدا نییە، ژمارەیەکی کەم مزگەوت و منارەکان، زۆر توندوتۆڵن، بەڵام هیچ نەخش و نیگارێکیان تێدا نییە و تاقی کەوانەیی بازاڕ، هێمای بیناسازییە بۆ ناوچەکە. دانیشتوانی تورکومان، یان ڕاستر بەشی بازرگانەکەی، زۆر بە باشی هاوشێوەن لەگەڵ خەڵکی بەغدا و موسڵ. غەریب بە چاوێکی مەزن تەماشا دەکرێت و چەپ و ڕاستیان لێناکرێ و ناشیاخەڵەتێنن و سەغڵەتیان ناکەن، بەچەشنی عەرەبەکانی شارە گەورەکان. خواردن و شتی تر کڕین لە بازاڕدا، بۆم دەرکەوت لە هەموو شوێنێك ڕاستگۆیی و نێت پاکی دەبینی و دڵی غەریب بەلای خۆیاندا رادەکێشن، کە من لە ڕاستیدا وەك فارس و موسڵمانێکی شیعە چوومەتە ناویان، کە ئەوانەی سوننەن هاوسۆزیەکی زۆر کەمیان هەیە.

من دەتوانم نمونەیەك بهێنمەوە کە ئەو میوانداریە چۆن بەو جۆرە نایەبە بەزۆری دەرکەوتووە.

چەند ڕۆژێ دوای ئەوەی کە من گەیشتمە ئەوێ، ڕوانیم بنی پێڵاوەکەم شەقەی دێ کە دەڕۆم بە ڕێگادا، بۆیە چووم بۆ دوکانێك لە بازاڕ کە پێڵاوی بەغدادی دەفرۆشت تا چاکی بکەمەوە. جوتێکم هەڵبژارد و کەوتمە مامەڵەکردن، بەڵام نرخی گونجاوی خۆیم نەدەزانی، تا ڕادەیەك سەرم لێشێوابوو بۆ دیاریکردنی بەرزتر لە نرخەکەم.

## خەڵکی کەرکوك

خاوەن دوکان داوای دوو مەجیدی یان 40 قورِۆشی دەکرد، بۆیە منیش سەرەتا 18 قورِۆشم دایە و وردە وردە زیادم کرد تا 22 قورِۆش، کە نزیکەی نیوەی نرخەکەی خۆی بوو، ئیدی رازیبووم و وتم نرخی خۆیەتی، مەجیدیەکم دایەو دەستمکرد بە گیرفانمدا و دەگەرِام بۆ دوو قورِۆشەکەی کە مابووی، خاوەن دوکان دەستی درێژکرد و وتی: مەجیدیەك نرخی بنەرِەتی خۆیەتی و تۆ کەسێکی غەریبی، ئەی پێغەمبەرەکەمان ئامۆژگاریمان ناکات کە رێز لە غەریب بگرین؟ لەبەرئەوە پێڵاوەکان هەڵگرە، من یەك مەجیدی زیاتر وەرناگرم، بۆ خەڵکی کەرکوك نرخەکەی 25 قورِۆشە، بەڵام قازانجی گەورە لەنێو خۆماندا کێشەیە نییە، من تەنیا مەجیدیەك لە تۆ دەسێنم و هیوام وایە کە کەرکوکت جێهێشت بیرەوەری جوان و باشت هەبێت.

ئەو هەستەم لە هەموو شوێنێکی ناو کەرکوکدا بینیوە، جگە لە مەسیحیەکان، بەڵام ئەوە سروشتیە، چونکە من بەرگی موسڵمانم پۆشیوە، دواتر دڵنەوایی مەسیحیشم بۆ مەسیحی غەریب لەناو شارەکەدا بینی.

لەگەڵ تورکومانەکان و موسڵمانەکانی تردا ژمارەیەکی زۆر کلدانی و مەسیحییە سریانەکانی خەڵکی بەغدای تێدایە. هەروەها ئەرمەنیەکی کەمیشی لێیە، لەکاروباری میری و بازرگانیدا کاردەکەن، بەڵام دانیشتوی بنچینەیی دیاریەکر، یان ئەرمینیان. نیشتەجێبوونی کلدانەکان دەگەرِێتەوە بۆ دەورانی چەرخە کۆنەکان، کۆچیان کردووە بۆ ئێرە، بەپێی دابونەریتی تایبەتی خۆیان، لەسەردەمی ئەلپ ئەرسەلان، لە سەدەی یانزەیەمدا. ئەگەر کەرکوك وەك خەڵکەکەی دڵنیان، پاشماوەی مەلیکەکانی سەلجوقی بێت، ئەوە لەوانەیە یان دەشێ وابێت. بەپێچەوانەی کلدانەکانی موسڵەوە، کە پیتە سریانیەکانیان لەبیرنەچۆتەوە، لەهەمان کاتدا خۆیان تەنیا بە تورکیش دەدوێن و ئەو پیتانەشیان لەنێو خۆیاندا خستۆتە نووسینەوە، تەنیا ئەو کلدانانەی کە لەناو کوردەکاندا دەژین پارێزگاریان لە زمانی نووسین و قسەکردن کردووە. لە موسڵ ئەو بەشەی لە ئاستی پەروەردە و فێرکردنی باشدان ئەوە دەیزانن، بەگشتی بۆ هەمووان بەکارناهێنرێت و ئەگەر بتەوێ گوێت لەو قسەکردنە بێت دەبێ بچیت بۆ گوندەکان. کەنیسەیەك لە کەرکوك هەیە، کە لەلایەن پریسانی خەڵکی موسڵەوە سەرپەرشتی دەکرێت، کلدانەکان، وەکو هەموو ئەوانەی لە خاکی تورکیادان، ئەوانە کاسۆلیکی رۆمن، سەر بە کەنیسەی کلدانی کۆنی وێرانبوو لەژێر هێرشە بێ ویژدانیەکانی کە کاسۆلیکەکانی رۆمان کردیانە سەری، ئەوانەی پەیرِەوی سیاسەتی

میکاڤیلییان دەکرد لە هێنانە ژێر باری کەنیسەی کۆن و ملکەچکردنیان لەژێر دەستەڵاتی پاپادا، ئەوەش گۆڕانێکە، کە بۆ هیچ بوو، بەڵام خراپتر.[32]

لە کەرکوکدا ئەوان بەهرەمەندن بە سەربەستیەکی گەورە لە چەوسانەوە، لەگەڵ بوونی هەوڵێکی ناوبەناو لەلایەن پیاوانی ئاینی موسڵمانەوە بە هاندانی هەستی دوژمنایەتی لە دژیان. بوونیان زۆر پێداویستە بۆ بەرژەوەندی شارەکە، خوێنڕشتنیش هیچ شتێ نابەخشێ جگە لە کارەسات بەگوێرەی بازرگانە موسڵمانەکانەوە، بەڵام ئەوان بەرگەیانگرت بەهۆی بڕواکردن پێیان و قەرزدانی بڕێك پارەی زۆر پێیان، بەم جۆرە سیفەتە راستگۆییە و توانای بەدەستهێنانی پەیوەندی ئاشتیانە لەگەڵ موسڵماناندا بەبێ ئەوەی وەك مەسیحیەکی کەللە رەق هەڵسوکەوت بکەن، ئەوان زۆر بەزۆرەملی بەراورد دەکرێن لەگەڵ ئەرمەنیەکان و سریانی و مەسیحیە عەرەبەکان.

تەنیا بەهۆی سەرومێزەرەکەیان و قۆڵی کراسەکانیانەوە جیادەکرێنەوە، لەبەرئەوەی کراسێکی خەتخەتی دەڵبی بێ قۆڵ لەبەردەکەن کە درێژبۆتەوە بۆ پاژنەکانی پێ و چاکەتێك بە چەشنی چاکەتی پیادەی نزامی فەرەنسی لە جەزائیر، یان "سەڵتە"، کە بەهەرحاڵ، نەخش و نیگارکاریی لە زێڕ و زیو پێوە نییە وەك کوردەکان دەیکەن.

قۆڵی کراسەکانیان بەدەوری مەچەکییاندا دەبەستن و لە قۆڵە درێژەکانی چاکەتەکانیانەوە شۆڕنابێتەوە، لەکاتێکدا سەروبەستەکانیان بریتیە لە دەسماڵێکی شین بەدەوری کڵاوێکی دەڵبی تەختدا، کە لەسەردا چەسپ دەکرێت، نەك وەکو عەمامەی پیاوانی ئاینی موسڵمان، قیت ناوەستێت.

تا ئەم ساڵانەی دوایش هێشتا هەر لە جلوبەرگی زەردی کاڵی خەتخەتدا دەبینرێن، بێگومان لەبارەی هەڵبژاردنی رەنگەکەوە لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا لەلایەن خەلیفەی بەغداوە سەپێنراوە بە سەریاندا، کە هەموو ئەو بێباوەڕانە دەبێ بەرگی جیاواز بپۆشن، بەناسایی رەنگی هەنگوینی.

لە کەرکوکدا کۆچنشینێکی زۆری جولەکەی لێیە، یەکەم میوانداری لەو نەژادە کە لێرەوە دەرچووە بەرەو رۆژهەڵات لە رێی کوردستانەوە بۆ سنەی کوردستانی ئێران و هەمەدان.

---

[32] - ئەوەکو ئەم وتەیە بێبەڵگە بێت، تکاکاریم کرد بۆ پشتگیری وتەکەم لەلایەن رای کلدانەکان خۆیانەوە. ئەوان لەزۆربەی حاڵەتەکاندا تەواو ناگادارن لە بارودۆخەکانی کە پێشینەکان- و هاوچەرخیش- لەلایەن کەنیسەی کاسۆلیکە رۆمانەکانەوە وەریانگرتووە، ژمارەیەکی کەمیان گوێم لێبوو سۆزیان لەسەر مەسەلەکە هەبوو، هەروەها زۆر بەداخەوە بوون، لەوەش زیاتر ئەوان ئێستا دەزانن کە دەکرا ئەو پەروەردە نایابە وەرگرن کە کاسۆلیکە رۆمانیەکان دەیانگەیاند بەبێ هەڵوەشاندنەوەی کەنیسەکانیان، ئەوەم لە سەرۆکی قەشەکانی کانتربەرییەوە وەرگرتووە.

وا هەستدەکرێت کە ئەوانە، لەوانەیە راستەوخۆ لەو جولەکانەی سێیەم دیلیەتیەوە شۆڕبووبێتنەوە،[33] ئەوانەی نەبوخەزنەسر بردنی بۆ بابل لە سەدەی شەشەمی بەر لە زایین، یەکسەر دوای روخانی ئیمپراتۆریای ئاشووری. ئەوان پیتەکانی ئارامی بەکاردەهێنن و لە کوردستان بە هیبرو قسەدەکەن، ئەوەی سەرنجراکێشەرە ئەوەیە، کە کلدانەکانی سنە لە کوردستان و جولەکەکانی هەمان شوێن، لەگەڵ ئەوەی هەر یەکەشیان پاشماوەی قۆناخێکی جیاوازن، کەچی کوتومت هەمان دیالێکتی سامی کۆن قسەدەکەن و بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە، ئەگەر پێویست بە بەڵگە بکات کە سامی بنەڕەتی کلدانیەکانە.

لە کەرکوک، وەك هەموو کوردستان، کاری سەرەکی دانیشتوانەکەی کۆتاڵ و وشکە فرۆش و بازرگانەکان، بازرگانی لۆکە و قوماش و نەخشکردن بەتەواوی لە دەستیاندایە، لە راستیدا برا موسڵمانەکانیان لە بەغدا تا ئێستاش بەردەوامن، کە لۆکەی کوردستان لە مانچستەرەوە دابیندەکرێت لەلایەن جولەکە بەغداییەکانی کە لەوێ نیشتەجێن.

بەو شێوەیە کەرکوك کۆمەڵەیەکە لە نەژادە رۆژهەڵاتیەکانی تورکی- جولەکە، عەرەب، سریانی، ئەرمەنی، کلدانی، تورك، تورکومان و کورد و لە ئاکامی بوونی سەربەستی لە کوێرباوەڕی، لەگەڵ ئەوەی کە حاکمێکی تورکی بەهێز فرمانڕەوایان دەکات، کە تەواو هێزی سەربازی هەیە بۆ پارێزگاری لە دەستوور لە هەموو رەگەزەکان. کوردەکان تەنیا یەك بەشی سەربەگۆیەندن لەناو دانیشتوانەکەدا، لەگەڵ بوغزاندنی هەموو حوکم و دەستوورێك کە لە گەورەپیاوانی خۆیانەوە دەرناچێت. بێبەختانە ئەو بارودۆخە لەبار و نایابە میلێك یان دوو میل زیاتر ناچێتە دەرەوەی شارەکە، کە عەرەب و کورد دەخولێنەوە بەخواست، بەرەنگاری هەموو دەبنەوە.

لە بازاڕەکاندا جار جارە کەسانی رەشتاڵە دەبینیت، زۆر رەق، بە دیالێکتێك قسەدەکەن، کە تەنیا گەشتیارانی باشووری رۆژئاوای ئێران دەزانن چییە، ئەوانە فەیلیە لوڕییەکانن، ژێردەستەی فارس، ئەوانەی بوونیان لێرە داوای دانانی قونسڵی فارس دەکات، ئەو کەسە زۆری لە خۆی کرد بەم شێوەیەی لای خوارەوە من بناسێت:

---

[33]- "لە ساڵی سێیەمی فرمانڕەوایی یەهویاقیم پاشای یەهودا، نەبوخەزنەسری پاشای بابل هات بۆ ئۆرشەلیم (قودس) و چواردەوری گرت و خواوەند یەهویاقیم پاشای یەهودای دا بە دەستیەوە لەگەڵ بەشێکی لە قاپوقاچاخی ماڵی خوا، ئەویش هەڵیگرت بۆ سەرزەمینی شەنعار." دانیاڵ 1. 1=2

# کۆنسوڵی ئێران

بەردەوام لە چایخانەکەی لای کاروانسەراکەدا، لە ماوەی ئەو چەند یەکەم رۆژەی مانەوەم، وەك فارسێکی خەڵکی شیراز ناسرام و هەروەك ئەوەی کە خەڵکی ئێران دەگمەنە لە کەرکوکدا، قونسڵ بەخێرایی ئەمەی بەر گوێ کەوت.

رۆژێك کوردێك کە نیشانەی شێر و خورشید بە ستارەکەیەوە بوو چاوەڕێی دەکردم، بەڵام نیشانەیەکی تری ئۆفیسەکەی پێوە نەبوو وەك کارگوزارێکی کۆنسوڵێت. داوای پاسپۆرتی فارسیی منی کرد، منیش نەمتوانی ئەوە پێشان بدەم، کە لەژێر چاودێریی بریتانیدا بووم، لەبەرئەوە من وابەستەی یاسای پاسپۆرتی فارسی نیم. نەمدەتوانی هیچ شتێك بڵێم کە ئەو دڵنیا بکەم، لە راستیدا قسەکردنم بە فارسیەکی بەو شێوە زۆر رەوانە نەفرەتییە ئەوە دەسەلمێنێت، بەڵام من سەرسەخت بووم و ئەویش لە ئەنجامدا دوورکەوتەوە.

دوای دوو رۆژ جارێکی دی دەرکەوتەوە، بەڵام ئەم جارەیان من ئامادەبووم کە ناسنامەی خۆم بسەلمێنم وەك لەدایکبوویەکی ئێرانی و لەژێر چاودێریی بریتانیدا. بۆ کۆتایی هێنان بەو مەسەلەیەی پاسپۆرتەکەم کە لە وەزارەتی دەرەوە سازاندبووم، کە ڤیزەی هەردوو کۆنسوڵێتی تورکی و فارسی لە لەندەن لێدراوە. ئەوەش برێکی دیاریکراو نووسینی بە هەردوو زمانەکە پێویستە و لەژێر هەر یەکەیاندا من بە مەرەکەبی هیندی نووسیومە، کە بتوانی دواتر بیسڕیتەوە، وشەکانی ناوی"میرزا غولام حسەین شیرازی" ئەوە لەژێر ڤیزەی فارسیەکەدا بە دەستخەتی خەتی شکستە و لەژێر تورکیەکەدا بە دەستخەتێ کە تورك بەکاری دەهێنێ. ئێستا ئەوەم بە بڕوا و سیمای سەرکەوتنەوە پێشانی پەیامبەرەکە و ئەو چەند کەسە دا کە تەماشایان دەکرد، ئەوەش دروشمی ئینگلیزی و واژۆی (سێر ئێدوار گرەی) و ئینجا لاپەڕەکەم هەڵگێڕایەوە، ڤیزەی فارسی و تورکی لەگەڵ ناوەکەم لەژێر هەر یەکەیاندا. سەرکەوتنی تەواوم بەدەست هێنا، کارمەندەکە ئاوازی دەنگی گۆڕا و بەڕەوشت بوو، کاریگەریشی لەسەر تەماشاکەران هەبوو، لەدوای ئەوەوە (مەرحەبا)ی زۆرم لە قاوەخانەکەدا لێدەکرا.

بەیانی رۆژی دواتر سەرقاڵی کەمێ درومان بووم، پاڵتۆکەم زۆر گەرم دەبوو، یان باشتر بڵێم، کەشوهەوا بۆ پاڵتۆ لەبەرکردن گەرمتر ببوو، جلوبەرگی ترم پێنەبوو، کە ئەوەندە درێژ و باش گونجاو بێت. پشتێنی رۆبە تەنکەکەم لێکردەوە و هەڵمگرت بۆ پێداویستیەك، هەندێ شریت و حەبلی

کەمەرەکەم لێکردەوە و هەندێ قۆپچەم لێنا و بەوەش بەرگێکی جوانم بەرهەمهێنا و دواتر ناوم نا (لەبادە) یان پاڵتۆی درێژ، بە چەشنی جبەی قوتابیانی ئایینی و بازرگانانی ئازەربیجان.

دوا دوگمەم دادەدووری، کاتێ لە دەرگاکە درا و کارگوزارێکی کۆنسوڵی فارس بە ملکەچییەوە لەوێ وێستابوو" دەکرێ بێیت و کۆنسوڵی فارسی لە دیدارێکی هاورێیانەدا ببینیت؟ ئەو لە کاروانسەراکە بوو، هەروەها سوور بوو لەسەر ناسینم". بەرگە نوێکەم لەبەرکرد و بە درێژایی داڵانەکە دوایکەوتم.

لە ژوورێکی سەر داڵانەکەدا بینیم، لە سەر بەشی کۆتایی فەرشێکی بچووک دانیشتبوو. خوار ئەو کە بەرامبەر لادیوارێکی درێژی نزیك دەرگاکە بوو، بریتی بوو لە کۆمەڵێکی هەمەجۆری کوردەکانی ساوج بلاق(سابلاخ، مەهاباد)، سنە، مەریوان و شارەکانی تری ئێران. مێزەرەکانیان هێمای نەژادیانی دەکرد، یەکێکی بەساڵاچوو لە تەنیشت کۆنسوڵەوە وەستابوو، کە پیاوێکی تۆکمە بوو، ریشێکی پڕ، شەرواڵێکی دەڵب و کراسێکی خستبووە ناوی، کە هەر وەکو سەربازەکانی سەر سنوور وابوو، بەڵام نیشانەی ستارەکەی هێمای بۆ موکری دەکرد. بەشێکی ژوورەکە سێ مێزی تێدا بوو، هەر یەکەیان قاپ و حەوزی مسی لەسەرە و جۆرەها خواردنی جیاواز، سینیەك پڕبوو لە حەلوای ورد، تازە لە فڕن دەرچوو بوو، فڕنێکی گڵێن لە سوچەکەدایە و پیاوێکی گەنج سەرقاڵی ئەوەیە سینیەکی تازەی پڕ لە شیرینی بۆ برژاندن بخاتە ناوی. کەللە شەکرەکان نرابوون بە دیوارەکانەوە و بە بزمار هەڵواسرابوون و مێزێکی بچووکتر نزیکی پەنجەرەکە بوتڵێکی زۆری کاری رەنگکردنی لەسەربوو، لەگەڵ کەرەسەی بازرگانی شیرینی دروستکردن. لە ناوەندی هەمووو ئەوانەدا کۆنسوڵ دانیشتووە، کە پیاوێکی سەرو ریش ماشوبرنجی توندوتیژ دەردەکەوت، لە بەرگی کوردیدایە بەڵام سەرو کڵاوێك و دەسرۆکەیەکی باریکی کوردەکانی کرماشانی پێوەیە.

چوومە ناو ئەو کۆمەڵەوە، بە ئاگاوە هەنگاوم دەنا بۆ ئەوەی خۆم بپارێزم لەو شتانەی لەسەر زەویەکەیە و هەموو بە یەك دەنگ وەڵامی (سەلام عەلەیکم)ەکەیان بە ئاوازەوە دامەوە (عەلەیکومە ئەسسەلام) و پیاوە ریشنەکە (وە رەحمەتوللە وە بەرەکاتو) شی خستە سەر.

کۆنسوڵ جێگەیەکی لە تەنیشت خۆیەوە بۆ من کردەوە و بە فارسیەکی زۆر نایاب وەڵامی سڵاوەکەمی دایەوە.

## پزیشکی فەرەنگی

کوردە تێکەڵەکەش، کە زۆر کەم تێدەگەیشتین، گفتوگۆیان لەبارەی دوژمنایەتی هەندێ تیرە لە شوێنێك دەکرد و ئێمەیان جێهێشت بۆ دەمەتەقێی خۆمان، کە پیاوە ریشنەکەش هات و دوایش دەرکەوت ئەو خاوەنی کارگەی شیرینیەکەیە و خەڵکی مەهابادی ئێرانە. هاورێ بەتەمەنەکە، حاجی رەسوڵ، دەروێشی خێڵێکی شیعەی موسڵمان بووە.

بێگومان دەمەتەقێکەمان گۆڕا بە باس و خواستی سیاسەت و هەست ئەکەم هاورێیانم بەبیروباوەڕ نەتەوەیین وەك زوربەی فارسەکانی ئەم سەردەمە، منیش دەستمکرد بە وەسفکردنی هەندێ چالاکی ئەنجومەنی لە تاران لە ساڵانی 1906-1907. بۆ ماوەیەك بە بێدەنگی گوێیاندەگرت و هیچ رایەکیان دەرنەدەبڕی، بەڵام کاتێ وێستام، کۆنسوڵ بە خرۆشێکی زۆرەوە دەستیکرد بە ستایش و لاواندنەوەی محەمەد عەلی شاە و بە زمانێکی زۆر بەهێز هێرشیکردە سەر جوڵانەوە شۆڕشگێڕیەکە، کە دەیانەوێ دەستەڵات بخەنە دەستی پیلانگێڕان خۆیانەوە، کە خەڵکانی هەڕەمەکی و بێباوەڕانن.

بەڵگەکانی بە بزماری کوێرباوەڕیدا هەڵواسراوە، وەك من دەترسم زووربەی بەڵگەکانی شاخوازان کە لەو رۆژانەدا پێشکەشکراوە لەو شێوەیەیە و هەڵچوونی پلەی گەرما بۆ بابەتەکەی ئەو ئامۆژگاریم دەکات بە شەڕی لێبوردەیی هۆشی لاوم کە دوورکەوتمەوە لە روالەتی بەڵگەکانی ئەوان، کە داوا لە پیرۆزان دەکەن تا گەواهی راستی بۆ کاری شەیتانی ئەوان بدەن. وەرگێراوێکی گونجاوی لە قورئانەوە رژاند بەسەرما، لە جاران زیاتر خرۆشاوە و لەپڕ بەهۆی هەناسەسواری و گەرماوە وێستا. منیش توانیم لەو بابەتەی دووربخەمەوە و ئەویش دەستیکرد بە باسی ژنە کۆچکردووەکەی کە بە هەندێ نەخۆشی کوشندەی ناوەکیەوە دەیناڵاند، بردویەتی بۆ موسڵ بۆ لای دوکتۆرێکی ئینگلیز لەوێ.

"ئەو کێشەیە،" ئەو وتی،" سەرچاوەی دڵەڕاوکێی هەمیشەییە بەگوێرەی منەوە، بۆیە من دڵنیانیم لەو زانستە کە خوا بڕیار لەسەر ئەنجامی کۆتایی دەدا بۆ مردنی ئەو. لە سلێمانییەوە بردم بۆ موسڵ لە کەژاوەدا و لەبەر دەرگای ئەوروپایدا دامنا لەگەڵ دیاری ئاڵتون و زیو و بوتڵێك براندی کە بەتایبەتی کریبووم، بۆ زانینت ئەو شتانە لای مەسیحیەکان پەسەندە. سۆزی جولا، چونکە پیاوێکی خێرەومەند بوو، هەرچەند کافرە، کەچی دیاریەکانی پەسەند نەکرد، ئەوی بردە ژوورەوە. چەند رۆژێکی بەو شارەزاییەی خۆیەوە لە چارەسەرکردنیدا بەسەربرد و لەگەڵ ئەوەشی شەرمە کە بە رووتی بینیویەتی و ئەو بارەشی لەسەر شانی من بارکرد، منیش هێشتا بەپێوەم، بەڵام خوا خۆی ژیانی لێ سەندەوە. من تا ئێستاش لەو بڕوایەدام کە مەرگی ئەو بەیانی نارەزایی خواوەندی

گەورەیە، هەرچەند ئەو ژنێکی موسڵمان بوو، هاوسەری موسڵمانێکە و ئەو ڕێڕەوەی بۆ چارەسەرکردنی گیرابووە بەر شیاو نەبوو."

دەستیکرد بە هێوربوونەوە، کاتێ توانیم بارودۆخی ژنی پیاوێکی ئایینی گەورەی شیرازی بۆ بگێڕمەوە، کە چارەسەری کراوە لەلایەن دوکتۆرێکی ئەوروپییەوە.

دوای ئەوە چاوپێکەوتنەکە تەواو بوو، ئەو ڕۆشت و منیش دوای ئەو، دواتر زانیم کە دانراوە بە کۆنسۆڵ و لەگەڵ ئەوەشدا کاری سەعاتچێتیش دەکات و ناوداره بە میرزای سەعاتچی، پیاوە پیرەکەش، خاوەنی دوکانی شیرینیەکە، هەندێ شتی هەبوو بیڵێت بەر لەوەی بچمەدەرەوە، بە زمانێکی فارسی لاوازی تێکەڵ بە کوردی قسەی دەکرد:

وتی: (من پیاوێکی پیرم) شارێکی زۆر گەڕاوم، لە سالۆنیکاوە بۆ بەسرە و ترابیزۆن و بۆ مەکە، بەڵام هەرگیز هەلی ناسینی فارسی یان شیعەم لە دەست نەداوە. لێگەڕێ با یەکتریمان لە یاد نەچێ، ئێمە هەردووکمان نامۆین، هەردووکمان خەڵکی ئەو خاکەین کە بە ویژدانترە لە هەموو خاکێك، کە بەزەیی و بەرەکەتی زەمین دادەپۆشێ، ئەو شوێنەی موسڵمان مامەڵە لەگەڵ موسڵمان وەك برا دەکات و نمونەی ئەم تورکە دوژمنانە نین. با لەوە زیاتر نەڕۆین، من حاجی رەسوڵم، لەگەڵ ئەوەی کوردێکی هەژارم، بەڵام باوەڕم بە ئیسلام و ئێران و کورد وەك یەك هەیە. لێرەدا بە ڕۆژ کاردەکەم و شەوانە بە تەنیا لە تەلارەکەدا دادەنیشم، یارمەتی پڕکردنەوەی بۆشایی ژیانی تەنیایم بدە.

پیاوە پیرەکە بە ئاشکرا زۆر ڕاستگۆ بوو، خۆی بە شەوق خرۆشەوە دەرخست، کە وای لە من کرد تا بەڵێنی ئەوەی پێبدەم ئێوارە بیبینم.

قەنەفەیەکی درێژ لە تەلارەکەدا بوو، کە دەمانتوانی سەیری قەرەباڵغیەکەی خوارەوە و جوڵەی پۆلیس بکەین، کە پۆلیسخانەکە لە لاکەی بەرامبەر بوو. لێرەش هەروەها هەموو بەیانیەك هەراج دەکرێت، لە ناوەندی کۆمەڵێك کە لە سێبەری درەختێکدا لەسەر قەنەفەی بەرز دانیشتون، چایی یان قاوە دەخۆنەوە و باسی سیاسەتی ناوخۆ دەکەن و فرت و فێڵ لە دژی هاوسێکانیان دەکەن.

ئەو خەڵکانەی بەردەوام دەچنە ناو ئەو قاوەخانانەوە، کە چواریان لەدەوری دەرگاکەی کاروانسەراکەیە، کۆمەڵێك کەسی بێ ئیشوکاری وەهای تیایە کە دەکرێ وێنایان بکەیت.

لە نزیکی نوسینگەی شارەوانی، دادگای پۆلیس و یەکێ یان دوو نوسینگەی گشتی تر، مشەخۆرە نیزامیەکانی زۆر لێیە، ئەوانە ماوەی دوانزە سەعات لێرەن، لە حەوتی بەیانیەوە تا دووی پاش نیوەڕۆ، ئیدی دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان لەناو شار.

## دەروێشێك و پشیلەكەی

دوای ئەوەی سەعاتێكی دەمێنێ بۆ خۆرئاوابوون دیسانەوە دەردەكەونەوە، لەوێ دادەنیشن و دەمەتەقێ دەكەن و تەسبێحە ئیسلامیەكانیان تا شەوێكی درەنگ بادەدەن.

ئەوانەی تازە هاتونەتە كەركوكەوە، بۆ نان كڕین دووچاری كێشە دەبن، مەگەر نانفرۆشێكی تایبەتی بدۆزنەوە، ئەوانەی ئەو خواردنە دەخەنە سەر سەبەتەیەكی تا رادەیەك تەخت و دەسوڕێنەوە تا بیفرۆشن. حەزم لە خورما بوو، هەر رۆژی یەكەم كە گەیشتم هەندێكم لە دوكانێك كڕی و لە تەنیشتیەوە تێبینی سەبەتەیەك نانم كرد، ویستم دوو كولێرە بكڕم، بەڵام خاوەنەكەی نەیدەفرۆشت. ئەگەر شتێیەكم لە دوكانەكە نەكڕیایە نانیان پێنەدەفرۆشتم و منیش ئامادەنەبووم ئەوە بكەم و هەندێ شتم دژی ئەو خووە نالەبارە بەدەمدا هات، كە خەڵكی غەریب بە برسێتی لە خاكی غەریبیدا دەهێڵنەوە. ئەوەش وای لێكردن كە دوو كولێرەم بەخۆڕایی بدەنێ و منیش پەسەندم نەكرد، دواجار رازی بوون بەوەی چەندم دەوێت پێم بفرۆشن. چونكە فرۆشتنی نان بە تەنیا لای دوكانداران شتێكی دەگمەنە و لەناو هەموو سونیەكانی میسۆپۆتامیادا و لەناو توركومانەكاندا زیاتر دەیبەخشنەوە، وەك لەوەی بیفرۆشن. ئەوە بەزۆری لەم سەرزەمینی باوك سالاریەدا باوە، كە لەماڵەوە نان دروستدەكەن و بەخۆڕایی دەیدەن بە هەموو كەسێك كە پێویستیەتی، فرۆشتنی ئەم پێداویستیە وەك شتێكی نەشیاو و شورەیی تەماشا دەكرێت.

ئێوارەیەك لەكاتی خۆرئاوابووندا چووم بۆ لای حاجی رەسوڵ، كە دانیشتبوو لەسەر كورسیەكەی و رامابوو. هاودەنگێكی لابوو، كە لە كاروباری رۆژانەیدا یارمەتی دەدا و كاری بۆ دەكرد و خواردن لێنان و پاككردنەوەی ژورەكانیان و ئەو فەرش و بەتانیەی رادەخست كە ئێمە لەسەری دانیشتووین. ئەم لاوە خەڵكی (سمیرنا)یە و لاوێكی سادە و ساكاری توركە، باشترین نمونەیەكی دەگمەنە كە من لە خاكی ئیسلامدا نەمبینیوە، سونیەك گۆڕابێت بە شیعە، بەلای حاجیە پیرەكەوە ئەو هەر لە سمیرناوە گۆڕاوە، لەگەڵ ئەوەشدا جگە لە توركی نەیدەتوانی هیچ زمانێكی تر قسە بكات.

هاوڕێی هەمیشەیی ئەو جووتە پشیلە سپیە بچكۆلەیە بوو، كە زۆر بە توندی لە سەردەمی بەچكەییانەوە ئالودەیان بووە، ئەویش هەمان شێوە سۆزی خۆشەویستی لەوانەوە بۆ دەهات و تا ئاستێكی بەرز زانیاریان بەرامبەر یەكتری هەبوو.

حاجی پیرە لە حەڵەبەوە هێنابووی، قەفەزێكی بچووكیشی هەبوو كە لە سەفەرەكانیدا بەكاری دەهێنا بۆ گواستنەوەیان. خواردنەكەی بەتایبەتی لەلایەن لاوە توركەكەوە لێدەنرا، كاتی ئاسایی

خۆی هەبوو لەگەڵ دەفری تایبەتی بۆ خواردنی ژەمە پاك و خاوێن و زۆر تایبەتەکانی، بەهیچ جۆرێ لە پشیلەکان نزیك نەدەبووەوە، کە لە سەربانی کاروانسەراکەدا دەسوڕانەوە و ئەوانی دووردەخستەوە لەخۆی.

هەریەکە لە فارس و کورد زۆر حەزیان لە پیشیلەی ماڵیە، لە شارە گەورەکانی ئێران خاوەن ماڵ زۆر بەداخە ئەگەر پیشیلەیەك یان دووانی نەبێت، وەك راگرتنی ئاژەڵی ماڵی بۆ خۆشی لە ئەوروپا.

دیمەنێکی سەرسوڕهێنەر بوو، کوردە توندوتیژەکان ببینی کە هەندێ جار دێن بۆ دیدەنی حاجی رەسوڵ، بەشێوەیەکی مەترسیدار فیشەکانیان بۆ پشیلەکان تلۆر دەکردەوە بۆ ئەوەی شوێنیکەون، یان پشتە خنجیلانەکەیان بە دەستێکی سوکی ئەوتۆ خوراندن کە لەوەبەر نەیانخستۆتە سەر هیچ شتێکی تر، لە هەمان کاتدا کە قسەیان بەجدی بۆ دەکردن بە زمانە رەقەکەی خۆیان دەیانکرد.

حاجی رەسوڵ خۆی بە عەرەبی و تورکی و کوردی دەدوا و کەمێکیش فارسی دەزانی، ئەوەشی لەماوەی بیست ساڵ گەڕاندا بەدەست هێنابوو، لە ساوج بلاقەوە- سابلاخەوە بیست ساڵ لەوەبەر دەستیپێکردووە و بەکوردستادا رۆیشتووە بۆ ئەنادۆڵیا و بۆ ئەستەنبوڵ. لەوێش فێری هونەری شیرینی دروستکردن بووە. کەمێ دەستمایەی پاشەکەوتکردووە، ئینجا چووە بۆ جدە بۆ بەجێهێنانی فەرزی حەج. لە مەدینەوە چووە بۆ دیمەشق و هەلی کارکردنی دۆزیوەتەوە و لەوێ دانیشتووە. دواتر بە پاپۆر چووە بۆ سالونیکا و ئینجا بۆ سمیرنا، کە لەوێ بۆ ماوەی چەند ساڵێك ماوەتەوە تا پارەیەك پێکەوە بنێت و بۆ ئەوەی گەشتێکی دوورودرێژ بکات بۆ کازمیە و کەربەلا لە نزیك بەغدا، کە پیرۆزترین مەزاری موسڵمانە شیعەکانە، دوو ساڵیشی خایاندووە، کە بە ئیشکردنەوە بە قۆناخی هێواش هێواش لە سمیرناوە هاتووە بۆ کەرکوك، لێرەش دەیەوێ پارەیەکی تەواو کۆبکاتەوە تا بیگەیەنێتە بەغدا. بەهەرحاڵ، ئەو بەهیچ جۆرێ نەیدەتوانی بڕوات، چونکە خێڵی هەمەوەند بە پەلامارەکانیان رێگای بەغدایان داخستبوو.

ئەوەندە دەمارگیرە کە من بەدەگمەن خەلکی وەهام بینیوە. هێمای بۆ دەقی یاسایی دەکرد کە پەیوەند بوو بە مەسیحیەکانەوە و زۆر خۆی پاراستبوو کە هیچ شتێکیان لەگەڵ نەکات، بەڵام پیاوێکی خێرەومەند و بەرێزم بۆ دۆزییەوە کە ئامادەبوو گەورەترین ئازار بچێژێت لەپێناوی یارمەتیدان، یان لە پێناوی ئەوەی ئاسودەی بکات.

ئەگەر مەسیحیەك سلاوی لێبکات، ئەو ناتوانێت بە هەمان ئاست وەڵامی بداتەوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەمارگیریەی شیعەکان، بەڵام وەك هەموو موسڵمانێکی دڵسۆز قینی لەوانەیە،

که بڕوایان به ئیسلام نیه و لەسەر ئایینی جیاوازن، زیاتریش له مەسیحی، هەروەها وتی ئەو یاسا و نووسراوەی هەیه و لەسەر ڕۆشنایی پیرۆزانی پێشویان، له کاتێکدا ئەوانه هەمیشه له ڕێڕەوی هەڵەدان و باشتر نازانن.

له گشت مامەڵەکانیدا دادپەروەر بوو، هەرگیز له ئیشوکاردا بەرژەوەندی نەدەخسته پێش بەرژەوەندی مەسیحیەکانەوە.

ئەو خوی گرتبوو بەوەی به قوولی رادەما. شەوێکیان پرسیاری ناوەکەمی کرد، به بیستنی غولام حسەین، ئەو چەند جارێ دووپاتی کردەوە.

"غولام حسەین، غولام حسەین، کۆیلەی حسەین، من بەقوربانی بم، ئای ئەی حسەین!، حسەین! دەبووایه راپەڕینایه و پەلاماری سوننیەکانمان بدایه، ئەوانەی تۆیان سەربڕی، بێگەرد و بێتاوان، خیانەتیان لێکرد و بەدەستی خیانەتکاران کوژرا، ئای لەو ناوە. کۆیلەی حسەین، ژیان چیه بەو ئاسته بژیت، حسەین، حسەین! ..."

ئیدی ئەو خەیاڵ بیردیەوە و ستایشی (حسەین)ی دەکرد — بێگومان چووه وردەکاری تراجیدیای مەرگی ئەو پیاوه پیرۆزەوە، که هەرگیز بەراورد ناکرێت لەگەڵ پیرۆزانی مەسیحیدا و که خۆی کرده قوربانی و ملکەچیش کەمتر نیه له پاڵەوانی.

خۆی کوردە، کەچی زۆر بەداخه بۆ ئەو هەموو گاڵتەوگەپەی کوردەکان، که زۆر هەڵدەپەڕن و گۆرانی دەڵێن. هەموو شەوێك ولاخداره کوردەکان لەسەربانی هەندێ ژوور له دەرەوه کۆدەبنەوه و گۆرانی دەچڕن، یان گۆرانی میللی دەڵێن، لەسەر نەغمەی جوزەلەکان هەڵدەپەڕن و بەخرۆش و کەیفەوه به جوزەلەکانەوه دێن و دەچن. زۆرجار دەستەکەن به زۆرانبازی و یەکتری دەدەن به زەویدا و وەرزشەکه جارجاره به تورەبوونێکی گەرم کۆتایی دێت، کاتێ چەقۆکان دەردەهێنرێت و خامۆش نابێتەوه تا یەکێ له بینەران نوکتەیەك دروستدەکات و دەنگی پێکەنین بەرزدەبێتەوه له هەمووان.

بەبێ هیوا له کەرکوك گیرمان خواردبوو. لەپشتی ئەو ڕێگایەی لێوەی هاتبووین، هەمەوەندەکان دایانخستبوون، بەرەو بەغداش هەمان شێوه بوو، هەروەها بەرەو ڕۆژهەڵات که ئێمه بۆی دەچووین وڵاتی تایبەتی خۆیان بوو، تەنانەت به یاوەری سەربازەکانیش نەیاندەوێرا بڕۆن.

هەموو ڕۆژێ رایاندەگەیاند که ژمێریاریکی دیاریکراوی سوپا، له سلێمانی پێویستیان به بوونی هەیه، هەوڵدەدات به سەد سەربازەوه له سنوور بپەڕێتەوە، که چەکدارن به چەکی ماوزەر و ژمارەیەك هێستریان پێیه، بەڵام ئەو پیاوه باشه هەرگیز لەوه ناچێت بیری خۆی سافکردبێ بۆ

ڕۆشتن. ڕەشیدی وڵاخدارم، هەموو هێسترە باشەکانی بۆ ئەو مەبەستە بۆ میری تەرخانکردووە، هەروەها بازرگانێکی کلدانی پەنجا بار شەکری ئامادەکردووە بۆ سلێمانی، کە شارێکی دەرکەنارە. شانزە ڕۆژ چاوەڕوان بووین و ئیدی لە دواجاردا فرمانی بارکردن لە نیوە شەودا هات و هەموو چووینە دەرەوەی کەرکوك، تا پەیوەندی بکەین بە کاروانی سەرەکی و پاسەوانانەوە. ڕابەری کاروان یەك شەفیق ئەفەندی بوو، کوردێکی تیرەی شوان بوو، کە خێڵێکی گەورەی دانیشتوی چیاکانی ناوچەی باشووری ڕووباری زابی خواروون، بەکاریگەری ناوبانگی ئەو و ئەو سەد سەربازانە هیوادارین بەسەلامەتی لەو هەمەوەندە دڕندانە دەربازبین. بە پێی یاسا ئەوانە یاخین، فرمانی تەقەلێکردنیان هەیە لە هەر یەکێکیان کە لەناو شاردا ببینرێن، بەڵام وەك ئەوەی زۆر بە جەرگ بوون، من زۆر جار لە بازاڕی کەرکوکدا بینیومن هاتوچۆیان کردووە و گوێشیان نەدەدا بە سەربازانی تورك کە دوایاندەکەوتن، دەترسان هێرشیان بۆ بەرن لەبەر خەڵکی کەرکوکی چەکدار و پارێزارو بە فەوجێ سەرباز، لەترسی هەڵچوونێکی کوتوپڕ بۆ تۆڵەسەندنەوە لەو چەند کوردە بەغیرەتە.

بە بیستنی ئەوەی کە من نیازی ڕۆشتنم هەیە، حاجی ڕەسوڵ ئەوپەڕی هەوڵیدا ڕازیم بکات بمێنمەوە. بۆ ئەوەش وتی: کورد لە جاف زیاتر دڕندەترن، یان گۆران، تەنانەت زیاتر بەغیرەت ترن لە خودی موکری. دەستەکانمی گرت و لێمدەپاڕایەوە کە بمێنمەوە، ژیان ناخەمە مەترسییەوە چونکە خوا پێیداوم لە پێناوی ژیانی دنیاییدا تەنیا بۆ کاتێك.

"کات" ئەو وتی،" درێژە و ژیانی تۆش لەسەرەتای لاویدایە، چی کێشەیەك دەبێ ئەگەر مانگێکی تر بمێنیتەوە، دوو مانگ، بەڵکو ساڵێك، ئەگەر تۆ نەتوانی پارێزگاری لە خۆت بکەیت، خوا سەرپەرشتی تۆی داوەتە دەست من، بیست ساڵە دەسوڕێمەوە و سکاڵا ئەکەم کە من هێشتا نەگەڕاومەتەوە بۆ وڵات و زێدی خۆم؟"

لەو کاتەدا بەدەوری جۆرێ لە نانتێوشیدا دانیشتبووین، کە نانەکانمان تێهەڵدەکێشا و بە پەنجەکانمان دەمانخوارد.

"بڕوانە" ئەو وتی، "من ئەم پارووە دەخۆم نەك لەبەر خۆشی چێژەکەی، لەبەرئەوەی ئەو لە هەموو کەس هەژارترە، نەك لەبەر ورگ پڕکردن، بەڵام ئەمە فرمان بەڕێکردنە کە لەسەر شانی هەموومانە، تەنانەت بێباوەڕانیش، دەبێ پارێزگاری لە جەستەی خۆمان بکەن، کە خوا پێیداوین بۆ ئەوەی عەقڵمان بپارێزین."

## کۆتایی بەهار

ئەگەرچی لە رۆژهەلاّت رۆح نائارامە، کەچی ماوەیەکی دوورودرێژە لە ناخمدا ئارامە، هێشتا دانەمرکاوەتەوە و ئەوەتا خۆی دوپاتدەکاتەوە. بۆ ماوەی شانزە رۆژ لە کەرکوك مامەوە. کەش و هەوا، لەگەڵ ئەوەی کوتوپڕ لە گەرمەوە دەگۆڕێ بە سارد و بەو شێوەیە لەو دەشتە وشکەدا دەردەکەوێت، شتێکی بەرگەنەگیراو پێگەیشت، کە ئێمە گەیشتین، دەشت و دەر بە سەوزایی داپۆشرابوو، ئەگەر تەنیا گژوگیاش بوویێت، بەلاّم ئێستا زەردێکی بریقەدارە، لاسکە وشکەکان سوتاون، بردنی هێسترەکان رۆژانە بۆ دەشت تا بلەوەڕن دیمەنێکی گاڵتەجاری بوو. بەم شێوە سەیروسەمەرەیە نیشانەی هاتنی هاوین دەردەکەوێت، خۆری بەرز بەچەشنی خێرایی گوللە دای لە پشتی چیا قرمزیەکانی کوردستان، ئینجا بەرزدەبێتەوە تا دەگاتە ترۆپکی سەرکەوتنی لە جاران زیاتر و لەوێ هەڵدەواسرێت تا دوانزە سەعات یان بەو شێوەیە و بەخێرایی شۆڕدەبێتەوە، سەعاتە فێنکەکانی رۆژی رووناك تەنیا سێ سەعاتە، بەرەو خۆرئاوابوون دابەزینی پلەی گەرما تەواو هەستی پێدەکرێت، بۆ دنیایەك کە دەکوڵا، ئیدی سەعاتێ یان دوو سەعات دواتر تاریك دادێ و تا رادەیەك فێنك دەکات. وەك لەوبەر وترا، شارەکە کەوتۆتە شوێنێکەوە کە لەم کەش و هەوایەی ئێمەدا دەبێ پێی بڵێین "دالّدە" کە لەم خاکەدا واتە زیاتر گەرم و خنکێنەر. لە سەعاتەکانی پاش نیوەڕۆدا دەگەینە ئەو پلەی گەرمایەی کە پاڵت پێوەدەنێ بۆ نوستن لە پشتی دەرگای داخراوەوە، بە رێکەوت جارێکیان لە دەوروبەری سەعات سێدا هاتمە دەرەوە بینیم شارەکە چۆڵ بوو، هەروەها هەتاوی سوتێنەری کەرکوك لە مانگی مایسدا. لەگەڵ ئەوەشدا، تەربوش یان فێست یەکێکە لەو شتە سەیروسەمەرانەی تا ئێستا مرۆڤ دۆزیویەتیەوە، کە نە لە گەرما و نە لە سەرما دەتپارێزێت، لەگەڵ ئەم گەرمایەدا وا لە مرۆڤ دەکات سەری لەژێر تیشکی ئەو هەتاوە سوتێنەرەدا لە عارەقدا بکوڵێت. هەروەها مێش و مەگەز بە چەشنی میکرۆب بلاّودەبنەوە. رۆژانە پیاسەم بۆ بازاڕ دەکرد و جارێکیان بردمی بەلای هەندێ دوکانی قەسابدا و بەیانیەك تێبینیمکرد گۆشتەکە لەژێر مێشدا رەش داگەڕابوو، وشکبوویۆوە و مێش ئاوێزانی ببوو، زۆر بە زەحمەت دەجوڵان کاتێ کە قەسابەکە چەقۆ درێژەکەی پیادا دەهێنا، سەدانی دەجنی بۆ لەتکردنی گۆشت، لە چرکەی دوایدا بێ ئەوەی چەقۆکەی پیابکاتەوە. خۆشبەختانە نەریتی ولاّتەکە بێگومان تا رادەیەکی زۆر رێگرە لەبەردەم ئەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی ئەم جۆرە بارودۆخەوە سەرهەڵدەدات.

# شێخێکی کورد

دوکانی قەسابەکان لە بەیانی زووەوە بۆ نزیکەی سەعات دوو کراوەیە، هەر جارە و تەنیا مەڕێك دەکوژرێتەوە و تا ئەوە نەفرۆشرێ یەکێکی تر دەرناخەن.

بەو پێیە کاتێکی کورت هەیە کە دەتوانرێ لەمیانەیدا گۆشتی تێدا بکڕیت، مشتەرییەکی زۆر هەیە بۆ گۆشت کڕین و گۆشتی مەڕ و بزن ئەوەندە نامێنێتەوە تا توێژێکی تەنکی بەهۆی مێشەوە لەناوبچێت. ئاو تەواو دەگمەن بووە، رووبارەکەی کە ئێمە هاتینە شارەکەوە تا رادەیەك پڕبوو، ئێستا وشکە و هەموو ئاوی بەکارهێنان لە بیرەکانەوە بەدەست دەهێنرێت. ئەگەر غەریبێك ئەو شتە بەنرخە بەفیڕۆ بدات، ئەوا کاردەکاتە سەر هەموو ئەوانەی لە کاروانسەراکەدان، لەبەرئەوە تەنیا لە دەست و دەموچاو زیاتری پێ ناشۆردرێ، ئەگەر ویستم لەوە زیاتر بەکاری بێنم دەبێ بەنهێنی کەمۆڵەی پڕکراو بهێنم بۆ ژوورەکەم. بێگومان گەرماوی گشتی لە کەرکوکدا هەیە و بەڵام تەنانەت هاووڵاتیانیش وابەستەی داب و نەریتە و دەبێ ستایشی هەموو دەزگا خۆماڵیەکان بکەن، دانیان نا بەوەدا کە زۆر خۆش نیە. بەلایەنی کەمەوە سەرسام بوون لەوەی کە من بە تەنگ (گەرماو)ەوە نیم، بەڵام ئەوەی دراوسێکانمی سەغڵەت کردبوو ئەوە بوو خۆم ریشی خۆم دەتاشی، کە دەبوایە لەلای سەرتاش بمتاشیایە و ئەوە بە دەمارگیری ناحەقی لە دژی ئەوە دادەنرێت، لە رۆژهەڵاتدا سەرتاش بە کەسێکی شارەزا دەناسرێت و ئەگەر مرۆڤ بە دەستی خۆی ریشی بتاشێت، ئەوە لە یاسای قورئان لایداوە و ئەگەر سەر بێت، ئەوە کەرێتیەکی مەترسیدارە، هەردوو ئەنجامەکەی ئەو لادانە بۆ بازرگانیە یان بەسروشتی جۆرێ سروشتی نەفرەت ئەنگێزە و دەبوغزێنرێ، ئەوەش راستیە کە سەرتاشانی رۆژهەڵات بە واتای وشە چینێکی زۆر هوشیارن.

لە رێی نوسینگەی هاورێی کۆنسۆڵی سەعاتچییەوە، برام بۆ دیدەنی یەکێکی ناوداری کەرکوك، رەزا ناوێك، کە لەلایەن موسڵمانانەوە پێیدەوترا شێخ رەزا و لەلایەن مەسیحیەکانەوە، کە قینیان لێیبوو، بانگ دەکرا مەلا رەزا، ئەوەش نازناوێکی نزم ترە.

ئەو پیاوە شایستەیە پیاوێکی ئایینی پرینسیبی شوێنەکەیە و لەگەڵ ئەوەی کە سوننەیە و کەللە رەقە لەوەدا، هیچ ناکۆکیەکی نییە لە بینین و بەئەدەبە لەگەڵ ئەوانەی پێچەوانەی باوەڕی ئەون لە ئیسلامدا و شیعەش کە هەردووکمان خۆم و ساعاتچیەکەی جیادەکردەوە.

لە خانووەیەکدا لە تەنیشت ئەو مزگەوتەی بەڕێوەیدەبرد دەژیا، یەکێك بوو لە باشترین خانوی کەرکوك. حەوشەکەی لەسەر شێوازی ستایەڵی فارسی ڕێکخستووە و هەندێ درەختی توو ڕووپۆشی لەسەر هەندێ دەرودیواری بەرز کردووە. لە ژوورێکی درێژدا پێشوازیکردین، کە بە باشی فەرشکراوە و خۆشی تەنیا بوو. بەڕاستی پیاوێکی ئاییی زۆر بەڕێزە، گرژ و مۆن و هەیبەتێك لەسەر برۆی دەرکەوتبوو، بە سپێتی عەمامەکەشی هەرگیز روناکی ناکاتەوە. لای ئانیشکێوە لەسەر زەویەکە گرامافۆنێك هەبوو لە بووقەکەیەوە دەنگێکی گڕی عەرەبی دەهات، کە تەنیا خوێندنەوەی ئایەتەکانی قورئان بوو- بۆ ئەو جۆرە شتانە داهێنەرە سەیروسەمەرەکانی ئەورووپی بەکاردەهێنرێت! بە بیستنی ئەوەی کە من شیرازیم، ئەو یەکسەر دەستیکرد بە وتەی حافز و سەعدی، بە فارسی قسەکردنێکی زۆر بەرز، ئینجا بەرهەمی کتێبی دەستخەت، هەندێ لە شیعرەکانی خۆی خوێندەوە. بە چوار زمان هۆنرابوونەوە- تورکی، عەرەبی، فارسی و کوردی، بەڵام فارسی لە هەموویان زیاتر پێ باشتربوو. زووربەی شیعرە تورکیەکانیشی لا سوك و بێ بەها بوو، کاری هەمیشەیی وەك دەیکات تا رادەیەك هەموو بە عەرەبی و فارسیە.

زۆر بەداخەوە سکاڵای لەبەرەوپێشچوونی مەسیحیەکان دەکرد و بێگومان دەیخەنە ژێر سایەی رژێمی حوکمی دەستورییەوە، لە قسەکردندا چاوەکانی دەدرەوشانەوە و حەماسەتی هەستا و تووڕەیی لە ناخیدا قوڵپی دەدا، حەزی بە بینینی خوێنڕشتنی ئەو کافرانە بوو، لەگەڵ هاواری نەفرەتکردن لە دژی تورکومانەکان، وەك یەك موسڵمان و مەسیحی تۆمەتباردەکرد و بە راشکاوی ئەوەی ئاشکراکرد، کە دەخوازێ سەری ئەوانە ببینێ دیوارەکانی سەربازگەکە برازێننەوە. ئەو پیاوە هەوڵیدەدا و هیچی بە دەست نەدەهێنا جگە لە یادەوەری ناپەسەند لەو جۆرە کارەساتەدا، چەند جارێ ئەو مەسیحیەکانی خستۆتە تەنگوچەڵەمەوە، بەڵام پارێزگاریی تەواویان بەدەستهێنا، لەبەرئەوە لە دەستی دەرچووە و پێشنیارەکانی هەموو کاتێ پشتگوێ دەنرێ، کاتێ دژی ئەو خەڵکە بێ زیانانە کە دەریدەبڕێ. لەو ماوەیەدا بۆ هێورکردنەوەی تووڕەییەکەی سێ پیاڵە چای خواردەوە، ئیدی داوای مۆڵەتمان لێکرد، بەبێ هیچ رادەربڕینێك بەرامبەر هەست و سۆزی ئەو.

سەعاتچی لەپاشان نمونیەکی لەسەر خووی هەڵچووی بۆ هێنامەوە، هەرچۆن لە قاوەخانەدا دانیشتبووین. رۆژێك لە ماڵەکەیدا فرمانداری قوستەنتینەی تورك دیدەنی دەکات، وتووێژەکان گۆڕا بە باسی شیعر، شێخیش کە خوێنی کوردی تێدایە و دەستیکرد بە ستایشی فارسی و تەنانەت بەرز راگرتنی هۆنراوەی کوردی و دەربڕینی سەرزەنشتکردنی خۆی بۆ تورکی.

# ئەفسەرێکی تورکی

ئەفسەری عوسمانلی بە شێوەیەکی سروشتی بەرەنگاری بووەوە و بە خێرایی شیعرێکی دوور و درێژی بۆ خوێندەوە کە بەم وشانەی خوارەوە کۆتایی دێت:-

"فروختە ئەم بێ شەمع و کافور و سان سین"

شێخ هاواری کرد و هەلێکی نمونەیی قۆستەوە، "فروختە ئەم" فارسیەکی پوختە و شەمع و کافور عەرەبیە و چی لە بەیتەکەدا بۆ تورکی ماوەتەوە جگە لە هیچ و پوچی و بێ هیوایی؟ "و سان سین" خالّی دواتر لە چوارچێوەی واتای تورکیەکەدا — و تۆ لەگەڵ ئەوەدا — واتە هیچ و پوچی بێ هیوایی.[34]

لە رۆژی دەیەمی مانەوەماندا لەوێ، رەشیدی وڵاخدار بەو پەڕی شادمانیەوە هات، لەوانەیە رۆژی داهاتو لێرە دەرچین و باشتر وایە هەندێ خواردن ئامادە بکەین بۆ رێگا، لەگەڵ ئەوەشدا، هێمای بۆ ئەوە کرد، کە " خوا خۆی دەزانێ ئەگەر خۆمان نانەکەمان بخۆین یان هەمەوەندەکان".

چوار پزیشکە سەربازەکان لە موسڵەوە پەیدا بوون، لە سلێمانی دامەزراون و (تابور)ێك یان چوارسەد سەربازی پاسەوانیان بۆ دیاریکردبوون، شکستێکی ئاسایی بەسەردا هات و رێگەی سەفەری بڕی، تا موچەی ئەو چەند مانگە نەدرێ، سەربازەکان مانیان لە کارکردن گرت و دووسەد سەربازی تریان لە شوێنیان دامەزراند، ئەوانیش بەتەواوی رەتیانکردەوە کە بڕۆن، لە ترسی ئەوەی بەرەنگاری هەمەوەندەکان ببنەوە، کە نەریتێکی دڕندانەیان هەیە و تینوون بە خوێن و چەکەکانی هێزی تورکی و بۆ نەهێشتنی تینوویەتیەکی ئاوا، بۆیە ماینەوە.

وەك یەك نمونە لە ئەرکی خۆخواستەی ئەفسەرێکی تورکی سەربەخۆ، من دەتوانم دەقی ئەمەی لای خوارەوە بگێڕمەوە:-

حاجی رەسوڵ و خۆم لە ئێوارەیەکی تاریکدا دانیشتبووین و جگەرەمان دەکێشا و گفتوگۆی ئاسایمان لەبارەی سیاسەتی فارسەوە دەکرد، کاتێ کەسێك بە بەرگی فەرمیەوە پەیدابوو، لەنێوان نزگرەکاندا بە دەنگێکی گڕ وتی "سلامون عەلەیکم."

بێ ئەوەی فەرمووی لێبکەین لەنێوانماندا دانیشت و خۆی بە من ناساند وەك مەیجەر لە فەوجێکدا و ئیدی دەستیکرد بە کەچەڵەکردنی حاجی. لەوە دەچوو پیرە پیاو هەندێ وشەی بەرز و نزمی

---

[34]- دەستکارییەکی بچوك لێرەدا کارێکە و نابێ لێیهەڵبێین، سەرەتای وتەکەی شێخ بەمە دەست پێدەکات: " وا بیر پارچە پوخ قالّدی، ڤا سان سین."

بەرامبەر یەکێ لە پیاوەکانی کردبێت، کە شیرینیەکەی پێ فرۆشتووە و ئەم نیمچە فەرمیە خۆتێهەڵقورتێنەرەی لەخۆوە قسەدەکات و خۆی خستۆتە نێوان ئەو دووانەوە وەك دادوەرێکی یاسایی بنەڕەتی. حاجیش بەشێوەیەکی سروشتی ئەوەی پەیوەندی بەو جۆرە کێشەیەوە بوو ڕەتیکردەوە، بەڵام ڕکابەرەکەی هەڵی بردنەوەی مەسەلەکەی بەدیکرد و کێشەکانی بۆ ئەفسەرەکە هەڵڕشت. پیرە پیاویش لە داخانا هەردووکیانی بەجێهێشت و مەسەلەکە خستە بەردەم موتەسەڕیفی شارەکە.

لە هەمان کاتدا مەیجەر کێشەکەی لەگەڵ ڕکابەرێکی تردا یەکالاکردەوە، خەریکی ڕێکخستنی ئەوەیە کە دوو مەجیدی وەك خەرج بسەنێت و بینی حاجی نێوەندکاری ئەوی پەسەند نیە، هات هەولیدا بۆ کەچەڵەکردنی تا پەسەندیبکات. گەشتمە ئەو بڕوایەی کە بڵێم هەموو ئەو شتە تۆقێنەرانەی ئەو هێناویەتە پێشەوە حاجی ناترسێنێت، کە هەڕەشەی ئەوەی لێدەکرد فڕێیداتە خوارەوە. خۆی پرسیارەکە بەوە شیکارکرد بەکەوتنەخوارەوەی لە خەودا، دوای هەڵوێستەیەك بۆ بیرکردنەوە کە سەرلێشێواویەکەی بارودۆخی گرانکرد. وەك هەندێك — تەمەنادەکەم هەموویان نا- لە ئەفسەرەکانی سوڵتان. ئەم دانەیەیان لە قوتابخانەی سەربازی بەغدا دەرچووە، بەڵام وەك لە دوایدا بیستم چۆن ئەم شاکارە هاتۆتە ئەنجام، بەواتای ڕاستەقینەی وشەی شتێیەك نیە لەوە زیاتر کە کەسێك بەختی باشی هێناوە و چۆتە دەزگایەکەوە- ئیدی تێگەیشتم کە ئەو چۆن بووە بە ئەفسەرێکی سەربازی.

بەیانیەك بروسکەیەکی بەڕەوشتانەم بە تورکی لەلایەن بەڕێوەبەری گشتی پۆستەوە پێگەیشت — لەگەڵ ئەوەی ئەویشم نەدەناسی- داوام لێدەکات بچم بیبینم. کەوتمە ڕێ بە درێژایی ڕێگەیەکی تەپوتۆزاوی گەرم، بەلای قاوەخانەکانی کە پڕبوو لە پشتکۆماوە تورکە نیزامیەکان، تا نوسینگەکەم دۆزییەوە. ئەمڕۆ ڕۆژی پۆست نەبوو، بەڕێوەبەری گشتی پۆست لەسەر کورسیەکی قۆڵدار لە پشتی مێزێکەوە دانیشتووە و جگەرەی دەکێشا. بە گەیشتنم زۆر بەڕێزەوە پێشوازی بە ناوی خۆمە لێکردم و بە تورکی دەدوا. بە دڵنیاییەوە باسی کارەکەی ناکات تا چەند وردە دەمەتەقێیەك نەکەین، بۆیە باسی بابەتی جۆراو جۆرمان دەکرد تا هێنای بۆ سەر باسی شتی ئەنتیك، کە ئەوە مەبەستە تایبەتیەکەی بوو باسی لێوە بکات. "ئەنتیك " لەم وڵاتەدا واتە سککە (پارەی کانزایی) و لولەکەکانی ئاشووری و پارچە لولەکە بەردە بچووکەکان لەگەڵ وێنەکان و پەیکەرە هەڵکۆڵراوەکان لە سەریان. ئەو بانگهێشتی کردوم بۆ ئەوێ تا کەڵك وەرگرێ لەو زانیاریانەی من پێویستە بیدەمێ

لەبارەی نرخی ئەنتیکەکانەوە، فەرەنگستان بۆ ئەو شوێنێك بوو کە نیوەی جیهانە و دەگەڕێ بەدوای ئەنتیکەکاندا و دەبێ نرخی ئەو شتە دێرینانە بزانیت، کە دەکرێ لە دەوروبەری کەرکوکدا بدۆزرێتەوە. لە ئەنجامدا بەو جۆرە ئامادەیکردم، ئەو لە ژوورەکە چووە دەرەوە و لە گەڵ تەریقیدا کیسێکی بچووکی سککە و مۆر لە قوتوی پاراستنی پولەکانیەوە هێنا. کە دەگەڕانەوە بۆ بەشی گەورەی سەرەتای ئیسلام، یەك دوویەکیش لە ئاشکانیەکانەوە و چەند پارچەیەکی ئاشووریش، بەنرخترین گەنجەکەی ئەو پارچەیەکی پێنج پاوەنی جۆرجی سێیەم بوو، کە وەك ئەو باسیدەکرد بەهایەکی نایابی هەیە. منیش نەمدەتوانی لە خوێندنەوەی مێژووی سەر ئەنتیکەکانی هیچ یارمەتیەکی تری بدەم، بەڵام ئەو وای هەستدەکرد کە حەزناکەم نرخەکانی بەیان بکەم چونکە وای دەزانی دەمەوێ بیانکڕم. بەڵام زۆری لێکردم و منیش ناچار هەندێ نرخم بۆ دانا کە زۆر شادمانی کرد. لەم دەورویەرە بازاڕێکی باش بۆ ئەنتیك هەیە و تورك و کلدانەکان زۆر چالاکن لەو بوارەدا، دەیکڕن و وردە وردە کۆیدەکەنەوە و ئیدی دەیبەن بۆ ئەستەنبوڵ بەهیوای ئەوەی سەرمایەیەکی پێ بەدەست بێنن.

ئەو بەیانیەی دەگەڕامەوە بیرمکەوتەوە هەندێ کاهوم لە پیاوکی پیر دەکڕی، ئەوەی بۆ مشتەریەکانی پاکی دەکردەوە و دەیشتنەوە. نرخەکەی، کە بیرێکی باشی دەدا لەسەر نرخی سەوزاوات و میوە، دوو کاهوو بە سێ "پول" کە حەوت پول دەکاتە"قەمەریەك" کە یەکسانە بە سێ "فارزینگ". کەواتە هەر کاهویەك دەکاتە 24 بەش لە یەك پێنس. لەسەر ئەم بنەمایانە ئەوە ڕووندەبێتەوە کە دوو کەس بۆ ماوەی سەعاتێك لەسەر شتێکی کەم نرخ کێشمەکێشیان بوو، بۆ ئەوەی "فارزینگ"ێك بەدەست بهێنێت، واتە بەشێکی بەرچاوی ژەمە خواردنێکی بەدەست هێناوە.

بەیانیەکی زوو ڕەشیدی وڵاخدار بە تەنیا هات و لە خەو بێداریکردمەوە. ئەفەندیەکە بۆی ڕێکخستوین کە لەژێر سایەی ئەودا بڕۆین و لەپڕ لە ڕۆژی پێشودا بیری گۆڕی و ئێستا ئامادەیە، لەبەرئەوە ئێمە دەبێ بە پەلە بارکەین و بە زەحمەت توانیم خواحافیزی لە حاجی ڕەسوڵ بکەم، کە سپاردمی بە خواو پیاوچاکان، ئیدی چووینە دەرەوە بۆ سەر شەقامی هێشتا چۆڵ بۆ شوێنی ژووان لە دەرەوەی شار. هەر کە گەیشتینە ئەوێ کۆمەڵێك وڵاخ و پیادە و سەربازمان بینی، ڕۆژ هەڵهات و ئێمەش دوعاخوازیمان لەم گۆشە دوورەی تورکیا لەم کاتەدا کرد.

# بەشی حەوتەم

## کلدانەکان

ئاراستەی داستانەکەمان دەمانبات بۆ ناو کوردستان و بۆ ناو ئەو خەڵکانەی کە جیاوازن لەوانەی تا ئێستا ئێمە لە میانەی گەشتەکەماندا لە ناوچەکانی دەریای سپی ناوەڕاست و لەسەر سنووری ڕۆژهەڵاتی میسۆپۆتامیادا بینومانن. دەرفەتی ئەوەمان هەبوو بەشێوەیەکی سەرپێی تێبینی نەژاد و میللەتانی جیاواز بکەین، بەڵام لە هەموو ئەمانەدا، ئەوانەی کە لە سەدە کۆنەکانەوە پەیدابوون، پێناسەدەکرێن بە کلدانەکان، کە تا ئەم کاتە جگە لە تێبینی ئاسایی شتێکمان لەبارەیانەوە نەوتووە. وەك ئەوەی کە ئێمە خەریکین بە خاکی باووباپیرانی ئەواندا تێدەپەڕین، بۆناو گرد و چیاکانی کوردە نیمچە سەربەخۆکان، ناکرێ ئەم هەلە لە دەستبدەین و تێبینیەکی تەواو لەبارەی نەژادی کلدانەکانەوە تۆمارنەکەین، کە سەرنجڕاکێشەرێت.

گەشتیارانی ئەمڕۆ، جارێك بە ئورفەدا تێپەڕێت و بچێت بۆ ڕۆژهەڵات و لەگەڵ ئەرمەن و کلدانەکانی کە لە نەژادی یونانین، ژمارەیەکی گەورە لە کۆمەڵگای ناموسڵمان دەبینێت، کە لە شوێنە جیاوازەکانەوە- لەژێر ناوە جۆراوجۆرەکانی نستۆریانەکان، نەسارا، کلدانی، یاقوبیەکان، کاسۆلیك، کلدانە نوێکان، ئینگلیزی، ئەمریکانی و پرۆتستان- سیانەکەی دواییان لە باکووری ڕۆژئاوای ئێرانە. ئەم ڕێبازە جیاوازانە هەموویان لقەکانی کلدان و ئاشووری ڕەگەزن، نەوەکانی بنچینەیی دوو نەتەوە، کە دۆڵی دیجلەیان بە پێوانەی گەروی دورگەی ئیبن عومەر و نزماییەکانی فوڕات، یان بابیلۆنیا داگیرکردووە.

ئێستا 2500 ساڵە نەتەوەی ئاشوور تێکشکاوە و بەڵام تۆزێ کەمتر قۆناغی دووەمی کلدان لەلایەن ئەسکەندەری مەزنەوە کۆتایی پێ هات و لەو کاتەوە ئاشووریەکان یان کلدانەکان (لەبەرئەوەی لە هەمان ڕەگەز بوون) لە ملکەچیشدا بۆ فرمانڕەوایانی بێگانە هاوشێوە بوون، لەگەڵ سروشتی بەهێز و سەرسەختی کلدانەکان، ئاستیشیان لە ژیانی کۆمەڵایەتی هەموو سەردەمەکاندا لە شوێنێکی بەرزدایە و ئەمڕۆش تەیارکردنی بەشێکی مەزن لە ڕۆژئاوای ئاسیا لەگەڵ گروپێك لە بازرگانان و دیهاتی لە شارستانی و کولتوردا لەسەر ئاستێکی زۆر گەورەترن لەچاو ئەو خەڵکانەی لەناویاندا دەژین. زۆر لە نووسەرەکان و زۆر لە دانیشتوانەکان لەناو وڵاتەکانی مەسیحیە ڕەسەنەکانی تێدا نیشتەنین، بەشێوەیەکی هەڵچوون و بێ بەزەییانە بە قەڵەمەکانی خۆیان دادانی پێدا دەنێن، کە

کەسایەتی قێزەونی ئەوان، تەفرەخواردوی ئەوان،، رۆحی بێ نرخ و نادڵسۆزی و شتەکانی تر وەسفدەکەن. کەس ناتوانێت نکولی بکات کە ئەوەش لە زۆر حاڵەتدا تەواو راستە.

بە دڵنیاییەوە مەسیحیەك کە دێت لەگەڵ ئەوروپیدا پەیوەندی دەکات، زۆر جار کەسایەتیەکی زۆر ناپەسەندە، بەڵام ئەوە بەویژدانیە بەگوێرەی ئەوەوە بەیانکرێت، ئەگەر توانرا، هەر ئەندامێکی هەر رەگەزێکی رۆژهەڵاتی یان ئایینێك – بەتایبەتی سامی- کە پێوانەیەکی ئاکاری نییە بە تێکەڵاوبوونی لەگەڵ ئەوروپیەکان بێ نرخی بکەین. لاساییەکی باوی نارەوشتی ئەوروپایی، لەسەر بیری هەڵەی کاسۆلیکی رۆژئاوایی و پێشرەوتە. ئەوە رێزی دەگیرێت کە مەسیحی بەئاسایی دوای ئەو هێڵە دەکەوێت لە رەفتارکردنی بەم زووانە و لەگەڵ ئاسانکاری زیاتردا لەچاو موسوڵماندا، سروشتی گۆشەگیرێتی ئەوەی بڕوای بەرگری دەکات لە ئامادەکاری بۆ نەریتی رۆژئاوایی، باش یان خراپ و بەتایبەتیش لە حاڵەتی سامی محەمەدی.

سەرچاوەکانمان بۆ زانیاری لەبارەی بنەچەی کەنیسەی کلدان لە میسۆپۆتامیادا، بێبەختانە زۆر کەمە و ئەوەش تەنیا بەهۆی سەرچاوەکانەوەیە بۆ تێپەرین بە رووداوەکاندا کە لە کارە نائایینیە رووتەکاندا روودەدات، تا ئێمە بتوانین دوای رێچکەی بڵاوبوونەوەی مەزهەبەکانی عیسا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بکەوین. بۆ هەوادارانی کەنیسەی پرۆتستانتی ئینگلیزی، مێژووی کەنیسەی کلدان، یان رۆژهەڵاتی دەبێ گرنگیەکی تایبەتی هەبێت، بۆ کلدانە کۆنەکان دوای پلانی رێبازەکان دەکەون، کە زیاتر هاوشێوەی ئەوەی کەنیسە ئینگلیزیە، لەچاو هەر بەشێك لەو بەشە زۆر دابەشانەی تری ئاینی مەسیحی. (Sir H. Layard) سێر ئێچ. لایارد، کە لەساڵی 1840 لەنێوان کلدانەکانی موسڵ مابووەوە، لە کارەکەیدا تێبینیەکان لەسەر نەینەوا: "لەبارەی پرۆتستانتەکانەوە، کە بڕوا و دروشمەکانی رێبازە سەرەتاییەکانی مەسیحیەکانە، تا ئێستا نەبۆتە ناوەندی ئەفسانە و باوەڕە پڕوپوچەکانی رۆم[35] کە دەبێ لە ئاستێکی بەرزی گرنگیداندا بێت. ئێمە هیچ زەمینەیەکمان بۆ هەر گریمانێك نییە، وەك ئەوەی دروستکراوە، کە مەسیحیەت بە رێگا کۆنەکەدا بەناو ئورفە و نسێبیندا گواستراوەتەوە، بۆ ئاشووریا لەلایەن وەدوکەوتوانیەوە بارناباس و پۆڵ بۆ نەینەوا، یان یەکێکی تر لە شارەکانی کە تا ئێستا لە ناوچەکانی پایتەختی ئاشووری کۆن ماون. بەهەرحاڵ،

---

[35]- رۆژی شانازی ئەو بەیانە بەسەرچووە و هەروەها ئەوە بەشێکی مەزنی کەنیسەی کلدانە-" ئەفسانەی رۆم" کلدانەکانی دیلکرد، ئەگەر نەیکردبێ، لە ئەنجامەکەی دەترسم، کە لە پێشبڕکێیەکی دادوەرانەدایە.

## کلدانەکان لە ئێران

لە 410 زایینی، کاتێ یەزدیگەردی یەکەم فەرمانڕەوای ئێران بوو، مەسیحیەت بەشێکی دانپیانراو بوو لە بناغەی کۆمەڵگای وڵاتی ئاشوور و ئێران. ئاشکرایە پێشکەوتنی ئاوا ئەوەی دروستکردووە کە ئاینی مەسیحی وەك یەکێ لە ئایینە پەسەندەکان لەو ناوچانەدا دابڕێژێت، ئەوەش هێمای ئەوە دەکات، کە مژدەدەران و قەشەکان دەبێ گەڕان و گەشتە مەزنەکانیان پێش 400 زایینی دەستپێکردبێت.

ئەوە ئاشووری یان کلدانەکان بوون، کە وەك نەتەوەیەك بە خێرایی ئاینی نوێیان وەرگرت. بێگومان دوای وێرانکردنی ئاشوور و ئینجا بابل، پەرستنی بەعل و عەشتار، خوایانی کۆن، چوونە دنیای لەبیرچوونەوەوە، بگرە بەتەواوی لەیادکران، ئەوەی لە نەتەوەکە ماوەتەوە پەیوەندیانکرد بە ئایینی نوێوە بۆ تێرکردنی پێداویستی رۆحی کە تاقیکردنەوەی هەموو کەسێکە. قەشەکان و پیاوانی ئایینی مەزن لە کاتێکی زوودا بوون بە بەشێکی گرنگ لە رێکخراوی مەسیحیدا و ئەوەش جێی سەرنجە کە پاشایانی ساسانی فارسی هاوسۆزی ئەم ئایینە نوێیەن و سەرکەوتنی هەوڵی مەسیحی لەنێوان فارسەکاندا بەدیهات. ئەو میللەتە دێرین و شارستانیە بەرزە، کە کەسایەتیان بڕێکی زۆر بیر و ئەندێشەی تێدایە، هەمیشە ئامادەیە لە بیردۆزەکانی خوایانی نوێ رابمێنێت و لە سەردەمی ئیسلامدا لایەنگیری رامانگەری دۆزییەوە کە شیعەی دروستکرد، کە بوو بە بەشێکی تەواوی فارسی لە ئیسلامدا. مەسیحیەکانی سەرەتا روانیان، لەوانەیە لەگەڵ دڵنیایی هیوایەك بۆ گۆڕەپانی ئێران، لێرەدا بەهرەیەکی بت شکاندن نییە بکرێت، نە دیانا، نە مشتەری و نە ڤینۆس، ناکۆکە لەگەڵ مەسیح، لە گۆڕەپانی پەرستنی مرۆڤ.

لە ئێران لێبوردەییەکی فراوانیان دۆزیوەتەوە، وەك دەشتە بەرفراوانەکانی، بیردۆزێکی دوولایەنە کە تەنیا بۆ بنەمای باش و خراپ ئامادەکراوە، وەك پێناسەکراوە بە شێوەیەکی تیژ بە چەشنی شاخە وشکەکانی، دەرکەناریەکی بیری قەشەنگ بەسەر گێژاوی سۆزە ئاڵۆزەکان کە رۆڵی (یەکێتی بوون) دەگەیەنێ، کە گریکەکان، رۆمانەکان و ئاشووریەکان خۆیان پێناسەیانکردووە. نمونەی بەرز و ئامانجەکانی رۆحی، بۆ بەرزبوونەوەی نادیارە بۆ ماتریالیستی رۆژئاوایی، خۆیان دۆزییەوە لە گونجاندنی تاك بە بیری رەبەندی مەسیحی سەرەتایی.

ئێمە پێویستە لەوە تێبگەین، کە لە هەموو شوێنەکان، دوور و نزیك، فارس و میللەتی زەردەشتی بوون، فارسی _ ئاریایی و لەوانەیە میدەکان – یان ئەو رەگەزانەی لە کوردستانی هاوچەرخدا

دانیشتوون- کە پێشوازیان لە مەزهەبەکانی عیسای مەسیح کردووە و پێشوازیکردنیان بەکاریگەریەکانی پاکردنەوەی رۆحی و بە شادمانی سەرەتایی کە زانستی بەرز ئاشکرا دەکات. بەم جۆرە لەلایەن گەورە قەشەی کلدانەوە پێمان وتراوە، لە ساڵی 400 زایینیدا نووسراوە، کە یەزدیگەردی یەکەم پاشای فارس، حاکمێکی بە بەزەیی و دادوەر و باش بووە[36] و دواتر وەك هاوسۆزێ ناسراوە و پشتگیری فارسەکانە کە کەنیسەی نوێی بۆ خۆی راکێشا بەناوی "پارتی فارسی."

ئەو ناوەی پێدرا، دوایی نستۆر خۆی لە کەنیسەی بێزەنتین دەرکرا، ئیدی پاراستنی لەژێر دەستەڵاتی یەزدیگەرددا بەدەستهێنا و پاش ئەویش لەلایەن فەیرۆزی کوڕی ئەو پاشایەوە یارمەتی دەدرا (459-484زایینی) دواتر دژەوەستاوانی لە کەنیسەی رۆژئاواییەوە خستە ژێر پاراستنی خۆیەوە.

لە 410ز دووبەرەکیەکی گەورە لەنێوان نستۆریوسی پاتریارکی قوستەنتینە و سانت سیریل، لەسەر چەند خاڵێکی جیاواز لە بڕواکەدا بەرپابوو، بووە هۆی جیابوونەوە و لقێکی نوێی لێ لەدایکبوو، کە پێیدەوترێ نستۆریان. لە هەموو لایەکی مشتومڕەکە- کە بووە هۆیەك بۆ ئەنجومەنی گشتی لە ئەفێسوس ساڵی 431ز- نستۆریوس لە لایەن گەورە قەشەکانی رۆژهەڵاتەوە پتشگیریکرا، ئەوەش بێگومان دوای ناکۆکیەکە و ئەو کلدانانەی کە ناردونی پێویستە بچنە ریزەکانەوە یان خۆشیان ببن بە نستۆریوس.

مەزهەبەکانی نیستۆریوس بە هیچ واتایەك نە رۆمان بووە و نە بۆ ئەوانەشی کە مەسیحێت وەك یەکەیەکی گشتی دادەنێ، ئەوە بە تەواو گرنگە کە بۆتە هۆی دابەشبوون، یان بۆنەیەکی وەك ئەو بوغزە وەك بێبەختانە هەمیشە تایبەتیەکی توندڕەوی تیرەگەریە بۆ ئایینی ئاشتی. قەشە مەزنەکانی وەك تارسوس و دیۆدۆروس بەکردەوە مەزهەبی نیستۆریوسیان لەناو ئاشووریەکانی رۆژئاوادا بڵاوکردەوە و ئەوانیش وردە وردە پەسەندیانکرد، باوەڕداران ناوی (پارتی فارسی)یان هەڵگرت، کەمێکی بەهۆی بارودۆخی تیرەی نوێوە و کەمێکیشی بەهۆی سۆزی پاشای فارسەوەیە.

---

[36]- "یەزدیگەردی پاشای بەبەزەیی و باش، لەناو پاشاکاندا پیرۆزە، لەوانەیە لەگەڵ پیرۆزیدا یادبکرێتەوە و لەوانەشە داهاتووی زیاتر دادوەرتر بێت لە ژیانی پێشوی! هەموو رۆژێ ئەو چاکە دەکات لەگەڵ هەژاران و لێقەوماوان." Browne, Lit. Hist., vol. i., p. 135.

لەم کاتەوە باوەڕی نیستۆریوس، لە سووریا و ڕۆژئاوای ئاسیا لەناوچوو، لەگەڵ نەتەوەی کلداندا ناسرایەوە و پەیدابوونی یەکەم کەنیسەی نیستۆریوس یان کەنیسەی ئاشووری نزیکەی لە ساڵی 450ز، یان زووتر دەستی پێکرد.

لە ئێستاوە تا هاتنی موحەممەد، دەتوانی بڵێی کەنیسە لە گەشەکردندا بوو. ئەو هەڵگەڕانەوەیەش بێگومان لەبەرئەوە بوو، کە لە ئاستێکدا نەبوو تا بوونی خۆی بەسەر پاشایان و فەرمانڕەوایاندا بسەپێنێت. ئیدی جارێکی دی، داخێکی تایبەتمەندی مەسیحیەت کە ئێمە پێمان وتراوە لە میانەی ئەو کاتەدا هەموو چەوسانەوەیەکی کە لە ئیمپراتۆریای ڕۆمی مەسیحیەوە دووچاری بووە و هەموو سۆزێك و پاراستنێکیش ئەوان لە پاشایانی زەردەشتەوە لە ئێران بەدەستیانهێناوە.

لەگەڵ ئەو کەسە نەگونجاوانەدا جگە لە قبادی پاشای فارس، کە پیاوانی ئایینی کلدان لەو قۆناغەدا وەك دڕندە وەسفی دەکەن. شەڕئەنگێز و کاروکردەوەی ئازار و سەغڵەتکردنی کەنیسە بووە، بەڵام ئێمە هیچ بەڵگەیەکی باوەڕپێکراومان نییە کە ئەو هەروەها بێباوەڕان و بتپەرستانیشی سەغڵەتکردبێت، بۆ فارسەکان کە سەربازەکانیان بەردەوام هێرشیانکردۆتە سەر میسۆپۆتامیا، بێگومان هیچ ئایینێکی ئەو میللەتانەیان وەرنەگرت کە داگیریانکردون، لەکاتێکدا ئارەزویان لە مەزهەبەکانی مەسیحی هەبوو، وەك ئەوەی بەکردەوە بینیمان.

لەمیانەی ئەو کاتانەدا کۆلیجێکی گەورەیان لە ئێدێساوە (ئورفە) گواستەوە، کە زەنۆ ئاسووریان داخراوە بەهۆی بیروباوەڕی نیستۆریانەوە، گواسترابۆوە بۆ جوندی شاپور، نزیك شوشتەری هاوچەرخ لە ئیلام، لەناو خاکی فارسدا، بۆ ئەوەی کلدانەکان دڵنیابن لە پاراستن و سۆز و بەزەیی لە خەڵکانێکی بەهرەمەند کە هەمیشە ئامادەبوون بۆ ئەدەب و فێربوون. تەمەنای ئەوە دەکرا کە قەشەکانی دەرەوە بەباشی پاساوی بۆ بهێننەوە. شوێنی ئاوارەیی بووە بە ماڵێکی ئازیز و کۆلیجی پزیشکی لە جوندی شاپور لە برەودایە بۆ مژدەدەرێکی مەزن و وەك بنکەیەکی پەروەردەیی.

لە جوندی شاپورەوە، لە هەرێمی شاهانەی فارسی ئێستاوە، مژدەدەران نێردراونەتە دەرەوە بۆ هەموو ڕۆژهەڵاتی وڵات، کلدانەکان بە لەدایکبوون و بە زمان، فارسی دەدوێن و پرۆژەکەیان بۆ هندستان و تورکستان و چین گواستونیەتەوە. ئەو دەستبەسەراگرتنەی مەسیحی بەسەر ئێراندا زۆر مەزن دەبێت، کە لە ڕۆژانێکی زۆر زوودا وڵاتەکە دابەشدەبێت بە سەرەك قەشەنشینەکان.

ئەو کۆلیجە لەدەوروبەری 550ز لەلایەن ئەنەوشیروانی دادپەروەری پاشای فارسەوە بنیاتنراوە، کە یەکێکە لە دوا پاشاکانی زەردەشتی و زنجیرەی ساسانی.

# ئەنەوشیروانی دادپەروەر

لەمیانەی هەموو قۆناغەکانی دواتریشدا ئەو لە وڵاتەکانی فارس و عەرەبیدا بابەتی شتایشکردن بووە، بەر لە مەسیحی و ئیسلام وەك یەك، بۆ دادوەریە مەزنەکەی، چاکی زۆرتر بەرز نرخێنراوە لە رۆژهەڵاتدا لەچاو ئەوەی لەلایەن ئێمەوە کراوە، لەبەرئەوەی زۆر زۆر دەگمەنە. ئەگەرچی ئەو هەرگیز دانینەناوە بە مەسیحیەتدا، هاوسۆزی لەگەڵ مەسیحیەکاندا وای لێکرد ژنێکی کلدانی بکاتە شاژنی خۆی. کورەکەی وەك دایکی بە مەسیحی هێنایە پێشەوە و بەکاریگەری ئاگادارکردنەوەی باوکی گۆڕانکاری بەسەردا هات، کە بیروباوەڕی بێلایەنانەی بەرامبەر بە هەموو ئایینەکان گرتەبەر. هەرچەند پەیوەندی لەگەڵ مەسیحیەکان و هەڵوێستی بەرامبەریان بەس نەبوون بۆ بەدەستهێنانی رێز و ستایشیان،[37] دەیتوانی ئەوە بەدەستبێنێ بە چەوساندنەوەی مەزدەکی باوەڕی خۆی، کە مەسیحیەکان بە دڕندە و ترسناك تێیدەڕوانن.

ئاسان نییە بەهای راستەقینەی کەسایەتی و باوەڕی مازداك پەیپێبەریت، لەبەرئەوە ئێمە هەموو دەزانین، یان لەلایەن بیروباوەڕەکانی ترەوە تۆمارکراوە، مەسیحی و زەردەشتی و محەمەدی و ئەم جۆرە راپۆرتانەش بەشێوەیەکی سروشتی دەمارگیری تێدایە.

بەگشتی سیستمی بیری کۆمۆنیستی بوو، کە هاوبەشیدەکرد لەگەڵ تقوسی سۆفیگەریدا، سامانی مرۆڤ، تەنانەت ژنەکانیشیان، هەمووان هاوبەشبوون تێیدا و هەندێ سیستم بۆ ژیانی رۆژانە سەپێنراوە، دیارترینیان لە خواردنی گۆشت و خوێن رشتنەوەیە، کە یاسای دواییان گاریکردە سەر پیاوانی ئایینی ئایینەکانی تر بۆ قیێزکرنەوە لێی.

رێبازەکە لە سەردەمی قوبادیدا دەرکەوت و باشبوو کە پێشتر باسکراوە و بەر هەمان نەفرەتی مەسیحیەکان و زەردەشتیەکان کەوت بەوەی کە مەزدەکی بە چاکتر دادەنا، لەوانەیە لە هیوای سەرکوتکردنی هێزی مەزنی بەدەستهاتوی پیاوانی ئایینی زەردەشتیەوە بێت. لەو کاتەشدا کە

[37]- براون لە کتێبە مێژوویەکەیدا (مێژووی ئەدەب)، 1-168 سوپاسگوزاری مەسیحیەکان بەیاندەکات بۆ ئەنەوشیروان، ئەویش لەبەرئەوەی بۆ سەدەیەك دواتریش چاکەی لەسەریان بووە، کاتێ کە بەهۆی یەدیگەردی سێیەمی ئەوەی بێبەخت دووچاری هیچ کێشەیەك نەبوون... کە بەبێ ئاشتی راکشاوە.

ئەنەوشیروان تاجی شازادەیی لەسەردا بوو، سیاسەتی چەوساندنەوەی پیادەکردبوو، کە بە قەلاچۆکردنی مەزدەکیەکان کۆتایی هات و مازداك خۆشی لەداردرا، کە هەندێ فارسی مەسیحی و پزیشکی بارەگا و قەشەیەکی مەسیحی ئامادەبوون. ئەوە تەنیا دوای ئەوە رویدا کە ئەنەوشیروان (ئەو کاتە بەناوی خەسرەوەوە دەناسرا) ئەو هۆکارانەی کە مازداك موعجیزەکانی پێدەکرد بۆی، بۆ باوکی ئاشکراکرد. لەسەردەمی دوورودرێژی ئەو شازادەیەدا قۆناغێکی زۆرتر ئاسایش و پڕ لە لێبوردەیی بوو لەو تەمەنەدا و بەو هۆیەشەوە مەسیحیەکان لە ئێراندا پێشکەوتنێکی گەورەیان بەدەستهێنا. ئەنەوشیروان، لەگەڵ ئەوەی وابەستەی هیچ شتێك نەبوو، بەقەدەر ئەو پەیوەندیەی کە هەیبوو بە بیروباوەڕە تایبەتیەکەیەوە و ئەوەی لە کۆلیجی فەیلەسوفەکانی یۆنانی و مەسیحیە دواکەوتووەکانیەوە بۆی هاتبوو، ئیدی تا ئاستی ئەوەش چوو، کە لەگەڵ رۆمانیەکاندا پەیمانێکی بەست تا بیانپارێزێت.

تەنانەت لەو کاتەشدا، لە کۆتایی دووەمی سەدەی شەشدا، وێنەیەکی تەواو جوانی ئێرانمان لایە، کە لەلایەن پادشایانی بیر فراوانەوە فرمانڕەوایی کراوە، کە شاژن و بەتەمەنترین کوڕەکەی مەسیحی بوون و کارگوزار و پزیشك و راوێژکارەکان لە ریزی پیاوانی هەمان بیروباوەڕ و ئاین بوون، کە کۆلیجێکی پرنسیبە، شانازی ژیانی دەزگایەکی مەسیحی بوو، شتێکی سەیر نیە، هەروەها، کە کلدانیەکان لەگەڵ هیوایەکی بەرزدا تێیدەڕوانرا لەسەر داهاتوو، کاتێ دەبێ زەردەشتی بتوێتەوە بۆ ئەوەی جێگاکەی بدات بە مەسیحیەکانی ئێران.[38]

لەکاتێکدا ئەنەوشیروان خەونی بە ئیمپراتۆرنشینەوە دەبینی و مەسیحیەکانیش لەسەرو ئاینەکانەوە بوون، ئەوەی ئیمپراتۆریای فارس و پیرەکانی زەردەشتی رامالی، لەدایك بوو، جگە لە بوارێکی کەمی دەستەلاتیان شتێکی ئەوتۆ نەمابوو لە فرمانڕەوایی بنەڕەتییان. ئیدی محەمەد مستەفا- "پێغەمبەر"— لەو کاتەدا لەدایك بوو، دواتر خۆشی هێمای بۆ ئەوە کردووە و دەڵێت: لە سەردەمی ئەنەوشیروانی دادپەروەری پاشای فارسدا لەدایك بووم.

[38] - هیچ ناتوانرێ بوترێ، بەشێوەیەکی سروشتی، بارودۆخی رۆژهەلاتی ناوەڕاست چۆن دەبوو ئەگەر محەمەد دەرنەکەوتایە، بەلام لە کاتێکدا کە زۆر لەوانەیە مەسیحی بووایە و ئەویش بڕوایەکی بێترخ و هیچ بووایە، تەنانەت بۆ لەو رۆژانەشدا پێش ئیسلام ، لە هەرکوێیەك کەنیسەی مەسیحی دەگەڕا دوور لە کلدانەکان، بەشێوەیەکی خراپ گەندەڵ دەبوو، و بیروباوەڕەکان لەوە وەردەگیرا بۆیە تا رادەیەك مافی خۆیەتی پێیبوترێ مەسیحی.

ئەنەوشیروان لە ساڵی 578ز کۆچی دوایی کرد و ژمارەیەك لە پاشایانی لاواز لەدوای ئەو هاتن تا یەزدیگەردی سێیەم، دوا زەردەشتی بەدبەختی پاشای فارسی، کە لە شەڕی قادیسیەدا لە 635ز لەلایەن عەرەبەکانەوە تێکشکێنرا و دواتر لە تاراوگە، لە خۆراسان لە ساڵی 651ز مرد.

لەمەوە، یەکێ لە هەرە گرنگترینی خاڵی وەرگێڕان لە مێژووی رۆژهەلات و هەلی دەرکەوتنی بیروباوەڕێك کە ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی جیهانی پێ ئایندار بووە، بۆیە باشترە بۆ چرکەیەکیش بێت ئاورێ لە مێژووی مەسیحیەکانی رۆژهەلات بدەینەوە، بۆ دڵنیابوون لەوەی کە لەو کاتەدا بزانین بارودۆخی کەنیسە چۆن بووە.

زۆربەی توێژەوەران لەبارەی ئیسلام و مەسیحیەوە لەو قۆناغەدا هاوڕان کە کەنیسەی یەسوع، لەمیانەی زۆر لە بیروڕای جۆراوجۆری بێباوەڕیەوە دابەشبوو بەوەی زیاتر لە ئاینێك لەسەر ئاستێکی فراواندا دەرکەوێت، کە لەو کاتەدا هەر بەناو بڕوا و ئامانج بوو، کە لە راستیدا هیچ نەبوو جگە لە ژمارەیەك بیروباوەڕ کە لەکاتی جەنگدا لەگەڵ یەکترین لەسەر خاڵەکانی بیروباوەڕ و بەگشتیش لە گەندەڵیدا نوقوم بوون. بێگومان ئەوە بارودۆخی نێوان مەسیحیەکانی رۆژئاوای ژێر دەستەڵاتی ئیمپراتۆرەکانی رۆم و مەسیحیە سوریەکان یان عەرەبەکانی رۆژئاوای دوورگەی عەرەبی و دیمەشق بوو. لەم جۆرە گێژاوەدا کەنیسەی مەسیحیەکان لەم بەشانەدا کە محەمەد لەنێوان دوو بیروباوەڕی مەزنی ناو خاکەکەیدا لە کۆششدا بوو، کە جولەکە و مەسیحی بوو، بۆ ماتریاڵ قورئان بەچی وەریگێڕاوە، لە بۆچوون و دیدی ناکۆکی پیاوانی ئاینی مەسیحی بەدوورگرت، بۆ بیروباوەڕی زیاتر گشتگیری تری جولەکەکان.

بەڵام ئێمە هەست بە نادڵنیایی دەکەین لەگەڵ نستۆریەکاندا بە تەنیا و هەموو رێبازەکان یان دووبەرەکیەکان، ئەوەش کەمترین تێکدانی بیرە بنەڕەتیەکەیە و ئێمە ئەوەمان وەك بەراوردێکی زۆر باش بۆ دەرکەوتووە لە رێکخستن و یەکێتی ئامانجدا، لەگەڵ زۆربەی رێبازە کوێرباوەڕەکانی سووریا و کەنیسەکانی قیپتی.

دووبەرەکی و جیابوونەوە و بێباوەڕی لە مالاباڕ و سوکوترا و دیاربەکر رویدا، بەڵام لەوەدەچێ بیری بنەڕەتی نیستۆریەکان بەگشتی پارێزگاری لێکراوبێت، واتە ئەوە سروشتی دوولایەنی عیسای مەسیحە، یەك کەسایەتی مرۆڤ و ئەویتریش وتەی خواوەند و بەرپەرچدانەوەی نازناوی "دایکی خوا" بۆ مەریەمی عەزرا، کە بەپێی وتەی ئەوان ئەوە دەفرێکی بێگەردە، بەهۆی موعجیزەوە تۆوێکی تەواو پەیوەندی پێوەکرد و لە ئەنجامدا بوو بە دایکی عیسای مرۆڤ .

# دەرکەوتنی ئیسلام

خۆیان لە ئەنجامی پێشبینیدا، بەهەرحاڵ، هەرگیز دەربڕینی کۆتایی بۆ گۆترە نییە، کە زۆر پێشکەوتوخوازترە لە سەردەمانی رابردو، هەروەها ئەوە ناکری تێبینی کرابێ کە ژمارەیەك لە بیردۆزی لاوەکی دەبێ لەنێوان کلدانەکاندا سەری هەڵدابێت، هێشتا ئێمە تێبینی ئەوە دەکەین کە کەنیسەی کلدان هەبووە، هاوشێوەیە، لە میانەی بەشی گەورەی بڵاوبوونەوەیدا لە ساڵی 410ز تا نزیکەی سەدەی حەڤدەیەم، راستیەك کە دەدوێت وەك ئەوەی بەڵگەیەك نییە بۆ یەکێتی بیر و فێرکردن، لە بەراوردا لەگەڵ بارودۆخی دامودەزگا بێبایەخەکانی مەسیحیەکانی سووریا و یونان.

لە ساڵانی سەرەتای ئیسلامدا لێبوردەیی زیاتر هەبوو بەرامبەر بە مەسیحیەت، وەك لەوە پێش و دواتریش و هەروەها بۆ جولەکەکانیش. تەنانەت زەردەشتیەکانیش بەو جۆرە بەچاوێکی تایبەتی تێیاندەڕوانین، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە محەمەد رێزێکی هەبووە بەرامبەر بە پێغەمبەرەکانیان. مەسیحیەکان و جولەکەکان لەگەڵ ئەوەی ئەهلی کیتاب بوون و باوەڕدار بوون، بۆیە شایانی مامەڵەی بەزەییانە بوون زیاتر لەوانەی بێ باوەڕ و بتپەرست بوون. لەسەرو ئەوەشەوە، محەمەد بۆ بەشێکی زۆری قورئان قەرزداری مەسیحیەکان و جولەکەکان بووە و قەشەیەکی نیستۆریان بەناوی (سەرگیوس)، دەڵێت، لە کۆکردنەوەی هەندێ بەشیدا یارمەتی داوە. بۆ وەڵامدانەوەی ئەو تۆمەتەی کە گوایە بێگانە یارمەتی داوە لەلایەن عەرەبەکانەوە، لە بەشێکی سورەتی نەحل" ئاشکراکراوە" ئیمەش هەروەها دەزانین کە دەڵێن، "بەڕاستی کەسێکی دیاریکراو فێریدەکرد، کە قورئان چۆن دابنێت." زمانی ئەو کەسە لە زمانی بێگانە دەچوو، بەڵام قورئان بە عەرەبیەکی پاك نووسراوەتەوە."

بۆیە لەکاتێکدا محەمەد کە گەورەترین نەفرەتی بۆ هەموو هێماکانی مەسیحیەت دەرخست، لەسەرو هەموویانەوە لەعنەتی لەخاچ یان خاچی عیسا کرد، هێشتا زۆری لێنەکردبوون کە لە ئایینەکەی خۆیان پاشگەزببنەوە، ئیدی کۆدێکی تایبەتی بۆ چارەسەرکردنیان سازکرد، لەوانەش لە خزمەتی سەربازی چاویان لێپۆشرا و لەبری ئەوە باجی سەرانە، یان "جەزییە"یان بەسەردا سەپێنرا.[39]

---

[39]- بوونی چەردەیەکی زۆر لە هەست کە لەم دواییەدا بووە هۆی هەڵسانەوەی ئەو مەسەلەیە لەناو دەستەڵاتی تورکیدا، لەمیانەی خواستی ئەنجومەنی تورکی نوێوە بە لابردنی (جزیە) و مەسیحی و جولەکە خزمەتی سەربازی بکەن.

## محەمەد و كلدانەكان

لە حاڵەتی ئەوەی کە شار و ئەو وڵاتانەی دەکەونە ژێر دەستەڵاتی سوپای ئیسلامەوە، سەرلەشکرەکانی محەمەد لەهەندێ حاڵەتدا دەچنە ناو پەیمانی پاراستنەوە، رێدەکەون بە پاراستنیان هەتاکو ئەوان ئەو باجە دەدەن و زەمینەیەك هەیە بۆ باوەڕکردن کە ئەو پەیمانەی نێوان محەمەد و کەنیسەی کلدانی، کە وێنەیەکی دەقاودەقی لە 1630زدا[40] بڵاوکراوەتەوە- بەڵام بڕواپێکراوە یان نا، کە ئەوە جێی گومانە، بە هەر شێوەیەك بێت هەیە. بەپێی مەرجەکانی ئەو پەیمانە نیستۆریەکان پارێزراون و لە زۆر باجی بێزارکەر بەدەرکراون.

ئێستا کلدانیەکان چوونەتە ناو قۆناغی دووەمی گەشەکردنەوە، کە دووسەد ساڵ بەردەوام بووە و لەو میانەیەدا لەژێر دەسەڵاتی خەلیفەکانی سەرەتادا ئەوان گەشتنە پۆستە سەرەکیەکان لە هەموو مەسەلە فەلسەفیەکان و فێرکردن و تەنانەت کاروباری دەوڵەتیش، کە زۆر جار دەبووە هۆی سکاڵادەربڕین لەلایەن بێ بەهرەکانەوە و لە ئەنجامدا لەلایەن موسڵمانانی عەرەبەوە کە لەوان کەم بەخت تر بوون. لە سەدەی دووەمی ئەو قۆناغەدا لەکاتی شەڕی زابدا، کاتێ کە بنەماڵەیەکی فارسی فرمانڕەوا بوون، هەروەها سەدەی زێڕین بوو بۆ خەلافەت و بەهەمان شێوە بۆ کەنیسەی کلدانیش لە دواتردا.

لەژێر فرمانی پڕ لەبەزەیی خەلیفەکانی سەرەتای عەباسی (لەنێوان ئەوانەی کە ناودار بوون هارونە رەشید و مەئمون) سەرەك قەشە بۆ بەغدا گواسترایەوە و سەرەك قەشەنشینێکی نوێ لە کوفەی ناوجەرگەی ناوەندی ئیسلامیدا بنیاتنرا. لەژێر دەسەڵاتی خەلیفە مەئمون و هارونە رەشید بەتایبەتی، کلدانەکان خۆیان لە مەزنترین بەرژەوەندیدا بینیەوە. کۆلیجەکانیان پارێزگاری لێدەکرا و لەگەڵ زۆر زمان و زانستدا ئاشناییان پەیداکرد، کتێبی ئایینی و فەلسەفی خۆیانیان لە کتێبەکانی فارسی و یونانی و لە زمانەکانی کلدانیەوە وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی. ئیسلام لەو سەردەمانەدا قەرزداری کلدانەکانە بەتایبەتی بۆ زۆر لە کارەکانی نووسەرە یونانیەکان، بەتایبەتی ئەرستۆ، کە بیروبۆچوونە فەلسەفیەکانی هەمیشە لەناو عەرەبەکاندا بڵاوبووە.

بێگومان، هەردوو پەیامەکانی عەرەب و کەنیسەی کلدانی گەیشتنە بەرزترین خاڵیان لە قۆناغی 809-813ز، لە خەلافەتی مەئموندا و لێرەدا ئێمە تێبینی ئەوە دەکەین کە کەنیسە تا چی ئاستێکە لەو رۆژەدا.

---

[40] (Testimentum Maliometi (Vaxxs : Sionita, 1630.

## چەوسانەوەی کلدانەکان

هەروەها لەوێدا، یان هەر خێرا دوای ئەوە، 25 سەرەك قەشەیان رەوانەی هەموو ناوچەی ئاسیا کرد،[41] وەك مژدەدەران لە سەدەی پێنجەمدا کە تەمەڵ و بێکارە نەبوون وەك ئەوەی دواتر دەیبینین.

بەهەرحاڵ، ئەوە درەوشاوەترین قۆناغی ئیسلام و مەسیحیەت بوو، بەداخەوە تاریك بوو بە هاتنی یەکێ لە درِندەکانی مێژوو بۆسەر تەختی خەلافەت، دوای خەلیفە مەئمون، ئەلموعتەسەم هات، ئەویش حاکمێکی ناودار بوو، کە پایتەختی گواستەوە بۆ سامەرا چونکە ئاستەکەی لە دیجلە بەرزتر بوو لەچاو بەغدا، ئینجا دوای ئەو واسیق هات و لە ساڵی 847ز متەوەکل هات، کە بارەگاکەی خۆی گەیاندە ترۆپك بە هەمان ئەندازەی پێشینانی خۆی چەندیان بڵندکردبۆوە.

یەکێ لە کارەکانی لە بەرژەوەندی سەربازە بێبەزەیی و زۆر درِندەکانی تورك بوو، کە لە خزمەتگوزاری ئەودا بوون، سوکایەتیان بە فارس و عەرەبەکان دەکرد، کە لەژێر فرمانی براکەی و پێش ئەویشدابوون. بەگوێرەی ئەوەوە شیاو نەبوو باوەرِداران ریسوا بکات، ئەو زیاد لەپێویست بەردەوام بوو بۆ چوونە ناو نەریتی دەمارگیریی خۆیەوە بۆ داپۆشینی بەدمەستی و رەفتاری ناشیاوی هەرزەییەوە لە بێ رێزیکردن بە شەهیدانی شیعە و تێکدانی مەزارەکانیان، هەروەها چوو گاڵتەی بە مەزارەکەی عەلی کرد، کە لەلای شیعە و سونەش وەك یەك پیرۆزە و دەستیکرد بە کوشتنی لە ژمارە نەهاتوی ئەوانەی هەوادار و پەیرِەوانی ئەو شەهیدانە بوون. هەموو سوکایەتی و ئابرووبردنێکی ئەو لە توانایدا بوو بەسەر جولەکە و مەسیحیدا کردی، کە بووە هۆی ئەوەی جلوبەرگێکی رەنگ دیاری ناشیرینی پێیان پۆشی، " جبەیەکی رەنگاورەنگ و کڵاوێك و پشتێنێکی بێنرخ، هەروەها تەنیان بۆیان هەبوو سواری هێستر و گوێدرێژ بن لەگەڵ زینی لە دارو تەختە

---

[41]- سەرەك قەشەنشینەکان: 1- ئیلام (عەرەبستانی باشووری رۆژئاوای وڵاتی فارس)، 2- نسێبین (باکوری رۆژهەڵاتی میسۆپۆتامیا)، 3- بەسرە (دوورگەی فارسی)، 4- ئاشوریا (دەروازەی نێوان روباری زاب)، 5- بەیت قورما لە ئاشورر، 6- حەلوان، لە رۆژئاوای ئێران، (ئێستا پێیدەوترێ زەهاو، ناوچەیەکی کوردیە) 7- وڵاتی فارس، 8- میرڤ ، 9- هێرات، 10- عەرەبیە، 11- چین، 12- هندستان، 13- ئەرمینیا، 14- سوریا، 15- ئازەربیجان (باکوری رۆژئاوای ئێران)، 16- رای و تەبەرستان (باکوری ئێران)، 17- دایلام، (رۆخی باشووریی دەریای قەزوێن)، 18- سەمەرقەند، (لە پشتی دەریاوە)، 19- کاشگەر و تورکستان، (وڵاتی تەتەری) 20- بەلخ و تەخارستان، 21- سیستان (رۆژهەڵاتی ئێران)، 22- خان بەلیغ (پێکین)، 23-تانکوت، 24- جاسیمکارا و نوشیتا (لە کتێبی لایارد- Layard ، نەینەوا و پاشماوەکانی، بەرگی یەکەم، لاپەرەی 257) لە سەرەك قەشەکانی 12 مەسیحیەکانی سێنت یوحەننا لە مالابار دێنە خوارەوە، کە نەوەی ئێران لەگەڵ سەرەك قەشەی هورمز لە دوورگەی فارسی، دەڵێن لەلایەن یەکسیوفیلۆسەوە لە دەوروبەری 350 دوای زایین بنیاتنراوە.

دروستکراو بەشێوەیەکی سەیر و سەمەرە و دەبێ شوێنیان هەبێ لەسەرو خانوەکانیانەوە بۆ پەیکەری شەیتان."[42]

کۆلیجی جوندی شاپور کە ئەنەوشروان بنیاتی ناوە، هەموو مافێکی کە هەیبوو قەدەغەیکرد، بەرێوەبەرەکەی، (بۆخت ییشو)ی دورخستەوە بۆ بەحرەین. کەنیسەی مەسیحیەکانی وێرانکرد، یان کردنی بە مزگەوت، بلاوکردنەوەی هەموو دەستورێکی تایبەت بە ئایینەوەی قەدەغەکرد کە بە تابلۆیەکەوە دانرابێ کاتێ کە لە ژیاندان، یان کە مردوە بە کێلی گۆرەکانەوە بێت.

لە تۆمارکراوێکی دووروودرێژی بابەتی فەلسەفە و ئەدەب و نووسینی تریش لە سەردەمی بەر لە ئیسلامەوە، شتێکی سەیر نییە کە نێوان ساڵەکانی 847 و 861 تا رادەیەك بەتاڵە، کاتێ کە متەوەکیل لە کاتی مەستیدا لەلایەن تورکەکانەوە کوژرا، کە بەرژەوەندی ئەوانی خستبووە سەرو هەمووانی ترەوە.

هەر هەموو ئەو چەوسانەوانەی مەسیحیەکان ئێستا دووچاری بوون، بەس نییە بۆ کوژانەوەی کاریگەرییان، ئەوان کەمێ لە ئاستی خۆیان لە سەدەی یانزەیەمدا لەژێر دەسەڵاتی پاشاکانی سەلجوقیدا بەدەستهێنایەوە، تا کاتی کارەساتە سامناکەکەی مەغۆل بە رابەری جەنگیزخان و هۆلاکۆخان، ئەوانە هێشتا هەندێ شوێنی گرنگیان داگیرکردووە و تا ئێستا کەنیسەی هەندێ شوێنیان لەژێر دەستایە.

زۆر لە دوور سنووری ئیسلامەوە ئەوان سەرقاڵ بوون، سەرقاڵی پلانێك بوون، کە سەرتاسەری ئیسلام وێرانبکەن و پیرۆزی بۆ مەسیحیەت لە هەموو لایەکی ئاسیادا لە پەکینەوە بۆ سووریا بگێرنەوە. ئەو پیلانە کەمتر نەبوو لە داگیرکردنی ئاسیا لەلایەن پاشاکانی تەتەری قەرەقەومەوە، ئەوانەی بەخێرایی گەشەیاندەکرد و تینوێتی خاك زیاتر کۆششی پێدەکردن. مەسیحیەکانیش لە هەمان کاتدا، هەوڵیاندەدا ئایینی عیسای مەسیح بکەنە ئایینێکی نەتەوەیی بەرلەوەی رۆژی وڵاتگیری هەڵبێت و بەدڵنیاییەوە هەنگاوێکی مەزنیان بەرەو پێشەوە نا لەناو هەمەچەشنەی خەڵکانی مەغۆل کاتێ کە لە رۆژئاوادا گردبووبوونەوە.

ئەوە یاددەکرێتەوە کە لە رۆژانی زوودا مژدەدەران نێراون بۆ چین و تورکستان و ئەوانە کاریگەریەکی گەورەیان بەسەر خانەکانی وڵاتی تەتەردا بەدەستهێنا، هەندێکیان وتویانە گۆراوە بە مەسیحی.

---

[42] Muir's Caliphate, pp. 521-2.

## کلدانەکان لە مەنگۆلیا

یوحەننای قەشەی ناودار، کە ناوی لەدوای ژمارەیەك ئەفسانەی هیچ و پوچەوە دەهێنرێ، یەکێك بوو لەو فرمانڕەوایانە.[43]

هەڵمەتی هەڵبژاردن لە مێرڤەوە دەستیپێکرد، سەرەك قەشەنشینی کلدان گەورە پیاوی ئایینی تەتەر، تا رادەیەك سەرکەوتوبوو لە بەدەستهێنانی ژمارەیەکی زۆر لە ئەندامانی ژن لە خانەوادەی فرمانڕەوایان و تیرەیەکی دەشتەکی گرنگ بەناوی کەرایت، ئەوانەی کە پایتەختەکەیان لە قەرەکۆرم لە چیاکانی ئەلتای بوو. هێشتا، داگیرکەرانی راستەقینەی رۆژئاوا هیچیان بە دەستنەهێناوە، بە راستی بێباوەڕ بوون، سیاسەتی سەربەستیی یەکسانیان بۆ هەموو ئایینەکان دانا، بەڵام وابەستەی هیچ نەبوون. لەکاتێکدا ژمارەیەك لە دایکانی مەسیحی و تەنانەت ئەوانەشی لە کۆرپەییدا رۆح پاکردنەوەیان بۆ کراوە و ناوی مەسیحییان لێنراوە، کەچی کە دەستەڵات دەگرنە دەست هیچ نیشانەیەك لە بنەڕەتیان دیارنیە، ناوەکانی منداڵیان دەگۆڕن بە ناوێکی تەتەری و ئایینی سەردەمی منداڵیان لەیاددەکەن.

لە چینیش مژدەدەرەکانیان هەمان سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، بە گەواهی ئەو تەختەبەردەی کە لە (سی- گان- فو) دۆزراوەتەوە، هەروەها ئەو بەرژەوەندیە راڤەدەکات، کە رێبازەکەیان لە پاشاکان و هەموو وڵاتەکەدا کۆیکردۆتەوە، هەروەها ناوی قەشەکانی مەسیحی چین و کاربەدەستە پایەدارەکانی ئەو ئایینە بەیاندەکات.

لەم تەختەبەردە سەرنجڕاکێشەرەوە ئەوە بۆ یەکەم جار بەدەستهێنرا، کە تا ساڵی 781ز مێژووی هەڵکۆڵینەکە، کلدانەکان وەك چین زۆر چوونە پێشەوە و ئاشکراکردنی بوونی کەنیسەیەکی دانپێنانراو سەرنجی زۆری پسپۆڕانی راکێشا، بۆ ماوەیەك نامتمانەییان بەسەر مۆنومێنتەکەدا دابڕی.[44]

بەرەو روخانی سیستمی خەلافەت، کلدانەکان کەنیسەیان لە ئێران بینی لەناوچووە و لە میسۆپۆتامیادا سنووردار کراوە و دەتوانیەوە بەر لەوەی لایەنی ئیسلامی وردە وردە هەڵیمژێت،

---

[43]- نامەیەکی گرنگی زۆر سەرنجڕاکێشەر لەبارەی دەوڵەت و مەزنێتی ئەو خانەوە لە کتێبەکەی لایارد- Layard و نەینەوا و پاشاکانی دانراوە، بەرگی یەکەم، لاپەڕەی 250-4

[44]- بگەڕێرەوە بۆ لایارد- Layard ، نەینەوا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە، 245، بۆ گەڕانێکی تەواو بەسەر ئەو مۆنومێنتەدا و بەشێك لە وەرگێڕانەکە. لە سەدەی بیستەمدا زیاتر شتی نوێ لەبارەی ئەو هەڵکۆڵینەوە دڵنیاکرایەوە، کە بۆ یەکەم جار لە 1625زدا بینراوە.

ئیدی چاوی هیوا بەلای ئەو دەوڵەتی مەغۆلەدا وەرچەرخا، خۆزگە دەخوازن کە چەکێکی تێدا بدۆزنەوە بۆ وەدەرنانی ئیسلام.

کە ئەوە کردەوەیەکە دژی ئیسلام، مامەڵەیەکی تارادەیەك کوشندەیە، بەباشی ئەوە دەزانرێت، بەڵام هەروەها گەشبینی مەسیحیەکان ئەوەی تێبینی نەکردووە کە ئەوە لەدەستی دووان لە خانەکانی مەغۆلدایە، یەکێك بە مەسیحی ناونراوە، کە دەبێ کەنیسەی نیستۆریەکان لەژێر چەوسانەوە و رەشەکوژیدا بناڵێنن و پاشماوەکەشی ناچارن خۆیان رزگارکەن بەهۆی هەڵهاتن بۆ گەیشتن بە چیاکانی کوردەکان.

لەبەرئەوەی هەرگیز ئەوە پەرۆشی مەسیحیەت نەبوو، کە مەغۆلەکانی لەسەر هاندان، لەگەڵ ئەوەشی راپۆرتەکان لەلایەن قەشەکانی کلدانەوە دەڵێت: سامانی رۆژئاوا لەوانەیە بەختیاریی تەواوی چلێسی خانەکانی مەغۆل بوویێت، تەواو لە قۆناغی پێش داگیرکردنە مەزنەکە، بە کردنەوەی سەدەی سیانزەیەم، هەوڵی مژدەدەران دووچەندانە بووە و کاسۆلیکە رۆمانەکان بۆ یەکەم جار لە گۆرەپانەکەدا دەرکەوتن، ژمارەیەك لە قەشەی ئازا کەوتنە گەشتکردنێکی بوێرانەی پڕ مەترسی لە ئەوروپاوە بۆ رۆژهەڵاتی نادیار و نەناسراو. لێبوردەیەکەی جەنگیزخان، یەکەم ئیمپراتۆری مەغۆل، بەبڕێکی مەزن بەرپرسە لە پێناوی خرۆشی ئەم نوێکردنەوەیە، کە تا بڕێکی زۆر گەشبینە بەوەی تا بیرمانبێت کە ئایینی ئیسلام نابێتە ئاینێکی نوێ.

بەڵام داگیرکردنە دڕندانەکەی هۆلاکۆ خان، کە گەورە و بچووکی پێکەوە راماڵی، باوەڕدار و بێباوەڕ، بەر لەوە، هەردوو مەسیحی و موسڵمانی بۆ ماوەیەك تێکشکاند، وەك یەك لە دڵی هەردووکیانیدا، بەغدا بوو بە وێرانەیەك لەناو مەترسیدارترین و دڕندەترین دیمەنێك کە هەرگیز نمونەی نەبووە.

هۆلاکۆ، خۆی بتپەرست بووە، باوەڕی بە هیچ هێزێك نەبووە، نە لە توانای مرۆڤ بەدەر و نە مرۆڤ، بەڵام خۆی دوای ئەو خەلیفانە کەوتووە کە باوەڕیان، یەکەم بە بوزی- بودیسم هەبووە و دواتر بە ئیسلام، ناودارترینیان غازان خان (1295 زایینی) کە بە هەزاران مەسیحی لە هەموو ناوچەکانی

---

[45] - لەبارەی ئەوانەی کە بتوانی بیخوێنیتەوە لە داگیرکردنی هۆلاکۆ خان، ئێمە هەزاران وردەکاری سروشتی بێزاریە دڕندانە نامرۆڤانەکەی مەغۆل و بلیمەتی فرومایە لە ستەم و زۆری ئەوان پیشان دەدات. ئەوانە لە کتێبەکانی پلانوکاریینیدا دیاریکراوە، Guillaume de Ruysbroeck, d'Ohsson, هیتد.

ولاتی تەتەر و ئێران و میسۆپۆتامیادا لەناوبردووە. ئێستا ئیسلام لەو وێرانکاریەی تەتەرەکان کەڵکی وەرگرتووە و دەستیکرد بە بوژانەوە وەك ئاینێك، لەگەڵ ئەوەی پلەی هەرە باڵای ڕووناکبیری



لەسەر سنووری ولاتی ئێران، باشووری کوردستان

ڕۆژانی پێشویان ئاشکرایە کە لەژێر فرمانی بەربەرەکاندا ناکرێ بۆی بگەڕێی. بەلام مەسیحیەت، چەوسێنرایەوە، تڕۆکران و وەك یەك لەلایەن مەغۆل و عەرەبەوە بێزران، بۆ دواوە گەڕایەوە و پەیڕەوانی بوون بە نادیار و سادە. لەگەڵ ئەوەی کە کەنیسە مەزنەکەی کلدانی لەوە زیاتر لە ئارادا نیە وەك ئەوەی لە ڕابردودا هەبوو، ئەندامەکانی لە چین و هیند لێکرانەوە و دەستیکرد بە جیابوونەوە لە کەنیسەی ناوەندی و بارەگاکەی خاپورکرا و قەشەکانی پەرش و بلاوبوونەوە، بەلام هێشتا ژمارەیەکی زۆر لە مەسیحیەکان لە پاوانی ئیمپراتۆرەکانی مەغۆلدا دەژین، تا دووەم قۆناغی داگیرکردن، کاتێ تەیموری لەنگ لەسەر ڕێی دڕندەیی خۆی دەڕۆشت وەك لەوەبەر بتپەرستەکانی داگیرکرد. لەنێوان ژمارەیەك لە کردەوە دڕندانەکانی کە کردوویەتی قەلاچۆکردنی مەسیحیەکان بوو. لە سەرەتای ساڵی 1380 زایینەوە، ئەو ئاماژەی بە سووربوونی لەسەر چەوسانەوەی ئەو خەلکانە کرد، پیلانەکەشی بە ئاشکرا بۆ قەلاچۆکردنی هەموو ڕەگەز و ئاینێکە. وێرانکردنی ئەو کەنیسانەی ماون بەس نییە، هەوڵیداوە لە هەموو لایەکی ئێران، کلدان و بابلدا ئەوە بەدیبێنێت، تا لە ولاتی باوبابپیریان وەدەریانبنێت، پاشماوەیەکی تۆقیوی لە پەناگاکاندا دۆزییەوە لەنێوان دۆڵە دورەکان و چیاکانی کوردەکاندا، کە تەنانەت تەیوری لەنگیش ناتوانێت پەلاماریانبدات. پەتریارك نشینەکە کە گوازراوەتەوە بۆ موسڵ، ئێستا ڕەوانەی persistent کراوە، کە گوندێکە لەناو جەرگەی کوردستاندا، دوور لە پەلاماری هەرکەسێك،' بەلام کوردەکان، کە

لەسەر ئەو مەرجەی بە دۆستانە دەژین، تەنانەت تورکەکان و قەشەکانیش بژارەیان داوە بە ئەمیرە کۆنەکانی کە فرمارِەوایی ئەوانیان کردووە لەویَ و لە سالّی 1839دا هانیداون دژی کلدانەکان هەلّگەرِێنەوە.

کاسۆلیکە رۆمانەکان لەمیانەی مژدەدەرانەوە، ئەو زانیاریەیان پەیداکرد کە کەنیسەیەکی کلدانی گەورە هەیە و ئێستا بۆ دزێوکردنی هەمیشەیە ئەوەی وت- لە راستیدا لەگەلّ تورکەکان یەکدەگرن بۆ چەوسانەوەی کلدانەکانی کە هێشتا لە داوێنی شاخەکان و دەشتاییەکانی نزیك موسلّدا ماونەتەوە.

"لەمیانەی زنجیرەیەك لە کراوەترین قۆلّبرِیدا، نێراوە کاسۆلیکە رۆمانیەکان ژمارەیەك لە بەلّگەنامەکانیان دەستکەوت کە ناونیشانی پاتریکەکانی کلدان پێکدەهێنێت و داخوازی ناساندنی فەرمی و پارێزگاریکردنیان وەك سەرۆکی کەنیسەی کلدان لەلایەن دەسەلاّتی تورکەوە پێشکەشدەکات. سیستمێکی چەوسانەوە و توندوتیژی کە دەگمەن متمانەی پێدەکریَ، کلدانەکان ناچاربکات واز لە بروای خۆیان بهێنن و لەگەلّ کەنیسەی رۆم یەکبگرن."[46]

بەهەرحالّ، ئەم ئۆپەراسیۆنە ناپەسەندانە هەندیَ کات لە پەرەپێدان و لەهەمان کاتدا لاوازبوون لە رەوتی کەنیسەدا دەبینین- ئێستا لە دوژمنایەتی لەگەلّ موسلّمان و مەسیحی وەکو یەك، دۆزینەوەی تەنیا پەناگایەك لە دوژمنانی خۆی لەنێوان کوردە شاخاویەکاندا، کە ناوە تۆقێنەرەکەی تورکی لە چیاکانەوە بەدوورگرتووە.

پاتریارکنشین لە سەدەی پانزەیەمدا لە قوش بوو، کە لە موسلّەوە دوور نییە، بەلاّم چەوسانەوە زۆر بە هێواشی سەریهەلّدەدات و زۆریش ناچارکراون بچنە ریزەکانی کاسۆلیکەوە، پاتریارکی ئەو کاتە مار ئەلیاس لەلایەن کلدانەکانی ئەرسەدۆکسی ئەوپەرِی رۆژهەلاّتەوە لەیادکراوە و پاتریارك مار شەمعون لە جولامێرك هەلّبژێرا، ئەوەی وەچەکانی هەمیشە ناو شەمعونیان دەبێت و هێشتا سەرۆکی کەنیسەی کلدانی کۆنە کە ئێستا خەریکە لەناودەچێت.

لە سەدەی شانزەیەمدا کاسۆلیکە رۆمانەکان ویستیان بە هۆکارێکی تا رادەیەك نەرمونیان کلدانەکان بە ناوی کاسۆلیك رابهێنن، پاتریارکێك هەلّبژێرا و بەوەش هێلّی پاتریارکنشین بەناوی یوسفەوە دامەزرێنرا، کە لە دیاربەکر جێگیرکرا و کردیانە سەر کلدانە کاسۆلیکەکان بەبیَ ئەوەی راوێژیان پێبکەن کە خواستیان چیە.

---

[46]- لایارد- Layard ، نەینەوا و پاشماوەکانی، موجلەدی 1 ، لاپەرە 259.

## کۆمەڵکوژیی کلدانەکان

لە کاتێکدا کە ئەم بەشە کلدانە کاسۆلیکەی بە هۆی هەوڵ و کۆششی مژدەدەرانەوە بەردەوامە لە ناونووسکردنی سەربازانی زیاتر لە کلدانەکانی دەشتەکان، ئەوا کۆمەڵی ئەرتەدۆکس لە شاخەکاندا توانا و بڕوابەخۆبوون بەدەستدەهێنێت. لەناو کوردە توند و دڕەکاندا، ئەوانیش هەروەها بوون بە جەنگاوەر. پۆشینی بەرگ و وەرگرتنی دابونەریتی کوردی، تا رادەیەك مەحاڵە بیانکات بەوەی پێیانبووترێت ئەوانە بە رەسەن شاخاوین، لەگەڵ ئەوەشی لەسەر باشترین مەرجەکان دەژین. نەدەتوانرا بگەنە ئەوێ وەك گوندەکان و قەڵاکانیان، تورکەکان ناچاربوون بەسەربەخۆیی جێیانبهێڵن، لەگەڵ ئەوەشی کە سوڵتان خاوەنی ئەو خاکەشە کە ئەوانی تێدا نیشتەجێن. تا ساڵی 1839 کاربەدەستانی حوکومەتی تورکی گیانی دوژمنایەتیان دژی نوراللە بەگ، هان نەداوە، کە کوردێکی هەکاریە، ئەوەی کە خوێنی دوژمنایەتی لەگەڵ هەندێ لە کلدانەکاندا لە بەینیاندا هەبوو، هەروەها بەدرخان بەگ، باشترین پیاوی مەزنە کە بەیادی بهێنینەوە.

راستیەکی زۆر گرنگ هەیە پشتگیری لە سووربوونی کوردەکان دەکات هانیان بدات بۆ راپەڕین، بۆ چارەسەری بەدرخان بەگە، کاتێ دوای پێداویستیەکی بەردەوام و فشارێکی زۆر لە ئەوروپاوە، سوڵتانیش ناچاربوو بەندیبکات. ئەفسەرێکی بۆ ئەو ئەرکە نارد، عوسمان پاشایەك ئەو مەرجە سوکانەی دانا لەگەڵ سەرۆکە کوردەکە، وەك ئەوەی بە کردەوە دڵنیایکردەوە کە هیچ هەڵسوکەوتێك بەبێ رەزامەندی تورکەکان ناکات. هیچ پارچەیەکی خاکی کوردەکان داگیرنەکرا، جگە لە هێرشبردن دژی بەدرخان بەگ و دوای ئەوەش هێزەکە کشایەوە. ئارای کلدانەکانی هاوچەرخ، لە هەندێ نامەی کۆندا هاتووە کە لە موسڵ بینیومە، پشتیوانی لەو بۆچوونانە و لە بارودۆخی کوردەکان دەکاتەوە، لەگەڵ ئەوەی هەستی هەمیشە زیندویان وابوو کە کلدانەکان سامانێکە، هەروەها هەمیشە لە پەیوەندیەکی باشدا بوون تا رادەیەك پێکەوە، لە راستیدا وەك بینیمان بۆ ماوەی زیاد لە 400 ساڵ ژیانێکی هاوبەشیان هەبووە و شان بە شانی یەك بەبێ هیچ کێشەیەك پێکەوە ژیاون. مار شەمعون لەو قۆناغی قەڵاچۆکردنەدا هەڵهات بۆ ورمێ، کە ژمارەیەك لە کلدانیەکان لەوێ نیشتەجێ بوون، بەڵام دواتر گەڕایەوە بۆ جۆلامێرگ و لەلایەن حوکومەتی تورکیەوە خانەنشینکرا و لە کۆتاییدا وازی لە هەموو خواستی سەربەخۆیی هێنا کە میللەتەکەی لەوانەیە بیپارێزێت. خەلیفەکان زیاتر ئاستەکانیان لاوازبوو بەوەی رێگەیاندا بە کاریگەریی سۆزی پیلانگێران و سەرقاڵ بوون بەم پرۆسەی باوەڕنەکردنە، کە هەوڵیاندا مژدەدەرە ئەمریکیەکان و پرۆستانتەکانی بەشدارکەن، بەوەش زووربەی

دەستەڵاتی خۆیان بەسەر کەنیسەوە لە دەستدا، بوارەکەیان بە کراوەیی جێهێشت بۆ دەستدرێژیی چالاکانەی کاسۆلیکەکان.

لە کانونی دووەمی ساڵی 1909 رەشەکوژییەکی نوێ لە گەڕەکی سعیرت، لە نزیکی بتلیس پێشهات، ناوچەیەك کە کلدانەکان تێیدا بە زۆر شێوە دەچەوسانەوە، بە شێوەی فیزیکی و بەشێوەی دەروونی، وەك ئەوەی تۆزێ زیاتریان لە دڕندەیان بۆ جێبهێڵن.

قەشەکانیان لە هەندێ حاڵەتدا بە بڕێکی تەواو داب و دەستووری خزمەتی ئاساییان پێ نەدەوتن و خەڵکی زۆر جار سکاڵایان لە دەستدەکردن بەوەی کە ئەوان نازانن چی بپەرستن و نە واتای ناوەرۆکی وشەی (مەسیحی)ش دەزانن. ئەو بارودۆخەی ئێستا ماوەیەکی دوورودرێژە روویداوە. بۆ ساڵانێکی زۆر، لەژێر سێبەری سیستمی فرمانڕەوایی بۆگەنی تورکیدا، رێ بە کوردەکان درابوو هەرچی بیانەوێ بیکەن بە موڵك و ماڵی جوتیارانی کلدان، هیچ هەنگاوێك دژیان لەلایەن تورکەکانەوە نەگیرایە بەر،کە ئەوە لە هەمان کاتدا رازیبوون و ترسیش بوو. راستیەك هەیە کە شایانی سەرنجە، ئەویش ئەوەیە کە کلدانەکان لەژێر دەستەڵاتی شیعەی فارسدا بووژانەوە و ئەو خەڵکە هەناسەساردانەی بە "گاڤارنیا" بانگیان دەکردن، کە بە رووتوقوتی و بە برسێتی هاتن و بەرەو داوێنی شاخەکان لە خاکی تورکیادا شۆڕبوونەوە، تا رادەیەك جیاواز لەو کلدانە رۆشنبیر و رێکوپێکانەی ئورمیە و سەڵماس لە ئێران. ئیدی ژمارەی کلدانە کاسۆلیکەکانی رۆمان لە خاکی تورکیادا لە دووبەرەکیەکەوە ساڵی 1550 لە زیادبووندا بوون، هەر هەموو ئەوانەی لە دەوروبەری موسڵ و دیاربەکرن لەم باوەڕدارانەن. لەگەڵ ئەوەشدا، رۆمانە کاسۆلیکەکان لە 1869دا دووچاری راچڵەکینێك بوون، کاتێ دەستوور دەرچوو بەوەی کە پاپا دەستی لێنادرێت. هەروەها بەشێك کە لەلایەن (تۆماس رۆنکوس)ەوە رابەریدەکرێن، مەتران مالوس و کاس یاقوب نەعمان، دوای ئەوەش سەرۆکی قەشەکانی بەغدا، کە پێیان دەوترا کلدانە نوێکان و لە کاسۆلیکی رۆمان دابڕاون.

بەندەکانی بڕوانامەکە کە بەرهەڵستی کراوە:-

1. سەرۆکی قەشەکان بەبێ بڕیاری پاپا دانانرێت.
2. ئەو سێ پاڵێوراوانە بۆ سەرۆکی قەشەکان دەبێ لە رۆما بکرێت، لەنێوانیاندا پاپا یەکێکیان هەڵدەبژێرێت و دووانیش رەتدەکاتەوە.
3. هەموو داهاتێکی کەنیسە دەبێ بنێرێت بۆ رۆما.

وادەردەکەوێت کە مەتران مالوس، ئەوەی لەلایەن پاتریارك یوسف ئۆدۆوە ناردیان بۆ ڕۆما، یەکەم جار بڕوانامەکەی پەسەندکرد، بەڵام ئەوە لەسەر دابەشکردنی کەنیسەی کاسۆلیکی ئەرمەنی بوو لە هەمان مەسەلەدا، پاتریارك یوسف ئۆدۆ و مەترانەکانی جیابوونەوە و ڕۆشتن بۆ ئەلقوش و لە گوندی (دار- ول- سەیدە) چوار مەترانیان دیاریکرد بەبێ ئەوەی پرسیار بە ڕۆما بکەن. یەکێ لەوێ، ئیلی، بەهەرحاڵ، هەڵهات بۆ دۆمنیکان لە موسڵ و کرا بە قەشەی تەواو، دواتریش بوو بە سەرۆکی قەشەکانی جەزیرەی ئیبن عومەر. لە 1875دا یوسف ئۆدۆ گەڕایەوە بۆ ناو کەنیسەی کاسۆلیکی ڕۆمانی و دەستەی کلدانە نوێکانی بە ڕابەریی مەتران مالوس جێهێشت. دوای کۆچی دوایی یوسف ئۆدۆ، کە هەر دوای هەڵهاتنی لە کلدانی نوێوە ڕوویدا، بۆ جێگاکەی ئیلی دیاریکرا و ڕاستەوخۆ هەموو تواناای خستەگەڕ بۆ کۆکردنەوەی کاسۆلیکەکان لە دەستەیەکی بچووکەوە بۆ کۆمەڵێکی یەك نامانج. یارمەتی ڕێکخستنی چوونی مالوسی دا بۆ مالابار و دوای گەڕانەوەی، خەڵکەکەی بینی دوودڵ بوون، لەگەڵیاندا هات بۆ موسڵ و چووەوە ناو کەنیسەی کاسۆلیکی ڕۆمانەوە. یەکێ لە سەنگەرە بنەچەییەکانی ئەم دەستەیە تەل کەیف (تلکێف) بوو، کە گوندێکی گەورەیە لە نزیك موسڵ، کە یەکێ بوو لە یەکەمەکانی کاسۆلیکی ڕۆمانی وەرگرتووە.[47] کلدانە کۆنەکان چەند هەوڵێکیاندا بۆ نوێکردنەوەی کەنیسە کۆنەکە و لە هەموو حاڵەتێکدا داوایان لە ئینگلتەرا کرد بۆ یارمەتیدانیان، کە هەمیشە خۆیان وا دادەنا کە زیاتر هاوسۆزن لەگەڵ کەنیسەی ئینگلیزیدا، وەك لەگەڵ هەر لایەکی تر.

لە ساڵی 1843، ئەو ساڵەی ڕەشەکوژیەکەی ئەم دواییە بە فرمانی بەدرخان بەگ، پەیوەندیکردن لەگەڵ سەرۆکی قەشەکاندا کرایەوە، بەڵام ئەنجامیکی لێوە بەدەستنەهات، پێش ئەوەش، دوو بەڕێز سەردانی ئورمێیان کرد، لەسەر داوای کۆمەڵەی برەوپێدانی زانستی مەسحیەت و کۆمەڵەی جۆگرافیای پاشایەتی، بۆ پێشکەشکردنی ڕاپۆرتێك لەبارەی بارودۆخی نیستۆریەکانەوە. وەڵامێکی ئەوتۆیان بۆ خواستەکانیان وەرنەگرتەوە، کلدانەکان بێ هیوابوون و (تایت)ی سەرۆکی قەشەکان لە 1868دا ئەوە بوو داخوازیەکانی دوایی پێگەیشت، دوای ئەوە پیاوێکی ئایینی نارد تا ڕاپۆرتێك لەوبارەیەوە بدات، لە ساڵی 1881دا یەکێ لە کاربەدەستانی ئایینی کەنیسەی نارد. چەند ساڵێك

---

[47]- ئەم گوندە، دانیشتوانەکەی لەوەدەچێ توانایەکی تایبەتیان هەبووبێت بۆ کارکردن لە ڕووباردا، پاپۆڕە هەڵمیەکەی میستەر (لینچ برۆس)یان پاکدەکردەوە لەسەر ڕووبارەکانی دیجلە و کارون، بۆ بەلەمەکانی تورکی و بۆ (نوسرەت) پاپۆڕی هەڵمی فارس لەسەر ڕووباری کارون. بەمەش واتە کلدانەکان جارێکی دی خۆیان بینیەوە زیاتر گەڕاونەتەوە بۆ وڵاتە کۆنەکەی خۆیان و ئێستا قەشەیەك لە ئەهواز هەیە، ئەوەندە دوورنیە لەو شوێنەی باو و باپیرانیان لە کۆلیجە مەزنەکەی جوندی شاپور دەیانخوێند.

## بیروباوەڕی کلدانی

دواتر سەرۆکی قەشەکانی کانتربیری گەشتێکی تایبەتی سازکرد و هەموو کارمەندەکان هاتن بۆ ورمییە و لەلایەن کلدانەکانەوە بەوپەڕی شادمانی و هیواوە پێشوازیکران، بۆ ئەو هاتنە، نەك بۆ ئەوەی بە زۆر و بە ناچارکردن بۆ چوونە سەر بیروباوەڕێکی دی، بەڵکو بۆ یارمەتیدانیان بۆ نوێکردنەوەی کەنیسە کۆنەکە لەمیانەی هێڵەکانی باوەڕ و دابونەریتی خۆیاندا. ئیدی قوتابخانە و کۆلیجەکان کرانەوە، هەروەها بۆ فێرکردنی خەڵکانی ئاسایی و قەشەکان و یاریدەدەری قەشەکان.

لەنێوان تۆمارەکانی قوربانی و بەرگەگرتنی ناڕەحەتی بەخۆشییەوە ناوی قەشە دەبلیو براون- Rev. W. Brown دەدرەوشێتەوە، ئەوەی لە 1887دا خاتو سەرۆکی قەشەکانی لەگەشتەکەیدا لە جولامێرگ بینی، کە لەم گوندەوە دەچوو بۆ ئەو گوند و باوەڕکردنی بەخۆی لە دەستدابوو بەوەی لەلایەن تورکەوە سەغڵەتیانکردبوو، کە لە نزمترین ئاستدا دەژیان و زۆربەی کات لە شاخەکاندا برسی و سەرمایان بوو. ئەو قەشەیە هەوڵێکی زۆری دا بۆ هێورکردنەوەی کوردەکان، کە دژایەتیەکی گەورەی کلدانەکانیان دەکرد و سەرکەوتووبوو لە بەرپانەبوونی ڕەشەکوژیدا.

لە هەمان کاتدا لە بانگکردنی خەڵکانی تر بۆ سەر ئاینی نوێ بێکارە نەبوون، ئەوە بوو ئەمریکیەکان لە ورمییە و خاکی تورکیادا لە ساڵی 1818دا دەرکەوتن، پەیامێکیان هەبوو لە ناوچەی ورمییە، لقێك لەوەش لە تەهران و کۆمەڵێك لە کلدان کەنیسە کۆنەکەیان جێهێشت بۆ وەدووکەوتنی بانگەوازەکەی ئەمریکیەکان و ناوی ئەمەریکانی بۆ خۆی بەدەستهێنا لەناو ڕێبازەکانی تردا.

دەستەی نێراوەکە لە ورمییە لەڕێی ئەو توانایەوە کە هەیبوو لەسەر پارێزگاری پەیوەندی باش لەگەڵ کوردەکاندا خۆی ناودارکرد، یەکێك لەوانەی لەگەڵ دوکتۆر کۆکرەین لە 1880دا زۆر دۆست بوو، کە کاتێ شێخ عوبەیدوللا ئێرانی داگیرکرد، ئەو ورمییەی جیاکردەوە و لەژێر نزای مژدەدەراندا پاراستی. ئەوەندەی نەخایاند دوای ئەمریکیەکان لازاریستە فرەنسیەکان پەیدابوون و لە نزیك سەڵماس خۆیان دامەزراند. قەشە ڕەسەنەکان، ئەبوونە کلوزێڵ و دارنێس، هەندێ تاقیکردنەوەی کێشە و سەغڵەتیان پێشهات و خەریکبوون دەربکرێن، لەبەرئەوە ڕوسەکان پاشایان هاندا "فرمان" یان بڕیارێکی پاشایەتی دەربکات و مەسیحیەکان ئاگاداربکاتەوە کە ئاینی خۆیان نەگۆڕن. لەگەڵ ئەوەشدا، مژدەدەرەکانیش سەرفراز بوون و ئیدی ئێستا قوتابخانە و قەشەکان لە ورمییە و خوسروڤا لەنزیك دیلمان هەیە. لەم شوێنەی دواتردا دانیشتوانەکان، لەکاتێکدا نزیکەی

هەمووی ددان بە کاسۆلیکی رۆماندا دەنێت، بۆ ئەو راستیەش هاواردەکات، لەبەرئەوەی دڵنیان لەوەی کە مژدەدەران ئەوەی پشتیان پێبەستبوو هەڵخەڵەتاندن و چاوبەست بوو، تەنیا لەلایەن ئەوانەی پێش خۆیان لە تورکیادا. ئەوە دڵنیایە، کە لە رێگای ترسەوە، بەکارکردن لەسەر ناکۆکی تایبەتیەوە و بە هۆکاری تر کە تەنانەت کەمتر شایستەیە، تەواو دەستیانگرت بەسەر دانیشتوانی شوێنەکەدا و باشترین خانو و ماڵ و باخچەیان بۆ خۆیان دابینکرد، تەنانەت خۆیان کردە دادوەر و بوون بە خاوەنداری سەرچاوەکانی ئاو، کە رێیان نەدەدا بەوەی پێنج هەزار کەس لە دانیشتوان کەڵکی لێوەربگرن پێش ئەوەی بەروبووم و کشتوکاڵەکانیانی خۆیان بەشێوەیەکی فراوان کەڵکی لێوەرنەگرن، کە لە ئەنجامدا بە کەوتنی ئەو گوندانەش نرخی شتەکانی ئەمان بەرزدەبۆوە. ئەوەبوو بە کورتی مێژووی کلدانەکان و ئاشووریەکان لەو کاتەوە کە نەتەوەکەیان لەتوپەت بووە. لە کاتی ئێستادا هەن، وەك لە ورمییەی ئێراندا دەبینرێن، لە ناوەندی کوردستان، لە موسڵ و لەم دواییەشدا لە وڵاتە نوێکەی ئەمریکادا.

پێویستە بە شێوەیەکی تایبەتی هێمابکرێت بۆ کۆلۆنی لە پایتەختە کۆنەکەی میرەکانی ئەردەڵانی کوردستان، سنە، لەژێر سێبەری فرمانڕەوایی ئەو خێزانە دێرینەی کە پەنایاندان و دواتریش تەنانەت پاراستیانن و هانیاندان بین بەوەی کە ئەمڕۆ هەن و بەتوانا و دەسترۆیشتوو، ئەگەرچی بە ژمارە زۆر نین، بەڵام بە باشترین شێوە و لە چاکترین حاڵەتدا لەگەڵ کوردەکان لە شارێکی ئێرانی لە ئەردەڵاندا دەژین. لەوێ قوتابخانەیەکی باشیان هەبوو، بەشی زۆری لەلایەن خانەدانە کوردەکانی سنەوە سەرپەرشتی دەکرا و ژمارەیەکی زۆری لاوانی کورد لەتەك لاوە مەسیحیەکاندا لەو قوتابخانەیەدا بەهرەمەند بوون.

هەروەها کۆلۆنیەکی زۆر لە تفلیس هەیە و ژمارەکی زۆریش ئێستا لە ئەمەریکا نیشتەجێ بوون، کە بەگشتی زۆر سەرکەوتوون.

بیروباوەڕی ئاینی نیستۆریەکان، کە بوونی دووانەیی عیسا، تێیدا تێبینی دەکرێت و ئێمە لەوانەیە درێژەی ئەوە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لە زانستی کەنیسەی کلدانیەکانی کۆنەوە بزانین. بیروباوەڕەکەش بەم شێوەیەی لای خوارەوەیە[48] :-

"ئێمە بڕوامان بە یەك خوا هەیە، باوکی تواناداری رەها، دروستکەری هەموو شتێکی بینراو و نەبینراوە."و بە یەك خوا، بە عیسا، کوڕی خوا، بە تاقانەی باوك بەر لە هەموو جیهانەکان، کە

[48] لایارد- Layard ، نەینەوا و تاسەوارەکانی، بەرگی یەکەم، لاپەڕەی 3-262.

دروستنەکراوە، خواوەندی راستەقینەی خوای راستەقینەیە، هەمان مادەیە لەگەڵ باوکیدا، لەلایەن ئەو دەستانەوەی کە جیهانی دروستکردووە و هەموو شتێکی ئەفرادووە، ئەوەی بۆ ئێمە پیاون و بۆ رزگارکردنی ئێمەی مرۆڤ لە ئاسمانەوە هاتۆتەخوارەوە و گیانی پیرۆزی کراوە بەبەرا و بوو بە مرۆڤ، ئیدی چووە منداڵدانی مەریەم و لەویش لەدایك بوو، ئەشکەنجەی زۆری چەشت و بەخاچکرا، لە رۆژەکانی پۆنتیوس پیلەیتدا مرد، نێژرا، لە رۆژی سێیەمدا هەستایەوە، بەپێی نووسراوەکان، بەرزبۆوە بۆ ئاسمان و لەلای راستی باوکیەوە دانیشتووە و جارێکی تر دێتەوە بۆ دادوەریکردنی هەردووکیان، زیندوەکان و مردووەکان.

" ئێمە بڕوامان بەیەك گیانی پیرۆز هەیە، گیانی راستی، کە لە باوکەوە دەردەچێت- ئەو گیانەی رووناکی دەدات.

"بە یەك کەنیسەی پیرۆزی جیهانی.

"ئێمە ددان دەنێین بە یەك خاچپەرستیدا بۆ پاکردنەوەی گونا و هەستانەوەی جەستە و ژیانی سەرمەدی."

لەوە دەچێت هەندێ گومان لە ژمارەیەك دابونەریتی ئایینیدا هەبێت، بەڵام ژمارەیان حەوت بڕیارە. لە بەکارهێنان و رێوڕەسمی ئایینیدا دیدێکی نزیکتری بۆ کەنیسەی ئینگلیزی هەیە زیاتر لە لایەکی تر. ددان پێدانان، گۆڕینی شێوەی خوایانە، شوێنی سزادان و تاوان پاکردنەوە، نمایشگای دیمەنەکان، ئەوە خاڵە سەرەکیەکانە کە نەهی لێدەکرێ یان قەدەغەکراوە، لەکاتێکدا ئەوانە هەردوو تونخمەکان بەرێوەدەبات بۆ گەیەنەرەکانی کە دڵنیان. پیاوانی ئایینی پێشو رێدرابوون کە هاوسەرگیری بکەن و ئەو نەریتە تەنیا فرمانبەرە پایە بەرزەکانی نەدەگرتەوە.

هەشت پایەی پیاوانی ئایینی هەیە: پاتریارك، سەرۆك قەشە، یاریدەدەری سەرەك قەشە، رابەری کەنیسە، قەشە، شەماس، یاریدەدەری شەماس و خوێنەرەوە. وەك بینیمان نوسینگەی باوك سالاری بە وراسییە و هەندێ سیستمی رێکخستنی شێوەی خواردەمەنی بۆ دایك پێش منداڵ بوون پابەندە، هەروەها پەیڕەوی سیستمێکی تایبەتی دەکرێت لەماوەی ژیانیاندا، کاتێ هەموو جۆرە گۆشتێك قەدەغەیە.

رۆژوگرتن و جەژنەکان زۆر زۆرە، هەموو کلدانەکان- کاسۆلیکەکانی رۆمان، ئەرسەدۆکسەکان، یان ئەوانی تر- زۆر سوورن لەسەر رێزگرتنی ئەو رۆژانە لە هەموو بەشە جیاوازەکاندان لەگەڵ ئەوەشدا لە رۆژانی شەممەدا زۆر وابەستەی کارنەکردنن.

# بەشی هەشتەم

# بە ناوچەی هەمەوەندا بۆ سلێمانی

**الاکراد طائفة من الجن، کشف الله عنهم الغطاء**

**"کوردەکان ڕەگەزێکن لە جنۆکە، کە خوا پەردەی لەسەر هەڵماڵیون ."**

بەیانیەك هەر زوو دوای ئەوەی ڕۆژ هەڵهات، لە کەرکوك دەرچووین و چووینە ناو ئەو کاروانەی، کە لەژێر چاودێریی شەفیق ئەفەندی ناوێك، کە (عەسکەری کەتێبی) یان ژمێریاری سەربازی بوو، دەچوون بۆ سلێمانی. هەروەك ئەوە یەکەم کاروان بوو بۆ ماوەیەکە، بۆیە ژمارەیەکی زۆر لە خەڵك کەڵکیان لەو هەلە وەرگرتووە تا بگەنە سلێمانی. هەندێ بازرگان لەگەڵ کاروانەکەدا بوون. زۆربەی خەڵکی هەژار بوون و بەپێ دەڕۆشتن، هەموو جۆرێکی جیاوازی کوردەکانی تێدابوو، دوکاندارێك یان دوو دانەی خەڵکی سلێمانی و ژمارەیەك لە کاربەدەستان، کە ئەرك و کارەکانیان بەرەو ئەوێ گواسترابۆوە. هەموو ئەوانەی دوایی ژنەکانیشیان لە تەکیاندا بوون و سامی ترس پەڕیبووە سەر ڕوخساری ئەو ژنە کوڵۆڵانە، کە چارەنووسی خۆیان بەستۆتەوە بە هەندێ ئەفەندیەوە. تەنانەت لەگەڵ ئەو پاسەوانیەی هەمانە، هێشتا تێپەڕین بە هەموو لایەکی ناوچەی هەمەوەندا زۆر مەترسیداربوو. ترسیان زۆر لێنشتبوو، بەڵام ئێمە حەفتا سەربازی پیادەمان بە تفەنگی ماوزەڕەوە لەگەڵدا بوو، کە خۆیان نەدەگرت تەنانەت بەرامبەر هەمان ژمارەی یەکسان لە هەمەوەندەکان و ئەوەشیان دەزانی.

تێشوی ڕێکردنی ئەم هاوڕێ بەهێزانە کارکردنی سەرکەوتوانەیان بوو. لەم خاکانەدا، مرۆڤ لە ڕۆژێکدا نە دەگەڕێ بەدوای سێ ژەم خواردنی گەرم و نە بەدوای خەوێکی بێ ترس لە چۆڵەوانیدا، گەشتیاری سادەش ڕێ دەبڕێ لەژێر مەرجەکانی کە سەربازانی ئەورووپی بڕیاری لەسەر دەدات.

بۆیە ناکرێت چاوەڕوانی ئەوە لە سەربازەکە بکرێت، کە کۆڵەپشتی خۆراکی هەمەجۆری هەڵگرتبێت. لە ڕاستیدا، ئەو لە ئێمە جیایە، تفەنگێکی باش و فیشەکێکی زۆری پێیە. بەگوێرەی خەڵکەکەوە پێڵاوێکی لەپێدایە کەخۆی دەیەوێت، بێگومان هیچ شتێك نییە لەوە باشتری بکات و ئەو لەو بەرگانەدا دەنوێت کە پێوەی دەگەڕێت، هەروەك هەموو ئەوانی تریش دەیکەن، کێشە نییە لەسەر چی رادەکشێ و بە چی خۆی دادەپۆشێت.

## کوردەکانی ناوشوان

دوو مەسیحی، کیمیاسازێکی سەربازی یۆنانی و ژنەکەی، کلدانیەك لە کەرکوکەوە لەگەڵمان بوون. بەسواری کەرێك، یان روونتر لەوە خۆی بەپێ دەڕۆیشت و کەرەکەش پێخەفەکەی هەڵگرتبوو، لەبەرئەوەی کەرەکە نەیدەهێشت ئەویش سوار بێت. ژنەکەی لەسەر شتەکانیەوە لەسەر هێسترەکە بوو. ئەفەندیەکی ئەفسەر دەگەڕایەوە بۆ سلێمانی، کە دانیشتوی ئەوێ بوو، ئەو کورد بوو، هەروەها چەند ژنێکی کوردیشی لەگەڵدا بوو، یەکێکیان بەسواری ئەسپەوە و ئەوانی تر بەسواری هێسترەوە بوون، ژمارەیەك کوڕی منالّ و کۆڕپە لە باوەشدا بوون و جولەکەیەك یان دوو جولەکە کوتاڵی لۆکەی گوڵداریان دەبرد بۆ کوردستان بۆ فرۆشتن. هێسترەکانمان هەندێ سندوقی تەقەمەنی و بارە کتێبی زانیاریە نوێکانی پەرلەمان بۆ رێکخستنی گرێبەستی کرێ و کاروباری شارەوانی. وڵاخدارەکان تەواو خۆشحاڵ بوون لەو بارەی پێیانە، لەبارەی بەفیڕۆدانی پارە و سامانەوە دەدوان بۆ ناردنی رێنوێنیەکان بۆ شار کە دەستووری هەرگیز تێدانییە و ئەگەر ئاوابێت، گرێبەستی کرێ و کاروباری شارەوانی نەناسراوە، تەنانەت بە ناویش.

یەکێ لە کەرکوکەوە بڕوانێتە رۆژهەڵات بەرەو کوردستان، زنجیرەیەك سوورکە گردۆلکەی رووتەن بەری دیمەنەکە دەگرێت و بەسەریاندا رێگەی سلێمانی دەڕوات و دوای تێپەڕبوون بە دەشتەکەی پشتەوەدا، بەناو تەنیا بۆشاییەك لە دووەم زنجیرەدا بۆ دەشتی بازیان، کە ناوەندی وڵاتی هەمەوەندە. کەلێنەکە ئەو شوێنەیە کە سوارە دڕندەکان هەمیشە لەوێدا هێرش دەکەنە سەر ئەو کاروانیانەی دەچن بۆ رۆژهەڵات، دوو مانگ دوای گەشتەکەی ئێمە بۆ سلێمانی، پەلاماری کۆمەڵێك سەربازیان داوە، کە بووە هۆی کوشتنی ژمارەیەك و دەستگرتن بەسەر هەموو چەك و تەقەمەنیەك کە پێیانبووە.

بەڵام دوو رۆژ پێش دەستپێکردنی ئێمە، دوو کەسی شڕۆڵە لەو دەربەندەوە هاتن بۆ کەرکوك- دوو رۆژی دوورودرێژی سەفەر- تەنیا تالانی کاروانێکی بچووکیان باسدەکرد، بۆیە چاوەڕوانی پێشهاتێکی روومان نەدەکرد. بڕیاردرا، ئیدی، لە خۆشی ئەوەی رابەرەکەمان، شەفیق ئەفەندی، رێگاکەی بڕی و دەستیکرد بە رۆشتن بەناو هەندێ گردۆلکەی نزمدا، کە تا رادەیەك بەلای باکوردا

بوو. بۆ ئەنجامدانی ئەو کارە ناوچەی هەمەوەندی لە پشتمانەوە جێهێشت و چووە پێشەوە بۆ ناوچەی ناوشوان، کە بەتوانان بەڵام تیرەیەکی بێوەین بۆ پارێزگاریکردنی مەڕ وماڵیاتەکانیان- وەك

ناوەکەیان (شوان) هێما بەو پاراستنە دەکات.[49] تا نیوەڕۆ سەرکەوتنێکی بەرچاومان کرد، گردەکان ڕێگەکەیان دادەخست و ئێمە هەرگیز نەماندەتوانی زۆر دوور ببینین، بۆ شوێنپێی هاتن و چوون لەنێوان لێژگاییەکانەوە. بەلای گوندێکی کوردنشیدا تێپەڕین، کۆمەلێك خانوچکە لەم وەرزەدا بەسەر گردێکەوە بوون. ژنان بە بەرگی ئالوواڵاوە دەرکەوتن، سەروپێچی ژنە کوردیان بەسەرەوە، هاتنە دەرەوە بۆ تەماشاکردن و بۆ ئاگادارکردنەوەی پیاوەکان لە گەیشتنی ئێمە. پیاوانی سوارە هەر زوو بەغاردان بەسەر گردەکاندا هاتن، لە گۆشەیەکی چۆڵەوانیەوە دەرکەوتن و لە رابەرەکەمان نزیك بوونەوە. هاتن بۆ لای و دابەزین و دەستیان گرت و ڕێز و ستایشیان کرد، ئیدی لەپاشان بۆمان دەرکەوت کە ژمێریاری سەربازییەکە سەرۆکی خێڵەکە بوو. زۆر نەبوو کە لە کەرکوك دوورکەوتبووینەوە، فێستەکەی لەسەری لابرد و دەستماڵێکی کوردی لەسەری بەست. لەگەڵ ئەوەی ئەو گوندییانە داوایانکرد لایان لابدەین، بەڵام رابەرەکەمان نەوەستا و بەناو دۆڵەکاندا بەردەوام بووین لە ڕۆشتن. لێرەوە لە هەندێ شوێن بە گردۆلکە دەورەدراوە و هەوا نامێنێت و گەرمی هەتاوەکە ئەوەندە بەتین دەبێت، بۆیە ئەو خەڵکە سکاڵا دەکەن.

چووینە ناو یەکێ لەو دۆڵانەوە، یان بەشێوەیەکی تر، دەشتێکی بچووکی تەخت لەنێوان گردەکاندا و گەرما تاوی سەندبوو. هەناسەی هەوا لە هیچ لایەکەوە نەبوو، سەربازە کولۆڵەکان لەوە دەچوو زۆر نەخۆش و بێتاقەت بن. هەموو کەسێك هەندێ ئاوی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو، بەڵام بەزوویی تەواوبوو، لەسەرو بێزاریی گەرماکەشەوە، مێشو مەگەزێکی وردی زۆر دەنیشتنەوە بەسەر سەرمان و دەچوونە ناو چاو و گوێکەکان و دەنوسان بە لێوەکانەوە. یەکێ لە ژنەکان لە هۆش خۆی چوو و لە هێسترەکەی کەوتەخوارەوە، ئەو پیاوانەی مێزەریان بەستبوو، مشکیەکانیان کردەوە و لە گۆشەکانەوە گرتیان بۆ سێبەرکردن لەسەریان. لە دەوروبەرماندا لە لێژگاییەکاندا هەندێ تەختەبەرد هەیە کە بە سەنگینی جێگیرن، یەکێکە لە جیاکەرەوە گونجاوەکانی ئەم دیمەنە سروشتییەن، کە تەنیا بەردی رووتی دۆڵەکەن، یەك گرێ سێبەر نییە، نە چڵێك گژوگیا و نە دلۆپێ ئاو و بێدەنگی و ئارامی زیاتر بێزارترە لە دەنگە دەنگی نالەبارترین زریان. ئارەق لە سەرو قژەوە بە روخساردا دێتەخوارەوە، بەسەر سنگدا دەچێتەخوارەوە بۆ هەڵمژینی بەناو جلوبەرگا و دەچێتە ناو ئەو پێخەفەی وڵاخ سوارەکان لەسەری دانیشتووە. هێسترەکانیش عەرەق دەکەنەوە و بۆگەنیان لێدێت و تەپوتۆز بەرزبۆوە، مرۆڤ بە قورگی وشکەوە خەریکە دەخنکێت.

[49] بە کوردی "شوان" چاودێریکەری مەڕ و ماڵات.

# بارکردنی هێسترێك

بۆ ماوەی دوو سەعات ئێمە بەدرێژی تەختانیەکدا دەخولاینەوە، تا گەیشتینە کۆتایی دۆڵەکە، کە گردەکان دایانخستبوو، لەوێوە ڕێڕەوەکە سەردەکەوت. نیو سەعاتی تر بەسەریا سەرکەوتین و بەشێوەی پێچاوپێچ بەدرێژی ڕێیەکی تیژ و بەردەڵان و هەر هەمووی بە یەك جار یەك هەناسە و یەك دیمەن. بۆ پێشەوەمان گردەکان بەرزترن لەوانەی لە ناوچەی شوان دەهاتنەخوارێ- کەناری داوێنی گردەکان سەوزاییەکی پانوبەرینە، سەوزە گیایەکی لاسك درێژ و درەوشاوە بە گوڵزار شەپۆل دەدات. دۆڵە قووڵە لێژەکان لەسێبەری نێوانیاندا راکشاون و لە مەودایەکدا، تەنانەت لەم کاتە رۆشن و روناکەدا لوتکە بەفرگرەکانی زاگرۆس و کوردستانی ئێران بەرزبۆتەوە.

ئێمە ئێستا لەناو خاکی ناوشواندا باشین و تا ڕێگاکەمان بەوێدا بڕوات پارێزراوین، لەبەرئەوەی هەمەوەند لە ناوچەی خۆیان نایەنە دەرەوە بۆ ناوچەی شوان، لەگەڵ ئەوەی کە ئەوان دۆستن، لەسەرو ئەوەشەوە بوونی ڕێزێکی باش بۆ هێزەکەی ئەو تیرە شوانکارەیە هەیە. ئیدی لە یەکەم رەوتدا وەستاین بێ ئەوەی بیر لە جەردەکان بکەینەوە و بارمان بۆ ماوەیەك خست. سێ حەوز لە ئاوەڕۆگەکەدا هەبوو، بەڵام ئاوی کەمی تێدابوو، کە لە کانیەکی بچووکەوە ئاویان بۆ دەهات و ماوەیەکی درێژی خایاند تا هەموومان توانیمان ئاو بخۆینەوە. هەروەها یەك درەخت لەم چەمە زۆر خۆشەدا هەبوو، سەربازەکان بەپەلە خێوەتێکیان لەژێریدا هەڵدا، کە بووە هۆی نارەزایی ئەوانی تر کە تەنانەت جێگای قاچیان نەدەبووەوە تا لەو سێبەرەدا هاوبەشیان بکەن. کۆمەڵە تایبەتیەکەی خۆمان کە لە بنەڕەتدا لە موسڵەوە هاتوون، باشتربوون لەبارەی ئاوەوە، یەکێکمان چارەکە میلێك لە داوێنەوە کانیەکی سازگاری دۆزییەوە، بە کەمۆڵە گڵێنەکانمان ئاومان لێخواردەوە و بەردەمەکەیمان سازکرد و ژەمێکی نایاب لەو ئاوە و نان و خورمامان خوارد. ئێمە بەتەواوی نوستین، چونکە خەڵکی لە دەرەوە لە هەوای بەرەڵادا بەزوویی خەوی لێدەکەوێت، بێ ئەوەی گوێ بدات بە تیشکی هەتاو و مێش و مەگەز- کاتێ فرمان هات، باربارکەین و وەك ئەوەی کە ئەفەندی بە هەموومان فرمانیدا کە پێکەوە دەستپێبکەین، پەلەپەلێکی ناخۆش بوو. هێستر بارکردن کارێکی گرانە، بەلایەنی کەمەوە پێویستی بە دوو کەس هەیە، یەکەم دەبێ وڵاخەکە بهێنێتە تەنیشت بارەکەوە، کە دوو تای یەکسانە لە کێشدا، هەریەکەی بەلایەکیدا هەڵدەواسرێت. ئەو دوو تایە پێکەوە بەستراون و بەیەکەوە بەرزدەکرێنەوە بۆ سەر کورتانەکە، کە نزیکەی پێنج شەش پێ بەرزە. ئینجا یەکێ لەو دوو کەسە دەبێ بچێت بۆ لاکەی تر و رایکێشێتە خوارەوە و

هاوڕێکەشی لە لاکەی ترەوە پێکەوە هامبەریی هەردوو تاکە دەکەن. ئینجا ئەگەر کەسێك بچێتە ناوکۆڵی ولاخەکەوە ژێرەخەرەکەی رادەخات و بە گوریسێك تەنگە و پالو دەکرێت. ئەمە بە دوو مەرج زۆر بە خێرایی جێبەجێدەکرێت- یەکەم، کە هێسترەکە نزیکی شوێنی بارکردنەکە بێت، کاتێ کە کاتی بارکردن هات، دووەم، کە بتوانێت لە کاتێکدا بارەکە دەخرێتە سەر کورتانەکەی ئەو بوەستێت و نەجولێت. چونکە لەو حاڵەتەدا ئەو وەك خویەك دەچێت بەو لاوە و بارەکە دەکەوێتە سەر زەوی. نامەوێ ئەوە بلێم، دوای بارکردنی شانزە هێستر، وەك ئەوەی دووجار لە رۆژێکدا ئەوەمان بە خێراییەکی بەرچاو کرد و ئیدی باقیەکەی زۆر ئاساییە، بەلام زۆر جار بۆ ماوەی چەند میلێك دەبێ بە رێگای بەردەلانیدا رێبکەین، لەبەرئەوە ئاژەڵەکان بەهێواشی هەنگاودەنێن و لەپلەکانیشدا دەبێ سوارەکان دابەزن و بەپێ رێبکەن.

لە دەرەوەی دۆڵەکەی چەمەکەوە کەوتینە ناو یەکێکی بەرزترەوە لەنێوان دوو کەناری درێژی گردەکان و ماوەی سێ سەعات رێگاکەمان بەرەو باکوور دەچوو، تا گەیشتینە گوندێکی شوان، بەجوانی کەوتۆتە دەورویەری چەمێك و چەند کۆمەڵە دار چنارێك، بارەکانمان لەسەر زەویەکانی ئەو دەورویەرەدا داگرت.

یەکەم شتێك لە کاتی خۆرێکخستندا بۆ شەو، ئەوەبوو کە بارەکان وەك شێوە دیوارێك رێکبخەین و لە پشتیەوە لباد و راخەرەکان رابخەین. لەلایەکی ترەوە، ولاخەکان بران بۆ سەرئاو و گەڕانەوە، کورتانەکانیان لەسەر لابرا. ئیدی ولاخدارەکان بە رنەیەکی تەنەکە کەوتنە پاکردنەوەی ئاژەڵەکان، کورتانەکانیان گۆڕی بە سیپالێکی بەتانی ئاسا و بە زنجیرێکی درێژ لە زەویدا بەستیاننەوە و کاوجۆیان خستنە بەردەم. لەم کاتەدا یەکێك چوو بۆ گوندەکە- ئەگەر لەو نزیکانە- خواردەمەنیەك پەیدا بکات، کە لە ولاتی کوردەکان ئەو شتە پێیدەوترێ "دۆ" هەروەها بە فارسی پێیدەوترێ "دوغ" کە بریتیە لە ماست و ئاو و کەمێك ترشە و هەمیشە ساردە چونکە لە مەشکەدا دەمێنێتەوە و خواردنەوەیەکی زۆر سازگارە. لەناو کوردەکاندا ئەوە دادەنرێت بە کارێکی لاوەکی لەو شێوەیە و ئەم گوندەش لەو دەستورە بەدەر نییە. من ئەرکی پەیداکردنی ئەوەم بۆ کۆمەڵەکەی خۆمان گرتە ئەستۆ و بۆی دەرچووین، بەناو دیوارە داڕوخاوەکاندا چووینە ناو گوندەکەوە، لەبەر نەبوونی رێگاویان. دوای ئەوەی سەرمکرد بە چەند ماڵێکدا، ژنێکی باشم دۆزییەوە کە دۆی دەکردە کەمۆڵەیەکی دارییەوە و داوای کەمێکم کرد، وتیان کە چەندین کەس لە ئێمە دەیەوێت هاوبەش بێت. بەبێ ئەوەی هیچ بلێت مەشکەکە و کەمۆڵەیەك و کەوچێکی قوڵ و دەستەوارەیەك نانی

تازەی دایە دەستم، وەڵامی سوپاسەکەمی دایەوە بە کوردی و وتی "نوێشت بێت" واتە "چێژی لێببینن". لەناو کوردەکاندا کەس بیر لەوە ناکاتەوە رێ نەدات کەسانی غەریب بچنە ماڵەکانیانەوە و تەماشای ژنەکانیان بکەن، کە زۆر بە کراوەیی دێن و دەچن، بە راستی، نە رووپۆشیان هەیە. کۆمەڵگایەکی سەربەستی بێ وێنە لە ئارادایە و ژنانیان لە گەشتەکاندا و لە وچانەکاندا دێن و دەچن و بەبێ هیچ جیاوازی لە نێوانی گەدا و ئەفەندیدا دەمەتەقێ و گاڵتە و گەپ دەکەن.

لە بەیانیەکی زوودا، ماوەیەك بەر لە رووناکی رۆژ، دەنگی ئەو خەڵکانەی دەهاتن و دەچوون بەئاگایان هێنایەوە و ئێمەش هەستاین و فرمانی رێکردن دەرچووە و نیوەی کاروانەکەش بارکراوە. یەکێکمان رایکرد کەمۆڵەکان لە کانیەکە پربکات لە ئاو، لەو شوێنەی کە ژنانی گوندەکە خەریکی هەمان کاری ئاو هێنان بوون، لەکاتێکدا ئەوانی ترمان خەریکی باربارکردن بوون و دوای چەند دەقیقەیەکی کەم کاروانەکە دەستیپێکرد. کازیوە ئێمەی لەسەر زنجیرە گردەکان و لە دووریانێکی پیادەرۆدا بەدیکرد. لەوبڕوایەدام ئەوە بەرەو رۆژهەڵاتە و بۆ سلێمانیە، لەلایەن سەربازانەوە رێنمایی کراین بەرەو باکور، کە لە کۆتاییدا بردنی بۆ سەر ترۆپکی چەند گردێکی بەرز و بەدرێژایی زنجیرە گردەکان بەتیژی لێژدەبێتەوە، کە لە خاکێکی لێژدا کۆتایی دێت. گەلیە جوانەکان لەگەڵ هاتنەخوارەوەی ئاو و باخی درەختەکانی کە لقەکانیان شۆڕبوونەتەوە بۆ داوێن و بە دەشتێکی پانوبەریندا رابوردین، دەمانتوانی جۆگە فراوانەکە ببینین کە لە رووباری زابی خوارەوە هەڵدەقوڵا. سلێمانی ئێستا تا رادەیەك بەلای باشووردایە و دەتوانی بەهۆی نیشانەی گەورەیی شاخی پیرەمەگرونەوە ئاستەکە ببینیت، کە بەلای باکووری خۆیدا بەرزدەبێتەوە، لێژاییەکی سەختی تیژ نزیکەی 10 هەزار پێیەك بەرزە. لە ناوەندی ئەو هەموو دەشتە جوان و لەوەرگا سەوزەدا هیچ کەسێکمان نەدەبینی، بەڵام دوو تاقم سوارمان لە دوورەوە بینی دیدەوانی ناوچەکەی خۆیان دەکرد.

تا نیوەڕۆ ئێمە زۆر لە بەرزیدا بووین، لە نێوانی گردەکاندا و لەپڕ لێژاییەکی تیژمان پێشهات، گوندێکی گەورە لە داوێنەوە بوو، کە قەڵایەکی بەهێز لەسەر گردێکەوە پارێزگاری لێدەکرد و ئەوەش یەکێك بوو لە گوندە سەرەکیەکانی تیرەی شوان. لە رێڕەوە لێژاییەکەوە گەیشتینە ناو گوندەکە و لەژێر هەندێ دارتودا بارەکانمان خست. ئەم رێکخستنەی بەشکردنی گەشتەکە بۆ نیوە رێ لە رۆژەکەدا نائاسیی نییە لە کوردستاندا، بەڵام من هەرگیز ئەوەم نەبینیوە لە ئێراندا، چونکە لەوێ قۆناغەکان کورت ترە.

## هاوڕێیانی کاروان

ئەفەندی چوو بۆ میوانخانە کە لە قەڵاکەدا نانی بۆ ئامادەکراوە و ڕێگەیەکی کورت بەسەر گردەکەدا دەچوو بۆ ئەوێ و پیاوێك سەرەك خێڵی ئاگادارکرد لە هاتنی ئەم، مەڕ سەربڕا و هەمووی برژێنرا، باقی ئێمەش دوای منەی پەیداکردنی "دۆ" ڕاکشاین بۆ کەمێ سەرخەو تا کاتی ئەوەی کە دەبێ باریکەینەوە بۆ جارێکی تر.

ئەم گوندە لە گۆشەیەکی دووری ناوچەی شوانە، لە دەرەوەی ڕێڕەوی سەرەکیە و دانیشتوانەکەی سەرسام بوون بە قەوارەی کاروانەکەی ئێمە و هەموویان هاتبوونە سەر سەربانە تەختەکانی خانوەکانیان تا سەیری ئێمە بکەن کاتێ دەردەچووین. لە ڕاستیدا، تەنانەت هاتوچۆیەکی بچووکە، کە ڕێگاوبان لە دەرەوەی گوندەکەدا نییە و سوارێك لەگەڵمان هات تا نزیکترین ڕێمان پیشان بدات بۆ شوێنی وەستانی داهاتوومان. ڕێڕەوەکەمان بە لێژاییەکی زۆر سەختدا بردینی و جارێك لەوێوە دابەزینێکی درێژ بە بڕبڕەیەکی تیژدا. لێرەوە لێژگاییەکە ئەوەندە تیژە تەنانەت مەحاڵە بەسواری گوێدرێژیشەوە خۆت ڕاگری و ژنان ڕانەهاتوون ڕێ بکەن و کراسە هاودامانەکانیان بۆ ئەوە گونجاو نییە، تا ڕادەیەك ئەوەندە مەترسیدار بوو، کاتێ بکەوتنایەتە بەرپێی ئەسپەکانیان و بەسەردا بەو سەرەوخوارکە تیژەدا بکەوتنایەتە ناو چەمەکەوە کە سێ سەد پێ لە داوێنەوەیە.

لە داوێنیشەوە دەبوو بەرەنگاری زنجیرەیەکی تر ببین و بەسەر ئەویشدا یەکێکی دی و یەك لێژایی، لە لاکەی بەرامبەریشدا گوندێکی دلگیری جوانی تێدا بوو، کە خەریك بوو لەناو درەختەکاندا دیارنەدەما، لەگەڵ دوو جۆگە لەنێوانی خانوەکانەوە دەهاتە خوارەوە. ئەو شوێنە، نزیکی بەرزترین خاڵ بوو لە خاکی ناوشواندا و لەو ترۆپکەوە دەمانتوانی هەموو وڵاتەکەیان ببینین، چەند میلێك لە گردەکان، سەوزایی لەگەڵ بەهارێکی ڕازاوەدا، کە بەرەو باشوور و ڕۆژئاوا کشاوە.

لەبەر دەماندا دۆڵی زابە و هەموو دیمەنەکە، باکووری ڕۆژهەڵات و باشووری ڕۆژئاوا بە کۆمەڵە شاخێکی بەرز و چیای زاگرۆس گیرابوو. ئێمەش ئەو شەوە لە کەناری گردێك بەرامبەر گوندەکە لە دەرەوە هەڵماندا. هەندێ لە گوندنشینەکان هاتن بۆ لای هەوارەکەی ئێمە تا نزیکی گەنمەشامیە ڕوواوەکان بن و لەناو بەربەستە نوك تیژەکاندا دەژیان، کە لەسەر بەرزایی گردەکان دروستیانکردووە.

لێرەوە بۆ سلێمانی ڕێگاکەمان تا ڕادەیەك بەرەو باشوورە. لە وڵاتی کوردانی ناوشوانەوە هاتووین و ڕێگەیەکی تر نییە جگە لەوەی بەرەوخوار بەناو هەمەوەندا بوو بۆ سلێمانی. بە نزیکبوونەوەمان

بەلای باکووردا ئێمە لاماندا بۆ شاخەکانی بازیان و ئیدی چووینە ناو دۆڵەکەوە، کە بە باکووری ڕۆژئاوا و باشووری ڕۆژهەڵاتدا لە کۆتاییە بەرزەکەیەوە دەهات. ئەمە وڵاتی ڕاستەقینەی هەمەوەندە، یەك دۆڵی تەسك و درێژ لەنێوان گردە سەرکەشەکاندا، کە لەوێدا هیچ گەشتیارێك خاوەنی سەرو سامانی خۆی نییە و کە تەنانەت ئەو گەشتیارە نامۆیانەی لەگەڵمان بوون شارەزای ئەوە نەبوون، لەگەڵ ئەوەی لە هەموو گۆشەیەکی وڵاتەکەدا بوون. پیاوی هەژار دەتوانێت بەپێ و بەبێ ترسی ئازاری جەستەیی بە هەموو لایەکدا بڕوات، چونکە ئەوەی هەیەتی نە سەرنجی چاوی تەماعی کوردەکان ڕادەکێشێت و نە دوژمنایەتی چەکەکەی دەکرێت. گاڵۆکێکی پڕچنگ و خەنجەرێك زرێپۆشەکەیەتی.

ئەو کۆمەڵە تێکەڵە، کە هەموو ئەو شتانەی پێیانە خستوویانەتە سەر پشتیان، ژمارەیەکی زۆریان زمانی فارسی دەزانن و بە خۆشحاڵییەوە لە هەر کاتێکدا بکرێت قسەی پێدەکات. هەموویان کوردن، لە هەموو بەشەکانی سنە، مەهاباد، کۆیسنجاق و تەنانەت کرماشانیش، کە تەواو لە سلێمانی دابڕاوە بەهۆی شاخە سەختەکان و خێڵە دڕندەکانەوە.

دووان لەنێوانیاندا هەورامی بوون و لە خێڵێکی بنار شاخی هەورامان بوون، کە شاخەکە وەك دیوارێکی سەختی بەردی نۆ هەزار پێ بەرزە، هەورامیەکان لە دۆڵەکاندا دەژین. زۆر حەزمدەکرد شتییەکیان لەبارەوە فێربم، لەبارەی کلتورەکەیانەوە کە بنەچەیان دەگەڕێنێتەوە بۆ ئێرانی باکوری. بە دیالێکتێ قسەدەکەن کوردی نییە، ئێستا لە سیمایان و هەڵسوکەوتیاندا ئەوە بەدیدەکەم کە بێگانەن بە نەتەوەی کورد. هەردووکیان فارسی سەردەم دەدوان و یەکێکیان زۆر باش دەیخوێندەوە، پارچە شعرێکی درێژی شانامەی خوێندەوە، چیرۆکە شیعرێکی فارسیی زۆر ناودار لە ناویاندا. لای خۆیانەوە کوردیبوونی خۆیانیان پەسەند نەدەکرد و بەخۆیان دەوت "فارسانی وهانگەهی" واتە فارسی سەردەمی کۆن- و زمانەکەشیان، کە من لەدوایدا فێریبووم و لە زۆر دەستخەتدا بینیم، بە دڵنیاییەوە دیالێکتێکی کوردی نییە.

ئەو بەیانیە کەمێ بۆ شەفیق ئەفەندیی ڕێبەرمان دواکەوتین، بەهۆی ئەوەی نامەبەرێکی نارد بۆ یەکەم گوندی هەمەوەند، لەگەڵ نامەیەکی سەرۆکی خێڵی شوانی ناوچەکە و بۆ ئاگادارکردنەوەی خێڵەکە لە گەیشتنی شەفیق ئەفەندی و هۆشیاری دا پێیان بەوەی، کە هەر هێرشێك بۆ سەر ئەو، وەك ئەوە وایە هێرش کرابێتە سەر خێڵی شوان.

# بینینی هەمەوەندەکان

لەگەڵ ئەو هۆشداریەشدا بەوان و بیست سواری شوان پاسەوانی دەکردین تا سنووری ناوچەکەی خۆیان، لەوە دەچوو دڵنیاش نەبن لەوەی کە ئێمە نابێ پەلامارنەدرێین، هەروەها سەربازەکانیش وەك خەڵکەکە نەبوون تا لەژێر پاسەوانی تیرەی شواندا بن، چونکە دەترسان لەوەی کۆمەڵێك لە هەمەوەندەکان بێنەخوارەوە بدەن بەسەر سەربازەکاندا. ئیدی لە هەردوو لاوە چاودێرانیان نارد بۆ تاقیکردنەوەی رێگاکە هەروەها بۆ پێشەوە، سوارە کوردەکان توانا و چالاکیەکی بەرزیان پێشاندا بەو شێوەیەی لە چەم و گەلیە تەسکەکانەوە سەرکەوتنە سەر لوتکەی شاخەکان و چاودێری کاروانەکەیان لە داوێنەوە دەکرد، لەگەڵ ئەو هەموو پێچاوپێچیەشدا کە ناچاربووین بیکەین. هەموو ئەندامێك لە کاروانەکە بەرگێکی هاوپۆشیان لەبەردایە، دەبوو پاڵتۆکەی بە هەڵگەڕاوی بەسەردا لەبەرکردایە، یان بە عەبایەك خۆی داپۆشیایە و تەربوشەکەشی بە سەروپێچی کوردی بشاردایەتەوە. کاروانەکە بەیەکەوە مابوونەوە، سەربازەکانیش لە ناوەڕاستیاندا دەڕۆشتن!

بۆ چەند سەعاتێك بە دەوری بەردە دابڕاوەکاندا سەردەکەوتین و دەچێتە سەر دۆڵی زاب، لە دوایدا لە روبارەکە دووردەکەوێتەوە، بەناو چەند دۆڵێکی جواندا بەرزدەبێتەوە و دەلکێت بە دابڕاوەکانەوە بۆ بانێك. ئێمە ئێستا لە خاکی هەمەوەنداین، چاودێرەکان هەندێ سواریان لە دوورەوە بەدیکرد.

ئەوەش هاوڕێك بوون بە ئاراستەکەی ئێمە، لە کاتێکدا یەکێ لە ژمارەکەیان بە غاردان چووە سەر ئەو رێگایەی کە ئێمە گرتبوومانە بەر.

لەناو خێڵەکاندا ئەگەر دوو کۆمەڵی سوارە بەرەنگاری یەك بوون زۆر مەترسیدارە، چونکە ئەوە وەك نەریتێك وایە، کە ئەو یەکەیان لەدوورەوە تەقە لە کۆمەڵە تازە هاتووەکە دەکات، ئەوەش بۆ دڵنیابوونە لەوەی کە ئایا ئەوانە دۆستن یا دوژمنن. لەباری یەکەمیاندا وەڵام نادەنەوە و چاوەڕوانی کۆمەڵەکەی دی دەکەن کە بێنەپێشەوە، ئەوانیش دێن، یان هەموویان یان لە پشتی گردۆڵکەکانەوە خۆیان قایمدەکەن. ئیدی سڵاو و چاك و خۆشی لە یەك دەکەن و دەکەونە ناسینەوەی یەك بە هۆی روخسار یان بە شێوە زارەکەی پێیدەدوێن، یان سەرو مێزەرەکانیان، ئەگەر ئەو شتانە تەواو بوو ئیدی کاروبارەکانی تر سازدەکرێت.

دواتر بۆ چەند سەعاتێك بەنێوان گردەکانی کە دەچووە سەر بانە تەختەکە رێمانکرد، تا گەیشتین بەو دۆڵەی کە لەلای گردەکەوە گوندێکی گەورە لای رووبارەکەوە هەبوو.

ئەمە ئەو گوندەیە کە هەمەوەند تێیدا نیشتەجێیە، کە بە باخ و باخاتەکەیەوە دیمەنێکی جوانی هەیە.

لەسەر سەربانێکی تەخت گوندنشینەکان کۆبوونەوە، پۆشتە و پەرداخی جلوبەرگەکانیان و رەنگوبۆی دوور لە ماندوبوونیان بە ئاشکرا هێمای چیرۆکی سەرکەوتنی دوو ساڵ هێرش و پەلامار و تالآنیانی دەکرد. لە دەرەوەی گوندەکە کۆمەڵێك سواری تر دەرکەوتن، بەڵام نەدەهاتنە پێشەوە و لەوبەری دۆڵەکەوە مابوونەوە.

تەنانەت نەیاندەویست لە نزیکی گوندەکەشەوە پشوویدەن، بۆ ماوەیەك بەردەوام بووین تا پێچمانکردەوە و گردەکان پەنایاندایین و دوای ئەوەش لە مێرگێکدا کە گژوگیا تا ئەژنۆکان بەرزبووبووەوە، ئیدی لەژێر هەندێ درەختدا بارەکانمان خست. بە سەختی ئەوەمان کرد و لە هەموو گەلیەکانەوە سوارەکان بە چوارناڵە هاتنە خوارەوە. پیاوە قۆزەکانی هەمەوەند. وەك بەردەوام بەخێرایی دەهاتن، مشکی و جامانەکانی سەریان هەمە رەنگ، کراسە هاودامان و بێ قۆڵەکانی بەریان، تەنانەت پێکانیشیانی داپۆشیوە و لەگەڵ ئەسپ سواریشدا هەڵئەکرێت و دادەدرێتەوە. ئاوزەنگیەکان زیوێکی زۆری پێوەکراوە، کە لەگەڵ کەوشە سورە لوت هەڵگەڕاوەکانیاندا نەدەگونجا. چاکەتەکانیان وەك چاکەتی نیزامی فەرەنسیەکانی جەزایر وەهابوو، کە خۆیان بە باڵاترین شێوە نەخشی زەرکەفتیان بە دەزوو لەسەر قوماشی شینی زەردهەڵگەڕاو چنیوە. زووربەیان بە تفەنگی ماوزەرِ چەکداربوون، کە بەزۆر لە سەربازانی تورکیان سەندووە و ئەو بەڵگە ئاشکرایەیان بە هیچ جۆرێ لە سەربازان و ئەفسەرانی ناو کاروانەکەی ئێمە نەدەشاردەوە.

هەموویان پەنجا کەسێك دەبوون و لەگەڵ ئەوەی کە سەربازەکان خۆیان لەپاڵ فەردەکاندا قایم کردووە و خۆیان لە هاتووان شاردۆتەوە، ئەوانیش راستەوخۆ بەرەو چادرەکان غاریاندا، ئاگایان لە سەربازەکان نەبوو کە لە پشتی فەردەکانەوە بەرزبوونەوە، ئەوەش شتێکی زۆر گێلانەبوو. هەر کە نزیك بوونەوە، هەر یەکەیان بە کەشوفشێکەوە قۆناغی تفەنگەکەی کردەوە و فیشەکەکانی خاڵیکردەوە، ئیدی قایشەکانیان کردەوە پشتیان، ئەوەش بەجارێ نیەتی دۆستانەی خۆیان و سوکایەتی کردن بوو بە سەربازەکان. ئیدی ئاشکرابوو کە پەیامبەرانی تیرەی شوان بە پەسەندی گەیاندبوویان، سەرۆکی هەمەوەندەکان گەنجێکی هەروا بیست ساڵانی شۆخ و شەنگ لە بەرگێکی حەریردا، تەنانەت فەقیانەکانی کراسەکەی ژێرەوەی شۆڕبۆتەوە بۆ سەر پێی. تەواو سەرنجڕاکێشەر بوو، هەروەها لە پاکوخاوێنیدا لە هەموو پیاوەکان خاوێنتربوو. لەگەڵ ئەو ژیانە سەختەی کە

هەمیشە لە کۆڵی ئەسپدان، یەك کراسی چڵکنت نەدەدی لەبەری کەسیاندا. دواتر بۆم دەرکەوت کە کوردانی ڕێگر و جەردە، تا زیاتر سەرمایەدار بێت، زیاتریش بەرگەکەی لە رابردوو خاوێن تر دەبێت- خویەکی سەیرە، وا بیرم لە کوردی ئەم بەشانە دەکردەوە- رەگەزێك نین ناوببرێن بە پیس و پۆخڵ، وەك ئەو خوو رەوشتەی فارسەکان هەیانبوو.

هەمەوەندەکان ئەندامانی نەژادێکی ناسراو بە ئازایەتی و یاخی بووانن، لەنێوانی هاوولاّتانی خۆیاندا ناوبانگێکیان بۆ خۆیان دروستکردووە، ئەویش لە ئەنجامی ئەو هەموو پەلامارە درندانەیانەوە و دلێرانە لەبەرەنگاربوونەوەی هەرجۆرە مەترسیەکدان لەگەڵ تورکەکان کە بەردەوام لە شکستیدان لەو سەردەمەوە کە توانای پاشایانی کۆنی سولەیمانی لەناوچوون. ئەو ساڵانەی یاخیبوون لەوەدەچێ کاریکردبێتە سەر رەوشت و هەڵسوکەوتیان، لە کاتێکدا جیاکەرەوە جوانەکانی نەژادی کوردیان تێدا بەدیناکرێت، چاوێکی زیت و رەش و تیژیان هەیە، کە لە شێوازی جۆری ژیانیانەوە هاتووە و بە شێوەی دوژمنانە کە تەنانەت لەنێوانی دۆستانیشیاندا هەمیشە ناتوانرێت دابینبکرێت. وردە وردە تێگەیشتین، لەو هەواڵانەی دزەیکرد لەژێر درەختەکەی کە خەڵکێکی زۆر بەدەوری شەفیقە ئەفەندیەوە گردبوونەتەوە، کە پەیامنێرەکەمانیان پێگەیشتووە و وەك خەیمەکەی سەرۆکەکانیان لە دەشتی بازیانەوە دەمانبینن، بەڵام ئێمە دەبێ هەل لەو بڕیارەی ئەو بقۆزینەوە. ئەوان نەیاندەتوانی دەرکەوتنی ئەو سەربازە زۆرە بشارنەوە و نەشیاندەتوانی بەرگری لە هێرشکردنە سەریان بکەن. لەلایەن بەرپرسی ناوخۆوە پێشنیارکرا، کە دەبێ سەربازەکان چەکەکانیان بارکەن لە هێسترەکان و بگەڕێنەوە بۆ کەرکوك، دڵنیایان کردینەوە لەوەی کە سەرۆك وەك کۆمەڵێك سەر بە شەفیق ئەفەندی پێشوازیمان دەکات. هەمەوەندەکان زۆر راشکاو و بەرێز بوون. ئامادە نەبوون هیچ خواردنێك لە ئەفەندی وەربگرن، لەبەرئەوەی لەوانەیە ئەو شەوە بدەن بەسەر ئەو و سەربازەکانیشیدا، بەڵام دوای ئەوەی لە هەموو بەرپرسیارییەك بەخشینی، ئیدی رازیبوون بەوەی هاوبەشی چا خواردنەوەکەی بکەن.

بەهەرحاڵ، پێیان لەسەر مەرجێکی دیاریکراو داگرد لەبارەی سەربازەکانەوە. کەرەناکە (بوق) کە لە ناوچەی شواندا کەڵکی هەبوو رادەستی بەرپرسی هەمەوەندەکان کرا و یەکێ لە پیاوەکانی خۆی هەوڵیدا فویەکی پیابکات و دەنگی هاوار و بانگکردنی پێدەربکات. سەرنەکەوتنەکەی بووە هۆی گاڵتەجاڕی هاوڕێکانی، نەك تەنیا لەسەر ئەو، بەڵام لەو کەرێتیەی کە بەهۆی فوکردن بە لولەیەکی مسدا و ناتوانێ لە بانگکردنی گردەکە تێبگات.

# بازیان

سەربازەکان دەبێت ڕێبکەن بۆ هەر کوێیەك کە سوارەکان ڕوویان تێکردووە، لە پێشەوە یان لەدوای کاروانەکەوە و لە شەودا دەبێ لەهەرکوێ پێیان وترا لابدەن و ئامادەبن ئەگەر لە شەودا جوڵانەوە تەقەیان لێدەکرێت. ئەو مەرجانە لەسەری پێکهاتن، بە ئامادەبوونی فرماندەیەکی (بیمباشی) تورك کە دەبوو وەرگێڕی کوردی هەبێت و لە ئەنجامیشدا بەوەی زانی کە کوردەکان چین.

ئەم مەرجانە ڕێکخرا، ژمارەیەك لە سەربازان بە ئامۆژگاری بەرپرسەکە ئێمەیان جێهێشت و بەرەو چیا سەختەکان کەوتنە ڕێ و بە زوویی لە چاو ون بوون. ئێمەش بە هێمنی بارمانکرد و ڕێی خۆمان گرتەبەر بە جوانترین ناوچەدا کە من لە کوردستاندا بینیبێتم. دارو درەخت و ئاوێکی زۆر، دۆڵەکە فەرشی گوڵڕێژ و گژوگیایەکی چڕ بوو. مەڕو ماڵات لە هەموو لایەکەوە لەژێر چاودێری کوڕان و کچانی لاودا دەلەوەڕین، لاوە هەمەوەندەکان هێشتا ناونووسنەکراون لە هێزی شەرکەردا- من کیژانیشم خستۆتە ژێر ئەو بەندەوە، چونکە لەکاتی پێویستدا ژنانیش هاوبەشن لە شەڕدا.

بەرەو ڕۆژئاوابوون ئێمە بە ریزە یاڵێکدا دەڕۆیشتین و لەبەردەمماندا دۆڵی دوورو درێژ و بەرتەسکی بازیانمان بینی کە ناوجەرگەی وڵاتی هەمەوەندە. بەتایبەتی ئاودارە، کە لە هەردوو لاوە ئاوی لێهەڵدەقوڵێت. بەلێشاو لە هەردوولای زنجیرەکەوە ئاو دەڕژێتە ناو دۆڵی بازیانەوە. بۆ دەشتەکە کە تا داوێنی خۆی دوور لە ئاوە و هەر داوێنێك کاتێ کە دەردەکەوێت، بۆ لای ناوەندی بازیان دەڕوانێت، سەوزە، ئەگەرچی داوێنە نشێوەکان، ئەوە پێشان دەدەن کە ڕووی دەرەوەی بە بەردی ڕووت داپۆشراوە. لەبەرئەوە دۆڵی بازیان لەگەڵ ئەو درێژی و بەرتەسکیەیدا بۆ ماوەی دوو میل دەشتێکی سەوزە و جێی لەوەڕی مەڕ و مانگاکانە، کە وەك جۆری (گورنەس)ی لای خۆمانە، بەدرێژایی ساڵ دەلەوەڕێن. هەمەوەندەکانیش بۆ بەرگریکردن لەخۆیان ئەم ناوچە چەپەکەیان هەڵبژاردووە، چونکە، لەکۆتایی هەردوو لای باکوور و باشوورەوە داخراوە و دیوارەکانی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات کەلەبەری تێدانیە، جگە لە بەشی دووەمی بازیان لە ئاستی ڕۆژئاوایدا و هەرچۆن لەوێدا سەگرمە شێوەیەکی نزمی هەیە. ئەو دوو دەربەندە بەباشی جێیی سەرنجە و بە تاوێری لاپاڵە دابڕاوەکانی هەرگیز ڕێی نەداوە بە هێزی داگیرکەر.[50]

---

[50]- بە بڕوای کوردانی خەڵکی سلێمانی، وشەی بازیان لە کوردیدا بە واتای شوێنی شکست و هەڵهاتن دێت، بەڵام ئەوان ئەو ڕاستیەیان بیرکردوە کە وشەی "بازی" و "بازیان" لە کوردستاندا یەك هاوبەشن ، لەگەڵ بایەخی (شاخی سەرکەش).

## لەناو هەمەوەندەکاندا

لە گۆشەی کۆمەڵەی رۆژهەڵاتەوە لە کاتی رۆژئاوابووندا گەیشتینە دەوارێکی رەش، هەواری بەهارەی حەمە بەگی سەرۆکی هەمەوەندەکان بوو. لە پشتەوە ژمارەیەك پیاو بەسەر ئەسپەکانیانەوە دەهاتن بۆ پێشوازی ئێمە و رێبەدیی ئێمەیان کرد بۆ شوێنی مانەوە و پشودانمان- رێبەدیی پێویست بوو. دەبێ سەرۆکی تیرەکە لە حەشارگەدا بێت، تەنانەت لە ناوچەی خۆشیدا، دەبێ خۆیپارێزن و ئەم سەرۆکە هەوارەکەی لە شوێنێکی ئاوادا هەیە، کە لە پشتیەوە هەزار بە هەزارە و سێ لاکەی تری زۆنگاوێك درێژبۆتەوە، تەنیا لە تولە رێیەکی باریکەوە بۆی دەهاتن. لە ناوەندی ئەو زۆنگاوەدا کە شێوە دوورگەیەکە، ئەو دەژی و شوێنێکی تایبەتیان بۆ ئێمەش تەرخانکرد. خاکەکەی هەمووی سەختە، وەك بەرگێکی هاوپۆش بە گیایەکی لاسك درێژ داپۆشراوە کە لە داوێنی بەردەکانەوە راستەوخۆ لە سەرانسەری دەشتەکەوە هاتۆتە دەرەوە.

لەوە دەچێت سەرۆك بریاریدابێت کە ئێمە بەبێ کێشە بە ناوچەکەیدا تێپەرین، لەبەرئەوە لە خێوەتەکەی هاتە دەرەوە و بەخێرهاتنێکی گەرموگوڕی تەواوی لە شەفیق ئەفەندی کرد، بردیە ژوورەوە کە چا و نێرگیلەی پێشکەشکرد.

تا ئەو چرکەساتە هەموو یەکێ لە حاڵەتی ترس و تۆقیندا بوو، کە لەوانەیە روتبکرێنەوە یا تەنانەت دوچاری کوشتن بن. ئەوەش تەنیا لەبەر سەربازەکانە، کە هەموو کەسێك تەماشای دەکردن، نەفرەت ئامێزانە تێیان دەڕوانین، نەك یەکێ بەڵکو هەموویان دەبوغزێنران. ئەو بێبەختانە، لەگەڵ ئەوەی کە ئازاریان دەچەشت بەدەست ترس و لەرزەوە، تەواو بێدەنگ بوون، هیچ جۆرە دڕندەیی نائاساییان پێشان نەدەدا کە لە سروشتی مرۆڤدا دەردەکەوێت. بەبێدەنگی لەسەر زەویە شێدارەکە راکشابوون کە بۆیان تەرخانکرابوو. هیچ بەرپەرچیەکیان نەبوو بۆ ئەو دوانزە هەمەوەندەی دەوریان گرتبوون.

سەرەرای هەڵوێستی دۆستانەی سەرۆکەکە، کە هیچ شێوە خۆپاراستن و بەدوورگرتنێکی خۆی پێشاننەدەدا، کە لەوانەیە ئەو گومانی کردبێت، یان لەوە دەچێت دەستدرێژی بکرێتە سەریان، لەکاتێکدا ئێمە سەدان سەربازمان هەیە، کەچی ئەو تەنیا سی یان چل پیاوێکی لەو ناوە بوو. بەهەرحاڵ، دوو دوو، سێ سێ سوارەکان لە هەموو لایەکەوە پەیدابوون، بەبێ چەندوچوونی تا ئەوانە سوکەڵەبن، بەڵام زۆر بە ئاگاوە دەهاتن و نزیك دەبوونەوە، دوای خۆرئاوابوون هاوەڵانیان بە ناو بانگدەکردن. لە نیوەی شەودا دەبێت سەد و پەنجا پیاو لەوێ بێت و بەخەبەربن لە دەوروبەری

خێوەتەی سەرۆکەکەیان. ئەسپەکانیان، زینکراون، کەمێ لە دوورەوە، لەو نزیکانە چاودێری دەکرێن و هەمیشە ئامادەن.

لەوە حاڵی بوون کە هەرکەسێك وێستابێت بەپێوە، یان لە جوڵەدا بێت خۆی دووچاری کوللەباران دەکات و یەك سەربازی وریا، پەنادەباتە بەر تاریکایی بێ روناکی مانگەشەو بۆ هەستان و جوڵەکردن و ئەوەش دەزانێت کە هەمەوەندەکان کاتێ لە حەرەسیاتدا بێت ناخەوێت و لەوەش زیاتر دەتوانێت لە تاریکیدا تەقەی باشتر بکات. لەو بڕوایەدانیم لەو شەوەدا زۆرمان نوستبێت. وڵاخدارەکان لەترسی هەمەوەندەکان بەبێدەنگی هێسترەکانیان برد بۆ ئەودیوی گردەکانەوە و دووریان خستنەوە و کە هیچی لێنەبوو بەڵام لە هەمەوەند رزگاریان بوو. سەربازەکانیش دەترسان لەپڕ سەریانبڕن و نەفەرەکانیش رووت بکەنەوە.

خانەخوێکانیشمان، هەروەها، بەدرێژایی شەو لە ئامادەکاریدا بوون، جگەرە هاتە کۆتایی و قسەکردن بڕایەوە و لەبەرەبەیاندا لەوە دەچوو کەس نەنووستبێت. ئەوە توانایەکی بەرچاوە کە کورد هەیەتی لە چاودێری لە شەودا. من کات لە دوای کات پیاوانم دەبینی شەویان رۆژدەکردەوە، بەبێ جوڵە بە دەوری ئاگرێکدا تەواوی شەو دادەنیشتن، بەڵام بە ئاگان، ئامادەی چالاکیە و لە کاتی رۆژیشدا سوارە و سی یان چل میل سواری دەکات و ئەمەش دووبارە دەکاتەوە. لەوە دەچێ ماندوونەناس بن، کە هێزی بەرگەگرتنی ئەو مەترسیە بەردەوامە فێریکردوون. ئەوەیە بەهەرحاڵ کە کورد مەحاڵە هەرگیز سەرسام بێت بە هێرشکردن لە شەودا.

تیرەی هەمەوەند کە هەموو هونەری شەرکردن و پەلامار و سواری بەشێوەیەکی تەواو شارەزایە، هەروەها خاوەنی ناوبانگێکی دێرینە بۆ ئازایەتی و سەربەخۆیی. لە رووی جوگرافییەوە، راستەوخۆ لەناو سنوورەکانی کوردستاندا نین، بەڵام لەلای رۆژئاوایەوە و بەپێی دابڕانی وڵاتەکەیان لەنێوان دوو زنجیرە شاخدا،ساڵەهایە بە گۆشەگیری لە هەموو دراوسێکانی خۆیان ماوەنەتەوە.

خۆیان بنەڕەتی خۆیان دەبەنەوە سەر عەرەب، ئەوەش خۆوادەرخستنێکی نائاساییە لەناو هەندێ لە تیرە بچووکەکانی کورد- دا و بەهیچ بەڵگەیەکیش پشتگیری نەکراوە و بە زۆر دژە ئارا بەرپەرچی دراوەتەوە. ساڵانێك لەوەبەر لە قەرەداغ رێ بە شێخی کورد یان سەرکردەی ئایینی دراوە لە ناوچەکانی خۆیان بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی گەورە، ئەوەش بە سووربوونی بەردەوام و هاندان و ئامۆژگاری، توانیویانە دابونەریتی ئایینێکی تەواو بێگانە بکەنە پێوەندێکی ئاسنین بۆ کوردی راستەقینەی چیاکان.

# پێشینەکانی هەمەوەند

جۆش و خرۆشی ئایینی، بەتایبەتی لەنێوانی سونییەکاندا، ڕێزێکی زۆری داوە بە زمانی عەرەبی و بنەچە، بۆیە تورکی سونە و کوردی سەرسنوور هەمیشە دەیانەوی خۆی بناسێنێت، هەروەك میستەر سمس یان میستەر جۆنس هەوڵدەدەن بنەچەی نۆرماندی خاوێنی خۆیان بسەلمێنن، کە ناوەکانیان و رابردوویان هێمای ئەوە بە پێویست پێشان نادات.

بۆیە ئێمە، هەمەوەند، بابان، شوان و جاف دەبینین، هەموویان بنەچەی سەرکردەکانیان دەبەنەوە سەر عەرەب، لەکاتێکدا هێشتا ئەمڕۆ زۆر بە کورد بوونی خۆیانەوە شانازی دەکەن.

هەموو ئەو خێڵانە شەیدای ئەوەن هێما بۆ جلوبەرگەکانیان بکەن، کە بگونجێ لەگەڵ عەرەبەکاندا، کە لەوانەیە لە جلوبەرگی قەشەنگی کۆنی کوردەوە وەرگیرابێت و هێما بەوەش دەکەن وەك دەرخستنی پەیوەندیان لەگەڵ عەرەبەکاندا.

لە لایەکی ترەوە، بەهەرحاڵ، زۆر بەڵگەی سەنگین هەیە کە کوردی بوونیان دەسەلمێنێ و لە کورد زیاتر رەگەزێکی تر نین. بەگشتی دیالێتەکەیان، کە زمانی پاك و پاراوی کوردی ئاشکرایە و هەندێ وشەی عەرەبی کە تێیکەوتووە هێنراوەتە ناو زمانەکەوە. ئەو وشانەش بە ئاسایی ناوی ئامراز و شتومەکە، کە بەر لە زانینی پتی عەرەبی ئەو وشانە بوونیان نەبووە.

لە بیرەوەریە نزیکەکانی باشووری رۆژئاوای کوردستان هەمەوەندەکان دژی دەسەڵاتی فرمانڕەوا یاخی بوون. وەکو هەموو خێڵە بچووکەکانی تر، مێژوویان هەیە بەڵام تەواو لاوازە کۆبکرێتەوە و ئەویش هەر تەنیا مێژووی ئەم سەردەمەیە. لە بنەڕەتدا لە خاکی فارسەوە هاتوون، کە لە نزیکی سنووری قەسری شیریندا دەژیان. لێرەوە بوون بە

سەرچاوەی نارەحەتیەکی بێ ئەندازە لەژێر فرماندەی جوان میرخانی سەرکردەیاندا، کە فارس بەهیوای ئەوە بوو بە بێدەنگی بیانهێڵێتەوە، بۆیە پێشنیاری کاری چاودێری بۆ کردن لە رێگەوباندا بە موچەیەکی دیاریکراو. ئەو جوان میرخانە پەسەندیکرد و پەلامارەکانی دوو چەندانەکرد، وای لێهات بەشێوەیە شیاوی بەرگەگرتن نەبوو، کە دەستگیرکراو لە سێدارە درا. دوای خۆی حەمە بەگی کوڕی شوێنی گرتەوە. بۆ کردنی بە سەرۆکی خێڵەکە تورکەکان داوای خێڵەکەی کردەوە. پێویست بە وتن ناکات، ئێرانیەکان بە تەواوی خۆشحاڵیەوە ئەو درکەیان لە جەستەی خۆیان دەرهێنا و رادەستیکرد، داواخوازن لە تورك زۆر بە خێرایی دەستوپێوەندەکانیان بگوێزنەوە. ئیدی لە ناوچەی قەرەداغ شوێنێکیان پێدان.

# هێرشەکانی هەمەوەند

لە 1874دا هێرشیان بۆ باشوور کرد و شارۆچکەکانی سەر سنووریان سەغڵەتدەکرد، لە راستیدا بۆ ئابلۆقەی مەندەلی، کە شارێکی گرنگی سەر سنوورە. بەهۆی لێدانی سوپا و تیرەکانی ترەوە، کشانەوە و چەند هێرشێکی سەرکەوتویان بۆ باکوور کرد تا گوندەکانی مەسیحیەکان لە دەوروبەری بایەزید، ئیدی گەڕانەوە، هەروەها هەواڵەکان دەڵێن، تالآنیەکی زۆریان هێناوە، بێ ئەوەی کەس پەلاماریانبدات، لەگەڵ ئەوەی کە چەکی سەرەکیان نێزە بووە.

دوای پێنج ساڵ بەسەر سلێمانیدا سەرکەوتو نەبوون و شارەکە تەنیا بەهۆی گەیشتنی بەتالیۆنێك سەربازوە لە تالآنی گشتی پارێزرا. دوای ماوەیەکی کورت لەم قۆرخکردنە، لە ئەنجامی هەندێ زوڵم و زۆردا چواردەوری هەندێ سەرەك خێڵی بچووکیان گرت، هەندێکیان رەوانەی تەرابلوسی ئەفریقا کرد، کە دواتر گەڕانەوە. دەڵێن دوای بەسەربردنی شەش مانگ بەسەر رەوانەکردنەکەیاندا، لە رێی گەڕانەوەیاندا هێشتا هەمەوەندەکان عەرەب و تورکیان وەك یەك تالآندەکرد و رووتیاندەکردنەوە. دواتریش جارێکی تر دایان بەسەر ناوچەی تیرە گەورەکەی جافدا و لە لایەن پاشای ئەو کوردە بەهێزانەوە هۆشیاریان دانێ بە رشتنی خوێنێکی زۆری دوژمنایەتی.

لە دەوروبەری ساڵی 1900دا، یان زووتر، بە هاندانی شێخان سلێمانی و قەرەداغ بێبەزەیانە دایان بەسەر کاروانێکی حاجیانی ئێرانیدا لە نزیك کەرکوك، دوو سەد لەو کولۆڵانەیان لەناوبرد. تا ئەو کاتە سلێمانی، رەواندوز و کۆی سنجاق داهاتێکی زۆریان لە حاجیەکان دەستدەکەوت کە لە ئێرانەوە، بە سابلاخدا، بۆ بەغدا تێدەپەڕین، بەلآم دوای ئەوە ئیدی هاتوچۆ نەما و شێخەکانیش سەرچاوەی سامانێکی زۆریان لە دراوسێیەتی خۆیان لە دەستدا لە پێناوی هاندانێکی دەمارگیری بۆ سەربڕینی موسڵمانە شیعەکان.

لە ساڵی 1908 هەمەوەندەکان هێرشێکیان بەرپاکرد، کە دوو ساڵی خایاند و لەو میانەدا تالآنی و کوشتن و بڕییەکی زۆریان کرد، بانگەشەی راپەڕینی خۆیان کرد. لە نێوانی پایزی ئەو ساڵە و هاوینی 1909 خۆیان باش سەلماند بە داماڵینی حوکمداری سلێمانی، بە وەستانی جوڵەی هاتوچۆ، کۆتاییان هێنا بە شکۆی پەلاماری تابوورێك لە سەربازانی تورك، کە لە ئەنجامدا دوانزە کوژران "کە سەرهەنگێك و چەند ئەفسەرێکی دی تێدابوو"، هەروەها بریندابوونی چل یان پەنجای تر و تالآنکردنی هەموو ئەو شتانەی پێیان بوو، لەوانەش تفەنگە ماوزەرەکان، چەند بارێك تەقەمەنی، جلوبەرگ، خەنجەرەکان، بەرگە یەکپۆشەکان و وڵاخەکان، رزگاربووە کولۆڵەکانیان سی و شەش میل

بۆ سلێمانی خۆیان بەکێشکرد. لە میانەی ئەو ماوەیەشدا چەند جارێکی دی هەڕەشەیان لە شارەکە کردەوە و هەمیشە دەستە گەڕۆکەکانیان بەو دەوروبەرەدا دەسوڕانەوە، تەنانەت لاشەی مردووەکانیش دەبووایە لەژێر پاسەوانیەکی بەهێزدا ببرایە بۆ ناشتن و زۆرجاریش بە ڕەزامەندی هەمەوەندەکان.

هەموو هاوینی ساڵی 1909 لە چەمچەماڵدا هێز کۆکرایەوە، کە شارۆچکەیەکی بچووکە لەسەر سنوورەکەی، هەشت هەزار سەربازێك بەپێی پلەکان کۆکرایەوە. بەڵام باشترە ئەوە بزانن کە نابێت جوڵە بکەن تا سەرکردەی ساردوسڕ دەگات، هەمەوەندەکانیش لە شەودا چوونە سەر خێوەتگاکە، ئاویان لــێ بڕین و کەمێ سڵیان لە پاسەوانەکان کردەوە، بەر لەوەی هەر چەشنە دەرچوونێك بکەن خۆیان شاردەوە. سەربازەکان موچەیان وەرنەگرتووە و بێورەن، ئەفسەرەکە لێڕاکشاوە و بێ توانا، سەرکردەش لە بەغدا گیراوە بەهۆی جۆرەها گەندەڵی و تەوەزەلیەوە. دوو حاکم لە سلێمانی و کەرکوکەوە بانگکران بۆ چەمچەماڵ بۆ سازکردنی دادگایەك بۆ دادگاییکردنی ئەو هەمەوەندانەی کاتێ دەگیرێن.

هەندێ کەس لەگەڵ ئەفسەرانی بەرپرس لە لایەن شێخانی سلێمانیەوە پارەیان دەدرایە بۆ ئەوەی چالاکی رابگرن و نەمانی پەیوەندی سەربازان و وڵاخەکان، هێستر یان ئەسپ، ئۆپەراسیۆنەکان لەو کاتەدا مەحاڵ دەکات.

بۆیە هەمەوەندەکان بەخۆشحاڵیەوە بەردەوامیاندا بە هێرشکردن و دەستیانگرت بەسەر نامەکاندا و سوتاندیان، هێڵەکانی بروسکەیان بڕی. کاتێ فەرمانداری سلێمانی داواکرا بۆ چەمچەماڵ سەرەتا رازینەبوو بچێت- لەبەرئەوەی لە دەرەوەی شارۆچکەکە ناتوانێ مامەڵەی مەترسیدار بکات. بەوجۆرە کاربەدەستانی چەمچەماڵ سێ سەد هێستریان لە کەرکوکەوە بەدەستهێنا بە هۆکارێکی سادە و سێ سەد لە باشترین سەربازانی خۆیان نارد بۆ ئەوەی موتەسەڕیفی سلێمانی بهێنن. بە کەڵك وەرگرتن لەم راییکردنە ئەویش پەلەیکرد، لەماوەی حەوت سەعاتدا گەیشتە چەمچەماڵ، بەڵام نەك بەبێ راونان لەلایەن هەمەوەندەکانەوە و لەناوچوونی هەندێ سوارە.

هەروەك ئەوپەڕی هێزی سوارەی هەمەوەندەکان دوو سەد و پەنجا پیاو بوون، بەشێوەی دەستەی بچووك بە ناوچەکەیاندا بڵاوبووبوونەوە، ئەوەی کە پەلاماریدابوون ژمارەیان لە سی، یان چل زیاتر نەبوو، بەڵام سێ سەد پاڵەوانی ئەوان دووچاری هەڵهاتن بوون لەبەر دەستیاندا.

## گەیشتن بە سلێمانی

لە رابردوودا بازرگانەکانی بەغدا، موسڵ و سلێمانی قاڵەقاڵێکیانکرد و حوکومەتی ناوەندیش - کەمێ نادان بوو لە هۆی دواکەوتنی بەرەوپێشچوونەکان- ئیدی فشاریدەدا، کە ئەفسەری فەرماندە لە بەغداوە دەستیپێکرد.

لە هەمان کاتیشدا هەمەوەندەکان لەلایەن هەواڵدەرەکانی خۆیانەوە ئاگادارکران، خێوەت و کەلوپەلەکانیان بپێچنەوە و بە سنووری ئێراندا بپەڕنەوە و بچن بۆ هەرێمی کوردەکانی شەرەفبەیانی، کە تیرەیەکی بچووکی ئەوبەری رووباری سیروانە، لەسەر سنوور.

فرماندەی گشتی بە هاشەوهوشەیەکی زۆرەوە گەیشت، لەگەڵ فرمانی بەدووکەوتنی هەمەوەندەکان و داگیرکردنی ئێران ئەگەر بکرێت، کە تاوانبارە بەوەی تەنانەت ئەگەر پێشوازی لە منالێکی هەمەوەندیش لەسەر سنوورەکانی کردبێت.

هێزەکە بەجارێ دەستیکرد بە دیاریکردنی شوێنی هەمەوەندەکان و کەسی لە دەڤەرەکەی ئەوان نەدۆزییەوە، رەزامەندی ئەوەیان وەرگرت کە سەوزە پێگەیشتووەکان بخۆن و داروپەردووی هەندێ گوندی چۆڵکراو بسوتێنن. بۆ ماوەی دوو مانگ تەواو دڵنیابوون کە هەمەوەندەکان لەو ناوچەیەدا نەماون، جارجارە کوردێکی هەژار و نامۆیان دەگرت بە تاوانی گومان لێکردن.

ئەم کارە پڕ لە قارەمانێتیە بەردەوامبوو، کاتێ منیش سلێمانیم جێهێشت و تا ئێستاش هۆکارم هەیە بۆ باوەڕی ئەوەی کە کۆبوونەوە خۆشحاڵیەکە لە چەمچەماڵ هێشتا هەیە، دوای شەش مانگ لە گەیشتنیان بۆ بەرەنگاری دوو سەد و پەنجا سوار.

رۆژێ دادێ بەجێیدێڵن هەر زوو کە خواردن کەم دەبێتەوە، ئیدی کوتوپڕ هەمەوەندەکان دەردەکەونەوە، بۆ دەستپێکردنی قۆناغێکی تر لە پەلامار و بەرهەڵستیکردن.

کاتێ لەو دەرفەتەدا لە نێوانیاندا بووین، هێشتا هیچ چالاکیەك دژیان نەکراوە و بە رای هەموان هیچ کاروانێك دوای کاروانەکەی ئێمە ناتوانێ بەوێدا تێپەڕێت. بارودۆخەکە ئاوەها بوو، لەبەرئەوەی تا کۆتایی مانگی ئاب، کاتێ خێڵەکە دوور دەکەوێتەوە، کاروانەکان جارێکی تر لە نێوانی سلێمانی و کەرکوکەوە دەڕۆن.

ژمارەیەکی سواری زۆر بۆ بەیانی رۆژی دوایی پاسەوانمان بوون و دوای دوو سەعات لە رێکردن ناوچەکەی ئەوانمان جێهێشت، لەداوێنی لای رۆژئاوای کۆمەڵەی گردە سنووریەکانی رۆژئاوا، دواجار لەسەر ملەکەوە رێڕەوێکمان دۆزییەوە. لە ترۆپکی ئێرەوە دەمانتوانی کۆمەڵەیەکی درێژی گردەکان

ببینین لەسەر لاکەی بەرامبەری دەشتێك کە نزیکەی 12 میل پانە و دوورە لە دیواری رۆژهەلاتی داپۆشراو بە بەفر، چیای هەورامان و ئێران. ئەوە دەشتی سورچینەیە، لەسەر سنووری رۆژئاوا کە سلێمانی دەکەوێتە سەر. لە داوێنی رێڕەوەکەدا پاسەوانە هەمەوەندەکە هێمای ئەو شوێنەی دەکرد کە لەم دواییەدا کاروانێکیان تێدا رووتکردەوە، بووە هۆی کوژرانی هەموو سەربازە پاسەوانەکان و لەناوبردنی ژمارەیەکی زۆری نێراوەکان و ئامارەکانی میری. شڕەوپڕەی هێشتا لەو ناوە کەوتووە و یەکێك دەتوانێ کۆتایی رستەکان بخوێنێتەوە و ئەوەش بۆ ماوەیەکی درێژ گەشتیارانی سەرقاڵ کردبوو. ئەو ناوچەیەی بەناوی هەمەوەندەکانەوە دەناسرێت، رێگایەکی بچووکە دێتەناو ئەم دەشتەوە و ژمارەیەکی زۆریان لەلای جۆگاکەدا لە دەوارە رەشەکانیاندا هەڵیانداوە و رانە مەڕەکانیشیان لاپاڵی گردەکانیان داپۆشیووە. نزیکبوونەوە لە سلێمانی، گەیشتینە کۆمەڵە گردۆڵکەیەك کە لە بنەڕەتدا باخاتێکی پانوبەرین بووە. ئێستا پارچە زەوییەکی چۆڵە و ژمارەیەکی کەم درەختی تێدایە کە لە بێ ئاویدا خەریکە وشك دەبن.

لە دەوروبەری سلێمانی ولاتەکە تەواو ئاودارە بە ئاوی رووبار و چەند جۆگایەك، بەلام ترس لە هەمەوەندەکان لە کاتە ئالۆزەکانیدا و حوکومەت و شێخەکان لە رۆژانی ئاشتی هێمنیدا، بوونەتە هۆی هەڵهاتن و چۆڵکردنی ناوچەیەکی دەوڵەمەند بە کشتوکاڵ. گەیشتن بە دەوروبەری سلێمانی هەمان دیاردەی غەمگینی پۆشتەیی رابردووە. ئێستا هیچ باخ و باخاتێ لە دەوری شارەکەدا نییە و میوەش لە گوندەکانی لاکەی تری چیاکانەوە دەهێنن، کە لە دەرەوەی سنووری هەمەوەندەکانە، بەلام بە نرخێکی زۆر گران.

سلێمانی کەوتۆتە ناو دۆڵێکی داوێنی شاخەکانەوە لە نێوان دوو پەلی شاخدا، لە ناوەندێکا کە ئاوێکی زۆر باشی لێهەڵدەقوڵێت. شارەکە بەتەواوی بێبایەخە؛ نە بینایەکی گەورە و نە هیچ شتێکی ئاشکرای تێدایە، جگە لە منارەیەك کە لەم دواییەدا بیناکراوە. لە دەرەوە وادەردەکەون، بەڵێ سەربانی گڵی تەخت بە یەکەوە نوساو، لێرە و لەوێش هەورەبانێك لەسەر بانەکە بۆ خانووە گەورەکان کراوە. نە دیوار و شورا و نە قولە و قەلای بەدەورا کراوە و هەر یەکێ بیەوێت لەو دەشتەوە دەچێتە ناو شارەکەوە، دەورویەری بچووك و خانوەکانی یەك نهۆم و بچووکە، لەناو حەوشەکاندا دەتوانرێ ژنی شۆخ و شەنگ ببینرێ کە خەریکی کارێکی نەگۆڕە و تەنیا کارێك کە جێبەجێیدەکات جگەرەکێشانە.

نزیکی لە کوردستانی ئێرانەوە زۆر بە ئاشکرا لێرەدا رەنگیداوەتەوە، شێوازی هەژارانەی بیناسازی هەمان شێوەی سنە و سابلاخە و خانوە باشەکانی تریش لە شێوەی شارەکانی رۆژئاوای ئێرانە. ئێمە رێگاکەمان بە رێگایەکی ناو بازارێکی کراوەدا بوو بۆ کاروانسەرایەك، کە بڕیارە من لێیبمێنمەوە. ئەوەش بەتەواوی لەسەر شێوازی فارسی بیناکراوە، ریزێك ژوور بەدەوری حەوشەیەکدا، کە لەسەر هەیوانێکی نزم کراوەتەوە.

ژوورێکم دەستکەوت و شتەکانم فڕێدایە ناویەوە، ولآخدارەکەم مەرەخەسکرد، کە داوای بەخشیشی دەکرد بۆ ئەوەی منی بە سەلامەتی بەناو هەمەوەندەکاندا گەیاندۆتە سلێمانی.



شاخی هەورامان

# بەشی نۆیەم

# سلێمانی

سلێمانی، کە لێرەوە زنجیرەی چیای هەورامان سنووری لەسەر نیشانەکراوە و لەوانەیە ببینرێت، کە لە راستیدا نزیکەی شەست میلە لە نزیکترین خاڵی سەر سنووری ئێرانەوە و سەد میلە لە ترۆپکی هەورامانەوە، کە لە شارەکەوە دەردەکەوێت. شاری سلێمانی کەوتۆتە داوێنی زنجیرە چیاکانی ئەزمڕەوە، کە پشتیوانی تەختاییەکانی فارسی دەکات لەم خاڵەدا و هەروەها گەورەترین شارێکی کوردی باشووری کوردستانی تورکیایە، بەڵام سەرەڕای گرنگی بازرگانی و سیاسی، کە جارێك هەیبووە، کەچی شوێنێکە بەبێ مێژوویەك کە شایانی باس بێت.

ناڕاستەوخۆ قەرزداری یەك مەلا ئەحمەدە- فەقێ ئەحمەدی دارەشومانە، کە 350 ساڵ لەوەبەر لە جەنگدا یارمەتی تورکەکانی دا. ئەو کەسە پیاوێکی ئاینی کوردە و دانیشتوی گوندی دارەشومانەیە لە پشدەر، کە دەکەوێتە باکووری سلێمانییەوە و یەکێکە لە بنەماڵەی نورەدینیەکان لە تیرەی بابان. لە پێناوی خزمەتگوزارییەکەی بە تورك لەلایەن سوڵتانی فەرمانڕەواوە زەوی و زار و چەند گوندێکی دیاریکراوی خەڵاتکرد و ئەویش لە گوندی قەڵاچوالاندا خۆی دامەزراند، کە ئێستا پێیدەوترێ قەرەچوالان، کە گوندێکە لە باکووری زنجیرەی ئەزمڕدا، ڕێگەی یەك رۆژ ڕێکردنە لە سلێمانییەوە. ئیدی لەوێدا مایەوە تا کۆچی دوایی کرد و ئەوانەی لەدوای جێمان، بوون بە فەرمانداریکی بەهێزی نیمچە سەربەخۆ، فەرمانداری سورچینەن، کە ئێستا سلێمانی دەکەوێتە ئەوێوە و زەوییەکانی دەوری قەڵاچوالان. ئەو فەرمانداراەنەش، وەکو زووربەی زۆری فەرمانداارانی سەر سنووری سلێمانی، بەهەرحاڵ زۆر بە ئەمەك بوون بۆ تورکەکان و ئەو ئەمەکدارییەشیان دەگواستەوە بۆ ئێران کاتێ بۆیان بگونجایە.

## مێژووی سلێمانی

لە سالی 1779، لە سەردەمی سلێمان پاشای بەغداد، بنکەی حوکومەت گواسترایەوە بۆ ئەو شوێنەی ئێستای شارەکە و خانوی میری و بیناکانی تری تێدا بیناکرا و شارە نوێکە ناونرا سلێمانی، نەک سلیمانیە.

ئێستا بەرەیەک لە پاشایانی کورد فرمانڕەوایی دەکەن، لەگەڵ ئیبراهیم پاشادا دەستپێدەکات و نەوەکانی بەدوایدا هاتوون. ئەم فرمانڕەواییە تا سەردەمی عەبدوڵڵا پاشا، کە لەگەڵ نامیق پاشای بەغداد هاوسەردەم بوو.[51] فەرمانڕەوای سلێمانی، هات بۆ بەغدا بۆ دیدەنی والی، پێکەوە لەگەڵ ئەحمەد پاشای برای دەستبەسەرکران و بەچاودێری پاسەوانان نێرران بۆ ئەستەنبوڵ. ئەوە لە ساڵی 1851دا بوو، هەروەها کۆتایی فەرمانڕەوایی کوردیش بوو لە سلێمانی. تورکێک بەناوی ئیسماعیل پاشا کرا بە قایمقامی سلێمانی، لەگەڵ ئۆردوگایەک و ئیدی لەو کاتەوە سلێمانی لەژێر فرمانی حوکومەتی تورکدایە. دوو پاشا کوردەکان سێ ساڵێک لەوەبەر کۆچی دواییان کرد و کوڕەکانیان وەک خانەنشینێک لە ئەستەنبوڵ دەژین.

ئیبراهیم پاشای کورد فەرمانڕەوایی ناوچەی سلێمانی و قەرەداغی بۆ باشووری ڕۆژهەڵات بەدەستهێنا، کۆشکێکی گەورەی بۆ خۆی لە لاپاڵی بەرزاییەکدا بیناکرد، کە ئێستا حاکمی نوێ یان موتەسەڕیفی تێدا نیشتەجێبووە. بەدەوری ئەوەدا و بەرەوخوار شارەکە پێکهاتووە. بنەماڵەی شێخەکانی کۆن، یان ڕابەرانی ئایینی، هەروەها خۆیان لەوێدا پێگەیاندووە و بینای گەرماو و مزگەوت گرنگیەکی دیاریکراوی بۆ شوێنەکە بەدەستهێناوە. بەهەرحاڵ، کورد ئاوەدانکەرەوەیەکی باش نین و دانیشتوانی شارە نوێکە بریتیە لە چەند تاقمێکی جیاواز لەو کەسانەی بەدوای بازرگانیەوەن. ئەوانە لەم ناوچانەدا، تورکومانی کەرکوک، جولەکە و مەسیحی- سریانی و کلدانی، بەگشتی دواتر. دەڵێن، کە لە ساڵی 1825دا لە بڕی هەزار خانووی کە شارەکەی پێکهێناوە، 800 خانووی لەلایەن مەسیحیەکان و جولەکەکان و تورکومانەکانەوە پڕبۆتەوە. گەڕەک سەرتاپا بە کوردەکانی تیرەکانی مەرگە، شوان، هەمەوەند، بانە و جاف دەورە درابوو، زمانی شوێنەکەش لە یەکەمەوە کوردی بوو. لە هەمان کاتدا شێخەکانیش دەستەڵاتی خۆیان لەپێناوی شەڕ و

---

51- هەروەها لە میانەی چەند ساڵێکدا لە نیوەی یەکەمی سەدەکەدا، کە سلێمانی لەژێر دەستی فارسدا بوو.

کۆیریاوەڕیدا بەکاردەهێنا، ژیانیان بۆ مەسیحیەکان و جولەکەکان تەواو سەختکردبوو، کە ژمارەیەکی زۆر هەموو ساڵێك لە ئاینی تایبەتی خۆیان وازیاندەهێنا بۆ رزگاربوون لە چەوسانەوە، دوای گۆڕین ئیدی جلوبەرگ و زمانی کوردەکانی ناوچەکەیان بەکاردەهێنا. لەم کەرەسە زۆر تێکەڵاوە خەڵکێك پەیدابووە کە پێشینانیان منالّی رەگەزانێکی بەرفراوانی جیاواز لە هەست و سروشتدا، تێکەڵە لە وەچەی ئاری، سامی و تورك، کە هەموو یەکێکیان خاوەنی سیفاتێکی ناپەسەندی هەر نەژادێکە و زۆر پڕ جۆش و خرۆشی کوێرەباوەڕیە کە- لەژێر سایە و چالاکی هاندانی شێخەکاندا- هەرگیز لاواز نەبووە، ناوێکی بۆ سلێمانی بەدەستهێنا بۆ نەزان و دڕندە و کەنارگرتن کە ئێستا ئەو وێرانکاریەی خۆی بۆ سازاندووە.

لەگەڵ ئەوەشدا، لە سایەی فرمانڕەوایی بەهێزی پاشا کۆنەکاندا، شێخانی ئایینی نەیانتوانی ئەو کاریگەریە ناپەسەندەیان هەبێت، کە بەهیوابوون لە سەردەمانی زوودا پێی هەستن. لەبەرئەوە شارەکە پێشکەوتنێکی مەزنی بەخۆوە بینی و بوو بە بازاڕێکی گرنگ بۆ خووری و پێستەی خێڵەکان و بنکەی دابەشکردنی هەموو کەلوپەلێکی نێرراو لە موسڵ و بەغداوە بۆ رۆژهەڵاتی کوردستانی ئێران. لە قەرەداغ و شارەزووردا دانیشتوانێك لە کلدانەکان و جولەکەکان هەیە و پارێزگارییان لە ئایینی خۆیان کردووە و بەجیا دەژین و یان لەگەڵ دانیشتوانی موسڵمانەکاندا تێکەڵبوون، بە مەبەستی بازرگانیەکی بەهێز و پێشکەوتو. پاشا هەمیشە مەرجی باشی پاراستووە لەگەڵ سەرۆکی تیرەی مەزنی جاف و پارێزگاری بە ژمارەیەکی تەواو لە سوارەی چەکدار و بەتوانا کردووە، بۆ دابینکردنی ئاسایش لەناو سنوورەکاندا و بەو شێوەیە سلێمانی بوو بە یەکێ لە گرنگترین شارەکانی سەر سنوور. لە میانەی شەڕەکانی بەشی یەکەمی ئەم سەدەیە، ناوچەیەکە لەگەڵ شارەزووردا بوو بە دراوسێی ناوچەی ئێران، وەك سەردەمانی زووتر، بەڵام لە لایەن تورکەوە سەنرایەوە و بەپێی پەیمانی 1847 لەژێر دەستیدا مایەوە.

لەم سەردەمەدا کۆمەڵکوژییەکی مەسیحییەکان لە هەموو لایەکی باشووری کوردستانی تورکیادا رویدا، لەو بەشەدا بەهۆی یەکێ لە خێزانی شێخەکانەوە ئەوە بەرپابوو، لە ئەنجامی ئەوەشدا، دەستەڵاتی سەرکردەکانی کوردە سەربەخۆکان زۆر لاوازبوون، وەك بینیمان، تورکیش سەرکەوتوبوو لە بەرەنگاری بەردەوامی دەستەڵاتیان. لەم پنتەدا، پاشایانی کورد دەستەڵاتیان بەسەر شێخەکاندا لاوازبوو، بۆیە ئەندامانی خێزانی شێخەکانی سلێمانی خۆیان خستە ئاستێکی زۆر بەهێزەوە و فەرمانڕەوا و فەرمان بەسەرداکراو وەك یەك لە ترس و سامی ئەواندا دەژیان.

# شێخ سەعید

بە درێژایی ژیانی سوڵتان عەبدولعەزیز تا ساڵی 1876، بەشێك لە باشی سیستەمەکەی بە شێوەیەکی ڕێژەیی شێخەکانی ملکەچ کردبوو، ئەوان خۆیان بە بەدەستهێنانی پایەی پیرۆزی و زەویوزار و کڕینی گوندەکان شادمانکردبوو.

شێخ سەعید، سەرۆکی بنەماڵەکە لە بەدەستهێنانی ئەو ئامانجانەدا بەشێوەیەکی باش سەرکەوت، کە بە چواردەوری سلێمانیدا زەویوزاری بەدەستهێنا و لە دەرەوە ناوی دەرکرد و ئەوەیان سەپاند کە ئەو هێزی پێشبینی و زانیاری نادیار و داهاتوی هەیە.[52] پێشتر ئەو هەیبوو، بەدڵنیاییەوە لەلایەن سیستمێکی تەواو نمونەیی هەواڵدەری و پەیوەندیەکانەوە. پێشبینی و نوقڵانەکانی بەشێوەیەکی ئاسایی لەلایەن بریکارە نهێنیەکانیەوە بە زەبری خەنجەر و گوللە بەجێدەهێنا. نائاسایی نەبوو کە ناوەکەی ترسێنەر بوو، ئەو ستایشە زیادەیەی کە بۆی دەکرا، کە خەڵکی سڵاویان لە ئەسپەکانیشی دەکرد.

دوای کۆچی دوایی سوڵتان عەبدولعەزیز و پاش هاتنی سوڵتان عەبدولحەمید، ئەم شێخە زۆرزانە دەستیکرد بە پرۆژەی خۆزلکردن و دەوڵەمەندکردن، کە لە کۆتاییدا لە ساڵی 1909دا بووە هۆی کوشتنی.

بینینی سوڵتانی گەندەڵ و چاوچنۆك و دەستوپێوەندەکانیشی نائاساییانە کاسەلێس و ناڕاست، گەشتێکی تری لەگەڵ شێخێکی ناوداری تر - شێخ قادر- بۆ ئەستەنبوڵ کرد، بە دیاری و باربوویەکی گەورەوە بەزەیی ئیمپراتۆری بۆ خۆی و خێزانەکەی دابینکرد. هەروەها بەو دیاریە دەگمەنەوە شایستەی بڕواپێکردنە و بە هاوکاری وابەستە و یاسای ئایینی کە هێناویتی بۆ پشتگیری هەموو بۆچوونەکانی، بە کردەوە بوو بە ڕاوێژکاری ئایینیی سوڵتان عەبدولحەمید. جەڵتەیەکی دەماخی کۆتایی و سەرکەوتنی بلیمەت بوو کاتێ شێخ سەعید و سوڵتان و عیزەت پاشا- لە بیرەوەری شەڕەنگێزیدا- لە ڕاستیدا بازنەیەکیان بۆ چەوساندنەوەی ناوچەی سلێمانی پێکهانی، تێکەڵەیەکی سیانی دەوڵەمەند بوون. عیزەت پاشا ئەفسەری بێ توانا و گەندەڵی بۆ حوکومەتی ناوخۆ دابیندەکرد، سوڵتانیش لەپاڵ باجەکانیشدا دەرامەتی داهاتیشی کۆدەکردەوە،

---

52- امر الغانیب و الموستقبل.

شێخ سەعیدیش بێ ئەوەی بە هیچ شێوەیەك بە فەرمی بەرپرس بێت لەو بارودۆخەی سلێمانی، ئازاد بوو لە پێشێلکردنی مافی میللەت و فشارخستنە سەر ناوچەکە تا ئاستی ئەوەی تەنیا خۆی و بنەماڵەکەی بمێنێت، تەواو دەوڵەمەند بوو، تێفکرین لە شار و وڵات شەکەت و داڕوخاوە.

لە چرکەساتی گەیشتنە دەستەڵاتی سوڵتان عەبدولحەمیددا، سلێمانی زۆر لە رابردوو گرنگتربوو، بوو بە بازاڕی ساخکردنەوەی هەموو بەرهەمی کوردستانی باشووری. فەرش لە وڵاتەکەوە دەهات بۆ ئێرە بۆ فرۆشتن، هەروەها گواستنەوەی بۆ موسڵ و بەغداد. روەکی کەتیرە لە بانەوە دەستپێکرد و فرۆشتنی لێرە باشتربوو وەك لە سنە، ژمارەیەکی زۆر لە کلدانەکانی موسڵ بە کارێکی فراوان و سودمەند لە جلوبەرگی لۆکە لە حەڵەبەوە و قوماشی ئەوروپاوە سەرقاڵن، کە لە سلێمانی دەفرۆشرێت و دەنێرێت بۆ هەمەدان لە رۆژئاوای ئێران، هەندێ پیشەی دەستی شوێنی تایبەتی خۆی لە بازاڕەکاندا دۆزیوەتەوە، بەتایبەتی پێڵاو- و زین- دروستکردن و هەروەها دروستکردنی خەنجەر و تفەنگ. بەگ و پاشاکانی خێڵی جاف کاروانسەرا و بازاڕیان دروستکردوە و کەوتونەتە پەیوەندی لەگەڵ بازرگانەکانی سلێمانیدا و هەموو بەرهەمی ئەو خێڵە گەورەیە لە پێستە و خووری و توتن و رۆن بەناو ئەو بازاڕەدا تێدەپەڕی. کاروانی بەغدا هەموو دوو هەفتەیەك دەهات و بە هەمان ماوەش هاتن و چوون بۆ موسڵ. جار جارەش، هەروەها کاروان دەچوو بۆ بانە و مەریوان و سنە و سابلاخ- مەهاباد. ئیدی پایەی حاکم بەرزبۆوە بۆ موتەسەڕیف- پارێزگار و سەربازگەیەکی گەورەتر لە شوێنەکەدا جێگیربوو.

پێموتراوە کە لە ساڵی 1880دا پەنجا کلدانیی موسڵ و بیست بازرگانی هەمەدانی فارسی لێرە جێگیربوون. ئەوەی دواییان زۆر گرنگە وەك بەشێك لە ریکلامی بازرگانی دانیشتوان بۆ بەکارهێنانی کاروانسەرایەکی تایبەتی، کە ناوی - خانی عەجەم- (کاروانسەرای ئێرانیان)ی بەسەردابڕاوە، ئەو ناوە تا ئەمڕۆش پارێزگاری لێکراوە و بەڵام یەك فارسیش لە سلێمانیدا نەماوە. نرخی ئەو بازرگانیە- کە کاری بازرگانی ناوخۆ ناگرێتەوە- ساڵانە دادەنرێت بە زیاتر لە نیو ملیون لیرە، واتە کۆی گشتی ئێستا هەرگیز ناگاتە ئەو ئاستە، کاتێ کە بەرزترین بڕی ساڵێکی باش چوارسەد هەزار لیرەیە، کە بەردەوام لە کەمبوونەوەدایە.

لە ساڵی 1881دا ستەمکاریی شێخەکان بە هاوئاهەنگی لەگەڵ حوکومەتدا، کە باجی زۆرەملی بووە هۆی بەرپابوونی هەڵچوونی بەشێکی میللەت و داوایان لە هەمەوەندەکان کرد کە ئابڵوقەی شارەکە بدەن و موتەسەڕیف و شێخەکان دەرکران.

شارەکە ماوەی چوار رۆژ بەرەنگاریکرد و لە خاڵێکدا ئیدی شکا، کاتێ کە بەتالیۆنێك لە کەرکوکەوە هات و دەستیگرت بەسەر بارودۆخەکەدا، لە هەمان کاتدا شارەکە درایە دەست شێخە داخ لە دڵەکان. ئیدی شێخ سەعید دەستیکرد بە هەڵمەتی تالانیەکی ئاشکرا. برە پارەیەکی زۆر لە بازرگانەکان بەبێ هیچ بیانوویەك زەوتکرا و ئەو ژمارە کەمەی کە بەرەنگاری ئەو داوایە بوونەوە دەستبەجێ کوژران، کە لە راستیدا بۆ ترساندنی ئەوانی تریش بوو، لە هەمان کاتیشدا سیاسەتی رابەریی و نان بدەیی و پشتوپەنای پیادەکرد. هەر کەسێك بچێتە ماڵی شێخەکان خواردەمەنی وەردەگرێت و دادەنرێت بە دەستوپێوەند. لەم رێگەیەوە هەموو خەڵکە بێ نرخەکانی دانیشتوان بوون بە لایەنگیرانی شێخان و دوکانێکی زۆر لە بازاردا کرایەوە، پۆلێکی نوێی لایەنگیر پەیدابوون کە لە کۆتاییدا بوون بە کۆی بازرگانان لە سلێمانیدا. لەم رۆژانەدا بیرورا دەربرین لەبارەی شێخانەوە پڕ مەترسی بوو، لە هەموو گۆشەیەکدا، سیخورێك یان دەستوپێوەندەکان، کە راپۆرتیان لەبارەی هەڵسوکەوتی هەموو کەسێکەوە دەدا بە گەورەکانیان. ئەو کەسانە هەموو شتێیەکیان لەبارەی ژیانی تایبەتی و جوڵە و دانیشتنی هەموو کەسێکەوە - مەسیحی یان جولەکە یان موسڵمان- لە سلێمانیدا دەزانی. رووداوی کوشتن زۆر دووبارە دەبووەوە، بۆ دیارنەمانی "کەسێکی یاخی" نەدەبووە هۆی باسکردن و بەزەیی هاتنەوە، پیاوکوژەکەش هیچی لەسەر نەبوو، تەنیا دانوسانە بە ملکەچی بۆ شێخەکان بۆ ئەوەی ستایش بکرێن لەسەر ئەو دەستدرێژییە لە جیاتی تاوانبارکردن. لە میانەی هەموو ئەوانەدا، بازرگانەکان بوون کە دەچەوسانەوە. فارسەکان لەبەرئەوەی شیعە بوون لەژێر ستەمی سوننەدا دەچەوسانەوە، لەگەڵ ئەوەشی کە شێخەکان نەیاندەتوانی راستەوخۆ بیانچەوسێننەوە، چونکە ترس لە ئێران هێشتا لەسەر سنووری وڵاتەکان زۆرە، بەلایەنی کەمەوە، زیانێکی زۆریان گەیاند بە ئیش و کارەکانیان، کە دەریانپەڕانن لە سلێمانی.

بنەماڵەی شێخ تا رادەیەك دەستیانگرت بەسەر هەموو باخ و بێستانی دەوروبەری شارەکەدا، کە میوە و سەوزەی لێ بەرهەمدەهات، ئێستاش بە پەیوەندی لەگەڵ دەستەڵاتی شارەکەدا باجێکی نوێیان سەپاندووە لە بردنەدەرەوە و هێنان و بردنی بەرهەم. ئینجا شێخەکان دەستیانکرد بە پیادەکردنی سیستمێك، کە بەپێی ئەوە لە سەدا سێ سەدی سەپاندووە، باجێکی تایبەتی بۆ ئەو میوەیە دانراوە، کە دەهاتە شارەکەوە. لە ماوەی دوو ساڵدا هەموو بەرهەمهێنەرێك ئاگری بەردایە

درەختە میوەکانی و جۆگە و ئاوەڕۆگەکانی وێرانکرد و رایکردە ناو خاکی ئێرانەوە، بۆ توتنکردن لەوێ. دوای رووداوەکانی ساڵی 1881، کاتێ هەمەوەندەکان تا رادەیەك لە دەستگرتن بەسەر سلێمانی و تێکشاندنی بنەماڵەکەدا سەرکەوتن، شێخ سەعید لە گرنگێتی خێڵ و بەکارهێنانێکی گونجاو وەك چەکێك تێگەیشت. ئیدی بۆئەوەی دەستبگرێت بەسەریاندا، لە میانەی زنجیرەیەك هاوسەرگیری حەکیمانەوە، توانی پەیوەندیەکی دۆستانەی توند لەگەڵ شێخانی قەرەداغدا گرێبدات. ئەو سیاسەتە زۆر بە باشی سەرکەوتووبوو، لە ساڵی 1908دا خێڵکە خۆی بینیەوە کە ناتەوانایە لە بێ فەرمانی شێخەکان، کاتێ فرماندرا یاخیبوونی خۆیان رابگەیەنن. ئیدی ئامانجی بنەماڵەکە تەنیا بەدەستهێنانی سامانی سلێمانی نەبوو، بەڵکو هەروەها بۆ سەلماندنی هێز و توانای مەزنیان تا ئەو رادەیەی، کە حوکومەت پێویستە ناچاربێت بیانکات بە فەرمانداری سلێمانی، لەژێر سێبەری ئەو بێ هیوابیەی کە نەتوانرا بە هۆکارێکی تر ئاسایش بەرکەماڵ بێت. لە تەموزی ساڵی 1908دا کودەتا لە ئەستەنبوڵ بەرپابوو، تورکیا سیستمی دەستووری راگەیاند و شێخەکان ئەگەری بێدەستەڵاتی خۆیان دەبینی و بگرە لەوەش نالەبارتر- تۆڵەسەندنەوە.

سوڵتانەکە، بەهەرحاڵ، دەستەڵاتێکی زۆری هەبوو- زیاد لەوەی چاودێرە ئەوروپیەکان گومانیان دەبرد- کە هیواخوازە لە زیادکردنی و ئەو دژ بە ئاژاوەی سەرکێشی نەبوو، کە پێویستە کێشەکانی بۆ کاری چاکسازی زیادبکات. دەستەڵاتە کۆنەکە، گەندەڵ بوو، وەك ئەوەی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا کارابوو، بەتایبەتی لە بەشە دوورەکانی تورکیای ئاسیادا، بۆ سوڵتان هەمیشە هەرە بەشی بەهێزی لە تەکدا بوو، کە لە میانەی هۆکارەکانی دزی و راووڕوتەوە داهاتی بۆ زیاد دەکرد،[53] کاتێ بەرژەوەندی ئەو کەسانە لەگەڵ بەرژەوەندی سیستمەکەدا هاوجووتبوون- کە زۆر جار هەروەهایە- ئەوسا دادپەروەری خێرا و کارا بوو.

پێویست بە وتن ناکات، وەلانانی رژێمی کۆن واتە بێگانەیی ئەو هێزانەی لە ئاستی دەستووریەکانەوە، ئەوەش مەرجێکی ئاشکرابوو کە لە هەمان کاتدا هیوای دەدا بە سوڵتان و بێ هیوایش بە ئەنجومەن، کە لە توانایدا نییە هێزێکی تەواو بەدەستبهێنێت لە بەرانبەر هەر ئاژاوە و یاخیگەریەکدا، لەوە زیاتر حوکومەتی نوێ نەیدەتوانی موچەی سوپا دوابخات لەوەی کە سوڵتان عەبدولحەمید ئارەزوی دەکرد.

---

[53]- نمونەی بەرچاوی ئەو تایبەتمەندیە بۆ سیاسەتی عەبدولحەمید، ئیبراهیم پاشا بوو، شۆرشگێری کوردی حەران، کە مێژووەکەی لە نوسینێکی میستەر فرازەر بەناوی Short Cut to India دیاریکراوە.

بەتایبەتی لیڤیەکانی تورکمان و کوردەکان لە سوپادا تەواو یاخیبوون، هەر فرمانێکیان بۆ دەربچووایە ئەوان ڕەتیاندەکردەوە. بۆیە هەمەوەندەکان بەناچاری دەرچوون بۆ هێرشبردن و لەناوبردنی ئەوانەی دەهاتە پێشیان. بارودۆخەکە لە سلێمانیدا زۆر ئاڵۆزدەبوو، بەهەرحاڵ، شێخەکان نەدەکرا لەلایەن پارتی نوێوە لە ئەستەنبوڵ پشتگوێ بنرێن. بازرگانەکان ئێستا دوو ئەوەندە و سێ ئەوەندەش ئازاردەکێشن. ئەگەر کەلوپەلەکانیان لەسەر دەستی هەمەوەندەکاندا لەناونەچێت، لێپرسراوانی گومرگ، شێخەکان و فەرمانبەرەکانی شار بە کردەوە وێرانیانکردووە، بەردەوام داخوازی بە بروسکە لە سلێمانییەوە دووپاتدەکرێتەوە و لە دواجاردا حوکومەت تێگەیشت کە بەکارهێنانی هێز مەحاڵە، هانی شێخ سەعید درا کە بێت بۆ موسڵ، لەگەڵ هەندێ لە ئەندامانی تری خێزانەکە. لەوێش دەستگیرکرا و پاش ماوەیەکی کورت ئاژاوە بەرپابوو، کە ئەوی تێدا کوژرا. تاوانبارەکەش هەرگیز ئاشکرا نەکرا. ئیدی ئاژاوە لەناو دانیشتوانی موسڵدا بەرپابوو، کە پەیوەند بوو بە کاروباری تایبەتی خۆیانەوە، دوای ماوەیەك ئەوان لە سەرەتای ئاژاوەکان دوورخرانەوە. لەگەڵ یەك ڕێکەوتندا، کە لەوە دەچێت لەژێر ڕێنماییەکانەوە گەیشتبێت، ئاپۆرەی ماڵەکەی شێخ سەعیدیان داوە و ناچارکراون و ژمارەیەك چوونەتە ژوورەوە و پیرە شێخ کوژرا. ئەوە ئاماژەیەك بوو بۆ ئاژاوەی زیاتر لە کوردستانی باشووریدا. شێخ سەعید بەوەش ناوبانگی پیرۆزیەکی نائاسایی بەدەستهێنا و ئەوەش لەپاڵ دەستەڵاتەکەیدا بووە هۆی بەرزکردنەوەی ئەو دەنگی توڕەییە لە هەموو لایەکەوە. شێخ قادری نوێنەر لە ئەستەنبوڵ، زنجیرەیەك وتاری هاندەری بڵاوکردەوە و بەناوی هەموو یاساکانی ئیسلامەوە داوادەکات، ڕاپەڕینێکی بەپەلە و تۆقێنەر بەسەر بکوژەکاندا. ئیدی ئەندامە لاوەکانی خێزانەکە ڕێگەیان پێدرا لە موسڵەوە بۆ سلێمانی بگەڕێنەوە، دوای ئەوەی سوێندیان خوارد کە تۆڵە لە بازرگانەکانی ئەو شارە بکەنەوە، لەبەرئەوەی وای بۆ دەچن کە بکوژەکە بە هاندانی ئەوان ئەو ناپاکیەیان بەرامبەر بە شێخ کردووە. بە توڕەیی گەڕانەوە. شاری سلێمانی ناچارکرا بە قووڵترین پرسە. هەموو قەوان و ئامێری موزیك بەزۆر لە خاوەنەکانیان سەندرا و تێکیانشکاند و هەموو ئاهەنگی زەماوەندەکان لەناکاو و بەغەمباری کۆتایی پێهێنرا. شێخ مەحمود کرایە ڕابەری بنەماڵەکە و توانای بەسەر زوڵم و زۆر و تاواندا پێشاندا، کە وێنەی نەبوو لەلایەن شێخ سەعیدەوە لە بەهێزترین ڕۆژانی دەستەڵاتیدا. ژمارەیەك لە بایەخدارترین بازرگان لەپێناوی ئەوە و بە بیانوی تۆڵەسەندنەوە کوژراون. تاڵان و دزی لە هەموو لایەکدا ڕوویدا. بۆ دەربڕینی ئارایەك، تەنانەت ئەگەر لەبارەی قاپشۆرەکەی شێخیشەوە بێت، هەمان شەو بەرەوڕووی

کوشتن دەبیتەوە. هەروەها دوای هەموو تورەیی و هەڵچوونێکی نوێ، پۆلیس و حاکم مزی خۆیان پێدەگات و خەڵکە کلۆڵەکەش لە خەفەتدا دەستی خۆیان دەگوشی، بە چرپەش ناوی تاوانباران دێنن و دەڵێن: " Piaoi shaikhana" - واتە پیاوی شێخانە.

والی موسڵ بڕیاریدا لەبەر دوو هۆ بچێت بۆ سلێمانی. بۆ هەوڵدانی لێکۆڵینەوە لە ئاژاوەکانی ئەوێ، ئەوە یەکێك بوو، هەروەها سزای دزەکانی موتەسەڕیف- پارێزگار- بدات، کە شارەکەی جێهێشتووە و لەلایەن سوارەکانی شێخەوە دەستدرێژی کراوەتە سەر و خەریك بوو ژیانی تێدابچێت، ئەوەش هۆکەی ترە. بەدڵنیاییەوە شێخەکان تاوانبارەکانن، بەڵام لە تواناداا نەبوو هیچ تاوانێکیان بەسەردا بدرێت، چونکە خەڵکی زۆر سڵیاندەکردەوە لەوەی کە بە ئاشکرا سکاڵابکەن، ئەو برە فرمانبەرەی لە شارەکەدا مابوونەوە کڕابوون.

والی بەخێرایی لەسەر هێڵی بەردەوامی سەقامگیربوو، کە نابێت خۆی دووچاری ململانێ بکات لەگەڵ ئەوانەی کە ناتوانێ بیاناخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، کە لەوانەیە لە هەمان کاتدا ئەنجامی قازانجی دارایی بێت بۆ خۆی. کاتێ کە ئەو هێشتا لە چەمچەماڵە، لە وێسگەیەك لەسەر سنووری رۆژئاوای وڵاتی هەمەوەند، ئەو سەرکەوتوبوو لە پەیوەندیکردن بە شێخەکانەوە لەبارەی بیروڕاکەیەوە" لێکۆڵینەوەیەکی ورد و بێلایەنانە و راپۆرتێك". وەك نەریت دانیشتوانی سلێمانی بەسواری بۆ ماوەیەك دەرچوون بۆ بینین و پێشوازیکردنی و لەو چاوپێکەوتنەدا بازرگانەکان ئەوەیان درکان کە بێ هیوان. هەردوو تاقمەکە، شێخان و بازرگانان، بەسواری دەرچوون و لە نزیك رووبارەکەی کە بە دۆڵی سەرچناردا تێدەپەرێت بە والی گەیشتن. شێخەکان ئاوزەنگیان بۆ پێشەوە لێدەدا، بەرێزترین پێشوازیان لێکرا، بەوپەڕی پەرۆش و لێپرسینەوە و والیش چووە ریزی ئەوانەوە، بە نەرمە غارێك لەگەڵیاندا رۆشتن و خۆیان لە بازرگانە چاوەڕوانکەرەکان گێلکرد. لە ماوەی بیستوچوار سەعاتدا فرمانی بانگکردنی هەموو جۆرە بازرگانێك دەرچوو، داوای ئامادەبوونیان لە سەرادا، یان بارەگای حوکومەتدا کرا، بۆ وەڵامدانەوەی ئەوەی کە بۆچی بوونەتە هۆی ئەو هەموو کێشە و ناکۆکیانە لە خۆبەدوورگرتنیان بەهۆی هەڵوێستیان لە دژی جەرگسوتان و ماتەمی شێخەکان. سەرەڕای ئەم پەیامە توندوتیژە، کە بە زۆر زاراوەی نائاسای زمانی تورکی داڕێژراوە، ئەو کوردانە کەم ئازایەتی رەسەنی خۆیان پێشان دەدەن و بەرپەرچی ئەو تۆمەتە نادادوەریانەیان نەدایەوە، یان تەنانەت دانپیانان بە بوونی لێپرسراوێکی گەندەڵ لەو جۆرانەی لە رێی نزیکی لە شوێنی مانەوەی ئەو.

ئەوە ئەو هەلەی بۆ والی رەخساند کە دەیویست. ئەو ئێستا داوای بەستنی کۆنفراسێکی کرد بۆ تاوتوێکردنی کێشەکانی پارێزگاکە. پێکدێت لە بازرگانەکان لەلایەك و شێخەکانیش لە لاکەی تر، کە هەریەکەیان دەتوانن ستەملێکراویەکانیان بەیانبکەن و بەڵگەش بهێننەوە. شێخەکان لە شوێنەکەدا دەرکەوتبوون، بەڵام بازرگانەکان ئامادەنەبوون بچن، وتیان ئەوە لەوانەیە بەلایەنی تاوانبار دابنرێن، هاندەرانی یاخیبوونن، ناڕازی و سەرکێش و ناحەزەکانن، ئێستا زۆر شەرمەزارن تەنانەت بۆ هەوڵدانی هاورێکی رەفتارەکانیان. شێخەکان بەپێچەوانەی ئەوەوە هاتن سکاڵاکانی خۆیان بە بەڵگەی باشەوە دژی بازرگانەکان خستە بەردەمی و هەروەها بەڵگەکانی سەلماندنی ئەوەی کە دەستیان لە کوشتنی شێخ سەعیدی شکۆداردا هەیە.

دوای ئەوەی گیرفانی بەبرێ پارەی زۆر پڕکرا،[1] ئیدی والی خواحافیزی لە سلێمانی کرد و بۆ موسڵ گەڕایەوە، لەخۆی و لە شێخەکان رازیبوو، هەروەها هەموو مافێکی دانێ بەبێ ئەوەی کەس بتوانێت دژایەتیان بکات.

حاکمێکی نوێ دانرا، بەڵام دەستنیژی والی نەبوو، لەگەڵ کارمەند و کۆمیسیاری پۆلیس. هەر بە گەیشتنیان دەستبەجێ کرییانن. ئەو هێزە کەمەی بۆ سلێمانی دیاریکراوە بە درێژایی سنوور بە ئاسایی وەك پاسەوانی مەخفەرەکان دابەشکران و لە پێنجوێن، بیستان، گوڵعەنبەر و هەڵەبجە لە 150 شەلاتی و ئاژاوەگێڕ و خەڵکی کفری و کەرکوکی- تورکمان و کوردی دووڕەگی زیاتر لێ نەماوە. بارودۆخەکە زیاتر نالەبار دەبوو. ئێستا هەمەوەندەکان گەشتونەتە دەروازەکانی سلێمانی و هەڕەشە کوتوپڕەکان کە دانیشتوان بە ملکەچی لەژێر دەستەڵاتی شێخاندا دەمێننەوە. ئەنجومەنیش لە ئەستەنبوڵ ئێستا بووە بە دامەزراوێکی زۆر ناسراوتر و بەلایەنی کەمەوە هێزێکی ئەوەندەیان هەیە بۆ دابینکردنی دیاریکردنی والی موسڵ و موتەسەڕیفی سلێمانی.

لەسەرو ئەوەشەوە، رۆژانی سوڵتان عەبدولحەمید وەك فرمانڕەوا گەشتبووە کۆتایی و شێخانیش ئەوەیان دەزانی. عیزەت پاشا تاراوگە بوو لە قاهیرە و شێخ قادر لە ئەستەنبوڵ، لە بێ رێزیدابوو. لەبەرئەوە شێخان هێرشێکیان دژی دەوڵەت کرد.

[54]- بەداخەوە من ناتوانم ئەو برە پارەیە دیاریبکەم، کە بەجیاواز پێنج، شەش، حەوت، دە، بیست و سی هەزار تمەنم داناوە (پارەی ئێران). لەوە دەچێت لەو بەڵگە باوەڕپێکراوانەوە برەکە بریتیبوو لە دەوروبەری دە هەزار، یان دوو هەزار پاوەند.

# شکستی بازرگانیی سلێمانی

هەوڵەکانی هەمەوەندەکان دژی دەسەڵات لەشێوەی سوپادا ئاڕاستەدەکرا. لێرە و لەوێ دەستەی بچووکی سەربازان پارچە پارچە دەکران و چەکەکانیان دەبرا. ڕێگاکان لە کەرکوکەوە بۆ بەغداد، کەرکوك بۆ سلێمانی و سلێمانی بۆ بەغداد بەتەواوی داخرابوون و ئێستا سلێمانی تەواو هەژارە، نیوەی بازاڕ و دوکان داخراوە، چونکە شتومەکی نیە تا تێیبکەن و ژمارەیەکی کەم لە بازرگانەکان ئازایەتی ئەوەیان هەیە کە نوسینگەکانیان بکەنەوە و لە ژووری بەتاڵدا بەبێ کار دانیشن. ئیدی دەنگوباسی "تاقیب" (شوێنکەوتن و سزادان)ی هەمەوەندەکان هاتە کایەوە و بینیمان چۆن جێبەجێکرا. گەندەڵی لە هەموو لایەکەوە باشترین پیلانەکانی ئەنجومەنی پوچەڵدەکردەوە و هەمەوەندەکان دوورکەوتنەوە، کاتێ شێخان لە سلێمانیدا بەبێ تاوان مانەوە و هێشتا داکۆکی لە هەڵوێستێکی بریندار ڕەوایی دەکەن، کە داوای دادگەری دەکات.

ئەوە شوێنەکە بوو لە مانگی ئابی 1909دا، کاتێ من سلێمانیم جێهێشت. لەو کاتەدا بازرگانەکان چاوەڕێی کۆکردنەوەی قەرزەکانیان بوون بۆ ئەوەی پارێزگاکە جێبهێڵن، کە دەبینن ئەو شارە هەرگیز چاکنابێتەوە تا بنەماڵەی شێخان لەوێ بن و دەستەڵاتی نادادوەریانەیان پێدرابێت. بازرگانی تا رادەیەکی زۆر سلێمانی جێهێشت. بازرگانەکان دەچن بۆ ئێران، کە لە نالەبارترین کاتەکانیا هەرگیز ڕێی بەم جۆرە بارودۆخە نەداوە و کاروباری بازرگانی- کەم و لاواز دەبێت- هێشتا دەرفەت دەدۆزێتەوە. ئێستا باجەکانی گومرگ، بەرزبوونەتەوە بۆ بڕی لە سەدا پانزە و هاوکاریی تێکچوونی بازرگانی دەکات، کە هاوردەی بەرهەمەکان لە ئێرانەوە کەمدەکاتەوە، بەتایبەتی کەتیرە و فەرش. هەرچەند بازرگانی گوزەرکردن بە دڵنیاییەوە تا رادەیەك بەردەوام دەبێت، بەڵام وەك ڕێژەیەکی گەورە لە ئیشوکار لەگەڵ خێڵە کۆچەرەکان پەیدابوو، کە گواستنەوەی بۆ شوێنی تر دەگونجا.

کاتێ لە مانگی مایسی 1909دا گەیشتم، کاروبار خراپبوو. کاروانەکەمان گرنگیەکی زۆری پێدرا بەهۆی ئەوەی توانیویەتی بەناو هەموو کەرکوکدا بێت و دەنگوباس بە پەرۆشەوە لە هەموو ئەوانەی گەیشتبوون دەخوازرا، بەتایبەتی ئەوەی پەیوەندە بە چاککردنی گونجاوی بارودۆخەکەوە، بەهەرحاڵ، ئەوەی دێت خراپتربوو، لەبەرئەوەی کاروانی تر نەبوو بەو ناوەدا بێت.

ژوورێکم لە کاروانسەراکەی غەفوور ئاغا گرت- ئەوەی ئەو کاتە شارەوان بوو- کەسێکی ترم نەبینی لەوێ دابەزیبێت جگە لە پیاوێکی عەرەبی بە تەمەن، کە خەڵکی تەرابلسی ئەفریقایە،

پۆستی بەڕێوەبەر یان فەرمانبەرێکی گچکەی گوندێکی هەبوو، بەشێوەیەکی فەرمی نەیدەتوانی بچێتە پێشەوە، چونکە گوندەکە بەرپرسێکی وەکو ئەمی نەبووە، دانیشتوانە کوردەکە ئەو کەسەی تەواو ئازابێت و هەوڵیبدایە خۆی لەوێ بکاتە فەرمانڕەوا دەیانکوشت.

دراوسێکەم، مستەفا بەگ، پیاوێکی بە تەمەنی رۆشنبیر و بەڕەوشت بوو، زووربەی ژیانی لە بەندەرەکانی دەریای ناوەڕاست و کۆنسۆڵخانەی مالّتا، تریست و ئەو شوێنانە بەسەربردووە.

زمانەکانی عەرەبی و تورکی بە باشی گفتوگۆیدەکرد، بەڵام وشەیەکی لە کوردی نەدەزانی، هەرچۆن نەیدەتوانی بە سروشتی بەڕەوشتی و رەسەنی خاوێنی خۆیەوە هەرگیز تێکەڵی رەفتارە ناقۆلاکانی سلێمانی نەبووە. نمونەیەکی زۆر تەواوی پشتگوێنانێکی هیچ و پوچ بۆ کەسێکی گونجاو بۆ پۆستێک کە نەیبینیووە. دەرفەتی گرتنەدەستی فرمانەکەی لە دەستداوە، ئێستاش پیاوە بەساڵاچووەکە بەتەنیا لە ژوورێکی دڵتەنگدا لە کاروانسەراکەدا دەژی. راخەر لە ژوورەکەدا نەبوو، تەنیا کەلوپەلێك کە هەیبوو بریتی بوون لە دوو سەندوق بۆ جلوبەرگەکانی، قاوە، ئاوگەرمکەرێك، سۆپایەکی نەوتی کۆن، تەنیا کوپێکی قاوەخواردنەوە و هەندێ پێخەف. شەوانە لەناو کەژاوەیەکی بەجێهێڵراودا دەنووست کە خاوەنەکەی کوژرابوو، هەروەها ئەو بەلایەنی کەمەوە بەهۆی ئەو خووە نالەبارەوە چەند مانگێك دواتر دووچاری مۆتەکەی مەرگی خۆی بوو. بازرگانێك لەدەم دەرگای کاروانسەراکەدا، خاوەنی نیوەی شوێنەکەیە، نوسینگەیەکی هەیە و هەندێ گەنجینەی جولەکەکان کە شتەکانیان لە دوو ژووردا داناوە. باقیەکەی بە بەتاڵی مابۆوە، دیوارە رووتەکانیش گەواهیی بارودۆخی سلێمانین، حەوشەکەش پڕبوو لە تەپوتۆز و پارچە کاغەز و حەوزێکی بۆگەن لە ناوەندا. وێرانەیەك نزیکی بوو، کە لەلایەن بریکارێتی شێخانەوە لەکۆتاییدا خرابووە سەری.

نیو سەعات پێش رۆژئاوابوون گەیشتم، خواردنم نەبوو، دەرگاکەم داخست- لە نیمچە دەڕابە دەچوو، بۆ سەرەوە و بۆ خوارەوە- و چوومەدەرەوە تا شتێیەك پەیدابکەم. نان بە شێوەیەکی ئاسای یەکەم شتی پێویستە و ئەوەش دوو جۆرم بینی، یەکەم زۆر تەنك و تەخت و ئەویتریان کولێرەیەکی خڕ بوو، هەر یەکە بە دوو "پوول" دەیانفرۆشت- پوول پارەیەکی مسی ئێران بوو، کە دەیکردە حەوت پێنی. سێ نانی تیری (یان یەك پێنی دەهێنا) بۆ پێویستی من بەسبوو، ئەوە و دوو کاهو- لەسەرو هەموو شتەوە- تۆپەڵێك خورمای پێکەوەنووساو، زۆر نازدارە لەم وڵاتە ساردەدا و قاپێکی پڕ لە ئاو دۆ، یان "دۆ" شێوێکی نایابی پێکهانی.

## پارەی سلێمانی

کڕینی هەر شتێك لە سەرەتاوە ناخۆشبوو، لەبەرئەوەی سلێمانی پارەی ئێرانی بەکاردەهێنا، هەرچەند ماوەیەکی دوورودرێژ بوو سەر بەو میللەتە بوو، پارەی کانزایی تورکی جگە لە مەجیدی وەرنەدەگیرا. بەو شێوەیە پارە کۆنەکانی کانزایی هەر مابوون، لە هەمان کاتدا ناوە تورکیەکانی پارەش هەروەها بەکاردەهێنرا، کە دەبووە هۆی سەرلێتێکچوون. سێ نیشانەی کرداری هەیە: مس "پوول"، زیوو "بێچوو" یان فارسی "پێنج شایی" و پارچە ئاساییەکەش "دوو- قران"ی ئێران، لێرە پێیدەوترا "تارانی". بەڵام لەپاڵ ئەوانەشدا رووبەرووی ئەم ناوانەش دەبووینەوە، وەك "چەرخی"، "جووت"، "دە پارە"، "غازی"، "قەمەری"، "قران" و "قرانی رەش" .

هەموو شت بە "قەمەری" ئەژماردەکرا و ئەو پارە خەیاڵاوییەش بەهای چوار "پوولە" و "بێچوو"ش (کە مامەڵە لەگەڵ نیشانی کرداریەکەیدا دەکرێت) بەهاکەشی حەوت پوولە. بۆ بڕێکی زۆر تارانی دەوترێت، کە دەکاتە پێنج بێچوو و پوولێك، یان نۆ قەمەری. خەڵکی بێگانە لە بێ هیوابیدا نوقمدەبێت. ئەوەش ناشاردرێتەوە کە لە کەرکوك بە بێچوو دەوترێ قەمەری و بە تارانی قران.

نمونەیەك لەسەر چۆنیەتی کارکردنی ئەم سیستمە وەردەگرم، کە ئاواتەخوازم ئاڵۆزتر نەبێت لەوەی کە هەیە. کاتێ دەچم بۆ ئەو شوێنەی پارچەکانی گۆشتی مەڕێك هەڵواسراوە بە قەنارەوە لە دوکانی قەساب، بۆ پرسیاری نرخەکە، پێمیان وت" سی و دوو"، من دەبووایە بزانیایە ئەوە واتە سی و دوو قەمەری، یان سێ قران و دوو بێچوو و شەش پوول. ئەوە نرخی "وەقە"یەکی سلێمانیە، "یان وەکو کورد پێیدەڵێت هۆقە." هەموو شارێك لە رۆژهەڵاتدا کێشی تایبەتی خۆی هەیە و داوای دەکرێت، لە سلێمانی بپرسی بۆت شیدەکاتەوە هۆقەی خۆماڵی دەکاتە چوار لەسەر پێنجی هۆقەی پێنجوێن، پێنج لەسەر چواری "مەن"ی تەبریز، دوو پێنجی "مەن"ی هەڵەبجە، تا دوا سات زانیاری ئەوەت ناداتێ کە یەکسانە بە دوو هۆقە و نیوی ئەستەمبوڵ، کە وەك دەستورێك بۆ ژمێریاری لە هەموو لایەکی تورکیای ئاسیاییدا دەڕوات.

کەواتە، وەڵامدانەوەی "سی و دوو" دەگات، یان چاوەڕوانە کە بگات، بۆ زانیاری بڕی گۆشتی پێویست، بە ئاسایی چارەکە هۆقەیەکە، بایی هەشت قەمەرییە، کە دەبێت چوار بێچوو و چوار پوولی بدرێتێ. لە هەمان کاتدا راستیەك دەرکەوتووە، کە هۆقە- وەکو مەنی فارسی وەهایە، لە

راستیدا- بە هەڵە ناونراوە، دابەشکراوە بە چوارسەد درهەم و کە دەبێت هەموو بەشەکانی هۆقە بە زمانی تورکی بوترێت نەك بە کوردی.
ئەوە باشبوو کە نزیکەی هەموو دانیشتوانەکە هەندێ فارسییان دەزانی، لەبەرئەوەی کوردی باکوور و رۆژهەڵاتی لێرە نەبوو، دانیشتوانەکەش لە چاو فارسیدا کەمتر لەوە تێدەگەیشتن. لە سەرەتاوە پێش ئەوەی بناسرێمەوە، راستی ئەوەی کە فێستم لە سەردا بوو لای زۆر کەس بە تورك ناسرابووم و ئەوانەشی تۆزێ تورکییان دەزانی هەوڵیاندەدا بەسەر مندا تاقیبکەنەوە، ئەوەش دەبێ بوترێت، زۆر زیاد دڵخۆشبووم بە دەرفەتی گفتوگۆکردن بە فارسی.
لەناو نەریتە سەیر و گەوجانەکانی تردا، ئەو هۆیەی کە رێنادا بە ژن لە بازاڕدا دەربکەوێت، لەترسی ئەوەی ناوی باشی لە دەستبدات.[55] بۆچی، لەوە دەچێت گران بێت بڵێیت، لەبەرئەوە شارێك نیە لە سلێمانی زیاتر بە رەوشتبێت. لەوانەشە لەبەر هەمان هۆ بە گونجاوی نازانن پیاو گۆرەوی نەخشدار بپۆشێت، یان قردێلە لەسەر سەرپاییەکانی بێت، یان بە رۆژا لە ماڵەوە بمێنێتەوە، یان وەك ژن مامەڵە لەگەڵ هاوسەرەکەی بکات و سەدان گاڵتەی هەمەجۆری تر کە دەستوورێکی گران و خێرایە بۆ کۆمەڵانی خەڵکی سلێمانی و ژیان.
پێشێلکردنی هەر یەکێ لەو دەستوورە بچووکانە بەرەنگاری سەیرکردنێکی تۆقێنەر و دەستەواژە کۆنە سوواوەکەی "عەیبە باوکم"[56] دەبیتەوە، کە زۆر بە قورسی لێرەدا کاردەکات و بەکاردەهێنێرێت بۆ بەربەستی زۆر چالاکی، کە هەر بەرەوپێشچوون، یان چاکسازیەك هەمیشە کپدەکرێتەوە لەلایەن ئەو "عەیبە باوکم"ە ترسناکەوە.
ئەگەر لەسەر رێگاویان قسەم لەگەڵ ژنەکەم بکردایە، ئەگەر لە شوێنێکی گشتیدا سەرم رووتبکردایە بۆ ئەوەی هەوایەکی فێنك لێیبدایە، ئەگەر لەگەڵ مەسیحیەکدا زۆر هاوڕێیانە بوومایە، یان شارستیانە لەگەڵ جولەکەیەك بدوامایە، ئەوانە هەمووی "عەیبە باوکم"ە و بەڵام کەمترینی ئەوانە. گەر من لە ساتە هەڵچووەکانی کارە خێرخواهی و نمونەییەکاندا پێشنیاربکەم مێش و مەگەزی سەر گۆشتە وشکبووەکانی ناو دوکانەکان بکوژم، یان شارەکە لە سواڵکەری ساختەچی رزگاربکەم، یان خانویەکی خاوێن بینابکەم، یان شەقامێك خاوێنبکەمەوە، یان هەر شتێك بکەم کە کەڵکی بۆ خۆم یان ئەوانیتر هەبێت، ئیدی من دەبێ ببم بە شێتێکی ورێنەکەر لە

[55]- ئەو نەریتە لە عەرەبی موسڵاوییەوە داکەوتووە.
[56] کوردی، ئەوە هەڵەیە، واتە باوکە بچکۆلە.

گوێگرتنی ڕۆژ و شەوی نارەزایی نازاراوی " عەیبە باوکم" ئەگەر، لە راستیدا، رێمپێدرا لە شارەکەدا بمێنمەوە.

لەوەدا، سلێمانی زۆر لە تەواوی رۆژهەلاتی محەمەدی دەچێت، بەتایبەتی ئەو بەشانەی کە زیاتر لە رۆژئاواوە دوورکەوتۆتەوە، کە بڕوایان وایە، کە" ئەوە دەکەم وەك باو و باپیرانم کردویانە و ئەوەش ناکەم کە ئەوان نەیانکردووە و نەفرەت لە داهێنەر."

نە ئەم بیروباوەڕە بە ئاستەم کەناردەخرێت، لەگەڵ ئەوەشی کە دەردەسەرییە بۆ خەڵك خۆیان. پێش چەند ساڵێك پزیشکێکی خاوەنی هەندێ بەهرە هاتە ئێرە، ئاواتەخوازبوو- وەك ئەوەی ئەو سەرەتا گەیشتۆتە ئێرە و شارێکی پڕ لە دەردی پیس- بە خێرایی سامانێك پێکەوە بنێت، هەروەك چۆن کەسانی تر لەناو کوردەکاندا کردویانە،[57] دوو مانگ دوای ئەوەی خۆی رێکخست چوو بۆ کوردستانی ئێران، شتەکانی دابوو بە کۆڵی خۆیدا، سەری زرنگەی دەهات لەگەڵ دەستەواژەی "عەیبە باوکم"دا.

دوای ئەویش وێنەگرێك هات، کە لە سەرەتاوە تا رادەیەك سەرکەوتوبوو، بەڵام سلێمانیەك بە زانیاریەکی قووڵەوە وتەی پیاوێکی پیرۆزی ئاشکراکرد، کە شێوەکاری مرۆڤ دەبێ سەری بە قەڵەمبڕێك ببڕن، یان رۆحی هونەرمەندەکە نازار دەچێژێت، لە رۆژی دواییدا وەك ئەو وێنەیە دەردەکەوێتەوە. لەبەرئەوە سلێمانیەکان سەری خۆیان لەسەر وێنەکانیان بڕی و وێنەگرەکەشیان دەرکرد. دوای ماوەیەك فۆنۆگراف- سندوقی قەوان لێدان- هات، کە جەماوەری لە رۆژهەلاتدا لە هەموو داهێنانەکانی تری رۆژئاوا زیاتر هەبوو، ئەوەش لەلایەن هەندێ کەسەوە داگیرکراو و لە کاتی کۆچی دوایی شێخ سەعیددا وەك ئامێرێکی بێ رێزیی راگیرا.

ئەم خووەی مێشك و ئەو قینە نەگۆڕە لە هەموو ئەوەی کە نوێیە، ئەوە روونەدەکاتەوە کە بۆچی سلێمانیەکان هێشتا لەو جلوبەرگانەدا رێدەکەن کە لە کتێبە چاپکراوەکانی گەشتیارەکان بۆ ئێران لە سەدەی شانزەیەمدا دەیبینین، بۆچی قۆڵی کراسەکان لە زەوی دەخشێت، بۆچی چاکی کەواکانیان بە درێژایی ئەوەی رێدەکات خۆڵ و خاشاکی سەر رێگاکان دەماڵێت. ئەوانە پارێزگاری لە خوو و رەوشتی ناپەسەندی کۆن دەکەن، کە لەوانەیە جولەکەکانی نێوانیان بکوژن، ئەو پەیوەستی خوێنەش پشتگوێ دەنێن، کە لەسەدا نەوەت 90٪ دەیانبەستێتەوە بەو رەگەزەوە. دابونەریت و یاساکانی کە

---

[57]- پێویستە ئەوەش بەیادبێنینەوە کە دانیشتوانی شاری سلێمانی، لەگەڵ ئەوەی زمان بەشێك لە جلوبەرگیان لە کوردەوە هەلگرتۆتەوە، بە تەواوی سەر بەم رەگەزە نییە، هەروەك لە یاداشتی جیاکەرەوەیی بنەچەی ئەم میللەتەدا دەردەکەوێت.

پەیوەندە بە جلوبەرگەوە ئەوەندە بەهێزە، کە ئەو خەڵکە بێگانانەی لە ناویاندا دەژین، ئەگەر ئاواتەخوازن بەبێ کێشە بژین، دەبێ پەنابەرن بۆ شێوازی جلوبەرگی ئەوان و پۆشاکەکانی خۆیان کە لە خاکی خۆیان زیاتر گونجاوە بینێنەلاوە.

کەنارگیرییان وای لێکردوون گومانیان لە هەموو بێگانەیەك هەبێت و لەو گومانەوە لێکۆڵینەوەیەك پەرەی سەندووە کە تا رادەیەك لە وزەبەدەرە. مافی هەموو سلێمانییەکە کە لە نزیکەوە پرسیار لە ئامانج و پێناسەی ئەوانە بکات کە تازە گەیشتوون. خۆشبەختانە ئەو پرس و رایانە ناگاتە ئاستی بێزاربوون، تەنانەت لەوانەیە رێزی لێبگرێت بە پێدانی هەلی ئەوەی کە رێزی کەسایەتی خۆی بپارێزێ. هەروەها ئەو گومانە توندە، کە لە خەڵکی بێگانە نزیکدەبنەوە تەواو دەرهەستیە گەربێتو بە درۆ یان راست وەڵامی پرسەکەی ئەوان بداتەوە. وەك دەردەکەوێت ئەوە نەگونجاو نییە، تەنیا بە وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی ئەوان و زانیاری بڵاو لەبارەی شارەکەوە، بێگانەکە پەسەند دەکرێت لە هەڵسەنگاندنی تایبەتیدا و دەبێتە بەشێك لە دانیشتوانەکە.

تا رادەیەك کە لەم کاروبارانە شارەزابووم، ئیدی لە دیدەنی کەسێکی رێکپۆش نەحەپەسام کە بەیانیەك هات بۆ کاروانسەراکە. ئەو کەسە خۆی لە عەبایەکی تووکی وشتر ئاڵاندبوو، کە لای راستی لە پشتەوە بە کاری چنینی خەیاتەی ئاڵتونی داپۆشرابوو. کێلانی خەنجەرێکی گەورەی کردبوو بە پێچەکانی پشتێنەکەی سەر کەمەری و هەر کە هاتە ژوورەوە جووتێ پێڵاوی نوێی بەغدادی لە پێ داکەند. بە فارسیەکی زۆر رەوان سڵاوی کرد و دوای وەرگرتنی جگەرەیەك، بەبێ پێشەکی کەوتە پرسیاکردنەکانی، کە بەپێی توانا بە کورتی وەڵامدایەوە.

گفتوگۆکە تا رادەیەك بەم شێوەیە بوو:

"وڵاتی بنەچەییت لە کوێیە؟"

"ئێران"

" کام شار"

"شیراز"

" ئایا خەڵکی سلێمانی لە شیراز هەیە؟"

"نەء لە هیچ شوێنێك"

" ئایا تۆ دەچیت بۆ ئێران؟"

" لەم کاتەدا نازانم"

" بۆ لەم کاتەدا نازانی؟ چۆن دەبێ پیاو نەزانێ بۆ کوێ دەچێت؟"

" لەبەرئەوەی پلانەکەم پێکنەهاتووە"

" مانەوە لێرە، باشترین شوێنە- ئاوی باش، هەوای باش و دانیشتوانی بەبەزەیی. تۆ بە بازرگانیەوە خەریکیت؟ یا پزیشکی؟"

"نەء بۆ؟"

" بە شێوازی جلوبەرگە ئەورووپیەکەتدا، وەك پزیشك وەهای، هەرچەند پزیشکی لێرە کارێکی ناپەسەندە. ئایا تۆ بازرگانیت؟"

" بەڵێ، لەوانەیە."

"تایبەتمەندیت چیە؟"

" جلوبەرگ و لەو بابەتە"

" هەروەها سابوونی بۆندارت هەیە؟"

"نەء بۆچی ئەوە دەپرسیت؟"

"لەبەرئەوەی بازرگانێك بیست ساڵ لەوەبەر لە موسڵەوە هات سابونی بۆنداری هێنابوو، بەڵام لێرە پەسەند نییە."

" بۆچی؟"

"لەبەرئەوەی پێشتر بەکارنەهاتووە، لەگەڵ ئەوەشدا، منداڵان کاتێ بۆنیانکردووە هەمیشە مردوون."

"کەواتە منداڵانی سلێمانی لە شیرینی یان بۆنە خاوێنەکان دەترسن؟"

"بەڵێ ئەوان پێی رانەهاتوون. ئەو پێڵاوانەت لەکوێ کڕیووە؟"

"لە کەرکوك."

"ئەوە لێرە بەکارنایەت، قەیتانی هەیە"

"خەریکی ئەوە بوو پرسیارێکی نوێ بکات، ئینجا لەپڕ: ئەو جانتایانە چیان تێدایە؟"

"جلوبەرگ."

" شتێکی تێدانیە بۆ فرۆشتن؟ تۆ چۆن بازرگانێکی بەبێ فرۆتەنی و بارەکان؟"

"من چاوەڕێی نمونەکانم، هیچ پیاوێکی دانا کەلوپەل ناهێنێت تا سەرەتا نەزانێت دەفرۆشرێت بەهۆی نمونەکانەوە"

" راست دەکەیت، بەڵام چی لە سندوقەکانتدایە؟"

"پێموتی جلوبەرگ."

" ئەو جانتایانەت لەکوێ کڕیووە؟"

"لە لەندەن."

"لە لەندەن، بۆ چوویت بۆ ئەوێ؟"

"ئیشوکارم هەبوو"

"ئیشوکاری چی؟"

"ئیشوکاری خۆم، هەموو کەسێك کاروباری خۆی هەیە."

"تەواو راستە، بەڵام من هاتووم بۆ ئێرە تا پێت بڵێم، وەك هاوڕێیەك، کە تۆ نابێت لە کاروانسەرادا دانیشیت، شیاونییە."

ئارامم گەیشتە کۆتا و من داوای شتەکانم پێچەوانەکردەوە و لای خۆمەوە دەستمکرد بە لێکۆڵینەوە.

"بۆچی ئەنگوستیلەی پیرۆزەت لە پەنجەدایە؟"[58]

" بە توندی پرسیم؟"

"چی؟"

"دەڵێم بۆ ئەنگوستیلەی پیرۆزەت لە پەنجەدایە؟- لە وڵاتی من ناپەسەندە."

" من وەکو هاوڕێیەك هاتووم بۆ ئێرە، بۆچی تۆ پرسیاری ئەوا نابەجێ دەکەیت؟"

" ئەو بە دەنگێکی رەق پرسی."

" لەبەرئەوەی"، وەڵامدایەوە، لە شیرازی وڵاتی من لەوێ وتەیەکی بەنرخ دەڵێت، ئەوەی بێگانەیەك بڕەنجێنێت بە لێکۆڵینەوە، دوای ئەوە هەمان گاڵتە و خراپەکاری ئەو رەفتارە ناخۆشە لەوانەیە ئازاری بێنێتەوە پێش!"

بە رووگرژییەکەوە هەستا، عەباکەی کۆکردەوە و بە پەلە دەرچوو، تەنانەت بێزی نەدەهات وەڵامی خواحافیزیەکەی من بداتەوە، دوای پێنج خولەك چاودێرەکەی کاروانسەراکە هاتە بەر دەرگاکە تا رادەیەك شڵەژابوو، ئاگاداریکردم ئەوەی وەك هاوڕێ هات و وەك دوژمن رۆیشت، خاوەنی شوێنەکەیە و سەرۆکی شارەوانی غەفوور ئاغا خۆی بوو.

---

[58]- بە کردەوە هەموو کورد و فارسێك ئەنگوستیلەی زیو لەگەڵ پیرۆزەدا لە پەنجە دەکەن، کە بەشێکی دیارە لە جلوبەرگدا.

# مەسیحیە رەسەنەکان

لەو چەند رۆژانەی یەکەم لەوێ، ئەوەم بۆ دەرکەوت خەڵکی سلێمانی مافی ئەوە بەخۆی دەدات چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵ بێگانەدا بکات و تەواوکردنی وانەکەش رۆژێك پێش ئەوەی دەرچم بۆ هەڵەبجە تەواوبوو. لەلایەن فرۆشیارێکی قاپ و قاچاغی فەغفوریەوە راگیرام، پەرداخی شەربەت، شقارتە و فرۆتەنی دەستگێڕ بەگشتی.

"راوەستە!" لە پشتەوە گوێم لە ئاوازی دەنگێکی بەرزبوو.

گوێڕایەڵی بۆ بانگەکەی، راوەستام و ئاوڕمدایەوە، خۆم بینی روو بە روو لەگەڵ کەسێکی تورە، یا لە کەسێکی تورە دەچوو، کە بە ئاوازێکی توند داوای یانزە قرانی دەکرد کە من قەرزاریم. بە زاراوەی کوردیە خۆماڵیەکەی و بەبێ سەرباری رێز، منیش نکولیم لە قەرزەکە کرد و ئەویش هاتەپێشەوە لەگەڵ خەنجەرێکی نیوە هەڵکێشراودا، تەماشایکرد من نە رائەکەم و نە پاڵدەنێم، راوەستا، کەمێ وازیهێنا دەبێ هەنگاوی داهاتوی چیبێت.

بۆ چرکەساتێك بە رووما گەشایەوە، ئینجا پێکەنینێکی سوکئامێز، چووە دواوە بۆ سەر ئەو کۆمەڵە قاپە قورقوشمانەی سەر کوشکەکەی و راوەستا لە تێڕامانی بنمیچە بازنەییەکەی بازاڕاکە. دوای ئەوە پێیوتم کە ئەوە گاڵتەیەکی سلێمانیەکانە، کە زۆر جار، پێش ئەوەی تورك بیانترسێنێت بە چاوبرسێتی هەموویی، بە فێڵ حاجیەکی باش لە رێگەی خۆراسان بۆ کەربەلا دەگرێت.

یەکەم ناسیاوم لە سلێمانی سووریاییەکی مەسیحیی موسڵ بوو، ناوی مەتی تۆما بوو. لەو شوێنەی کە دووچاری کێشە بووم لەبارەی ناردنی ئەو پارەیەی کە لەگەڵ خۆمدا هێناومە، بەڵام لە کۆتاییدا دوو مەسیحیم پەیداکرد، بەناوی سافو و سامی ناسراون، کە ئامادەبوون پێشنیاری یاسایم بدەنێ لەسەر هەواڵنێرەکەیان لە سلێمانی. ئەوەم وەرگرت، بەپێی ئەم رەشنووسە دەبێ بدرێت بە غولام حسێن فارسی، لەژێر ئەو ناوەی پێیدەپەرمەوە. ئەو رەشنووسە لە حەوت رۆژدا بوو دوای بینین، بەڵام یەکەم بەیانی دوای گەیشتنم پیاوێکی بە تەمەن پەیدابوو، کوتومت وەك خەڵکی سلێمانی جلوبەرگی پۆشیبوو، جگە لە سەروپێچە بچووکەکەی، خۆی وەك مەتی تۆما ناساند، هەواڵێکی دڵخۆشکەری پێدام کە پارەکە ئامادەیە. هەڵسوکەوتی هێمنانەی، لەگەڵ دڵنیایی ئارەزووی یارمەتیدانم بە هەموو شێوەیەك، هانیدام کە کەم تا زۆر نەخشەکانی خۆمی پێ بڵێم، بەبێ ئەوەی، بە دڵنیاییەوە هێمای پێناسنامەکەم بکەم.

یەکەم جار بوو فارسێك ببینێت، لەو کاتەوە کە بازرگانە هەمەدانیەکان سلێمانیان جێهێشتووە. لە پێناوی ئاسانکاری ژیانمدا لە کوردستان، بەبێ ئامانج دەسوڕامەوە، بەڵام یەك شت گومانکراو بوو، پێش دەستپێکردن من چارەسەرمکرد، بۆ پەیوەندی پەیداکردن بە چەند دامەزراوێکی بازرگانییەوە و ئێستا لەو ئاستەدا بووم کە لەبارەی جۆرەها نموونەوە بدوێم و پرسیار لە نرخی بەرهەمە ناوخۆییەکان بکەم. لەسەر ئەو خاڵانە مەتی- م بینی، تەواو ئامادەبوو زانیاریم بداتێ، لەهەمان کاتدا هەندێ ئامۆژگاری باشم بکات لەبارەی کڕینی هەرچیەکم پێویستە و داوەتمکات بۆ بەکارهێنانی کارگوزاریەکان و شارەزایی سلێمانی- کە بیست ساڵە لەوێیە- بەبێ دوودڵی. بەوپەڕی تواناوە داکۆکی لە مانەوەم دەکرد لە سلێمانیدا بۆ ماوەیەك، وتی هێشتا هیوا بۆ چاکبوونی بازرگانی لەوێدا هەیە. هەرچۆن من خواستی بینینی زیاتری کوردستانم دەربڕی، وەك ئاشکرایە لەگەڵ بیرێکی باوەڕپێکراو لەگەڵ کاروباری بازرگانی کە سودمەندە و باشترین کڕینی کاڵای بنەچەیی وڵاتەکەیە، ئیدی بەربەرچیی زیاتری نەکرد و تەنانەت پێیوتم مەسەلەی پەیداکردنی هێسترەکان بۆ گەشتەکەم بۆ ئەو جێبهێڵم.

ئینجا بردمی بۆ نوسینگەکەی، کە لە کاروانسەرایەکدا بوو بەناوی خانی عەجەم. نوسینگەکە بریتی بوو لە ژوورێکی درێژی تەسك، لەسەر داڵانێکی بەرزی حەوشەی سەراکە دەکرایەوە. بە دەوری دیوارەکاندا رەفەکان بوون، کە شتومەکی ئاسایی بازرگانەکەی موسڵی لەسەر دانرابوون، قامیشە جگەرە، لۆکە، نەخشکراو، خام و بلوری، قوماشی حەڵەبی، قوماشی هەرزانبەها و دوو کیسەی گەورەی بزمار، کە لە ئەوروپاوە هێنراوە، لێرە بۆ فرۆشتن هەیە.

ناوفەرشکرابوو بە فەرشێکی هەمەدان و مەتی لەسەر دانەیەك نزیکی دەرگاکە دانیشتبوو، لەبەردەمی سندوقێکی ئاسنی گەورەی روسی کە بە کلیلێك دەکرایەوە بەچەشنی ئەوەی زیندانەوانەکانی سەردەمانێك گەورەیە و لە کاتی کردنەوەیدا سێ جار زەنگی لێدەدا.

هەروەکو هەموو کاروانسەراکانی تری سلێمانی، ژوورەکان لە راستیدا هیچ نین، زیاتر لە بۆشایەکی قوڵ دەچێت و لە پێشەوە دەرابەیەکی تەختەی لە سێ بەش بۆ دروستکراوە. بەشەکانی دەرابەکە بە خلیسکاندن دەکرێنەوە و بە قولاپێکی ئاسن لەو ئاستەدا هەڵدەواسرێت بە تلیشێکدا کاتێ کە دەڕۆنەوە. دراوسێکانی بەرامبەری مەتی، هەروەها مەسیحی موسڵ بوون و بەرامبەر- بۆ نوسینگەکە لە راڕەوێکی درێژی کە دەچووە ناو حەوشەکەوە- ژوورەکانی سێ بازرگانە کوردەکان

بوون، کە لەلایەن مەتی-یەوە منی پێناساندن، وەك نەریتی شوێنەکە ئەوان بێشەرمانە هاتن بۆ لێکۆڵینەوە، کە ئەو تازەهاتووە دەبێ کێ بێت و ناچاربووم وەڵامی زنجیرەیەك پرسیار بدەمەوە.

ئەو کەسانە فارسیەکی زۆر باش دەدوان و خۆشبەختانە شێوەکەی کارەکانی خۆم وەك راستی پەسەندکرا و لەوێدا ناسراو بووم و ئینجا وەك میرزا غولام حسێن شیرازی.

هەروەها ناسێنرام بە یەك حەبیب بەدرییە، کە مەسیحیەکی موسڵە و پیاوێکە شێوەی ئاسایی ناچێتەوە سەر نەژادی عەرەبی. پێستی سپی شڵ بوو، قژی ئەو رەنگە دیاریکراوەیە کە پێیدەوترێ "کارۆتی"(واتە قژ سوور) و سمێڵیشی هەمان رەنگ بوو. چاوی شین و شێوەی سکۆتی بەگشتی وایلێکردبوو، کە لەگەڵ جلوبەرگی عەرەبی و فێستەکەیدا نەدەگونجا. هەرچۆن ئەوە کاریکردبێتە لەسەر سروشتی، کەچی ئەو بیروبۆچوونی پێشکەوتوتری پێشاندا. هەرکە بیستی من لە ئەوروپا بووم، داوایکرد کامێرایەکی وێنەی سەرپێیی، سابوونی بۆندار، فەرهەنگێکی زمانی فەرەنسی و هەندێ وتار و نووسینی تری ئەوروپی بنووسم. بانگەشەی نەفرەتی دەکرد لەگەڵ نەریتی جلوبەرگەکەی کە ناچارکراوە لەبەریکات و هەناسەی بۆ شادمانی یاخە و سەرقۆڵەکان هەڵدەکێشا. بەهەرحاڵ، سەرەڕای ئەو حەز و خۆزگانەش، لە پاشاندا دەرکەوت کە هاوڕێیەکی دەگمەن و راستگۆ بوو.

رێگای گەڕانەوەم بۆ کاروانسەراکەی غەفوور ئاغا دەکەوتە بەشێکی گەورەی بازاڕەکانەوە، منیش نەمدەتوانی تێبینی شێوازی چۆڵکردنی ریز بە ریزی دوکانە بازرگانیەکان نەکەم، کە لەلایەن خاوەنە دڵسارد و بێتاقەتەکانیانەوە بە زەبری شەڕ و ستەمی سلێمانیەوە چۆڵکراوە.

هەر کە چوومە ناو حەوشەی خانەکەوە، لەلایەن بازرگانێکەوە پێشوازیکرام، کە نوسینگەکەی لە دەم دەروازەکەدا بوو. وەك خویەك لە دەرەوەی ژوورەکە لە داڵانەکەدا دادەنیشت، لەسەر کورسیەکی درێژ لە کوێوە دەیتوانی سەیری خوارەوەی داڵانە چەماوەکە بکات بۆ دەرەوەی شەقامەکە و سەرنجی هەموو ئەوانەی دەدا کە بەوێدا تێدەپەڕین. بانگیکردم کە لەسەر کورسیەکە دابنیشم و و کاتێ چوومە ئەوێ، پرسی ئەگەر بتوانێت یارمەتیم بدات بە هەر شێوەیەك و بە قەرز شتومەکی ناوماڵ یان راخەرم بداتێت تا جێگیردەبم. پێموت دەچم بۆ هەڵەبجە و ئەویش راستەوخۆ گرنگیەکی نائاسیی پێشاندا. من توانیم هۆ تەواو ژیرانەکانی بدەمێ بۆ ئارەزوی سەردانی شوێنەکە، چونکە ئەو عوسمان پاشای هەڵەبجەی زۆر باش دەناسی و خۆشی کاری بازرگانی لەوێ کردووە.

# پاشایەکی کورد

بۆیە باسی بینینی خانمی پاشام کرد لەگەڵ سەرچاوەیەك بۆ تێگەیشتنی ئاوریشم (کە دەمزانی ئەو ئارەزوی لەوەیە ئەوە بکات) و بەدەستهێنانی کاریگەری ئەو لە پێناوی کڕینی بەرهەمی شاخاوی لە ناوچەکەی ئەودا. ئەوە بزانە، پێیوتم کە پاشا خۆی لە سلێمانیە و پاشنیوەڕۆ بۆ دیدەنیەك دێت بۆ ئێرە، کاتێ ئامۆژگاریکردم کە ئامادەبم.

لە دەوروبەری سێی ئەو پاشنیوەڕۆیەدا گەیشت و جێی شیاوی خۆی لەسەر کورسییە فەرشدارەکە وەرگرت، بازرگانەکەی هاوڕێم، وەك بازرگانێکی فارسی پێشکەشیکردم، کە ئارەزوی دیدەنی هەڵەبجە دەکات. پاشا بە فارسیەکی رەوان بانگهێشتی کردم و ئینجا بێدەنگ بوو، کە من دوای ئەوە تێگەیشتم ئەوە شێوازی سەرۆکانی جافە.

هەلێکی باشم بۆ رەخسابوو بۆ تاقیکردنەوەی پیاوێك کە ناوی لە بەشێکی گەورەی کوردستاندا رێزی لێ دەگیرێت و سەرۆکی بەشێکی گەورەی تیرەی جافە و حاکمی هەڵەبجە و شارەزوورە.

جلوبەرگەکەی تایبەت بوو بە تیرەکەیەوە، بەڵام باشترین جۆرایەتی. جگە لە بەنەخوێنە سپیەکەی، هیچ جلوبەرگێکی نەبوو ئاوریشم نەبێت. کراسێکی دەڵبی درێژی خەتخەتی رەنگ هەنگوینی، چاکەتی زواڤ (کە لە چاکەتی سەربازی پیادەی فەرەنسی دەچوو) نەخشکرابوو بە خەیاتەی ئاڵتوونی و ژێرکراسێك یان عەرەقگیرێکی سپی، کە هەمووی لە باشترین جۆری ئاوریشم بوون. خەنجەرێکی نەخشکراوی تەواو بە بەرپشتێنەکەیەوە بوو، هەروەها دەمانچەیەکی بچووکی جۆری براونی لە کیفێکی چەرمی سووردا بەلاقەدیەوە هەڵواسرابوو، قاچەکانیشی کردبووە ناو باشترین پێڵاوی کوردیی لە چەرمی سوورناڵ، لەگەڵ خاڵە هەڵگەڕاوەکان و سەری خۆشی پێچابوو لە مشکیەکی زۆری ئاوریشم، لەسەرەوە وەك مێزەرێکی گەورە لەچاو ژێرەوەیدا پێچرابۆوە.

لوتێکی باریکی قولاپی و روخسارێکی رەقەڵی راستەقینەی کوردی باکووریی هەبوو، چاوە بچووکەکانی لەژێر برۆی چڕی مەیلەو خۆڵەمێشیدا دەیڕوانی. سمێڵێکی گەورە دەمی شاردبۆوە، بەڵام هێڵە جێگیرەکانی روومەت و چەناگەی دانەپۆشیوە. چەمکی ئاسایی توندو تووڕە بوو، کاتێ کە دەدوا رستەکانی کورت بوون و لەسەر شێوازی زاری دیالێکی تیرەکەی بوو. چەند پیاوێك لە خزمەتیدا بوون: دوو خزمەتکار، بیست تفەنگچی، شمشاڵ هەڵگر و ژمارەیەك لە کارگوزارانی تر، هەموو چەکدارێك، جەربەزەیی لە شێوە و سروشتیاندا دەبینرا، هەڵبژاردنی پیاوان لە تیرەیەك تێبینی ئازایەتی و شەڕی دڕندانە دەکرێت.

## مستەفا بەگ

وەستانێکی زۆر بەرێزانە نەبوو لە حەوشەکەدا و دوودڵ نەبوون لە هاتنە ناو دەمەتەقێکانەوە هەرکاتێ پێیان باشبووایە ئەوەیان دەکرد، لەلایەن پاشاشەوە بەرهەڵستی ئەو خۆتێهەڵقورتانە نەدەکرا. ئەم پیاوە پیرە دابونەریتی کوردەکانی پاراستووە، لەکاتێکدا دەوڵەمەند و بەهێزە، خۆی بە هیچ شێوەیەك لە ژیانی خێڵەکەی جیانەکردۆتەوە، نە خۆشی لە رووی کۆمەڵایەتیەوە لە چاو ئەواندا بە گەورەتر دادەنێت. لە ئەنجامی ئەوەوە تەواو لە هەست و سۆزی ئەوانەوە نزیکە و لەوەش زیاتر، ئاگای لە هەموو چالاکیەکیانە. کاتێ کە لەوێ دانیشتبووین، سوارێك بە پەلە لە هەڵەبجەوە گەیشت و سەبەتەیەکی لە خورجەکە دەرهێنا و پێشکەشی پاشای کرد. بەو هەموو رێگایەدا لە هەڵەبجەوە ئەرکی کێشاوە بۆ هێنانی یەکەم نۆبەرەی خەیار! پاشاش دەستبەجێ یەکێ لە سوارەکانی خۆی ناردەوە بۆ هەڵەبجە بۆ سوپاسکردنی ژنەکەی، کە ئەو خواردنە بەلەزەتەی بۆ ناردووە.

دوای ئەوەش ئەو رۆیشت و منیش هەروەها گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، کە پاش ماوەیەکی کورت پیرە مستەفا بەگی دراوسێم هات بۆ لام.

داخی خۆی هەڵکێشا بە بیستنی ئەوەی کە من دەچم بۆ هەڵەبجە، چونکە یەکێکی دۆزییەوە، وتی، ئەو یەکەش هەم وەك هاوسێ و هەم هاورێ بوو، ئیدی دەستیکرد بە هەڵسەنگاندنی ئەوەی کە تەنیا بێگانە دەتوانێت خەڵاتی ناسینی بێگانەیەکی دی بکات. هەوڵی نەدا پەشیمانم بکاتەوە، لەبەرئەوەی خۆی چووبوو بۆ هەڵەبجە و هاوبەشی میوانداری خانمی هەڵەبجە- ژنی عوسمان پاشای کردووە، کە لە کوردستاندا ناودارە. لەوە کەمتر دەرچوونمی بۆ هەڵەبجە دەلاوانەوە، وتی، ئەو کەشوهەوای ئەو شوێنە دەزانێت هانیدام بۆ گەڕانەوە بۆ سلێمانی، کاتێ ئێمە دەبێ دووبارە یەکبگرینەوە.

پیرە پیاوەکە حەزیدەکرد باسی ئەستەنبوڵ و رۆژئاوا بکات و لە مندا ئەوەی بینیەوە گەشتیارێك دەگمەن لە کوردستاندا ئەو شوێنانەی بینیوە، دەکرێت لەگەڵیدا بدوێت لەبارەی ئەو بابەتەوە، کە پێکەوە کۆیکردوینەتەوە و لەپڕ غەم و پەژارەی بەگوێرەی منەوە هەڵڕشت. کاتێ کە لە ئەستەنبوڵ بوو وەك ژمێریاری هەڵەبجە دانراوە. دوای ئەوە بە تەنیا لە تەرابلسی زێدی خۆیەوە لە ئەفریقاوە دوای چوار مانگ گەشتۆتە هەڵەبجە. کوردەکان رازینەبوون لەناویاندا بمێنێتەوە، لەبەرئەوەی تورك بووە و هۆیەکیان بۆ دۆزیەوە تا ناچاریکەن بڕوات. یەك وشە کوردی و فارسی نەدەدوا، خۆی لەناو خەڵکانێکی نەیاردا بینیەوە، تەنانەت نەیدەتوانی پەیوەندیشیان پێوە بکات، بۆیە گەڕایەوە بۆ

سلێمانی و کرابوو بە "مودیر" ی گوڵعەبەری پایتەختی کۆنی شارەزوور. هەروەها نەیدەتوانی ئەو پۆستەش وەربگرێت، چونکە کوردەکان سەرتاپا رازی نین بەرپرسێکی تورك لەناویاندا بێت. ئیدی زۆر نەخۆشکەوتووە و بە تەنیا لە زیندانەکەیدا لە سەراکەدا بۆ ماوەی شەش هەفتە کەوتبوو، بە تۆزێ پەنیر و نان دەژیا، کە لەلایەن پاسەوانی سەراکەوە بۆی دەهێنرا. ئینجا ئێستا کراوە بە مودیری سەراجیق، کە گوندێکە لە رۆژهەڵاتی سلێمانیدا، بەڵام بارودۆخی وڵاتەکە و نەبوونی زانیاری پێویست لە سلێمانیدا هێشتویانەتەوە و ئەو هەموو کاتە هیچ مووچەیەکی وەرنەگرتووە. بە کەمێك نان دەژیا و هەندێ جاریش کەباب لە بازاڕەوە، ژەمی سەرەکیشی شێوکردنەوەی کە لە ژووری میوانە گشتیەکانی ماڵی شێخانەوە بە دەستدەهێنا، کە هەموو ئێوارەیەك دەچوو. رۆژانەش بە نوێژکردن و شتن و چاکردنەوەی جلوبەرگەکانیەوە بەسەردەبرد (ئەو بەویژدانەوە خاوێن بوو)، قاوەی دروستدەکرد و بە شارەکەدا دەسوڕایەوە، بانگی بەرپرسان و کاتبە تورکەکانی دەکرد.

هەندێ جار دادەنیشێت، غەمگین، خەریکبوو دەگریا و بیر لەو مەودایە و بیابانانە دەکاتەوە کە لە خێزان و نیشتمانەکەی جیایکردۆتەوە و سەرسامی ئەو شێوەیە، لەگەڵ لاوازی چوونە ساڵەوە، دەتوانێت جارێکی دی بگەڕێتەوە. تەنیا خۆزگەی بینینەوەی جارێکی تری دەریای ناوەڕاست بوو پێش مردنی و ئەو هەڵدەلەرزی کاتێ بیری لە خەڵکە دڕندەکان دەکردەوە، کە فڕێدراوەتە ناویانەوە و گاڵتەیان پێدەکرد کاتێ بیویستایە پەیوەندیان پێوە بکات.

دۆستایەتیەکەمان کەمێك خەریك بوو تێکبچێت کە زانی من موسڵمانێکی شیعەم و من ملکەچی ئەو پشکنینە وردەم کە تایەفەی (دوانزەیەمی) بۆی ملکەچن، ئەوەش بەر لە دڵنیابوون بۆ سەلامەتی بروا ئاینیەکەم لە بنەڕەتدا. گەورەترین داکۆکی کە کردم ئەوە بوو ببینێت نوێژدەکەم و دەستم بەملاولامدا شۆڕکردۆتەوە لەجیاتی ئەوەی لەسەر سنگم لەسەریەك دایانبنێم و بۆ دەستنوێژێك کە زۆر وردنیە و لای شیعە شیاوە.

ئەو ئایەتێکی قورئانی هێنایەوە و ئاشکرایکرد ئاراکانمان جیاواز نیە لەو، ئیدی بەشێوەیەکی گشتی گەڕانیەوە بۆ سۆز و خۆشەویستی خۆی، لەگەڵ هاوارێکی زۆری: " ئاوارە دەبێت لەگەڵ ئاوارەدا بە بەزەیی بێت."

# بەشی دەیەم

# شارەزوور

دوای چوار رۆژ مانەوە لە سلێمانیدا، بەیانیەك زوو هەستام بۆ وەڵامدانەوەی ولآخدارێك و دوای ئەوە شتەکانم کۆکردەوە و هەندێ نانی کەمیشم تێکرد، سواری ئەسپەکەم بووم و خواحافیزیم لە مستەفا بەگی بەساڵاچوو کرد و کەوتمە کازێوەوە پێش خۆرهەڵاتن لە گەشتەکەمدا بەرەو هەڵەبجە، ئەو شوێنەی بەو هەموو رێگایەدا لە ئەستەنبوڵەوە هاتووم بۆئەوەی بیبینی. رێگاکە لە سلێمانیەوە بۆ هەڵەبجە یەکێك بوو لەو سێ رێگا بێ ترسەی لەو شارەوە دەردەچێت، دوورە لە ولآتی هەمەوەندەوە، بەڵام تەنانەت لێرەش بوونی جەردەکان کە سەربە شێخانن مەحاڵیان کردووە بۆ ئەوانەی تەنیان و لەگەڵ کاروانە گەورەکاندا سەفەرناکەن. بۆیە ئێمەش لە دەرەوەی شار چووینە ناو کاروانە سەرەکیەکەوە، ئەم کاروانی هەڵەبجەیە هەفتانەیە و بەشێوەیەکی رێکوپێك دەڕوات، دانیشتوانی رەسەنی ئەو شوێنە بەرێوەیدەبەن.

مەحاڵە کاتێ بە شارەکەدا تێدەپەڕیت تێبینی ئەو کاریگەریەی بیناسازی ئێرانی لەسەر خانوبەرەی سلێمانی نەکەیت، هەموو خانویەکی کۆن و باشتر لەسەر شێوازی ئێرانی بیناکراوە، ژوورەکانی بەشی سەرەوە لەگەڵ دەرگای شوشەبەند، شێوەی ولآتی کوردستانی ئێران دەدات بە شوێنەکە. ئێستا هەموو شت زۆر وێرانە و شلۆقی هەمیشەیی رێگرە لەبەر هەر هەوڵێکی چاکسازیدا.

ئەو شەقام و خانووە دارزاوانەمان جێهێشت و بەژێر گۆڕستانەکەی سەرگردەکەدا چووینەدەرەوە، کە وا رێکخرابوو کاروانەکە لەوێدا کۆبێتەوە. بەهەرحاڵ، کاروانمان نەبینی، بەڵام سێ ژن لەسەر زەویەکە هەڵتروشکابوون و پریاسکەکانیان توند گرتبوو، هەروەها نیو دەرزەنێك لە سوارەی جاف، کە هەر یەکەیان سێ بۆ چوار فیشەکدانیان پێوەیە و تفەنگ و خەنجەر و دەمانچەیان هەڵگرتووە، لە نێوانی داغڵە سەوزەکە و ئەسپەکانی خۆیاندا دانیشتن. یەك لە دوای یەك گەشتیاران پەیدابوون- پیاوان بە پێ دەهاتن، ژن بەسواری کەر و هێستر لەسەر کەلوپەل و شتومەکەکان دانیشتبوون و سەر و لاقی خۆیان لە ئەسپەکانیان دەپاراست. ئەفسەرێك هاورێیەتی کردین، کە لە هەڵەبجەوە دەچوو بۆ خانەقین و رەزامەندی بیست سەربازی وەرگرتبوو بۆ یاوەری تا دوا شوێن. ئەوەش لە دواجاردا دەرکەوت و وادەرخرا کە بۆ شکۆکانی یاوەری بۆ کاروانەکەیە، بۆقیەکە چەند جارێك لێدرا بەهیوای ئەوەی هێمایەکە بۆ کەوتنەرێ. کاروانەکەمان گەورە بوو، نیوەی خەڵکەکان ژن بوون و لە سلێمانیەوە دەگەڕانەوە بۆ شوێنی زێدی خۆیان، گوندەکان بەدرێژایی سنووری ئێران- هەمووی

## دەرچوون بۆ هەڵەبجە

کوردە، جگە لە سێ بەغایی کە ژنەکانیشیان لەگەڵیاندابوون، بەرپرسە تورکەکە، کە دەچوو بۆ خانەقین. کۆمەڵێکی بچووك کە ژنیشیان لەگەڵدابوو، ژنێکی پیری خەڵکی ناوچە شاخاویەکانی هەورامانە، خەسوی ولاخدارێکە و لەبەرئەوە رێدراوە بەخۆڕایی سواری کەرێکی بچووك بێت، کە لەوە دەچوو ئارەزووی بە پێ رۆشتنی نەبێت بۆیە دانیشتنی هەڵبژاردووە.

هەر بە تەواوبوونی پێچە یەك لەدوای یەکەکانی چیاکانی ئەزمەڕدا، یاوەرە سەربازەکانمان بۆ دەرخستنی ئەو پەرۆشەی بۆ ئەرکێ کە هەرگیز لە دەرکەوتنی شکستیان نەهێناوە. بەهەرحاڵ، ئەرکەکانیان کاتێ لە رێڕۆشتندا و لە شارەکان هەمیشە بە لای من و دانیشتوانیشەوە دەستپێکردن و کۆتاییە لەگەڵ توێژینەوەی کردەوەیی بۆ زانیاری جارسکردنی دەستدرێژی هاوپەش و دزی و زەبروزەنگ، وەك کاریگەری لەسەر سەرجەمی خەڵك و لەمەوە ئەوان ئەو کارامەییە بەرجەستەیە بەدەستدێنن.

لەسەر ئەو دەرفەتە یەکەم چالاکیان سێ یا چوار کوردی بێوەیان لەسەر کەرەکانیان فڕێدایە خوارەوە و دەستیانگرت بەسەر ولاخەکاندا. دوای سەعاتێك لە دەرچوونی سلێمانی خۆر دەستیکرد بە گەرمبوون و تینوێتی سەربازەکان و شەربەی ئاوی هەموو گەشتیاران ئاوی تێدا نەما، لەگەڵ نارەزایی دەربڕینیش، ئەوەش لەبەر دوو نمونە، لەوانەیە بە ئەنقەست سەربازەکان شکاندبیان و ئاوەکەیان رشتبێت.

دەنگوباسێکی زۆر هەبوو لەبارەی دزی و جەردەییەوە، رێگاکەش بە قەراغی ولاتی کوردە هەمەوەندە یاخیەکاندا تێدەپەڕێت و لەپڕ دەرکەوتنی هەندێ سوارە لەسەر گردەکانەوە بووە هۆی سەغڵەتی و نائارامی پاسەوانەکان. چونکە چەکداربوون بە تفەنگی جۆری ماوزەر، ناچاربوون جۆرە گیانێك پیشان بدەن و هەوڵیاندا سەرچلانە خۆیان نزمکەنەوە و دەستڕێژێکیان لە سوارەکان کرد، خۆشبەختانە کەس پێوەنەبووە. دوژمن بە تەواوی ئاشتی ئامێزانە وەستا و بە ئاوازێکی سەرزەنشتانەوە قیژاندیان و بە جلوبەرگ و شێوە زارەکەیاندا ناسرانەوە کە شەش سواری خۆمانن. بە زانینی ئەوە بارودۆخی سەربازەکان شایانی بەزەیی بوون. نزیکەی شەش یان حەوت، کە ترسی تۆڵەکردنەوەی عەشایەری زاڵبوو بەسەر کاریگەری رێکوپێکی سەربازیدا، بە سەرشۆڕی هەڵهاتن بۆ

شار، پیاوەکانیش کە تەقەیان لێکرا بوو هەر لەبیری خۆیان بردەوە. ئەوانە، دیمەنێك لە دووری بارودۆخەکەوە، بەدوایاندا دەرچوون لەگەڵ قیژاندنی تورەیی زۆر دڕندانە. ئەوانەی مابوون لەلایەن سوارەکانی خۆمانەوە تەوقکراون و قۆناغە تفەنگی بۆ بەزەییانەیان دەخوارد کە بەشێوەیەکی حەکیمانە لەسەر پشتی ئەسپەکانەوە بەکاریان دەهێنا. " یوزباشی"[59] بە لوتبەرزیەکەوە بە تورکی هاواریکرد بۆ کەرەناژەن و "باش چاوش"[60]- بەڵام هەردووکیان کەوتبوون، یەکێکیان لەژێر ناڵی ئەسپەکاندا و ئەوی تر لەژێر ورگی کەرێکدا لە هۆش خۆی چووبوو، کە وەڵامی یوزباشی بە هاوار هاوار دایەوە.

ئەگەر چەند کەسانێکی تیرەی جافمان لەگەڵ نەبوایە، کە چووبوونە ناو خاکەکەیانەوە، سوارەکان نێستا ئێمەیان جێهێشتبوو، هەروەها ئەوانەی نێو گردەکان زیاتر هێرشیان دەهێنا و کاروانەکەیان تالاَندەکرد. خۆشبەختانە بەخێرایی تورەییەکەی نیشتەوەو باقی سەربازەکان، شین و مۆر، بریندار و شایستەی بەزەیی بوون، جارێکی تر بەرەو هەڵەبجە بوونەوە و بەپێی توانا خۆیان لە ئێمە دووردەگرت. لەژێر تینی گەرمای خۆردا گرد و چەمەکانی سلێمانیمان خستە دوامانەوە، تا سەرکەوتینە سەر دوا نشێوییەکی دووروودرێژ و دەشتی شارەزوور کەوتبووە پێشمانەوە، دۆڵێکی پانوبەرینی خاڵ خاڵ لەگەڵ رەشماڵە رەشەکانی خێڵی جاف و ژمارەیەك لە تەپۆڵکەکان کە لەوێدا بەپێوەن، ئاسەواری دانیشتوانی پێشینە و گوندەکانی ئەم دواییەی بە فرمانی شێخی ناودار و پیاوچاکی سلێمانی وێرانکران.

داوێنی رۆژهەڵاتی ئەم دەشتە دەکەوێتە ژێر سێبەری دیواری ئەو شاخە مەزنەی هەورامان، کە سنووری وڵاتی ئێرانە، دیوارێك سنووری دابڕاوترین وڵاتانە و لەوانەشە لێڵ و ناڕوونیەکانی تیرەکانی کوردستان بێت، هەورامی و ریژۆیی و ئەو محەمەدییانەی ئیمامی عەلی دەپەرستن، کە پێیدەڵێن خوایە.

هەڵەبجە، یان ئەڵەبجە، وەك نووسراوە، پەڵەیەك لەسەر لێژایی بەرزاییە دوورەکەی دەشتەکەیە، کە لە دووری 30 میلەوە بەتەواوی دیاربوو، لە نێوانی ئێمە و ئەودا وێرانەیەکی تەواوی تورك بوو.

---

[59] - یوزباشی = پێشەنگ.

[60] - باش چاوش = سەربازی چوار خەت.

دەستی لێرەدا دەڕۆشت، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا لاوازە و ئەم ناوچەیە کە لە رابردوودا پارێزگایەکی بەپیت و سەرکەوتوی ئێران بووە و تا ئێستاش لە هەموو روویەکەوە ئێرانیە جگە لە ناوەکەی، بەگشتی لەژێر دەستەڵاتی عوسمان پاشای سەرۆکی تیرەی جافەکاندایە، کە کەمێك سەر بەحوکومەتی تورکیایە، یان ملکەچی نییە، یاخود لەوپەڕی ناچاریدا رازیە چەند بەرپرسێکی تورك لە هەڵەبجەدا هەبن. پۆستە و بروسکە دەمێك بوو هەڵوەشێنرابووەوە، ناڕازین پارە بدەن بە پارچە کاغەزێك و بینێن بەسەر نامەیەکەوە کە خۆیان دەتوانن هەڵیبگرن و تەلی هێڵی بروسکەیان بەکاردەهێنا بۆ دروستکردنی زنجیر و فیشەکەکان. تا ئێستاش، لە کاتێکدا هەڵەبجە بەڕێوەبەری پۆستە و بروسکەی هەیە، نوسینگەکەی لە کۆکەرەوەی باج زیاتر شایانی گاڵتەپێکردنە، کە لە سلێمانی دانیشتووە و داوای موچە لە عوسمان پاشا دەکات.

ئەم شارەزوورە، کە تەپۆڵکەکانی پڕە لە پارچە پارەی ساسانیەکان و نیشانەکانی ئاشووری، کە تا چەند دەیەیەك بۆ دواوە پارێزگایەکی "گوڵعەنبەر[61]- گوڵی عەمبەر" بوو، کە لە هەموو راپۆرتەکاندا یەکێك بووە لە جوانترینی هەموو جوانەکانی کوردستان.

پڕیەتی لە دانیشتوانی تیرەکانی هەورامانی و کلدانیەکان، خاکەکان پڕن لە چەندەها میوە و گوڵ، هەیانبووە و هێشتا هەیانە و سەرچاوەیەکی باشی ئاوی شیرینە و شنەی شەماڵێکی فێنك لە چیا سەرکەشەکانەوە دێت بۆ کەمکردنەوەی گەرمای دەشتەکە.[62]

بەڵام تورکەکان خاوەندارێتیان بەدەستهێناوە و ئەو دەردەی لێداوە هەموو شتێکی لەناوبرد، تا ئێستاش تاکە خەڵکانێك کە لەوێن خێڵی کۆچەریی جافە، کە هەموو بەهار و پاییزێك گەرمیان و کوێستان دەکەن. من هەموو ئەوانە فێربووم و ئیدی بە دیدێکی گرنگیدانەوە روانیم بە گۆڕەپانەکەدا تا لەلایەن سوارەکانمانەوە پەلەیان لێکردین، کە کۆمەڵێکی گەورە لە سوارەی هەمەوەندیان لە دوورەوە بەدیکردووە، لەگەڵ هاوار و پەلەپەلکردنندا ئێمە هەڵهاتین بۆ پەناگەی کۆمەڵە دەوارێك، کە شوێنی نیشتەجێی خێڵێکی بچووکە و خەڵکی گوندی مووانن، گوندەکە نیو میل لەولا باخی دارچنارەکانەوەیە و لە هاویناندا چۆڵدەکرێت. لێرەدا بارەکانمان فڕێدایە سەر دەشتەکە و هەر تاقمێکی بچووك بەربەستێکی بە کەلوپەلەکانی خۆیان دروستکرد.

---

[61] - کورد ناوەکەی بەشێوەیەکی گونجاو تێکداوە بۆ "خولمور" " واتە خاکی مردو".

[62] - ناوچەکە لە هەندێ نوسراوی کۆندا ناودەبرێت بە سیازووروس و ناوچەیەکی گرنگی "حلوان" بووە لە چەرخی ساسانیدا.

## هەوارگەی پاشا

نانی گەنم لەم کاتەی ساڵدا لای گوندیەکان ناسراو نەبوو، ئێمە نانی خۆمان هێنا و کاسەیەك "دۆ"ی گەورەمان کردە پێخۆری، کە خواردنەوەیەکی نەتەوەیی کوردستانە.

لەگەڵ شەو داهات باران دەستیپێکرد و پەناگەیەکمان نەبوو، هەموومان زۆر تەڕبووین. هەروەها دوپشکێکی زۆر بەهۆی تەڕییەکەوە لەژێرماندا خۆیان حەشاردا و لەبەر با و باران و هەورەچەماخە و دوپشك و تابوورە کێچ و تەق و تۆقی ناوبەناو، زۆر کەم نوستن و ئێمە بەداخەوە نەبووین بەو بەیانیە زووە ساردە دیسانەوە باربکەینەوە. خەسووی ولاخدارەکە خراپترین بەختی هەبوو، بۆ ئەوەی ئەو تەواوی شەو وەك پاسەوانێك کاری کردبوو، کاری سەرەکی ئەو راکێشانەوەی ئاژەڵە تەمەڵەکان بوو لەسەر پێخەفەکانمان، کە لەسەری دەوەستان و پێشێلیاندەکرد، لەسەر ئەوەی کە لە شەودا سەرچاوەیەکی پەستکەر بوو. سەربازەکان ماندون و بێتاقەت لە ژیان، ئەم بەیانیەی رۆژی دووەمە زۆر خەمناکە. گیانیان تەڕبووە و پێکانیان بریندارbووە، لە دارکاریەکەی رۆژی پێشوشدا هەموو گیانیان تێکشکابوو، رۆشتنی 30 میل بەناو گەرمای شارەزووردا کە لە راستیدا ئێش و ئازارێکی زۆرە. لەنیوەی رێ بەناو دەشتەکەدا، کە هەوای پەنگخواردو هەڵمی گەرم لەجیاتی ئاو هەڵدەچنێت و لەش دادەهێزرێنێت، گەشتینە سێبەرگرێکی گەورەی لە مووی بزن دروستکراو، کە بە سێبەرگری بچووکتر لە هەمان مادە دەورەدرابوو.

ئەوە هەواری مەحمود پاشای جاف بوو، بەهێزترین پیاوی ئەم ناوچەیە و تەنیا نیشانەی شکۆداریەکەی جوانی و نایابی فەرشەکان، ریزە سندوقە چەرمەکان و لێفە ئاوریشمەکان کە لەبەر هەتاو هەڵخراون، تا کێچ و ئەسپێکانی نێوانیان بێنەدەرەوە.[63]

پاشنیوەڕۆ گەیشتینە هەڵەبجە، شارۆچکەیەکی بچووك کەوتۆتە نێوان باخەکانەوە. بەهۆی سێ کۆشکی گەورەوە دەناسرێتەوە، کە تایبەتن بە عادیلە خانم، تاهیر بەگ و مەجید بەگی هەنەزاوە- زڕکوڕەکانی، کە ئەگەر ناوی ئەو خانمە واتا بکەین، باشترین واتا دەبێتە "خانمی داد". ئەوانە و لەگەڵ بازاڕێکی خاوێن و باش دروستکراودا، جیاکەرەوەی نەبوونی بەر لە پەنجا ساڵ دەدات بە

---

63 - پیسایی نائاسایی شوێنی ژیان پێویستە نەکرێتە دیاردەیەك بۆ کوردەکان بەهۆی بەیانکردنی ئەو کێچە زۆرەوە. دەشتەکانی میسۆپۆتامیا، سووریا و کوردستان ملیۆنەها لەو گیانەوەرە زیاندەرە لەناو لم و تەپوتۆزەکەیدایە و بەزۆری لە ناوچە بیابانیەکان و لە شوێنی نیشتەجێبووندایە. لە مانگی تەموزدا دیارنامێنن و لە بەهاردا دەردەکەونەوە.

هەڵەبجە، کاتێ کە گوندێکی بێبایەخ بووە. سەیرە لە هەڵەبجەدا ئاساییە وڵاخدار وڵاخەکەی بەرێت بۆ تەویلەی ماڵی خانەخوێکە، چونکە تا ئێستا کاروانسەرا- خانی تێدانییە، لەگەڵ ئەوەی دانەیەك خەریکە بینادەکرێت. بەڵام دۆستایەتیم لەگەڵ بازرگانێکی هەڵەبجەیدا دروستکرد کە دەیزانی وەك لەسەر هەموو دانیشتوانی هەڵەبجە پێویستە، عادیلە خانم و ئەویش سوورن کە " زانست و زانیاری و پەروەردە و بە رەوشتیم" دەبێتە هۆی ئەوەی پێشوازییەکی گەرم بکرێم لەلایەن ئەو خانمە ناودارەوە، ئەگەر ماڵێکی تایبەتم بۆ خۆم دامەزراند، ئەو کاتێ بیستی بە سەرپێچی دادەنێت، بە دڵنیایەوە ئەو ئەوە دەکات، بە گەیشتنی فارسێك، گەشتیارێکی نمونەیی لەو بەشەی کوردستان. ئەو پێیوتم ئازایانە بچۆ بۆ ماڵی تاهیر بەگ، کە بە دەرگایەك و پردێك پەیوەندە بە ماڵی عادیلە خانمەوە و بڵێ کە من فارسێکی نووسەر و بازرگانێکم و بەناو خاکی ئەودا سەفەردەکەم و پشت بە چاکەی ئەو دەبەستم. نیازم وایە ئەوە بکەم و چوومە ناو چۆڵاییەکی زۆر گەورەوە، سەرکەوتمە سەر تەلارێکی بەرز و دابەزیم. دوو خزمەتکار دەرۆیشتن، سەیری من و شتەکانمیان کرد و لێیانپرسیم من کێم. خۆم پێناساندن وەك ئامۆژگاری کرابووم و بانگهێشتیانکردم دابنیشم تا عادیلە خانم ئاگاداردەکەن، کە لە ماڵەکەی تر بوو. بینیان کە ئەو تازە هەستاوە لە خەو و دوای ماوەیەکی کورت گەڕایەوە لەگەڵ پەیامێك کە شادمانە بە دەرفەتی بینینی فارسێکی خەڵکی شیراز، تەنانەت یەکەم جارە خەڵکی وڵاتی خۆی دەبینێت و ژوورێکی نهۆمی سەرەوەی لە ماڵەکەی تاهیر بەگ بۆ تەرخانکردم، کە لەوێوە دەتوانیت بڕوانی بەسەر باخ وباخات و دەشتودەر و چیادا. لێرە فەرش ڕاخراوە، لەلایەن ئەو پیاوەوە، کە کەمێك فارسی دەدوا و دوو کارەکەری تەرپۆشی کورد، چایی و جگەرە هێنرا، سەروپێچەکانیان بە گۆشەیەکی جواندا ڕێکخستبوو، بەدەم جگەرەکێشانەوە هاتە پێشەوە تا پرسیارم لێ بکات. عادیلە خانم دوای ماوەیەکی کورت پەیامێکی تری نارد تا بڵێت کە ئەو سبەینێ بەیانی لە جەماوەرێکی تایبەتیدا دەمبینێت، دەربڕینێکی بەراوردکاری لەناو ئەم خاکەدا بۆ گلدانەوەکان و نەریتی باوکسالاریە. ئینجا شێویان لەسەر دوو سینی گەورە هێنا، پڵاو، گۆشتی مزر، ماستاو، شیرینی و شەربەت و بەدوایدا لەلایەن پیاوێکەوە لەگەڵ پێخەفێکی نوێی پێچراوە، کە تەواو شادمان بووم تا ڕاکشێم و بنووم.

بەر لەوەی بەردەوام بین لە چیرۆکەکەدا، چاکتر وایە هەندێ تێبینی لەبارەی بنەماڵەکە و تیرەی جافەوە بدەین و بەتایبەتیش زیاتر لەبارەی ئەو ژنە نائاساییەوە کە لە ماڵەکەیدا میوانم- ژنێکی

نمونەیی لە ئیسلامدا- لە دەستەڵاتێکدا کە ئەو هەیەتی و کاریگەری لەگەڵ بەکارهێنانی ئەو چەکانەی لە دەستەکانیدایە.

تیرەی جاف، تیرەیەکی کۆنە و لە مێژوویەکی زۆر کۆنی کوردستانەوە بەهێزبوون و ناودارن بە شێوازەکەی کە سەرکردەکانی کۆکن لەسەری و پێکەوە کۆیاندەکاتەوە. ئەم دیاردەی کەسایەتیە- پێکەوەلکان – لەناو سەرکردە مەزنەکانی کورد- دا زۆر دەگمەنە، سامان و دەستەڵاتیان بۆ تیرەکەیان بەدەستهێناوە، بۆیە ئێستاکە سەرکردە جیاوازەکان خاوەنداری شارەگرنگەکانی وەك پێنجوێن و هەڵەبجە و قزڵ رەباتن، لەپاڵ ژمارەیەك لە گوند و زەویوزاردا، کە بە کڕین دەستیانکەوتوون.

ئەوانە، موڵکی تاکە کەسە، بەهیچ شێوەیەك پەیوەند نییە بە "خاکی جافەوە" ئەو وڵاتە دەگرێتەوە، کە تیرەکە گەرمیان و کوێستانی تێدا دەکات و مافی خۆیەتی پێیدا تێپەڕێت، بارگەی تێدا بخات و کشتوکاڵی تێدا بکات، ئەوانە لە کۆنەوە مافی خۆیانە، خەڵات و وڵاتگیری سەر بە تیرەکەیە وەك هەموو.

لەو کاتەوەی بەغداد لە سەدەی هەڤدەیەمدا گەڕایەوە بۆ ژێر دەستەڵاتی تورکەکان، جافەکان لە پەیوەندیدا بوون بە رۆژئاواوە لەگەڵ ئەو میللەتە[64] و بۆ ماوەی دووسەد ساڵ دادنیان بەوەدا نابوو کە سوڵتان لایەنێکیانە، هەروەها خەلیفە یان سەرکردەی رۆحی موسڵمانی سونییە، بۆ ئەو بەشەی کە ئەوان تێیدا ئەندامن. بەهەرحاڵ، تا ئەم کاتەش پارێزگارییان لە تیرەکە وەك نیمچە سەربەخۆیەك زیاتر کردووە، مەحمود پاشا بەرپرسی ئەو برە پارەیەیە کە ساڵانە دەیدات بە سوڵتان. لە سەدەی هەژدەیەمەوە کاتێ بەشێکی گەورەی تیرەکە خاکە کۆنەکەی خۆیان لە جوانرۆی ئێران جێهێشت، دوو بەش لە تیرەکە جیابوونەوە و هەواری خۆیان لەگەڵ تیرەی گۆرانی ئێراندا هەڵدا و هێشتا لەگەڵ ئەواندا ماونەتەوە. ئەوانەش جافی قادری میر وەیسی و تاشین. لەم دواییەدا بەشێکی دی - بە رابەری فەتاح بەگ- ناوێك، جیابوونەوە و گەڕانەوە بۆ پارێزگای کرماشان لە ئێران. جگە لە بەشە بێ بایەخەکان، تیرەی مەزنی جاف هەر یەکگرتووە بە چەشنی سەردەمانی رابردوو، جارجارە هەڵدەستن بە سزادانی ئەو خێڵە بچووکانەی کە هەڵسوکەوتیان ناپەسەندە و لەپێناوی تورکەکاندا وەك پاسەوانی سەرسنوورەکان کاردەکەن، بەبێ ئاگاداری سەرۆکە دەستەڵاتدارەکانی

[64]- لە میانەی پەیمانی تورکۆ- فارسی لە 1639دا، جافەکان بەشێکی سەر بە تورك و بەشێکی سەر بە فارس بووە.

خۆیان. تیرەکە خۆی- واتە ئەو کەسانەی کە دەیانویست هەموو بەهارێك لە قزلّ ڕەبات بۆ پێنجوێن و سەقز بوونیان هەبێت- ملکەچ بوون بۆ سەرپەرشتی ڕاستەوخۆی مەحمود پاشا کە لەگەڵیان بێت. عوسمان پاشای برا گەورە، وەك لەوەبەر ناومان هێناوە، لەلایەن حاکمی سوڵتانەوە وەك قایم مەقام- قایقام بۆ ناوچەی شارەزوور دانراوە. ئەو فەرمانڕەواییە گرنگیەکی بەرچاوی زۆری هەبوو، کە سنووریەکەی، پێویستی بە دەسەڵاتێکی چەکداریی هەیە لەلای حاکمەوە. عوسمان پاشا، کە دەتوانێت تیرەکە بانگبکات، هەڵبەتە ئەو دەسـتەڵاتەشی هەیە.

بەڵام ئێمە لێرەدا دەبێت کەمێ لە باسەکە دەربچین تا عادیلە خانم بێنینە ناوەوە، کە بەسەر سنووردا هاتووە، لە بەشی فارسیەکەی کە خاکەکەی دەگاتە سنووری شارەزوور، ئەویش ئەردەڵانە. ئەم ئەردەڵانە لەوەپێش میرنشینێك بوو لەژێر دەستەڵاتی زنجیرەیەك لە میرە گچکەکانی کورد، هەرچەندە لە ڕاستیدا سەربەخۆبوو، کەچی ملکەچی دەستەڵاتی شای ئێران بوو. ئەو میرانە بۆ پێنج سەد ساڵ فرمانڕەواییانکرد، میرنشینەکەیان لە سنەیە، کە تا ئێستاش پایتەختی ئەردەڵانە.

لەژێر ڕۆشنایی فرمانڕەواییاندا هونەر و ئەدەبیات لە سنەدا پەرەی سەند،[65] ئەدەبیات لە شێوازی فارسی و کورد، کە تەنیا ئێستا دۆزراوەتەوە،[66]- شارەکە بە خانو و باخ و باخاتی جوان ڕازاوەتەوە و سنە بووەتە شوێنی تۆمارکردنەکانی ئەوانە، کە جوانیەکەی ئاشکرایە لە کتێبی هەموو ئەو گەشتیارانەی کە لەوەبەر پێیدا تێپەڕیون. بەهەرحاڵ، فەرمانڕەوایان کزبوون و ئەوەش بەدەرنییە لە دەستوور. خانەکانی ئەردەڵان (وەك فەرمانڕەوایان بانگکرابوون) پەیمانێکی داکۆکییان لەگەڵ بنەماڵەی فەرمانڕەوایان لە ئێران بەست، قاجارەکان، یەکێکیان کچێکی فەتح عەلی شای مارەکرد، کە لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا فرمانڕەوایی ئێرانی دەکرد. مێردەکەی ئەو خانمە سەرکەوت و فرمانڕەوایی ئەردەڵانی لەگەڵ دەستێکی بەهێز و ڕەوادا کرد. دوای خانم کوڕەکەی هات و دوای ئەویش حکومەتی ئێران- بۆ ناسرئەلدین، شای ئێران، فەرمانڕەوایەکی بەهێز، کە ئامانجی بوو هەموو دەوڵەتە نیمچە سەربەخۆ کۆنەکان ڕاستەوخۆ بۆ ژێر دەستەڵاتی خۆی ڕابکێشێت، جێنشینی دوای مردنی دوا والی ئەردەڵان، غولام شاە خان، شوێنەکەی بە خزمێکی دڕی خۆی، معتەمەد

---

[65] - تەنانەت زمانی تایبەتی فرمانڕەواییەکەش هەبوو، کە دیالێکتی گۆرانی ناسك و بەناوازە، زمانێکی فارسی کۆن، کە هێشتا لەلایەن تیرەی هەورامانی و هەندێ لە گۆرانە نیشتەنیەکان قسەی پێدەکەن. خەڵکانی ئاسایی کوردی دەدوێن، کە زمانی ئەمڕۆی شاری سنەیە.

[66] - لە مۆزەخانەی بریتانیدا دەستنووسێکی ئالیستکراوی هۆنراوەکان هەیە کە نووسەرەکەی وەك کۆمەڵە کارێکی شاعیرە ناودارەکانی کوردی فرمانڕەوایی سنە پێناسیدەکات.

ئەلدەولەی پڕکردەوە. شان بە شان لەگەڵ ئەو سوڵتان و وەزیرانە لەوێ پێگەیشتون و بنەماڵەیەکی بەهێزتریان دۆزییەوە، کە لە وەزیران یان وەزیران لە میرەکان، کە خاوەنی شارۆچکەی دوایسەی نزیك سنە بوون. ئەم بنەماڵەیە لەناونەبران و تەنانەت بێ دەستەڵاتیش نەکران، هەروەها تا رۆژگاری ئەمڕۆش بەردەوامن، ئەمڕۆ، کاتێ بەرپرسیاری گەورەی کوردستان، وەك ئێستا پێیدەوترێ هەرێم، نەوەی بنەماڵە کۆنەکەی وەزیرانە.

ئەو پەیمانانە بە ڤینێکی گەورەوە تەماشاکراوە و هەندێ زەنگی ئاگادارکردنەوەش لەلایەن تورکەکانەوە، کە زۆر بە توندی خواستیان بوو جاف لەوپەڕی ناسازیدا لەگەڵ دراوسێکانیان لە ئێراندا ببینن.

پاشا کۆنەکانی جاف ناچاربوون پارێزگاریەکی باش لە پەیوەندیان لەگەڵ بنەماڵەی ئەردەڵان بکەن و جارجارە هاوسەرگیری لەنێوان سەرکردەکان و بەرپرسە بچووکەکاندا کاریگەری هەبوو.

لە ئەنجامدا کاتێ عوسمان پاشا لە 1895دا ویستی هاوسەرگیریەك لە خێزانی وەزیرانی ئەردەڵان پێکبێنێت، هەندێ بەرهەڵستی بێهوودە لەلایەن حوکومەتی تورکیاوە کرا. بەهەرحاڵ، ئەو چوو بۆ سنە و وەك بووك هێنای بۆماڵەوە لە هەڵەبجە، ئینجا بۆ گوندێکی بێ بایەخ، خانمێك لە خێزانی وەزیران، کە باوکی ئاستێکی گرنگی لە تاران پڕکردۆتەوە.

هەر کە لە هەڵەبجە جێگیربوون، عادیلە خانم بەهۆی پلە و پایەی خێزانەکەیەوە بەردەوامبوو لە دیاریکردنی پێگەی خۆی، ئەو پرۆسەیە لەلایەن عوسمان پاشاوە بەرهەڵستی نەکرا. دوو کۆشکی جوانی بیناکرد، باشتر لە هەر بیناسازیەکی سلێمانی و لەسەر شێوازی سنە، بیناساز و پیشەوەرە داناکانی لە ئێرانەوە هێنابوو تا ئەو کارە جێبەجێکەن. خزمەتکارەکانی خەڵکی ئێران بوون و لە هەڵەبجەدا لە ماڵە نوێکەیدا کەمایەتیەکی بچووکی لە کوردەکانی ئێران دامەزراند و دەرگاکانی کراوەبوون بۆ هەموو گەشتیارانێك کە لەو وڵاتەوە هاتبێت یان بچێت بۆ ئەوێ، بەردەوام لە پەیوەندیدایە لەگەڵ سنەدا، کە رێگەی پێنج رۆژ دوورە.

بەرەبەرە دەستەڵاتی فەرمی گرتەدەست. زۆرجار عوسمان پاشا دوور بوو لە چارەسەرکردنی کاروبارەکاندا و زۆرجاریش بەکاروباری میری دەبوو بچێت بۆ سەفەر بۆ سلێمانی، کەرکوك و موسڵ. بۆیە عادیلە خانم لەکاتی ئامادەنەبوونی ئەودا فرمانڕەوایی دەکرد، بەندیخانەیەکی نوێی بیناکرد و دادگایەکی دادپەروەری دامەزراند کە خۆشی بووە سەرۆك و هێزی خۆی چەسپاند،

پاشاش کاتێ لە هەڵەبجە بوو، کاتی خۆی بە نێرگەلەکێشانەوە بەسەردەبرد، گەرماوە نوێکانی بیناکرد و خەریکی چاکسازی ناوخۆ بوو، لەکاتێکدا ژنەکە فەرمانڕەوایی دەکرد.

عادیلە خانم بازاڕێکی لە هەڵەبجەدا بیناکرد، چوارگۆشەیەکی دروستکرد کە بریتی بوو لە چوار ریز دوکان و بەهۆی کۆڵانەکانەوە بەسترابوونەوە بە دوکانی زیاترەوە، هەمووی بە تاقی خشتی نوێ داپۆشراوە و بازرگان رژانە هەڵەبجەوە، کە بە گرنگیەکی گەورەوە گەشەیکرد. گرنگی لەو جۆرەش وای لە شوێنەکە کرد کە تورکەکان لە راستیدا بەخیلی پێبەرن و دەستی بەسەردا بگرن، هێڵی بروسکەیان بۆ راکێشا، کە پیاوانی تیرەکە نارەزابوون و نارەزاییەکەشیان بە پچڕاندنی تەلەکە دەردەبڕی.

لەهەمان کاتدا عادیلە خانم ئامۆژگاری تورکەکانی کرد بەچاکنەکردنەوەی، لەبەرئەوەی هەروەها بەرهەڵستی هاتنەناوەوەی تورکەکانیشی کرد بۆ سەر خاکەکەی و ئاگاداریکردن هەر کە ئەوان وایەری بروسکەیان دانا میللەتەکەی ئەم دەبێت بیپسێنێت. هەڵەبجە لەو رۆژەوە تا ئەمڕۆ هیچ هێڵێکی بروسکەیان نییە، لەگەڵ ئەوەی بەرپرسی فەرمی بەرگی هاوشێوەیان لەوێ پۆشیوە و شادمانن بە ناونیشانی بەڕێوەبەری پۆست و بروسکە. هەموو هاوینێك کاتێ کەشوهەوای هەڵەبجە تەواو گەرم دەبێت، عادیلە خانم شوێنی حەوانەوەی خۆیی و دەستوپێوەندەکەی لە گوندێکی گچکەدا لە بەرزاییەکاندا رێکدەخاتەوە، یان بۆ شارۆچکەیەکی ناو خاکی ئێران، تا سێ یان چوار مانگ تێدەپەڕێت.

عادیلە خانم لەناوەوە و لە دەرەوەی هەڵەبجەدا لەسەر شێوازی هاوچەرخی ئێرانی باخەکانی رازاندۆتەوە، ئەوە جگە لە باخچەکانی دەوروبەری ماڵەکان و ئێستاش لە دەرەوەی شارە بچکۆلەکە ژمارەیەك باخچەی ناسك و دارودرەختی چڕ هەیە، کە تەنیا لە وڵاتی ئێراندا بینراوە، باخەکانی کە خۆرسکە و درەختە سێبەرگرە گەورەکان، لەگەڵ ساباتە چاوەڕواننەکراوەکان و راخەری گوڵ لەناو قووڵاییە سێبەرگرەکاندا.

تا ئێرە، لە گۆشەیەکی دوورە دەستی ئیمپراتۆریای تورکیاوە، کە بۆگەندەکات و بۆ دواوە دەچێت، تەنیا خاڵێکی بچووك، کە لەژێر دەستەڵاتی ژنێکی کورد- دا پێگەیوە و لە گوندەوە بووە بە شارۆچکە و لاپاڵی گردێك، سەردەمانێك وشك، ئێستا پڕ باخ و باخاتە و ئەوانە مامەڵەی نوێکردنەوەی دەوڵەتە کۆنەکەی ئەم بەشانەیە. شارەزوور یان شاری زۆر، لەلایەن هەندێکیشەوە پێیدەوترا شاری بازاڕ و تا سەردەمێکی ئەم نزیکانەش پێیدەوترا گوڵعەنبەر، کە لە داوێنی شاخی

# حەلوان

هەوراماندایە و ئەفسانەیەك هەیە دەڵێت لە سەردەمێکی زووتردا گوندێك پێیدەوترا ئەحمەد کوڵوان، بەدرێژایی شاخەکانی باکوور پایتەخت بووە. بەهەرحاڵ ئەوە لەوانەیە لەسەردەمی ساسانیەکاندا بوویێت لە ئێران، کاتێ قەسری شیرین بیناکراوە و فەرهاد چیای بێستونی دادەتاشی، شارێکی مەزن هەبوو ناوی حەلوان بوو. ئەوەش لە دەوروبەری ساڵی 400 پێش زاییندا بوو. حەلوان و خاکەکەی درێژدەبۆوە تا ئەو شوێنەی ئەمڕۆ بە شارەزوور ناسراوە و لەپشتی شوێنی هەڵەبجەی هاوچەرخەوە، لەناو ئەو بەرزاییانەی کە پانتاییەکی خڕی لەداوێنی لێژگاییەکان لە پشتیەوە پێکهێناوە، شارێکی گەورە لەوێدا هەبوو پێیدەوترا ساسان. لەوێدا تاشە بەردی گەورەی بیناسازی هەیە و ئاسەواری هێشتا بە پێوەیە، دیواری ئاسایی و کۆڵەکەکانی چەرخی ساسانیی مەزن لە ئێران. هەموو هێماکان گەواهی بوونی شارێکی گەورە دەدا لەوێدا و لە دەشتی شارەزوورەوە بەرەوخوار ژمارەیەك گوند هەبوون، کە دانیشتوانەکەی کشتوکاڵیان لە خاکێکی دەوڵەمەند و تەواو ئاوداردا دەکرد. ئەمڕۆش ژمارەیەك گردی بەرزی گەورەی تێدایە، نیشانەیەکی بێگومانی دانیشتوانێکی دێرینە. شارەزوور زۆر باش بە گردەکانی پارێزراوبووە، کە جێی سەرسوڕمان نییە پاشا دێرینەکانیان وەك شوێنێکی شایستە و تایبەت تێیان ڕوانیوە و پەسەندە بۆ پەرەپێدان و بازرگانی. بەدەوروبەری هەموو لایەکاندا بازنەیەکی بەرزی چیاکان هەیە، جگە لە باکووری ڕۆژئاوا و تەنیشتی بازنەی گردەکان کە ڕووبارێکی بەهێز و خێرا لای باشوورییان لێ دادەخات. بەناو ئەوەدا، لە ساسانەوە پردێکی گەورە بیناکراوە بۆناو خاکی حەلوان، کە بەشێکی هێشتا بە پێوە ماوە. شارەزوور، واتە شاری زۆر، یان شاری بازاڕ، هەردووکیان وەك یەك ناوێکی گونجاون، بەڵام بەڵگەی ئەوە نییە کە لە بنەڕەتدا ناوی دەشتی بۆ بەکارهاتبێت.

لەناو گوندەکانی گردەکەدا، کە لە دۆڵە تەنگ و قووڵەکانی دیوارەکانی هەوراماندا بەرزدەبێتەوە، شێخە ئایینیەکان ژیاون و مردوون و ئەمرۆش ژمارەیەك لە کەسایەتی پیرۆز کە لە گوندە گچکەکاندا دەژین لەسەر بەرزایی هەزاران پێ لەژێر دیوارە مڕومۆچەکەی ئەو شاخە مەزنە. لە دەشتەکەدا، کورد و مەسیحی بە ئاشتی ژیاون، تا پلەو پایەی عەبدولقادرێکی تایبەت بەرزبووەوە، کوێرباوەڕانە سەری هەموو ئەوانەی دەپەڕاند کە باوەڕیان پێینەبوو. شارەزوور لە سەردەمی ئەودا (نزیکەی دووسەد ساڵ لەوەبەر) دانیشتوانێکی تێکەڵی هەبووە و خەڵکە کوردەکەی تا ئێستاش بە

**دیالێکتە کۆنەکە دەدوێن، کە بە گۆڤەری شارەزووری دەناسرێت، زمانی کۆنی ئێران، خۆشی لە ناسکی شێوە و دەنگدا، ئێستا تەنیا لە هەورامان دەبیسترێت، کە زۆر تێکچووە.**

**ئەو کوێرباوەڕیە بووە هۆی کۆمەڵکوژی مەسیحیەکان، کلدانەکانی کە لە دەشتەکەدا نیشتەجێبوون بۆناو چیاکان و کەرکوك و بەغداد هەڵهاتن. شارەزووریەکەی کە لەسەر مەرجە خراپەکان بوون لەگەڵ هەندێ لە دڕندەکانی ناوخۆدا بەکارهێنراون لە کۆمەڵکوژیەکەدا، بڵاوەیانکرد و دیارنەمان و شارەزووریان بەوێرانەیی جێهێشت. شارۆچکە گچکەکەی گوڵعەنبەر، لەگەڵ گوندەکانی بەدرێژایی داوێنی چیاکە، چۆڵ و وێران بووە. کەمێکی سەرلەنوێ ئاوەدانکراوەتەوە و ئێستا سێبەری رابردووی خۆیانن.**

**لە ساڵی 1821، یان لەو دەورویەرەدا میرێکی فارس بەناوی محەمەد عەلی میرزا هەبوو، هێرشی بۆ کرد و داگیریکرد، بەڵام لە شەڕ و کوشتارێکی دواتردا لە نزیکی هەڵەبجەوە بەشێوەیەکی کوشەندە برینداربووە و بە رووبارەکەدا کشایەوە، گوڵعەنبەری لەژێر دەستی پاشای تورك لە بەغدا جێهێشت.**

**لەگەڵ ئەوەشدا، فارسەکان داوای شارەزوور دەکەن، چونکە جارێك لەژێر دەستەڵاتی ئەودا بووە و چەندجارێکی تریش داگیریانکردۆتەوە و ئەمڕۆش لەسەر پارچە خاکێك وەستاوە، ناوچەی مشتومڕە لەناو سنووردا، لیژنەیەکی نێودەوڵەتی ژێرانە تێبینیکرد، " بوونی سنوور پێویستە هەبێت."**

**کاتێ سلێمانی لەژێر دەستەڵاتی نەوەکانی سولەیمان پاشادا بوو، گوڵعەنبەر کرابوو بە بنکەی قایمقام و سێ "مودیرلق"ی پێویست لە دەشتەکەدا دانرا. بۆیە کاروبارەکان رۆشت تا عوسمان پاشا، کە سەرۆکی بەشی جافەکانی پشتەماڵە بوو، لە هەڵەبجەدا جێگیربووە و وەك دەردەکەوێت، بەرەوپێش چووە بۆ ئەوەی گرنگی بکات. گوڵعەنبەر هەرگیز گرنگی و ئاستی دێرینی خۆی بەدەست نەهێنایەوە و هەڵەبجە دەستیکرد بە داپۆشینی پارچەکانی دەرەوەی هاوسێکانی بەناو دەشتەکەدا، تا قایمقامەکە، کە ئێستا عوسمان پاشایە گواسترایەوە بۆ هەڵەبجە و گوڵعەنبەر کرا بە شوێنی مانەوەی "مودیر." واتە بەڕێوەبەری ناحیە.**

**لە کاتی سەردانەکەمدا، لەگەڵ عوسمان پاشا و هاوسەرەکەی، ماجید بەگ و تاهیر بەگی کوڕانی پاشا لە ژنەکەی پێشوی لە هەڵەبجەدا جێگیربوون. ئێستا ماجید بەگ سەرکەوتووە لە سەرکردایەتی پشتەماڵە، چونکە لە ئۆکتۆبەری ساڵی 1909دا پیاوە پیرەکە کۆچی دوایی کرد و لە بیارەدا نێژراوە، کە گوندێکی شاخاویە و دادەنرێت بە شوێنێکی زۆر پیرۆز لەم ناوچانەدا.**[67]

[67]- زانیاری دواتر هەروەها لەبارەی کۆچی دوایی ماجید بەگەوە دەدوێت.

# مێژووی جافەکان

نزیکەی سەد و بیست ساڵ زیاتر نییە لەو کاتەی بەشەکەی عوسمان پاشا لە تیرەکەدا کە لە هەڵەبجەدا سەقامگیربوون، لە بنەڕەتدا تیرەی جاف لە وڵاتێك دەژیان بەلای باشووری ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجەدا، لە خاکی ئێراندا، کە پێیدەوترا جوانڕود- جوانڕۆ. لەوێدا سەربەخۆبوون، تا والی ئەردەڵان سەرکەوتوبوو لە بەدیلگرتنی سەرۆکەکە و کوڕەکەی و براکەی و لە سێدارەدانیان. شەڕ بەرپابوو، جافەکان، کە خۆیان زۆر لەلای میرەکانی ئەردەڵاندا ناخۆشەویست کردبوو، یەکەم لە ڕێی سەربەخۆبوونیانەوە و دووەم لەڕێی لوتبەرزی و دوژمنایەتیانەوە، لە ئەنجامدا دەرکران. بەشی ڕەوەندەکەی، کە پێیاندەوترا مورادی، نزیکەی 50 هەزار کەسیان هەڵهاتن بۆ لای پاشا سلێمانی، کە تازە دەردەکەوت و زەویوزاری پێدان کە ئێستا تێیدان و لە قزڵ ڕەباتەوە لە باشووردا درێژدەبێتەوە بۆ پێنجوێن، لەسەر سنووری ئێرانی لە باکوردا. ژمارەیەکی دیاریکراو لە جافەکان لەسەر خاکی باووباپیرانیان مانەوە، بەڵام لەژێر فرمانی کوڕی میری ئەردەڵاندا دەچەوسانەوە، چوونە ناو تیرەی گۆرانەوە و بوون بە بەشێك لەوان، سەریان بۆ سوڵتانەکانیان کەچکرد.

هەندێکی تریان مانەوە، سوورنەبوون لەلایەن دابڕانی هاوڕێکانیان و هێشتا لە جوانڕۆی ئێراندا دەژین، ئەوەشیان بیرچۆتەوە کە ئەوان هەرگیز لە ڕابردودا جافە کوردەکان بوویێتن.

لە هەمان کاتدا بەشی مورادی گەشەیکرد و لە زیادبووندابوو، کە بەشی سەرەکی تیرەکە پشتەماڵە بوو. پشتەماڵە، بەشێکی بەگزادەییە، بەردەوام تا دوای سەردەمی محەمەد پاشاش، کە دوای مردنی سێ کوڕی شوێنیانگرتەوە: عوسمان و مەحمود و محەمەد عەلی. ئەوانە خاکەکەیان بەشکرد، لە کاتێکدا پەیوەندی بەهێز و هەمەئاهەنگیان پێکەوە هەبوو. مەحمود پاشا سەرۆکی گشتی تیرەکە بوو، کە لەگەڵیاندا لە بەهار و پایزدا لەنێوانی چیاکان و زەویە نزمەکاندا گەرمیان و کوێستانی دەکرد. عوسمان پاشاش گوڵعەنبەر و هەڵەبجە و خاکەکانی شارەزووری وەرگرتووە و بە زیادبوونی هێز و سامان توانی دەستەڵاتی هەرێمەکە بگرێتەدەست. محەمەد عەلی بەگی کوڕی سێیەم لە قزڵ ڕەباتدا مایەوە، کە خاوەنی زەویوزار و باخ و باخاتێکی زۆرە و ژیانێکی ئاسایی و دڵخۆش دەژی.[68]

لەژێر دەستەڵاتی ئەو سێ بەشانەی پشتەماڵەدا تیرە و خێڵی بچووکتر هەن کە بریتین لە: ئەماڵە، جافی سەرتەك، جافی تیلان، میکایلی، ئاغاسووری، چەنگانی، ڕۆخزایی، تەرخانی، باشاکی،

---

[68] - نوسەر خۆی بە قەرزداری محەمەد عەلی بەگی جاف دەزانێت بۆ ئەو بەشە زۆرەی مەسەلەی مێژوویی کە پەیوەندە بە تیرەی جافەوە، لە هەموو کاروبارێکی پەیوەندیداردا ئەم پیاوە بەڕێزە کوردە بە ڕۆشنبیریەکی باش و شارەزاییەکی فراوان و بەپەرۆشەوە.

کیلالی، شاتری، هارونی، ئەورۆلی، کۆکۆیی، زەردۆی، یەزدان بەخشی، شێخ سمایلی، سادەنی، باداخی، موسەوی و تیلەکۆ. ئەو تیرانەی هێشتا لە خاکی ئێراندان لەسەر خاکەکانی باووباپیران بریتین لە: قوبادی بابەجانی، وەلەدبەگی، ئەنیاخی، ئیمامی، دەروێشی، دلەتەژە، میراوبەگی، دایتەری و نامداربەگی. لەکاتێکدا ئەوانەی پەنایان برد بۆ تیرەی گۆران و ناوەکانیان بوو بەناوی گۆرانی کە بریتین لە: قادری میروەیسی، تایشەی، قەڵغان چاگی، یوسف یار ئەحمەد، کۆیك، نایرژی و گورگکایش. ئەوانە هەڵبەتە لەژێر دەستەڵاتی فارسدان و بەرگری لە هەوڵەکانی جافەکانی ناو تورکیا دەکەن لە هاندان و هاتنیان بۆ سەر سنوور و چوونە ناو تیرە مەزنەکەوە، لەبەرئەوەی ئەوان لە ناخەوە بەخۆیان دەڵێن گۆران و بوون بە هاووڵاتیەکی ئێران.

سوارەکانی ژێر دەستەڵاتی مەحمود پاشا، مەجید بەگ (جێنشینی عوسمان پاشا) و محەمەد عەلی بەگ 4000 پیاو بوون، کە هەمیشە چەکداربوون بە تفەنگی مارتینی و لە ماوەی چەند سەعاتییێکی کەمدا ئامادەی جەنگن لەپێناوی سەرکردەکانیاندا. ئەوە و باجێکی کەم دەدرا بە حوکومەتی تورکیا کە تەنیا پابەندبوونێکی پیاوەکانی تیرەکانە بۆ سەرکردەکانیان دەیانکرد و هەڵبەتە لە کاتێکدا بەناو لەژێر دەستەڵاتی مەحمود پاشادان، کە لە راستیدا لە کاروبارەکانیدا سەربەخۆیە، تاڵانی و هێرشکردن بەبێ سڵکردنەوە لە سزادان، لەبەرئەوە لەگەڵ دەستووری تیرەکەدا رێکدەکەوێت بە دانپێنان بە مەحمود پاشادا، هامرای باقی تیرەکەیە، باجی خۆیان دەدەن و جەنگاوەریش لەکاتی پێویستدا ئامادەدەکات.

ئەوە شتێکی سروشتی بوو کە کاتێ عوسمان پاشا خانەدانێکی کوردستانی ئێرانی هێناوە، تورکەکان بەوە زۆر رەنجاون، چونکە خێزانی یەکەمی لەلایەن حوکومەتی تورکیاوە پێشنیارکراوە، کەسێك لەوانەی بەشێوەیەکی تەواو رەزامەند بوون لەسەری و لە میانەی کاریگەرییانەوە ئاواتەخوازبوون عوسمان پاشا وا لێبکەن سۆزی بەلای تورکیادا لە جاران زیاتر بێت. کە دەبێت دوای کۆچی دوایی خێزانەکەی هاوسەرگیری لەگەڵ بەگزادەیەکی ئەردەڵانی سەرکێشدا بکات، کە هەمیشە ئەمەکداری ئێران بووە و دەبێت، زەبرێك بوو بۆ شکۆی تورك لە کوردستاندا، کە لەو کاتەوە ئەفەندیەکان دەیبوغزێنن و کاتێ عادیلە خانم زۆرێ لەو هێزەی بەدەستهێناوە کە ئەوان داویانە بە عوسمان پاشا، ئەوان بەتورەییەوە گاز لە نینۆکی پەککەوتوویی دەگرن و بیر لە ژمارەیەك نەخشەی بێهوودە دەکەنەوە بۆ کۆتاییهێنانی کاریگەری عادیلە خانم. ئەم لادانە دووردرێژەی سەرگوزەشتەکە پێویست بوو بۆ روونکردنەوەی سروشتی ئەو خەڵکانەی لە ناویاندام لە هەڵەبجە،

## هەڵەبجە

شوێنێکی دەگمەن لە کوردستانی تورکیادا، کە شوێنی نیشتەجێی ئەو کوردە بەدەستەڵاتانەی وەك عوسمان پاشا، عادیلە خانم، تاهیر بەگ و ماجید بەگ و کە بەدڵنیاییەوە دەبێ خاوەنی سێ کۆشکی گەورە بن کە تێیدا ژیاون.

بەیانیەکەی دوای گەیشتنم بە دەنگی لەیەك کەوتنی پیاڵە چاکان لەو دیوی دەرگای ژوورەکەمدا راپەڕیم و کردمەوە و رووبەڕووی دووان لە دەستوپێوەندەکان بوومەوە، کە ئامێری چایی "ئەلا پەرسەن" یان هەڵگرتبوو، سەماوەرێکی مسی زەردی گەورە، تەشتۆلکەیەك بۆ پیاڵە و ژێرپیاڵە شۆردن و پیاڵە ناوقەد بچووکەکانی چای ئێرانی و ژێرپیاڵە فەخفوریەکان و خۆشیان.

پێخەفەکە لولکراو گواسترایەوە و بەپێی نەریتی خۆیان سێ پیاڵە چای گەرم و شیرین هاتە خزمەت. لەماوەی نێوان دوو پیاڵەدا دەکرا جگەرەیەك بکێشیت و ماوەیەکی باش هەبوو تا یەکێکی دی پێشکەشدەکرایەوە. رێوڕەسمەکە کۆتاییهات، کەرەسەکان لابرا و رۆژەکەش بە فەرمی دەستپێکرد، ئیدی لە دەرەوە دانیشتم بۆ بینینی عادیلە خانم.

لەسەر شێوازی کوردستان ئەوە دیدارێکی تایبەتی بوو، بۆیە لە دوانزە خزمەتکار، سەرباز و پیاوە چەکدارەکان زیاترم نەبینی، کە لەبەر دەرگاکەدا وەستابوون. ژوورەکە درێژ و تەسك بوو، دوو دیواریان کونکراوە لەگەڵ هەشت دەرگای دووتاکی دەکرێتەوە بۆ سەر هەیوانەکە، دیوارەکانی تر سپیکاری کراوە و تاقی تێدایە، وەك ئەوەی لە هەموو خانووەکانی ئێراندا هەیە. ناو ژوورەکە بە فەرشی نایابی سنە فەرشڕێژکراوە و لە کۆتایی ئەو سەرەوە چەرپایەکی مسی زەردی گەورە و بەرز دانراوە لەگەڵ لێفەی پەڕ. لە پێش و لەبەرپێی ئەوەدا راخەرێکی ئاوریشم راخراوە و عادیلە خانم خۆی لەسەری دانیشتووە و جگەرە دەکێشێت. لە یەکەم نیگادا دەردەکەوێت کە لە بنەڕەتدا کوردێکی تەواوە. رووخساری باریکەلە و هێلکەیی، دەمی زۆر گەورە، چاوە رەشە بچووك و گەشەکان، لوتی باریك کەمێك وەك دەنوکی باز هەڵکەوتووە، نیشانەکانی لەسەر بوون و تەنکەڵەیی خۆی وەك سروشتی کورد بە جوانی پاراستووە، کە هەرگیز قەڵەو نابێت. بێبەختانە، خووی بۆدرەکردن و بۆیەکردنی هەیە، بۆیە لێواری پێڵوی چاوەکانی رەشتر دیار بوو لە بەراورێکی ناسروشتیدا بۆ ناوچەوانی سپی و کولمە ئاڵەکانی. سەرەڕای ئەو هەڵەیە هەموو هێڵەکانی سەر رووخساری شاراوە نەبوون، لە چاوەکانەوە کە پێیدەڕوانێت، بۆ دەمی رەق و چەناگە.

# خانمێکی مەزن

سەروبەستەکەی کوردانەی ئێرانی بوو، سەروکڵاو نەخشێنرابوو بە لیرەی ئاڵتونی یەك لەسەر یەك دانراوە و بە سەرپۆشێکی ئاوریشمی یەزد و کاشان گیراوە. لە هەر لایەکی ناوچەوانەوە زوڵفیکی ڕێکی نموونەیی لە لاجانەکانەوە بۆ ڕوومەتەکەی هەڵواسراوە، لە خوار گوێچکەوە و بە پەردەیەك لە قژ شاراوەتەوە، کە بە شێوەزاری باشووری کوردستان پێیدەوترێ "ئەگریجە". قژەکەی دواوە هۆنرابووەوە و لەژێر سەرپۆشی ئاوریشمدا شارابۆوە، کە درابوو بە سەردا. هەموو جلوبەرگەکانی ئاوریشم بوو، لە کەوایەکی درێژی هاودامانەوە بۆ ئاوەڵکراسە دەڵبەکە. قاچەکانی ڕووت بوون و خەنەی تێگیراوە و لەسەر قولەپێی و مەچەکی پاوانە و بازنی ئاڵتونی کاری ئێرانی تێکرابوون. دەستەکانیشی حەڤدە ئەنگوستیلەی تێدابوو. بە سەنگینی خشڵکراوە و لەسەر گەردنیشی ملوانکەیەکی مرواری گەورە، ناوبەناو ماسیە ئاڵتونەکان کە کوردی ئێران و زۆر لە فارسەکان خۆشیان دەست لە خشڵی وا هەڵناگرن.

ژنێك باوەشێنی دەکرد، لەکاتێکدا یەکێکی دی جگەرەی بۆ ئامادەکردووە و کارەکەرێکیش بە شەربەت و گوڵاوەوە وەستاوە. کاتێ چوومە ژوورەوە، عادیلە خانم زەردەخەنەیەکی کرد و هێمای بۆ کردم کە لە تەنیشت ئەوەوە لەسەر دۆشەکەکە دابنیشم و بەخێرهاتنێکی کۆنی کوردانەی کردم.

"وەخێر هاتن، وەبانی چاو، ئەحواڵەکیتان خاسە شەڵڵا." (بەخێربێن، بەسەرچاو، ئەحواڵەکەتان باشە ئینشائەڵڵا.) ئەوە بە زمانی جوتیارانی سنەی شوێنی بنەچەیی ئەو بوو، نەك دیالێکتە تێکەڵ و پێکەڵەکەی سلێمانی، منیش بەهەمان شێوە وەڵامدایەوە، سوپاسگوزار بوو بە بیستنی زمانەکە کە من ساڵێك لەوەبەر لە کوردستانی ئێران لە گەڵیدا ڕاهاتبووم.

ئاوازەکانی سەیر بوون، ئاوازی ژنانە نەبوو، قووڵ نەبوو، ڕوون و یەکلاکەرەوە و کوتوپڕ بوو. زۆر بەباشی لە زمانی فارسی دەگەیشت، لەگەڵ ئەوەی کەمێ شەرمیدەکرد قسەی پێبکات لەبەردەمی یەکێکدا کە ئەو تەنیا وەك فارس دەیناسێت. دوای ئەوەی لە وردەکاریی گەشتەکەم و دەنگوباسی شیراز و خەڵکی ئەوێی لێپرسیم، کە بە ناوبانگی باش بیستویەتی، داوای لێکردم نامەیەکی فارسی بۆ بخوێنمەوە کە تازە لە تارانەوە هاتووە و بەو شێوەیە بە زاری شیراز وەریگرتووە، کە ڕازی نەبوو تا من سێ جار نامەکەم خوێندەوە، ئاوڕی لە خزمەتکارانی دایەوە.[69]

---

[69]- ئەوەك ئەوە داوایەکی ناڕەوا بێت بۆ شارەزایی زمانی فارسی کە لە ئەورووپییەك چاوەڕێبکرێت، نووسەری ئەم کتێبە ئەوەی بەیانکردووە کە ئەو لەنێوان شیرازیەکاندا ژیاوە وەك یەکێ لە خۆیان، بەبێ ئەوەی بزانن کە ئەو شیرازی نییە.

# سەرکردەیەکی جاف

"براڤۆ! ئەوە ئاخاوتنی راستەقینەی فارسیە، لە هەموو زمانەکانی خوا شیرینترە." دوای ئەوە لێی قەدەغەکردم کە بە کوردی گفتوگۆبکەم و سووربوو لەسەر فارسی، داوایکرد لێکدانەوەی دوورودرێژ بۆ هەر زاراوەیەکی شیرازی نوێی بۆ بکەم.

دیدارەکە بۆ ماوەی سەعاتێك یان زیاتری خایاند، ئیدی هەستا و زۆر بە راستی دەیویست بزانێت کە من ئاسودەبووم، فرمانیدا کە فەرشی نوێ و پێخەفی باشترم بۆ بێنن و ئینجا رۆشت و بۆ یەکەم جار بە فارسی قسەیکرد وەك خواحافیزیکردنێك، داوای ئامادەبوونمی کرد لە گەڕانەوەم بۆ دیوەخانی فەرمی کە هەموو پاشنیوەڕۆیەك ئەو کۆڕ دەگرێت.

دەگەڕامەوە بۆ ژوورەکەی خۆم، کاتێ خزمەتکارێك پێیوتم کە من دەبێ بڕۆم بۆ لای تاهیر بەگی دووەم کوڕی عوسمان پاشا لە ژنی یەکەمی، کە لە کۆتاییەکەی تردا لە ماڵە گەورەکەدا دەژیا لەو شوێنەی ژوورەکەی منی لێ بوو. ئەم گەورەیە، کە هەندێ زەویوزاری لە هەڵەبجەدا هەیە، ناو و ناوبانگێکی بەدەستهێناوە بۆ توانای ئەدەبی و لەگەڵ زمانی کوردیشدا فارسی و تورکیش دەدوێت، لەوەبەریش بڕێکی زۆر شیعری باشی دەنووسی. هەروەها زانیاریەکی کەمی لە فەڕەنسیدا هەیە.

هەروەکو نەریتە لەناو ئەم جۆرە کەسانەدا، بەردەوام ماڵەکەی کراوەیە و پەیوەندیکەران لە هەموو کاتەکانی رۆژەکەدا دەگەن و چاویان پێی دەکەوێت.

لە ژوورێکی گەورەی سێ لاییدا بینیم، یان هەیوانێکی سەرگیراوی هاوینە، کە کراوەتەوە لەسەر سەقفی چوونەژوورەوەی سالۆنەکە و هەندێ ژووری پێوە لکاوە. لە لا کراوەکەوە دەڕوانێت بەسەر دیمەنێکی جوانی شارەزوور و چیاکانی ئەزمەڕی راخراو لەپێش یەکدا، روون و گوڵێکی رەنگاوڕەنگە لە رووناکی بەیانیدا. دەوری سالۆنەکە ریزە کورسی بەرز و پان دانراوە، کە دەتوانیت دابنیشیت و قاچەکانت شۆڕکەیتەوە کە ناگاتە سەر زەوی، یان بە چوارمەشقی دانیشیت کە لە رۆژهەڵاتدا باوە. فەرشەکان بەسەر زەوی و کورسیەکان و دەرەوە و لەسەربانیش راخراوە، ژمارەیەك لە کوردانی چەکدار لە ئامادەباشیدا وەستاون. تاهیر بەگ دانیشتوە و رادەمێنێت، لەسەر کورسیەکی درێژ دانیشتووە کە بە فەرشێکی باش داپۆشراوە، لەوە دەچوو بێئاگابێت لە سەیدێکی پیر، پیاوێکی ئاینی رووگرژ بە عەمامەیەکی گەورەوە و بە تەواوی هاوپۆشی بیمباشی تورکیەوە. پیاوێکی تورە بوو. برۆ چروپرەکانی سێبەری لەسەر چاوە شینەکانی لە دوکەڵی بەنگکێش کردووە، بەڵام سوکەڵەیە بە دەربڕینی راڕا لەلایەن لوتی چەماوەیی و چەناگەی بەهێزەوە. دەمی بە سمێڵێکی زلی

زەردهەڵگەڕاو شاردرابۆوە. جلوبەرگی ئاسایی کوردی لەبەردابوو- کەوایەکی حەریری خەتخەتی درێژی شۆڕ- و لەبەر پشتێنەکەیدا دەمانچەیەکی کۆڵت و خەنجەرێکی گەورەی پێوە بوو. سەرومێزەرەکەی وەك ئەوانەی سەرۆکانی جاف مشکیەکی ئاوریشمی ریشودار کە لە سەرەوە پانتربوو وەك لە بنکەکەیەوە، کە سیمایەکی توند و تیژی دەدایە.

لە گەیشتنی من ئاگادارکراوە و وەڵامی سڵاوەکەمی بە فارسیەکی تەواو دایەوە، بێ ئەوەی کاریگەری شێوەی کوردی پێوەبێت، بانگیکردم بۆ دانیشتن لە تەنیشت خۆیەوە. هەندێ پرسیاری لێکردم، لە کوێوە هاتووم و بۆ کوێ دەچم و ئایا بە فەرەنسی قسەدەکەیت، وەڵامی هەموو وەڵامە ئەرێینەکانی منی دایەوە لەگەڵ..

" Et moi aussi, je sais un peu," واتە "منیش کەمێك دەزانم" ئەوە سەرسوڕهێنەرە لە سەرۆکێکی کوردەوە کە لە ژیانیدا بەرزاییەکانی وڵاتی خۆی جێنەیەشتووە. وەك ئەوەی کە ئەگەر ئەو رەنجە زیاد لە پێویست بێت بۆ ئەو، بێدەنگبووەوە و ئیدی لە دەرەوە دانیشتین، بێدەنگیەکە قاوەگێر دەیکردەوە و دەیوت قاوەی "تورکی"، کە خزمەتکارەکان دەیانهێنا. چاکەیەکی تریشی لەگەڵ کردم بەوەی کە لە سندوقە تایبەتیەکەی خۆی جگەرەیەکی پێشکەشکردم و خۆشی بۆی داگیرساندم.

لەهەمان کاتدا، بەرپرسێکی تورك گەیشت کە لە خانەقینەوە هاتبوو بچێت بۆ سلێمانی، هاتەژوورەوە و کەسێکی زۆربلێ بوو، سووربوو لەسەر دەمەتەقێکردن، کە بەچەند وشەیەکی کورتی تورکی لەلایەن تاهیر بەگەوە سنووردار کرا. دیدارەکەی کورتکردەوە بەوەی هەستا و چووە ژوورە تایبەتیەکەی خۆیەوە و ئێمەش بڵاوەمان لێکرد.

دیدەنیەکی دیم ماوە بیکەم. کاتێ سلێمانیم جێهێشت دوو کومپیالەم کڕی بە دووسەد و پەنجا و بە سەد و پەنجا قران (نزیکەی هەشت پاوەند)، لەسەر جولەکەیەکی هەڵەبجەیی و کە لەلایەن مەتی هاورێ مەسیحیە موسڵاویەکەمەوە راسپێریکراوم، تا بچم بۆ لای مەنسوور ناوێك، کە کلدانیەکی خەڵکی سنەی کوردستانی ئێرانە. ئەو کەسە بازرگانیکی بچووك بوو، خۆی لە سنە بە گەورەتر دانابوو، بە حاجی خانەکە ناسراوە. وەك ئەوەی کە ئەو خەڵکی شوێنە بنەچەییەکەی عادیلە خانم بوو، سەرەتا کە خۆی بنیات دەنا، لە ژووری خوارەوەی ماڵەکەی ئەودا بووە و بۆ چەند ساڵێك وەك میوانی ئەو ژیاوە، کرێی نەداوە، ناوماڵی نەبووە و خواردنیشی نەکڕیووە، لە چێشتخانەکەی ئەوەوە ژەمە نایابەکانی بۆ هاتووە.

# بازاڕی هەڵەبجە

لە بەرامبەر ئەو میوانداریەدا هەندێ ئەرکی بچووک جێبەجێدەکات وەك هەواڵنێر بۆ بازرگانەکان و مەسیحیەکان لە سنە لەگەڵ ئەوانەی عادیلە خانم مامەڵەی لەگەڵ دەکردن و کڕینی ئەو شتە تایبەتیانە یان جلوبەرگەی کە داوایدەکرد. لە کوردی سنە جیاینەدەکردەوە، لەبەرئەوەی کراسێکی دەڵبی بێ قۆڵی لەبەردەکرد، کەوایەکی چنراوی ئێرانی و مێزەرێك بە دەوری کڵاوێکدا، کە ئەوە شێوە پۆشاکی ئەردەڵانە.

ئەو هەروەها تەواو بەباشی کوردی دەدووا و فارسیشی زۆر باش دەزانی. ئەو لەم کاتەدا نامەیەکی لە مەتیبیەوە پێگەیشت لەبارەی خۆمەوە و بەخێرهاتنیکردم بۆ هەڵەبجە، بەتەواوی لە خزمەتمدا بوو. لە ژوورێکی تاریکدا دەژیا، کە بە جووتێ فەرش و چەند لبادێکی تێدا راخراوە. لە هەردوولا دوورەکەوە دوو تەختەی نووستن بوو، کە لە شەودا بۆ مەبەستی تایبەتی خۆی بەکاردێت و لە رۆژیشدا وەك قەنەفە بەکاردەهێنرێت. بریتیە لە دۆشەکی سەر زەویەکە و پێچراوەیەکی پێکهاتوو لە سەرین و لێفەش. لەنێوانی ئەو دوو تەختەی نووستەنەدا، بەتەواوی لەسەری ژوورەکەدا، سندوقێکی ئاسنی گەورەی رووسی بوو، نیشانەی بازرگانەکەیە و لەسەرو ئەویشەوە لەسەر رەفەیەکی گڵین کۆمەڵە کتێبێکی بە زمانی کلدانی لەسەر بوو. کە چوومە ژوورەوە، مەنسوور لەبەردەم سندوقە ئاسنەکەدا دانیشتبوو نێرگەلەی ئێرانی دەکێشا و هەستایە سەرپێ و هاتەپێشەوە و بە شادمانیەوە سەرێکی دانەواند بۆ سەر جێگاکەی کە بەرزترین ئاستی داگیرکردبوو، ئەوە گۆشەی چەپی دووری ژوورەکەیە، کە لەلاکەی ترەوە خەڵك دەهاتنە ژوورەوە.

غەمی دەخوارد بۆ ئەو کاتە ناخۆشانەی کە لە قەلەمرەوی تورکیدا بووە، چونکە زۆر ئازاری چەشتووە کە تا رادەیەکی زۆر زیان لەگیرفانی کەوتووە لە دزینی کەلوپەلەکانی لە تێپەربوونیدا لە سلێمانی و کەرکوکدا.

هەروەها برێك پارەی دیاریکراوی دابوو بە عوسمان پاشا و نەفرەتی لە تورکەکان دەکرد، کە پاشایان لە سلێمانیدا هێشتۆتەوە، رێگرییان کردووە لە کۆکردنەوەی داهاتە تایبەتیەکەی بۆ ئەوەی قەرزەکەی بداتەوە. لە هەڵەبجەش خۆی کارێکی کەمی هەیە، تەنیا لە بەهار و زستاندا، کاتێ کوردەکان لە چیاکانەوە پێستە بەنرخەکان دێنن کە دەیکڕن و دەنێرێت بۆ سنە، کە هەموو هاوینێك لەلایەن هاوئاینەکانیەوە دەبرێت بۆ "نیجنی نۆڤگۆرۆد" بۆ پێشانگا. هیوایەتی بوو هەموو ساڵێك بچێتەوە بۆ سنە و هاوینەکە لەوێ بمێنێتەوە، بەڵام ئەم ساڵ، لەبەر ئەو برە قەرزەی لای عادیلە خانم

و پاشایە، لەلایەن خاوەن کارەوە فرمانکراوە بێنێتەوە تا هەندێ گەنم دەدوورێتەوە، یان هەندێ توتن دەفرۆشرێت، کاتێ ئەو دەتوانێ فشارێك لە پێناوی دانەوەی قەرزەکەدا بکات. دوای چاخواردنەوەیەك پێکەوە، پێشنیاریکرد کە گەڕانێك بە بازاڕدا بکەین و بزانین کوپیالەکانم بای چەندە. بۆیە چووینە دەرەوە، لە گۆڕەپانێکەوە بە دەرگایەکی نزمی پەڕیوتدا کە دەچووە سەر کۆڵانێکی بنبەست و لەوێشەوە بۆ شەقامێکی تەسك و پیسوپۆخڵ. ئەوەش گۆڕەپانێکە کە لەلایەکیەوە ریزێك کوشکە، کراوە بە دوکانی کەباب برژاندن و مەڕ سەربڕین و میوە کڕین لە جوتیاران کە تازە لە باخەکانەوە هێناویانە. ئەوە بازاڕی خواردەمەنی بوو لە هەڵەبجەدا، مەنسوور پێیوتم کە بەر لە حەوت ساڵ لەوەبەر، ئێرە تەنیا شوێنی زبڵ و خۆڵ و خاشاك بووە، کە ئێستا تا رادەیەك ناوەندی شارۆچکە کچکەکەیە.

لە دەروازەیەکی گەورەوە دەچوویتە بازاڕەکەوە و دیوارەکەی سێیەم لایەکی چوارگۆشە گچکەکەی شێوەکردووە، دیوارێکی باشی توندوتۆڵ لە باشترین خشت دروستکراوە. دەروازەکە رادەبووری بە لایەکی ڕاڕەوێکی قوبەیی درێژدا، هەر لایەکی بە دوکان گیراوە و کە بە ماوەیەکی کورت لە دەروازەی سەرەکیەوە بە گۆشەی راستدا دەگەڕێتەوە.

نەخشەی بازاڕەکە، لەلایەن عادیلە خانمەوە کێشراوە، لەوە زیاترە کە ئێمە لە بازاڕ تێدەگەین. شێوەکەی بەتەواوی چوارگۆشەیە، لەگەڵ دەروازەیەك لە ناوەڕاستی هەر لایەکیدا. رێگا لە دوکانەکانەوە بەناو دیوارەکاندا دەڕوات و ڕێڕەوێکی تر دوو دەروازە بەیەك دەبەستێتەوە، دوو تەریبی هاورێك دەکات بە دوو نیوەی یەکسانەوە. دوکانەکان لەسەر سەکۆی خشت دروستکراون، یان باشتر بڵێین دوو پێ بەرزتر لە زەوییەوە و سەکۆیەکی خشتی بەو بەرزاییە لەبەردەمدا هەیە، کە بە چوارمشقی لەسەری دادەنیشن یان شتومەکی لەسەر دادەنێن. دوکانەکە خۆی سەرەڕای ئەوەی دۆڵابێکی گەورەیە، پێشەکەی کە دەکەوێتە سەر دەرەوە، لە تەختە دار دروستکراوە، یان دەڕابەکان. لەناویدا رەفەیە کە شتومەکی لەسەر دادەنرێت و ئەگەر خاوەندارەکە جولەکە بێت، سندوقێکی ئاسنی بەهێز لەبەردەم شتەکاندا هەیە. لە بازاڕی هەڵەبجەدا پەنجاودوو دوکانی لەوانە تێدایە و لەوانەیە بیستیان بازرگانی کوتاڵ و جلوبەرگی کەتان بێت، زووربەشیان جولەکەن، کە بەشێکی سەرەکی بازرگانەکانن. بازاڕەکە، هەموو هەواڵی شارەکە و ناوچەکەشی بۆ دێت و لەلایەن زانخوازانەوە کۆدەکرێتەوە، هەر ئێستا هەواڵی گەیشتنی منیان بیستووە، کاتێ لەگەڵ مەنسوور چوومە ژوورەوە خۆم بینی کە لەلایەن کورد و جولەکەوە وەك یەك پێشوازیکرام.

# دیوەخانی عادیلە خانم

ئەو گەرموگوڕییە بەهەرحاڵ پەیوەندی بە کاری بازرگانییەوە نییە، بۆ بێزاریم جولەکەکەی کومپیالە گچکەکانم بۆ کڕیوە رازینەبوو وەریگرێت، ئەوەشم بۆ دەرکەوت کە فرۆشارەکەی سلێمانی بەڵێنی دابوو بە نرخی کومپیالەکان کەلوپەلی بۆ بنێرێت، بەڵام پارەکەی کەم بووە، گەڵاڵەکراوەکانی راکێشایەوە و شتەکانی لە سلێمانی لەسەر حسابی خۆی فرۆشت. مەتی، کە لە سلێمانی لێیکڕیوون بۆ من، خۆشبەختانە دەستەبەرکراون، لەبەرئەوە زۆر کەم بەشێوەیەکی کاتی ناڕەحەت بووم، چونکە وەك مەنسوور وتی " ئەوەی لای عادیلە خانم بێنێتەوە پێویستی بە پارەش نییە."

وا دەردەکەوت من یەکەم فارسێك بووم ئەوان هەرگیز لە هەڵەبجەدا بینیبێتیان و زانخوازێکی زۆر لەبارەی شوێنی بنەچەیەوە دەرکەوت. لەسەر فەرشێك لەبەردەم دوکانی جولەکەیەکی بازرگاندا دانیشتبووین، کۆمەڵێکی کەمی ئارەزوومەندانی کورد و جولەکە کۆبوونەوە، هەوڵیاندا لەگەڵ هەندێ سەرکەوتندا بە فارسی قسەم لەگەڵ بکەن و هەر یەکەیان شتایشی جوانی هەڵەبجەیان دەکرد، بەتەواوی باوەڕیان بەوە نەبوو کە شیرازەکەی منی لێوە هاتووم گەورەتر و خۆشتر بێت، یان ئەوان کە کوردن شارەزای ئەوێ نین.

سەرنجڕاکێشترین شتێك بۆشاییەکە بوو کە عادیلە خانم لە کاروبار و ئاخاوتنەکانیدا بەدەستیهێناوە. لە بیناکردنی ئەو بازاڕەدا کە بازرگانی راکێشاوە و سەرچاوەی قازانجە بۆ بازرگانەکان، لە هەمان کاتدا باشترین کارێکی بۆ گیرفانی خۆی ئەنجامداوە، کە تەنیا ئەو لەوانەیە توانیبێتی ئەوە دابهێنێت، لەبەرئەوەی بە قورسی قەرزدارێکی زۆری نیشتەنیەکانە و مەودایەکی فراوانیشی بە ئاسایی داناوە بۆ کاتی دانەوەی قەرزەکان. رایانگەیاند کە هەمیشە لە کۆتاییدا دەیداتەوە و لەبەر ئەو هۆیە و هەروەها هۆیەکی نایاب کە کرێچییەکان ملکەچ دەکات بۆ خاوەنداری بەتوانا، کەسیش هەوڵی نەدەدا ئاستێ بۆ کرێنەکانی دابنێت، کە بەڕاستی لە کوتاڵ و شتومەکی تری زۆر زۆر بوو. نرخی شتومەکی ئەو جولەکانە کە لەسەریان دادەنا هەروەها زۆر گرانبوو، پاساوی ئەوەشیان بەوە دەدایەوە کە بەهۆی دواکەوتنی قەرزەکەوە قازانج لە دەستدەدەن، تا رادەیەکی زۆر وەك بەرگدروویەك دەبێت بیکات.

هەموو بەیانیەکەمان لە بازاڕ بەسەربرد و گەڕاینەوە بۆ خواردنی نانی نیوەڕۆ، کە لە نیوەڕۆدا دەردەکەوێت. لەدوای نیوەڕۆ، نزیکەی کاتی ئەوەیە چا دەهێنن- بۆ ئێرانیەکان کاتی چا خواردنەوەی دوانیوەڕۆ زۆر لەپێش ئەورووپیەوەیە- چووین بۆ دیوەخانەکەی عادیلە خانم. ئەم

جارەیان ژوورێکی درێژی پڕ لە خەڵك بوو. لە نزیك دۆشەکەکەی عادیلە خانمەوە دووانی تر دانراوە، یەکێك بۆ مەجید بەگی کوڕە گەورەی پاشا، پیاوێکی چل و پێنج ساڵی، یان لەو دەوروبەرەدا و تاهیر بەگ، کە هەردووکیان بە ئاسایی لەپاش نیوەڕۆکەدا بانگهێشت دەکرێن. یەکەمیان ئێستا لەوێیە، کوردێکی توندوتیژ، بەتەواوی پێچەوانەی برا گچکە تەرپۆشەکەی بوو. پیاوێکی زۆر گەورەترە، روخساریشی زیاتر لە روخساری ئینگلیزیەکی رووخۆش دەچوو، وەك لەو کوردانەی من هەمیشە لەوەبەر بینیومن، لەگەڵ ئەوەی کە ژمارەکی زۆر لەوانە سیما و شێوەی رەگەزی ساکسۆنیەکانیان تێدایە.

چاوانی شین، پێستی رۆشن، لوتی رێك و کورت، سمێڵی زبر و تیژ و چەناگەی چوارگۆشە، ئەوە سیمای روخسارێتی بۆ کەسێك راستەوخۆ تێبینی بکات، دانیشتووە و دەستی لەسەر رانیەتی، تێبینی کەس ناکات، جارجارە سەرێك دەلەقێنێ بۆ هەندێ شت کە عادیلە خانم دەیڵێت، زۆربەی سەرۆکانی جاف لەم شێوە بێدەنگیەیان تێدایە و چەند سەعاتێك دادەنیشن بێ ئەوەی بڕگەیەك بە دەمیانا بێت. بە دەوری ژوورەکەدا، چوارمشقی لای دیوارەکەوە، هەموو جۆر و چەشنە کوردێك دانیشتووە. خەڵکی هەڵەبجە و ناوچەکەشی لـێ بوو، دوو هەمەوەندی رێ هەڵەبوو، کە بەچاکی دەزانرێ ئیشوکاریان چیە، بێدەنگ و چەتوون لەوێ دانیشتوون، رەشتاڵەیەکی دانسقە، پیاوانی دڕندەئامێز، کە دەستیان لەسەر تفەنگەکانیانە و چاویان بە وریایی و لە هێزێکی بێ کۆتای نەریتەوە بە هەموو لایەکدا دەگێڕا. پیاوێکی ئایینی برۆ رەشی پاوەیی، کە گوندێکە لە کوردستانی ئێران، سێ جوتیاری خەڵکی سنە و بازرگانێکی هەمەجۆر، کۆمەڵێکی هەمە چەشنەی کوردانی باشووریان پێکدەهێنا، هەر یەکەیان، تەنانەت خاوەن دوکانەکان و پیاوە ئایینیەکەش خەنجەرێکی گەورەی کوردانەیان هەڵگرتووە. خزمەتکارەکان بە چواردەوری دەرگاکەدا و لای خانمەکەیان و گەورەکانیانەوە وەستاون و کۆمەڵێك تفەنگ لە گۆشەیەکدایە کە وادیارە تایبەتە بە ژمارەیەکی ئەو کۆمەڵەوە.

لە دەرەوەی ژوورەکە لە هەیوانەکەدا هەموو زیادەکان لوت درێژدەکەن بۆ دەرگا شوشەبەندەکان و جارجارە هاوارکردنی تێبینیەکان زۆرجار بەسە لە وەڵامدانەوە بۆ سەرنجەکانی عادیلە خانم. کارەکەرە تەرپۆشەکان لە بەرگی ئاڵوواڵا و سەروپێچی لاردا، لە دەوری راوەستاون، یان جگەرە دەگێڕن، یان باوەشێنی عادیلە خانم دەکەن- بۆ ژوورەکەش لە رۆژانی گەرمدا- یان مەقەست و شریت بۆ قوماشی ئاوریشم دەهێنن کە ئەو تاوتوێیدەکات. جولەکەیەکی بازاڕ شتومەکەکانی

## تاوانبارێك

پێشان دەدات، داخوازیەكی زۆر لە هەموو جۆرە شتێك هەڵدەگرن، لەبەردەمیدا دایدەنێن، تێبینیەكان لەسەر پارچە كاغەزێكی پۆخڵ بە زمانی عیبری دەنووسێت. كارەكەرەكان ئامۆژگاریكران، هەڵسەنگێنن و جلوبەرگ و شتی پێویست بۆ خۆیان هەڵبژێرن، كە عادیلە خانم، یان بەخێرایی رەتیدەكاتەوە، یان جارجارە خەڵاتیان دەكات، چونكە زۆر بە جوانی مامەڵەیان دەكات. ئامادەبووان لەبارەی ئەوەی روودەدات سەرنج دەردەبڕن، زۆر جاریش لەبارەی ئەو شتانەی كڕیویەتی گاڵتە لەگەڵ عادیلە خانم دەكەن، كاتێ ئەویش خێرا بە كوردی بە باشترین گاڵتەوگەپ بەرپەرچیان دەداتەوە، هەر هەموو دەستدەكەن بە پێكەنین كە زۆر دەگمەن دژی ئەو بوو. خاوەن دوكانێك بە لیستێكی زۆر دواكەوتووەوە گەیشت، كە خانم لە پشتەكەی واژۆیكردووە، بەوەی كە ئەو دەبێت بە خاوەنی بڕێك گەنم كاتێ دانەوێڵە دێتە بەرهەم، لەبەرئەوەی پارەی نەختینەی نییە، یان هیچ شكنابات. كاتێ ئەو هێشتا ئاوریشمی دەپێوا، دوو سوارە كە هێشتا بوتی سواریە سوورەكانیان لە پێدابوو، تفەنگ لەسەر شان، بە خواری هاتنە ژوورەوە، پیاوێكی عەرەبی عەشایەریان لەنێوانی خۆیاندا هێناوە، كە دیشداشەیەكی هاودامانی لەبەردایە، ئەو بەرگەش نازناوێكی بۆ عەرەب سازاندووە و لەلایەن كورد و توركەوە پێیان دەڵێن عەرەبی "بێ دەرپێ" . سەری رووت بوو، چونكە "دەستماڵ" و "عەگال"ەكەی ونكردوە و چووبۆوە یەك و دەلەرزی لەبەرئەوەی بە پاڵ كردیان بەناو كۆمەڵەكەدا. كەس هەرگیز خەڵكانی ئەوا دڕەندەی لە ژیانی خۆیدا نەبینیوە. تەنانەت عادیلە خانمیش لە جلوبەرگە رەنگاوڕەنگەكەیدا، چاوەكانی لەژێر سەروبەستێكی گوڵۆنكەداری لاردا دەبریسكایەوە، كە شێوەی كوردە بەربەریەكانی نێو داستانەكانی تێدا دەردەكەوێت و دیمەنی ئەو هەموو پیاوە زەبەلاحە چەكدارانە ترسی خستە گیانی عەرەبە نەگبەتەكەوە، كە زیاتر لەگەڵ خەڵكانی خۆی ئاساییدا هەڵسوكەوتی كردووە. هەرچۆن ناثارامی ئەو بووە هۆی پێكەنین، كە پێشوازی لەدەركەوتنی كرد. ئیدی پاسەوانەكانیش هەروەها مەسەلەكەیان بە گاڵتە وەرگرت.

عادیلە خانم پرسیاری هۆی هاتنی ئەوانی كرد و پاسەوانەكە وەك چیرۆكێكی پێكەنیناوی، لە كاتێكدا گیراوە كە ویستویەتی لە یەكێ لە گوندەكانی شارەزووردا دزیی بكات. لەوە دەچوو كە بەهەندێ هۆ لەگەڵ وشترەكان چوویێت بۆ سلێمانی و لە هاوڕێكانی جیابۆتەوە، هەوڵیداوە رێگایەك بدۆزێتەوە بۆ گەڕانەوەی بە رێگای خانەقیندا بۆ زەویە نزمەكان. داوای یارمەتی كردووە و لە ماڵی

جوتیارێکی کورد شوێنی مانەوە و خواردنی پێدراوە، بۆ نووستنیش کراوەتە ژێر سایەبانێکەوە کە وڵاخی خاوەن ماڵەکەش لەوێدا بەستراوەتەوە. زنجیرێکی لەوێدا دزیوە و شوێنی نەبووە تێیدا بیشارێتەوە، لەژێر کراسەکەیەوە بەستویەتی بە ناوقەدی خۆیەوە و بەرەبەیان بۆی دەرچووە. جوتیارەکە چاودێری دەرچوونەکەی کردووە، لەسەر بنەما دوایکەوتووە، کاتێ پێی هەڵگرتووە و پەلەیکردووە، زنجیرەکەش لەبەر وەزنە قورسەکەی لە ناوقەدی شلدەبێتەوە و دەکەوتە سەر قولەپێکانی، عەرەبە کولۆڵەکە دووچاری کێشە بووە. کوردەکە دەیگرێت و هیچی نەبینی جگە لە زنجیرەکە، لاقەکانی پێبەستەوە و لەبەر خۆرەکە داینا تا بەهێواشی بکولێت، تا دوو سوارەی عادیلە خانم پەیدا بوون و رادەستیانکرد و گرتیان و هێنرا بۆ هەڵەبجە بەپێی رەوتی ئەسپەکان.

زنجیرەکەیان، وەك بەلگەیەك کردبۆ ملی و کاتێ کەوتە سەر زەوی و دەپاڕایەوە و هەوڵیدەدا خۆی بەکێشبکات، تا قاچەکانی عادیلە خانم ماچ بکات، ئامادەبووان نەیانتوانی خۆیان لەبەر جدێتیەکەیدا بگرن، تەنانەت مەجید بەگی بێدەنگیش هاوبەشیی پێکەنینە گشتیەکەی کرد.

دەبووایە هەر ئێستا تاوانبار لێپێچینەوەی لێبکرایە، بەڵام کەس لەوە نەدەچوو زمانی عەرەبی بزانێت، جگە لە وشەیەك، ئەویش وشەی "وسکوت"ە واتە "بێدەنگبە"، کە بەکار دەهێنرا و بەبێ ئەوەی پێویست بکات، هاوار و گریانی کابراش ژوورەکەی پڕکردبوو.

تەنیا سەرنجێك عادیلە خانم هەستی پێدەکرد دژی خەڵکەکەی خۆشی بوو، کە بەشێکی تەواو باشی وەرگیرا: " چارەنووسی ئەوەی لە کورد دزی بکات چییە؟ ئەی کورد گوایە خراپترین دزەکانی سەرزەمین نین؟ بیبەن و بەریدەن."

چونکە بە راکێشان لە ژوورەکەوە بردیانە دەرەوە، سوورهەڵگەرا، لەبەرئەوەی دەبێت هەستبکات دەبرێت بۆ لەداردان لەجیاتی بەرەڵاکردن. هەر کە ئەو چووە دەرەوە، هاتنی تاهیر بەگ راگەیەنرا و هەموو کەسێك لە کاتی هاتنە ژوورەوەیدا هەستانە سەرپێ، بە هێمنی ریزێك خەڵکی بەدوادا هات، کە شوێنی خۆیان لەناو ئامادەبوواندا دۆزیەوە. تاهیر بەگیش رێگەیەکی لەنێوانیاندا هەڵبژارد و لەسەر دۆشەکێکی ئەو نزیکانە دانیشت، بانگیکردم کە لە تەنیشتیەوە دابنیشم، ئیدی ئەو دەستیکرد بە گفتوگۆ لەبارەی بەهاکانی فەڕەنسی و فارسیەوە.

دوای گەیشتنی ئەو، دیوەخان زۆر بەردەوام نەبوو، یەکەم مەجید بەگ چووە دەرەوە، ئینجا عادیلە خانم هەستایە سەرپێ و چووە ژوورەکەی ناوەوە و ئەوانەی دەوروبەریش چوونە دەرەوە. تاهیر بەگ داوای لە من کرد کە بچم بۆ دیوەخانی ئێواران لەسەر سەربانەکە، کە هەموو شەوێك لەوێدا

## پەیوەندیەکی خۆشەویستی کوردێک

دادەنیشن. گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم، کارمەندێك یان کاتبێکی تاهیر بەگم بینی، کە جگەرەیەك لە جگەرەکانی منی دەکێشا و لە پەنجەرەکەوە دوکەڵەکەی بە بادەکرد. وەکو زووربەی دانیشتوانەکانی ئەم خێزانە سەیرە ئەو بەندەیەکی ئێرانی خەڵکی سنە بوو، بەڵام کەوایەکی درێژی جافیانە و چاکەتێکی سەربازانەی لەبەردایە. بەهەرحاڵ ئەو سەرومیزەری سنەیی رەتکردۆتەوە و هێشتا کلاوێکی لەسەردایە کە بە مشکی و دەسترۆکەی ئاوریشم دەورەدراوە. هەندێ بابەتی هەبوو بۆ دەمەتەقێ و قسە لەسەرکردن. یەکەم راسپێریکرد پیاوێك کە داوایکردووە ببێت بە خزمەتکاری تایبەتی من- رێکمخستووە بەیانی بیبینی، دواتر پرسیاریکرد لەبارەی نرخێکی گونجاو بۆ دەمانچەیەکی برۆونینگ، کە بە حەوت لیرە کڕیویەتی و دواجار، ویستی بزانێت من هیچ کتێبێکم بە زمانی فارسی هەیە. کۆپییەکی کۆنی دڕاوی سەعدیم هەبوو، ئەوەم دایە و دانیشت لەوێ بێ ئەوەی گوێ بداتێ دەستیکرد بە خوێندنەوەی ئەو بەیتانەی کە بە ئاستەم تێیدەگەیشت، بەڵام بڕگە دەنگدارەکان و ڤاوڵە قورسەکان دەچووە گوێی کوردەکەوە. هەروەها ئەوەش دەبێت دیاریکرێت کە لەناو زووربەی کوردەکانی باشووردا ئەوەی کەمێك رۆشنبیربێت هەمیشە کاریگەربووە بە سۆزی ئەدەبی فارسی، ئەوەش ئەو هۆیەیە کە زۆر لە شاعیرانی کورد تا رادەیەك تەنیا بەو زمانە دەنووسن و زمانی تایبەتی خۆیان لەبیر دەکەن، کە بوار دەدات بۆ شیعری فۆلکلۆری زۆر نایاب.

ئەو پیاوە گەنجە، ناوی حەسەن بوو، دواتر بیستم کە لە تاو ناموس خوێن کەوتۆتە بەینەوە و لەوە دەچێت کەسێکی لە سنە کوشتبێت و هەڵهاتووە بۆ هەڵەبجە تا کێشەکەی چارەسەردەبێت. لێرەش زیاتر سەروکاری بە شیعر نووسینەوە خەریکە. دوای ئەوە کەوتە خۆشەویستیەوە لەگەڵ کارەکەرێکی ژێر سایەی خۆی، کە ناوی پیرۆزەیە و خەڵکی موکریانی سابڵاخە- ئەویش هەروەها کوردی ئێرانە. دواتر هەندێکم لەبارەی دڵداریەکەیانەوە بیست، کە بینیم هەرچۆنێ بێت کچێکی جەربەزەی چەقاوەسوی چاوباشقاڵە. ئەوە یەکێکە لە دیاردە هەرە دیارەکانی ژیانی کورد. لەنێوان وڵاتەکانی تری ئیسلامیدا، کە ژنانیان بەتەواوی شاراوەتەوە، هاوسەرگیری دەتوانێت تەنیا مەسەلەیەك بێت کە لەلایەن لایەنی سێیەمەوە رێکبخرێت، بەڵام لەنێوان کوردەکاندا، ژنان بە کردەوە وەك هەر وڵاتێکی ئەوروپی ئازادن، جگە لەوەی کە ناچن بۆ بازاڕ- بە ئازادی لەنێوانی دوو رەگەزدا وەك دەستورێك پێکەوە کۆببنەوە و لە ئەنجامدا ژمارەیەکی زۆری هاوسەرگیری خۆشەویستی، کە هەمووی لەپێناوی رەگەزی چاك زۆر ئاساییە لە نەریت و ژیاندا. حەسەن

هەولێدەدا پیشەی پزیشکی من بسەلمێنێت، لەبەرئەوەی یەکێکیان هێمای ئەوەی کردووە، کە ئەو پیاوە فارسە و ئەوروپای بینیووە و ریشەیەکی گەورەیان هەیە، بە دڵنیاییەوە لە وڵاتانی زۆر سەرچاوەی هەڵگرتووە، دەبێت پزیشك بێت. لەگەڵ بەهرەیەکی گەورەدا رابەری گفتوگۆیەکی دەکرد لەبارەی داودەرمان و نەخۆشیەکانەوە و منیشی گلان لە لێدوانێکی دوورو درێژ لەبارەیانەوە، ئارای منیشی زانی کە راستە، ئیدی لێمگەڕا بۆ پشتڕاستکردنەوەی ئەو قسە و قسەلۆکە.

دوای نانخواردن، رێگەی خۆم لە تاریکیدا بینیەوە بۆ دوورترین دالآنی تاهیر بەگ و سێ کورسی درێژم بینی وا رێکخرابوو کە سێ لای چوارگۆشەیەکیان لەسەر سەربانەکە دروستکردووە. لەسەر ناوەڕاستەکەیان تاهیر بەگ دانیشتووە، وەك سروشتی خۆی بێدەنگ و لەسەر ئەوانی دیکەش بەبێدەنگی کۆمەڵێك بازرگان، دوو پیاوی ئایینی و دوو تورك لەبەرگی سەربازیدا. لەلایەن خاوەن ماڵەوە جێگەیەکم پێدرا و خۆم لە پاڵتۆیەکی توکی وشتردا پێچابۆوە، قاچەکانم جووتکرد لەژێر خۆما و بێدەنگی خۆم نایە سەر بێدەنگی ئەوانی تر، تا لەلایەن ئامادەبووانەوە بەخێرهاتنمکرا و منیش وەڵامی یەك لەدوای یەکیانم دایەوە.

دوای ماوەیەك ئەو تورکەی کە بەرامبەرم بوو، بە زمانی خۆی کەوتە گفتوگۆ لەگەڵمدا، پرسی کە ئەگەر من لە ئەستەنبوڵ بووبم و وەڵامێکی ئەرێنی وەرگرتەوە، دەستیکرد بە پرسیارکردن لێم، وەك لە کوێ ماومەتەوە و چۆن بوو بە لامەوە. ناچاربووم بڵێم لە ئەستەنبوڵ ژیاوم، ترسام ئەگەر بڵێم لە پێرا بووم لەوانەیە سەرسامبێت و بە راستی بڵێم کە فارسێك لەو گۆشەیەی ئەوروپاییانە چی دەکات. خۆشبەختانە چوونم بۆ ئەستەنبوڵ دووبارە دەبووەوە و زۆر باشیش شارەزابووم و وای بیردەکردەوە هاوسۆزیەکی لە مندا بەدیکربێت، کە لەو شارە دەرکراوم و نەفرەت لەو ناوچەوانە کە ئەوی بۆ دوورترین گۆشەیەکی کوردستان دوورخستۆتەوە. لە دواجاردا لەبارەی هەڵەبجەوە ناسیاوانە دووا، ئەوەش لە میانەی بەراوردکردنی تورکیا و کوردستانەوە سەرچاوەی هەڵگرتبوو، دەستبەجێ تاهیر بەگ لە بێدەنگیەوە بە ئاگاهات و بە رستەیەکی توند پرسی بۆچی لە ئەستەنبوڵ نەمایتەوە، کە دەبێتە هۆی ئاسوودەیی هەمووان. گەشتە ئاستی نەیارانە، ئیدی ئەفسەرەکە- بیمباشی هاوئاهەنگی نەکرد و بەبێ قسەکردنی زیاتر مۆڵەتی خواست.

پاشان تاهیر بەگ دەستیکرد بە پرسیارکردن لەبارەی شوێنە جیاوازەکانەوە و چووە ناو وتووێژی سیاسەتەوە، لەبارەی بالقان و دوورگەی کریتەوە پرسیارەکانی تاووتوێدەکرد، خۆی دەرخست کە بەشێوەیەکی بەرچاو زانیاری باشی هەبوو، بەڵکو بابەتەکەی زۆر زیاتر وردکردەوە، کە من بابەت و

## بیروڕاكانی سیاسی

مەسەلەی ئاوا گرنگیەكی ئەوتۆی پێنادەم. بەهەرحاڵ، لەوانەبوو زانیاری لەبارەی خاڵە نزیكەكانی نزیكتر لە مالەوەی بدەمێ، لەسەر سنووری باكوری، كە توركەكان هێرشدەكەنە سەر خاكی ئێران. هەر هەموو ئەوانەی ئامادەبوون گرنگیەكی زۆریان دەدا بە كاروباری سیاسی ئەو كاتە و وەك زووربەی كوردەكان خۆیان ئاشكراكرد، كە هاوسۆزیەكی زیاتریان لەگەڵ شاخوازەكان هەیە وەك لەگەڵ نەتەوەییەكان، ئەوانەی كە دادەنران بە ژمارەیەك گێرەشێوێنی خۆتێهەڵقورتێن و بەبێ هیچ بەهرەیەك خۆیان بۆ فرمانڕەوایی هاوڕەگەزانیان دادەنێن، ئەوەش تا رادەیەكی زۆر بیرو رایەكی تەواو راستە. هەروەها هەستی دژایەتی پەرلەمانی توركی تەواو بەهێزبوو، چونكە سوڵتان عەبدولحەمید هەمیشە تەماشای كوردی بە كەمتر دەكرد لەچاو پێشینەكانی خۆیدا و ئەوپەڕی هەوڵیدەدا كە لەگەڵ نیمچە شارستانی ئەستەنبوڵدا تێكەڵ بن. بەبێ ئەوەی سەركردەكانیان بگرێت لەسەر ئەو ناپاكیە یان باج بەسەردا سەپاندنێكی زیادەڕۆیانە. ئەوە سوڵتان عەبدولحەمید نەبوو كە چەك و تەقەمەنی دا بە كوردەكانی باكوور و بەرگی هاوپۆشی دانێ و پێیان دەوتن سوارەی حەمیدی و رێپێدان لە كوێ بیانەوێ بژین و راووڕووت بكەن.

سیستمی حوكم لە رێی نوێنەرایەتیەوە بۆ كورد نەگونجاوە، چونكە حوكم هەمیشە لەلایەن سەرۆكانی بەشەمیراتیەوەیە، كە ماكی فرمانڕەواییان تێدا لەدایك بووە و ئەوانەش بێگومان باشترینیانن لە رەگەزی خۆیان و تیرەكەدا بۆ ئەوەی سەرداریبیان بكەن. ئەگەر كۆچەریی كورد دابنرێت بە نەگونجاو و بە رادەیەكی پێویست ناهوشیار بێت كە بزانێت چی باشترە بۆ ئەو، ئەی كەواتە چی لەبارەی جوتیاری توركەوە دەوترێ، كە ئەوەندە گێلە هۆشیاریبیان ناگاتە ئاستی مانگایەك و كەمترن لەئاستی جوتیاری كورد لە هۆشیاریدا، هەروەك تەمەڵی بۆ ئەسپەكە. بەو شێوەیە كوردەكان مشتومڕدەكەن و بە راستیش مشتومڕدەكەن، لە ئێستادا حاڵەتێكی باش دروستدەكەن بەگوێرەی حوكومەتی سەپێنراو لە رۆژهەڵاتی توركیای ئاسیایی و كوردستاندا.

لە كاتێكدا قاوەمان لە فنجانی بچووكی توركیدا دەخواردەوە، كەسێك دەستیكرد بە پرسیاركردن لەبارەی عادیلە خانمەوە كە لە مانگەكانی هاویندا نیازی چوونی كوێی هەیە. ئەم ساڵ چەند كێشەیەك لەو بارەیەوە لە ئارادابوو، چونكە پاشا لەبەر كاروباری میری لە سلێمانی ماوەتەوە و هێشتا هەر لەوێیە، كەواتە پێویستیەكانی خۆسازدان بۆ گواستنەوەی بنەماڵەكە هێشتا تەواو نەبووە.

عادیله خانم بەگشتی دەچێت بۆ گوندە بناریەکانی چیای هەورامان، یان بۆ شوێنێکی گچکە کە پێیدەوترێت مەریوان لە خاکی ئێراندا. بە ئاسایی تاهیر بەگ بەدوایدا دەڕوات، یان دەچێت بۆ پێنجوێنی شارۆچکەی خۆی، کە سێ رۆژ رێیە لە هەڵەبجەوە، کە هەر ساڵە کۆمەڵێکی زۆر لە فرمانڕەوایان و تیرەی جاف لەوێ کۆدەبنەوە، وەك دیدار و کۆنگرەیەکی هاوینە و ژمارەیەك لە سەرۆکە کوردەکانی تریش دێن بۆ بەسەربردنی کاتێکی کورت لەوێ، بۆ بیستنی ئەوەی چی دەگوزەرێت و بۆ پاراستنی پەیوەندی دۆستانە لەگەڵ جافدا. لە سنەوە ژمارەیەکی زۆر لە "بەگزادە" یان خانەدانەکان هاتون بۆ دیدەنی تاهیر بەگ و باسکردنی شیعری فارسی و هەروەها سەرکردەیەکی گرنگی زۆرتر لە کوردستانی ئێرانەوە هاتون، بەڵام نەك بۆ لای تاهیر بەگ، بەڵکو بۆ کاروبار هاتون بۆ لای مەحمود پاشا، کە لە مانگی حوزەیراندا لەگەڵ تیرەکەدا دێت بۆ پێنجوێن. ئەو کاتەی ئەم گفتوگۆیەی تێدا تەواوبوو، کەسێك نەبوو بەرچاوروونتر بێت لە جاران، کاتەکەش درەنگ بووە و تاهیر بەگ هەستا و بە چوونە دەرەوەی ئەو کۆمەڵەکەش بڵاوەی لێکرد.

بەیانی داهاتوو عادیله خانم ناردی بە دووی مندا کە هەندێ نووسراوی فارسی بۆ بخوێنمەوە. بینیم سەرقاڵی نامە ناردنە و ژمارەیەك نامەی دایە دەستم تا بۆی بخوێنمەوە و لە رێنووسەکەیدا ژمارەیە وەڵامدانەوەم بۆ خستە سەر کاغەز، فارسیەکەیم بۆ راستکردەوە کە لە زمانی رەوان دەرچووبوون. لە کاتێکدا بەو شێوەیە سەرقاڵبووین، یەك "ئەمین ئەفەندی" بەیانکرا و بەدوای یەکێ لە خزمەتکارەکانەوە هاتە ژوورەوە. کە تەماشات دەکرد پیاوێکی سەیر بوو، بە هیچ جۆرێ لە کورد نەدەچوو. کەڵەگەت، روخسارێکی گەورە و چاوەکانی بچووك و شین لەو شێوانەی لە باکووری ئەڵمانیادا دەبینرێن، قژی زەردێکی کایی کورت، لوتێکی درێژی قۆقز و لەوە دەچوو کە نەتوانێت زەردەخەنەی لەخۆ رازیبوون لەسەر دەمی کراوەی دووربخاتەوە.

جلوبەرگی باشی لەبەردابوو، لولەیەکی بچوو کاغەزی بە دەستەوە بوو، وەك بیەوێ هەڵوێستی بەرزی خۆی نیشان بکات، بە دڵنیاییەکی تێبینکراوەوە هاتەژوورەوە و لەسەر یەکێ لە سندوقە چەرمەکانی کە بەدەووری ژوورەکەدا ریزکراوە دانیشت. عادیله خانم، کە بە ئاشکرا ئەو جۆرێکە لە پەیوەندیدار و لێی پرسی چی دەوێت، وەڵامیدایەوە، کە ئێستا بیستویەتی کە من گەیشتووم، هیواداره بە چاوپێکەوتنم. وتی، بیستوویەتی، کە من لە ئەوروپا بووم و لەوانەیە زمانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی بدوێت و لەوەش زیاتر پزیشکیشە و لەوانەیە بتوانێ وێنەکان بگرێت. ئەو

هەموو لێهاتووە و بەدەستهێنانانە لەودا هەیە، شایستەی پیرۆزباییەکی زۆرە کە وەسف ناکرێت، زەردەخەنەی لەخۆباییبیەکەی هەرگیز جێینەدەهێشت.

عادیلە خانم پێی وت بە فەرەنسی قسەم لەگەڵ بکات و سەرسام بووم، کە بەو زمانە کەوتە قسەکردن لەگەڵ مندا، هەرچەند هەندێ کێشەی هەبوو لە قەسەکردندا، بەردەوام وشەی کوردی دەخستە ناو گفتوگۆکەوە. پێی وتم سەردەمێك باشم دەزانی و بە دڵنیاییەوە لەوە دەچێت زیاتر بیرچوونەوە بێت وەك لە نەزانی. بەڵام خۆی ناچارنەکردبوو گرنگی بدات بەو شێوە گۆکردنە جوانەی کە فەرەنسی پێی دەدوا، چونکە ئەگەر لە ئەوروپا بووبنایە، بە گۆکردنەکەی بەیانی رەگەزی ئەڵمانی دەکرد. کەس چاوەڕێی ناکات یەکێکی کورد فەرەنسی بدوێت و من بە ئاسایی لێمپرسی لەکوێوە ئەوە فێربووی و وەڵامێکی بە پێچ و پەنام درایەوە. لە وەڵامی ئەوەی لەبارەی بازرگانی و کاروپیشەیەوە پرسیم، بە شانازییەکەوە پێی وتم کە پزیشکی تایبەتی عادیلە خانم بووە و ویستی بزانێ لە کوێ من پسپۆری پزیشکیم بە دەستهێناوە. منیش ئینکاری هەر شارەزاییەکم کرد لەبارەی نەشتەرگەرییەوە و پێم وت کە هەرچۆنێك بێت من بەرپرس نیم لەو پروپاگاندەی پزیشك بوونەی من، ئەوە من نەبووم، لەو حاڵەتەدا ئەو کەمێ ئارامبووەوە و ئەوەی من وتم بۆ عادیلە خانمی گێڕایەوە، لە کاتێکدا منیش بە دڵنیاییەکی بەهێزەوە دوایکەوتم. هەر زوو دواتر مۆڵەتی خواست و منیش بە هەمان شێوە.

پیاوەکە زانخوازیەکی زۆری لەبارەی منەوە تێدابوو، کە چووم بۆ لای مەنسووری مەسیحی هاوڕێ نوێکەم، بۆ ئەوەی بپرسم ئەم ئەمین ئەفەندیە کێیە- ناوەکەشی زۆر لە کوردی ناچێت.

بە جۆشێکەوە، لەگەڵ نەفرەتکردندا هاواریدەکرد، "ئەو کابرایە" لەوانەیە بەر نەفرەتی ئیسکاریۆت کەوتبێت" و پاشان، بەخێرایی بیریکەوتەوە کە لەگەڵ موسڵمانێکدا قسەدەکات، لەپڕ بێدەنگ بوو."

باشە،" من وتم" بۆچی:

" وەك دەیبینی،" وەڵامیدایەوە،" ئەو کورد نییە. ئەڵمانیەکی ئەستەنبوڵییە کە باوکی حەبی مەنعی منالبوونی دەفرۆشت، بەڵام بەهۆی هەندێ تاوانەوە کە کردبووی ناچارکرا شارەکە جێبهێڵێت. دوو کوڕی هەبوو، ئەم ئەمین ئەفەندیە و یەکێکی تر. هاتن بۆ بەغداد و ئەوەی کردیان هەڵەبووە و دەبێ دەربازبن. چارەنووس بەو شێوەیە هێنانی بۆ هەڵەبجە، کاتێ خۆیان لەسەر سنووری کوردستان بینیەوە، دەترسان یەك هەنگاو هەڵبێنن و نەشیاندەتوانی بگەڕێنەوە، خۆیان دا بەسەر

دەستوپێی قازیدا و گۆڕان بە موسڵمان. عوسمان پاشا ئەم یەکەیان دەپارێزێت و ئەویتریان چووە ژێر سایەی شێخ عەلی تەویڵەوە، کە ئێستا لەوێیە. ناوی ئەمین ئەفەندی و عەلی ئەفەندیان هەڵگرت و هەردووکیان ناودارن بە سروشتی ناپەسەند و پیلانگێڕی هیچ و پوچ و نادانی و تەمەڵی و تەوەزەلی. ئەم ئەمین ئەفەندیە بانگەشەی ئەوە دەکات کە پزیشکە، بەڵام هەرچیەك کە پیاو یان ژن لەوەوە بەدەستی بهێنێت وەك دەرمان تەنیا یەك چارەسەرە، بە نرخێکی گران پێیان دەفرۆشێت، ئەویش خوێی ئیپسمە کە لە بازاڕ لای جولەکەکان دەیکڕێت. لەبەرئەوە هیچ کەس ناچێتە لای و ئەو لەژێر سایە و خێری عادیلە خانمدا دەژی، کە جارجارە دەستێك جلوبەرگی دەداتێ و ڕێیداوە کە بڵێت پزیشکی ئەوە. بەو بۆنەیەوە، ئەو بیستویێتی، کە تۆ پزیشکی و چووی بۆ ئەوروپا، وا هەستدەکات کە تەواوتکردووە و هەر شتێك لە توانایدا بێت دژی تۆ بەکاریدێنێت، بۆیە من ئاگادارتدەکەمەوە ئاگات لە خۆت بێت.

ئەم گوزارشە سەرسوڕهێنەرە من لەگەڵ گرنگی و هەروەها هەندێ هەستی بەزەییدا بیستم، کە بەهەرحاڵ، کاتێ من بیرمدەکردەوە چەند دەبێ کەسێکی وەها لێرە بووبێت و چۆن بە تەواوی ئەوروپای لە یادکردووە. بەلایەنی کەمەوە شتە دیاریکراوەکان هەبوون کە لەوانەبوو بەئاسانی بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی گرانە کە ئەو وا ڕێکیخستووە. بۆ نمونە، لەسەر سندوقەکەم بە پیتی درشت نووسراوە "ئی. بی. ئێس- E. B. S."، کە لە راستیدا جێگای سەرنجی تەواوە بۆ کەسێك شارەزای پیتە ئەوروپیەکان بێت و من وەك غولام حسێن، تا ئێستا پیتەکانی یەکەم نەبۆتە جێی سەرنج، لەبەرئەوەی لەو کاتەوە لە دیاریەکرەوە سندوقەکەم لە تورەکەیەکی قوماشدا پاراستووە، کە لە ڕێگاوباندا وەك فەردەیەکی شتومەك دەردەکەوت، بەڵام لێرە بۆ ئەوەی شتێیەك دەربێنێت، دەبێ لە تورەکەکەی دەربێنم و لەوێدا، بە روونی دیارە سندوقێکی لەندەنیە- ئاشکرایە ئینگلیزیە.

هەرچۆن بە راستی مەنسوور لە دڵیەوە بۆی باسکردم، ئاوا هەر ئەو ئێوارەیە بە باشی هاتەدی. شێومکرد و بەبێدەنگی جگەرەم دەکێشا، کە تەپەیەك لە دەرگاکە درا. لێرە هیچ کوردێك نازانێ مانای یەك جار لە دەرگادان- ئەو یان پاڵپێوەدەنێ بیکاتەوە، یان لەو دیوەوە هاواردەکات، لەبەرئەوە زانیم دەبێت ئەمین ئەفەندی بێت. دەرگاکەم کردەوە، وەك یەکێك کە بەنهێنی بۆ هەندێ کاروباری گرنگ هاتبێت خۆی کرد بە ژووردا. هەر کە هاتە ژوورەوە تەماشای ئەملاولای خۆی کرد و بێ ئەوەی چاوەڕێی داوەتی من بکات بۆ سەر فەرشەکە، لەسەر سندوقەکە دانیشت، عەباکەی بە شێوەیەکی کاریگەریانە داپۆشی.

## ئێوارە سەردانێك

دەستیکرد بە قسەکردن بە فەڕەنسی، سروشتە سەرسوڕهێنەکە کە دەتوانێت هامبەری دژواریکات من کوردی نازانم و لە توانامدا بوو کە گوێ نەدەم بە شێوە زارە ئەڵمانیەکەی.

"چیت دەوێت،" ئەو دەستیپێکرد، "یەك...یەك... وشەیەکی بچووك، کەمێ نیتراتی زیو بۆ دەرمان... دەرمان زۆر پێویستە."

ئەوە تێگەیشتم داوای نیتراتی زیوی دەکرد بۆ مەبەستی پزیشکی، بەڵام منیش بە خێرایی دڵنیامکرد کە هیچ شتێکی وەهام نیە و ئەویش بە پەلە بەسەریدا تێپەڕی و وەك هۆیەك بێت بۆ ئەوەی بێت بۆ لام. کۆتایی عەباکەی لە خۆی دوورخستەوە، هاتەپێشەوە تا ئاستی ئەو شوێنەی من لەسەر فەرشەکە دانیشتبووم و دەنگی نزمکردەوە، لە دەستەواژەی پچڕ پچڕدا بابەتێکی پێیوتم ئەوەی کە من لێرەدا دایدەنێم.

" تۆ، بەڕێز، پیاوێکی شارستانیت، منیش هەروەها پیاوێکی شارستانیم، بەڵام هەمیشە بەم شێوەیە نەبووم- باوکم پزیشکێکی دیاربوو لە ئەستەنبوڵدا و من کوڕە گەورەی بووم، لە باشترین قوتابخانە و کۆلیجەکاندا پەروەردەکراوم. بێبەختانە ناردمی بۆ ڕۆژهەڵات و جەڵتەیەکی دەماغی ناخۆش کە منی لەناو ئەم دڕندانەی کوردستاندا جێگیرکردووە. ئێستا سیانزە ساڵە کە من لێرەدا پەکمدەکەوێت و توانام لە دەستداوە، ئایا هۆکارێکم هەیە تا بۆ ئەوروپا بگەڕێمەوە، کە زمان و دابونەریتەکەیم بیرچۆتەوە، من تەنیا وەك خەونێکی خۆش لە یادم ماوە. ئای، ئەی بەڕێز، چی گەمژەییەکە هانتدەدا شارستانی و ئاسودەیی جێبهێڵیت و بڕوات بەخۆت بێت لەنێوان ئەم بکوژانە و ئەو جەردە و ڕێگرانەدا.

"بۆچی؟"، من وتم " وڵاتەکەم هێشتا دورترە، ئەمەش جگە لە قۆناغێك زیاتر نییە لەسەر ڕێدا و ئەوەندە دەمێنمەوە کە سۆز و خۆشگوزەرانی تێدا ببینم، وەك ئەوەی دەیبینم لەوانەی کە تۆ وەك بەربەرەکان ناویان دەهێنیت.

"ئاگاداربە،" بە چرپە وتی، " تۆ نازانی قوڵایی دووڕوویی و بێباوەڕی کە ژیانی ئەم شوێنەی تێدا نوقمبووە. تەنانەت ئێستا ئەوانەی بە رووتەوە پێدەکەنن، لە پشتەوە رووگرژ و هەوڵدەدەن تێکتبشکێنن و منیش لەبەرئەوە هاتووم ئاگادارتبکەم. پڕوپاگاندەیەك هەیە، نازانم لەلایەن کێوە بڵاوبۆتەوە، کە تۆ فارسێکی سەر بە پارتی شۆڕشگێر، بۆ سیخوڕی هاتویتەتە ئەم خاکەی ئێرە و سەرکردەکان دژی تورکەکان هاندەدەیت.

## سەرگوزشتەیەکی نابەجێ

لەگەڵ ئەوەشدا هۆکاری کورتتریان لێرەدا هەیە. ساڵی رابردوو بێگانەیەك لە سنەوە هات و پێیوتین کە ئەوەی بۆی هاتووە تەنیا کۆکردنەوەی دیالێکتی کۆنی هەورامانە. ئەو وتی دانیمارکیم، بەڵام من تاقیمکردەوە و نەیدەتوانی بە ئەڵمانی بدوێت. هەرچەند نەمدەویست لایەنێك بم لە ناثارامیی، ئاگادارمکرد کە ئەو لەسەر خاکێکی مەترسیدارە و کە من ئەوم بە رووسی دەزانی، چونکە کتێبی بەو زمانە لەلا هەبوو، هەروەها نەخشەکانم لە خێمەکەیدا بینی، لەبەرئەوەی زۆر خۆشمەشرەف بوو، بانگیکردم لەگەڵیدا دابنیشم. بۆیە ئاگادارمکردەوە، بەڵام ئەو بەردەوامبوو لەسەر ئەوەی بە دڵنیاییەوە بێتاوانە. باشە، بەیانیەك بە دووربین تەماشای گردێکی دووری دەکرد و منیش دیاردەیەکی سەرسام و ناوێزەم بۆ دەرکەوت و هەلێکم بۆ هەڵکەوت کە سەیرمکرد لەناوەوە کامێرەیەکی بچووکی تێدا شاردراوەتەوە. لەو کاتەدا تاهیر بەگ گومانی پەیداکرد، چونکە زیاتر لە هەموو سەرکردەکانی تر حەزی بە دەرکەوتنی خەڵکی بێگانە نەبوو، بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیکرد بە عوسمان پاشا و مەحمود پاشاوە. هەر یەکەیان پسوڵەیەکی تێبینییان دا بە گەشتیارەکە، کە دەبێ پێشانی بەرپرسانی بدات لەکاتی تێپەڕبوون بە گوندەکانیاندا. رێیان پێدابوو بۆ ماوەی نیو سەعات لە هەر شوێنێك بمێنێتەوە، بەڵام کە بوو بە 31 دەقیقە تەقەی لێبکرێت. لەماوەی یەك رۆژدا چووە دەرەوە لە خاکەکەمان و دووركەوتەوە. ئێستا من هیچ بەراوردێك لەنێوانی تۆ و ئەو سیخوڕەدا ناکەم، چونکە دڵنیام لە نێت باشیت، بەڵام تاهیر بەگ گومانی لێت هەیە و ئامۆژگاری عادیلە خانمی کردووە، کە چاودێریت بەسەرەوە دابنێت. هەستێك هەیە دژی تۆ و من ئاگادارتدەکەم کە ئاسانکارییەی کە بۆ رووسەکە کران بۆ تۆی ناکەن، بۆ تۆ وەك فارسێك و گوللەیەك بە ئاسایی و بە خێرایی هەموو مەسەلەیەك یەکالآدەکاتەوە. ئەم بەیانیە تاهیر بەگ بەدواتا دەگەڕا بتدۆزێتەوە و تەقەت لێ بکات، بەڵام من بەو باشییەی دەتناسم و لە ناخەوە بۆت دەگریم و پاڕامەوە و دەستەبەری خۆم کرد کە تۆ بوویت بەڵام شتێك کە تۆ بیزانی ئەوەیە کە ئەو کەسێکی بێ زیانە و تا کۆتاییش هەر وادەمێنێتەوە. تا لە کۆتاییدا چاوپۆشی لە مەسەلەکە کرد، بەڵام ئەگەر تۆ ئامۆژگاری من وەردەگریت درێژە بە مانەوەت مەدە.

"ئای، گەورەم، تۆ پەندە پێشینانە کۆنە ئەڵمانییەکە دەزانی، " چیا لە دوورەوە باش دیارە، بەڵام کاتێ لە داوێنیدای چۆن بێ هیوادەبیت." ئەوە زۆر راستە لەم شوێنەدا. لە دوورەوە، کاتێ گەشتیاران باس لە میوانداری عادیلە خانم دەکەن، ماڵە مەزنەکان، باخەکان، بازاڕی هەڵەبجە،

دڕەندەیی و ناپاکیەك کە باوەڕناکرێ و نەبوونی ئاسایشی بیریدەچێت، کە لێرەدا ژیانی خستۆتە مەترسیەوە. ئای، ئەو خەڵکانە، هەوڵدەدەن پیاو چی هەیە بیگوشن و لێیدەربێنن و ئینجا بیکوژن. بیرکەرەوە کە نە ئەوانە لێرەدا هیچت دەدەنێ، نە پیاوەتیشت لەگەڵ دەکەن، بەڵکو تۆ دە بەرامبەر نرخەکەی دەدەیت. ئامۆژگاری من وەرگرە، هاورێ، لەم لانەی دوپشکانە هەڵبێ بەرلەوەی پێتەوەبدەن تا مردن، واز لەم شارۆچکەی سیسارکە برسیانە بهێنە، تا گۆشتەکەت بەسەر ئێسکەکانتەوە ماوە و پێش ئەوەی لەسەری گەشەبکەن. سەیرێکی من بکە، چیم هەیە، لەناو ئەم بەرگە هەژارییەدا دەڕۆم کە هەوڵدەدەم تەنیا پارێزگاریان بکەم لە کوردی تالانکەر.

منیش وتم،" بە بۆچوونی من لەو رۆژەوە کە تۆ لە بەغداوە هاتویت، وەك پەنابەر، کە تەنانەت لەمەش کەمتر بووی، بارودۆخەکە لە ئێستا نالەبارتربوو، کاتێ بەهۆی چاکەی پاشاوە تۆ بوویتەتە خاوەنی ماڵ و جلوبەرگ و ژن و منداڵ و بەوەشی پێویستە بۆ پارێزگاری لە هەمووی.

"ئای، تۆ تێناگەیت،" وردە وردە بەرپەرچی دەدایەوە و ماوەیەکیش بێدەنگبوو. جارێکی تریش دەستیکردەوە بە ئاگاداریکردن و هۆشیاریدان، بەڵام منیش تەواو بەسە و بۆ ئەوەی خۆمی لێ رزگاربکەم، دەستمکرد بە گاڵتەپێکردنی بۆ ئەوروپاییەك بووبێ بە موسڵمان و پرسیارم لێ کرد لەکوێدا سوننەکان یەك تۆز لە ئێمەی شیعە باشترن- پرسیارەکان تۆقانی- و چووەدەرەوە.

هەموو ئەو قسە قۆڕانە ئەوە نەبوو من بترسێنێت، بەڵام بۆم دەرکەوت کە لە هەڵەبجەدا دوژمنێکی مامناوەندی و ترسنۆکم هەیە، کە چەکی دڵخوازی بوختانی ئاشکرابوو. خۆشبەختانە ئەمە ئەو کوردستانە بوو، کە ئەو نەریتی هاوارەیان هەیە لەبارەی کاروباری یەکێکەوە لە سەر سەربان یان لاپاڵی گردەکانەوە و تەمەنی درۆ کورتە، بە ئاسایی بە گوللەیەکی لابەلا کۆتایی دێت.

بۆیە، بەپێی سیستمی سەر سەربانی ماڵ ویستم یەکسەر بچم بۆلای تاهیر بەگ، رەخنەیەکی گەورە و بەهێز بگرم لەو شێوە رێزگرتنە لە میوان و بەهانەی خواحافیزییەکی بەپەلەی بدەمێ. لە میانەی ئەوەوە من دەبێ لە توانامابێت ئەوە دەقاودەق بڵێم کە ئەوە بیروڕای ئەوە. ئەگەر گومانی لە من هەبێت، بەرهەڵستی لە رۆشتنم ناکات.

بۆیە، بە دالانە تاریکەکەدا رێی خۆم گرتەبەر، لەسەر سەربانەکەی خۆی بینم لە ناوەندی برادەرە ئاساییەکانیدا و لەلای راستیەوە بە بێدەنگی دانیشتم. دوای هەندێك پرسی کە ئایا خۆم رێکخستووە بۆ مانەوە لێرە تا ماوەیەك، کە ئەو زۆر سووربوو لەسەر ئەوەی دراسەی فەڕەنسی لەگەڵ مندا بکات. منیش خستمە سەر هەوایەکی کینەدار و وەڵامدایەوە کە دوای چەند رۆژێکی

کورت هەڵەبجە جێدێڵم و لە وەڵامی پرسیارەکەی ئەو کە وتی بۆچی، پێم وت کە میوانێك رانەهاتبوو شەوانە پەیامنێرەکانی شەیتانی بۆ بێت، لە خانەخوێکەیەوە وتەی شەڕی پێبوترێت و کە ئەگەر دەستووری کۆنی کوردی لە میوانداریدا بەو شێوەیە پێشێلکرابێت، بۆ من باشترە هەر ئێستا جێیبهێڵم. بەو بۆنەیەوە ئامادەبووان گوێیان قوڵاغکرد و لە هێماکردنی میوانداری کورد تیلایەکی تەڵخ نیشتە سەر روخساریان و خورتە و بۆڵەیەك بڵاوبووەوە، بەشێکی لەسەر غەم و پەژارەی من بوو، بەشێکیشی لەسەر لۆمە و بێزاری لە دەستەواژەیەکی وا لە ماڵی جافدا. هەروەها تاهیر بەگی هەژاند و شەو بەشێوەیەکی نائاسایی داوای بەدواداچوونی بە پەلە ناکات بۆ ئەم وتانە، ئیدی منیش هەموو شتێك کە روویدابوو پێم وت.

بۆ سەرسامی من ئامادەبووان رابواردنێکی رەچاوکراویان پێشاندا و تەنانەت تاهیر بەگیش تا رادەیەك پێکەنی، بەڵام پێش ئەوەی هیچ وەڵامێك بداتەوە، پیرە شێخێکی بەرزنجی، کە یەکێکە لە شێخە دیارەکان، وتی: " دۆست، ئەو کەسە گێلە، ئەمین ئەفەندی ناناسیت، نازانی ئەو، لێرەدا ئەو شتە لە هەموو کەسێکی نامۆ دەکات، کە دەبێتە هۆی بەدناوکردنی ئێمە و هۆی دڵەڕاوکێی میوانەکانمان. گوێی مەدەرێ.

ئەوە پیاوێکی سپڵەیە و تا بڵێی بێ مێشکە، بەجۆرێ لە تۆ دەترسێت، کە تۆ بە پزیشك دەزانێت، بەرەکە لەژێر پێی ئەو دەردێنیت و بە دەرکردنی دەگەیەنیت. راوەستە تا سبەینێ، بچۆ بۆ بینینی عادیلە خانم، بەڵام مەسەلەکە بۆ ئەو بەیان مەکە."

تاهیر بەگ، پێچەوانەی ئەوەی نەوت، ئەو ئەوەشی خستەسەر کە من نابێ گوێ بدەم بەو کابرایە-بێ بەزەییە، سپڵەترینی سپڵەکان، کەسێکی تەفرەدەر و بێ مێشك کە لەوانەیە نەنگی بێت لەسەر ئەوانەی داڵدەیان داوە. ئینجا وەك ئەوەی دڵخۆشی ئەوەم بداتەوە کە هەستمپێکردووە، گفتوگۆیەکی دوورودرێژی دۆستانەی لەبارەی بابەتە جیاوازەکانەوە دامەزراند و ئەو گرنگییێدانە بۆی روونکردمەوە کە لە رەفتاری ئامادەبوواندا دیاربوو، کاتێ ئەوێم جێهێشت هەوڵی ئەمین ئەفەندی بۆ خۆ رزگارکردن لە من هەلوێستی منی باشکرد، لەگەڵ تاهیر بەگ بە هەرجورێك.

# بەشی یانزەیەم

# شارەزوور و هەڵەبجە

بەیانی داهاتوو لەگەڵ بەرچاییدا، کەسێك وەك یارمەتیدەر دەرکەوت، کە تا ئەو کاتە من نەمبینیبوو. لەوە دەچوو خزمەتکار بێت، بەڵام جلوبەرگێك کە ئەو پۆشیبووی کەمێ لە جلوبەرگی خزمەتکارەکان دەچوو. بۆ هاتنەژوورەوە و چوونە دەرەوەوە لە دەرگا نزمەکەوە، دەبوو دوو ئەوەندە خۆی بچەمێنێتەوە، چونکە باڵای بە باشی 6.4 پێ دەبوو. ئەو تۆنیکەی- کە کراسێکی دەڵبی بێ قۆڵە- پۆشیبووی تا سەر ئەژنۆی هاتووە، کەڵەگەتیەکەی دەریخست کە کوردێکی موکریانی ئێرانیە و ئەوەش بەس نەبوو، کڵاوێکی قوتی ئەو نەژادەی لەسەردا بوو، بەدەوریدا دەسترۆکەیەکی شینی لۆکە لەگەڵ دوو گۆشەکاندا بەدەوری گوێکانیدا ئاوێزانە. لەژێر تونیکەکەدا هیچی لەبەردا نەبوو، جگە لە شەرواڵە کۆنە پینەکراوەکەی، ئەوە تەنیا جلوبەرگی بوو، سێ گۆشەیەکی پان لە سینەی سوتاوی بە چەشنی خشتی سوور دەرکەوتووە. ئەو کاتێ دەهاتە ژوورەوە هەرگیز کێشەی نەبوو لە پێڵاو داکەندندا، چونکە پێڵاوی لە پێدا نەبوو. لەکاتێکدا چاییم دەخواردەوە، کارمەندێکی تاهیر بەگ هاتە ژوورەوە و هاوبەشی لەگەڵدا کردم و دوای ئەوە پرسیارم لێکرد ئەو پیاوە کێیە، روونیکردەوە کە یەکێکە لە کارمەندەکانی، هاتنیشم لەم کاتەدا بۆ ناسادنی ئەو بوو. ئەوە موکریانیەکی هەژاری بێ ئیشوکارە و بەدوای کارا دەگەڕێت و وەك ئەوەی زانراوە بۆ عادیلە خانم، تاهیر بەگ و مەنسوور، ئەویان وەك خزمەتکارێك بۆ من پێشنیارکردوە." بۆ،" ئەو وتی،" تۆ، وەك کەسێکی گرنگ، ناکرێ بەبێ خزمەتکار بەملاولادا برۆیت، باشتر وایە پیاوێکی ناوخۆیی بخەیتەکار تا لێرەیت و ئەویش هەروەها بۆ هەرکوێیەك حەزبکەیت سەفەردەکات و حەزیش دەکات ئێران ببینێت."

لە هەمان کاتدا داواکار وەستاوە و بە سەروسیمایەکی گێلۆکە و منیش پێمناخۆش نەبوو کە بە هەر نرخێ بێت کەسێك لەم خاکە نامۆییەدا لەگەڵمدا بێت، رازیبووم بیخەمە کارەوە، لەسەر ئەو مەرجانەی نائاسایی نییە لەناو دانیشتواندا- هەندێ جلوبەرگ، خواردن و بڕی یەك تمەن مانگانە- نزیکەی سێ شیلینگ و شەش پێنس، یان دە پێنس و نیو هەفتەیەك.

## لە ئایینومرگەڕاوەکە پیسایی دەخوات

خواردنەکەی جگەرەشی لەگەڵدایە، کە شتێکی گران نییە، سی و پێنجی بە یەك پێنیە و ئەگەر توتن بکڕێت بۆ پەنجا نزیکەی دەگاتە هەمان بڕە پارە، "بێچوویەك" بە دیالێکتی باشووری کوردستان.

لەمیانەی وتووێژدا من بانگکرام بۆ لای عادیلە خانم و ئێستا خزمەتکارەکەشم بە دوامەوەیە- کە جلوبەرگەکەی کەمێ لەئاستی گەورەکەیدا نییە، من گوێڕایەڵی بانگهێشتنامەکەم. لەناو جەماوەرەکەدا گروپێ لە کارەکەرەکانی تێدابوو پێدەکەنین بەوەی سەرقاڵیکردبوون، هەروەها چەکدارەکانی کە لە دەریشەوە وەستابوون. ئەمین ئەفەندی نزیك دەرگاکە وەستابوو، ناڕەزایی دەردەبڕی و عادیلە خانمیش لە شوێنی ئاسایی خۆیدا دانیشتبوو، بە دەنگێکی نزمی قوڵ هەرچی ناو و ناتۆرەیەکی ناپەسند هەبوو لە زاراوەی کوردستاندا پێیوت. وەك من چوومە ژوورەوە ئەو جنێوەکانی نوێکردەوە، هاواری ئاسمانی کرد بۆ تەقینەوەی کەسێك کە تەواوی نەریتی کوردەکانی پێشێلکردووە، کە رووی جافەکانی لەبەردەم کەسێکی نامۆدا رەشکردووە، کە دەبووایە بیزانیایە ئەو میوانە لەژێر سایەی ئەودایە، لەدوایدا فرمانی پێدا کە لەوێدا پۆزشم بۆ بهێنێتەوە ئینجا بە وشە نزمە بێ رێزیەکان. ئەویش گوێڕایەڵیکرد لەگەڵ داوای بەخشین. " قوڕ بەسەرم، پیسی بەناوی چاوم، گووم خوارد و دڵم خراپە، سی کەرەکەی سواریدەبی ماچ دەکەم، پێڵاوی خزمەتکارەکەت یادەکەمەوە، کە کۆیلەم من لەبەردەمی هەموو پیاواندا بێنرخکراوم، درۆزنم و من هاوتای ژنە بێ ئابڕووەکانیش نیم،" و هیتد و دوبارە و دوبارە بەو شێوەیە. سەرەتا دوودڵ بوو، بەڵام دەنگی کرتەکردنی گوللەیەك لەناو ماشەی تفەنگێکی مارتینیدا هێنرایە سەرێ و نوکی چەقۆیەکیش لە پشت ملەوە لولیکرد، بۆ سەرگەرمی زۆری ئامادەبووان و لەدوایدا من لە عادیلە خانم پاڕامەوە تا رێگەی بدات بڕوات. ئەویش رێیدا لەسەر سك خۆی بەکێشکات، لەکاتێکدا کارەکەرەکان بێباکانە ئامۆژگاریانکرد کە خوێی ئیپسۆم بۆ رۆحی نەخۆشی خۆی بەکاربێنێت. من بەدوای ئەو جۆرە تۆڵەیەدا نەدەگەڕام و نە ئارەزووشم لێیبوو، بەڵام هەموو ئامادەبووان لەوە دەچوو لەوبڕوایەدا بن کە من سەرکەوتنێکی مەزنم بەدەست هێناوە، بەسەر یەکێکدا بە ئاسایی دوژمنایەتی لەگەڵم هەبووە و بوو، سەرەڕای ناڕەزاییە توندوتیژەکان، بۆ کوژانەوەی وەك پزیشکێکی هەناوی، لە راستیدا عادیلە خانم لە پێناوی مندا خزمەتکارە بە ساڵاچووەکەی خۆی شکاند.

# ئاوڕدانەوەیەك

پیرۆزبایی ڕەق بەڵام ڕاستگۆیانە لەلایەن پیاوان و کارەکەرەکانەوە، کە بە هەمان شێوە پێویستی بە لادان هەبوو لە بابەتەکە و داوای چایەیەکی دەکرد لە قاوەخانەکە، من لەگەڵ ژمارەیەك پیاوی چەکداردا هاوڕێییانکردم و وردەواڵای داستانەکەی ئەمین ئەفەندی بە هەموو خەڵکی لەوێ ڕاگەیەنرا، کە بەو بیرخوێنندنەوە تەمومژاوییانە لە ڕۆژهەڵاتدا کەڵکیان لە داستان وەرگرتووە.

لەوانەیە بیرمانبێتەوە لە بەشی یەکەمدا هێما بە پیاوێکی ئایینی کورد کراوە کە لە ئەستەنبوڵ چاوم پێیکەوت، کە قسەکردن لەبارەی وڵاتەکەی ئەوەوە وایلێکردم ئەم گەشتە بکەم. لە میانەی ئەو کاتانەی کە بەناو تورکیادا دەپەڕیمەوە، ئەوم بیرنەچووە و هەواڵیم لە کەرکوك بیست، کە لەلایەن هەمەوەندەکانەوە رووتکراوەتەوە. لە سلێمانیش بەدوایدا گەڕام، هەستمدەکرد لەوێ بێت، بەڵام وتیان گەڕاوەتەوە بۆ سنەی کوردستانی ئێران. ئەو هەواڵە ئومێدێکی گەورەی بە من بەخشی، چونکە زۆر بە ڕاستی چاوم بە مەسەلەکەدا خشاند کە ناتوانم دواییخەم، واتە بۆ روونکردنەوەی پێناسەی من دەبێ پەیوەندی بەوەوە بکەم و بە فەرمی دانی پێدابنرێت. کاتێ لە میانەی گفتوگۆدا لە ئەستەنبوڵ بە منی وت، کە دەبێ من وەك مەسیحیەك بێمە کوردستانەوە و لەوێ ببم بە موسڵمان، ئەوسا ئەویش دەتوانێت ژیانێکی خۆشم بۆ پەیدابکات لە وێنەگری، نەشتەرگەری و پزیشکی و مامۆستایی، بەڵام ئەوە تەنیا شێوازی هاندانە نمونەییەکەی پیاوە ئایینیەکە بوو، جگە لە ستایشێکی جوان زیاتر مانای هیچی تری نییە. ئەگەر ئەو ئێستا لە ناکاو توشم بێت، وەك موسڵمان و شیعەیەك بە لاما تێپەڕێت،( دەیکردم بە سونی)، بارودۆخەکە زۆر دژوارە و تەواوی بێ باوەڕیی ئەو سەرهەڵدەدا، لە بینینی پێش ئەو یەکێ لە ڕەفتارێکی زۆر جیاوازدا لەوەی کە لە ئەستەنبوڵ هەیبووە و ئەوەی ئەو خاڵەی هەڵبژارد بۆ سەفەرکرن بەبێ هیچ هۆیەکی دیاریکراو، کە دوای لێپرسینەوەکانی پەیوەند بە گەشتکردنەکەوە کە لە ئەستەنبوڵ بەڕێوەچوو.

بۆیە بیرم لەم تەنگوچەڵەمە چاوەڕوانکراوە دەکردەوە و باشترین کارمکرد بۆ خۆپاراستن لێی. من دەبێت چۆنیەتی خۆگۆڕینی خۆم لە بەرگی فارسیدا بەشێوەیەکی زیاتر بپارێزم، داوای لێبووردن لە خوێنەر دەکەم بۆ چرکەساتێ رابردووی دێنمەوە یاد، کە دیمەنی شیرازی چوار ساڵ لەوەبەرمان دەداتێت. لەوێ دوای سێ ساڵ خوێندنی ئایینی فارسەکان، چوومە سەر ئایینی ئیسلام. من بۆ ئەوە لێرە نیم کە تا چ ڕادەیەك بە ڕاستی یان ناڕاستی بیروباوەڕی محەمەدی بڕوابکەم، نەك ئاخۆ

بەهیچ جورێك بڕوام هەبێت. ئەگەر بەڕواڵەت نەچومایەتە سەر بیروباوەڕی محەمەدی هەرگیز نەمدەتوانی بەشێوەیەکی راست فێری زمانەکە ببم، کە زمان و ئایین لێك جیاناکرێتەوە. ئیدی دوای هەندێ دیدار لەگەڵ پیاوێکی ئایینی کە ئەمڕۆ ناویم بەیادهاتەوە لەگەڵ سۆزی تەنیا سەرسووڕمان و رێزگرتن، من بووم بە ئەندامی ئەنجومەنی کۆمەڵانی ئیسلام و هەستام بەکردنی خولێکی ئایینزانی. لەژێر پەروەردەی پیاوە ئایینیەکەمدا زانستێکی زۆرم بەدەسهێنا و دەمتوانی خۆم راگرم لە گفتوگۆکانی ئاینزانی و تاووتوێکردنەکاندا، کە لە هەمان کاتدا پیشە و سەرقاڵی بەشێکی زۆر گەورەی دانیشتوانی شیرازە. بە بچووکترین هێرش بۆ هەلەکە من لە رۆشتن رێگریکرام، وەك ئەوەی نەخشەم بۆ دانابوو، بۆ کەربەلا و مەککە و خۆم بینیەوە پەلەمە بۆ بریتانیا لەسەر پاپۆڕی ( P & O.) لەجیاتی ئەوەی بچێت بۆ جددە وەك گەشتیارێکی سەر پاپۆڕێکی هەڵمی لەسەر "ditcher"ەیەك. بەوجۆرە زانستێکی باشم لە بابەتەکەم وەرگرت، ئەگەر من بتوانم چەند ئەوە بڵێم و لەکاتێکدا دوورم، نامەیەکی زۆرم لە هاوڕێ ئاینیەکانم لە شیرازەوە پێگەیشت، ناونیشانکرابوو بە میرزا غولام حسێن، کە بەشێوەیەکی ناسروشتی نایانپارێزم و بەڵام تا ئێستاش ماون، کاتێ خۆم لە کوردستاندا بینیەوە.

بڕیارمدا ئەگەر تووشی پیاوە ئایینیە کوردەکە هاتم، واتە شێخول ئیسلامەکەی سنە، هەندێ لە نامەکانی پێشان دەدەم، کە باسی ئەوەی تێداکراوە من لەژێر بەرگی ئەورووپایدا بووم، بەڵام سوپاس بۆ خوا کەوتمە سەر رێگەی ئاسایش و ئاینی ئیسلامم هەڵبژاد نەك بتپەرستی، وەك دیارە." لەگەڵ ئەو نامانە و زانیاریم لەبارەی ئیسلامەوە، هیوادارم بتوانم ئەوە بسەلمێنم کە فارسم و موسڵمان بووم و ئەگەر باوەڕی بەوە کرد، ئیدی پێویست بەوە ناکات باسی ئەوە بکرێت ئەو چی دەزانی، کە رۆشتنی فارسێکی وەك من بۆ لەندەن، کاتێ چوو بۆ ئەوێ دەبێت جلوبەرگی ئەورووپی بپۆشێت، ئەوەش دەرکەوتنی من وەك ئەورووپیەك لە دیدی ئەودا روونددەکاتەوە.

گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە، بەیانیەك یان دوو بەیانی دوای کەوتنەکاری خزمەتکارە نوێکەم قسەم لەگەڵ کرد، ئەوەی دەمویست بیلێم ئەوە بوو، کە ئایا شێخول ئیسلامی لە سنە بینیووە. نەیبینیووە و ئەوەش هۆیەکی تەواو باشە کە پیاوە ئایینیەکە هەرگیز نەگەڕاوەتەوە ئەوێ. وا دەردەکەوێت کە ئەو تا دەگاتە پاوانەکانی عادیلە خانم و لە دیدارێکی تۆفانیدا لەگەڵیدا، داوای یارمەتی چەکداری دەکرد بۆ وێرانکردنی سنە و شلەژاندنی دوژمنەکانی لەوێ- حوکومەت و دەستەڵاتی ئایینی.

# ژیان لە هەڵەبجەدا

عادیلە خانم، کە هاوسۆزی لەگەڵ ئەودا تەواو سنووردار بوو، بەدڵنیاییەوە دەستی ناوە بە رووبەوە و قەدەغەیکرد بچێتە ناو خاکی ئێرانەوە، ئەو هۆشداریدا بە حوکومەت تا زیندانیبکەن. بۆیە لە حاڵەتی هەڵچوون و تورەبووندا، چوو بۆ شوێنێکی پیرۆز لە چیای مەزنی هەورامان، کە لە داوێنی نشێوییەکدا شێخی بیارە تەکیەیەکی بۆ خۆی و سەرگەرمکردنی جۆرەها دەروێشەکان و رەهەندەکان لە رێی خوادا بنیاتناوە. لەم گەڕانەوە بێدەنگە ئەو نەدەجولاّ جگە لە سەردانی جارجارەی هەڵەبجە، کە لێیبووڕابوون، بەڵام شایانی پێشوازی نەبوو.

لەو کاتانەدا لە ماڵی تاهیر بەگ دەمایەوە، هەندێ جاریش لەو ژوورەی کە ئێستا منی تێدام. حەمەی خزمەتکارم هەندێ بەدواداچوونی لەبارەی ئەوەوە کرد، دڵنیابووەوە کە بەم نزیکانە سەردانی هەڵەبجە دەکات، لە راستیدا، هەر کە پاشا هاتەوە، بۆ رێزلێنانی ئەو. وەك لەم رۆژانەشدا چاوەڕواندەکرێت پاشا بێتەوە، کەمێ هەستم بە نائارامی دەکرد، تا ئێستا بڕوای هەموو خەڵکی هەڵەبجەم بەدەستهێناوە و هاورێیەتیم لەگەڵ هەندێکیاندا پەیداکردووە، لەسەر رێ و شوێنی رۆژهەڵات، وەك بەشێك لەخۆی لەلایەن شوێنەکەوە پەسەندکراوم و لەوەش زیاتر، لەگەڵ هەندێ پارەدا دەچمە پێشەوە و نێت باشی خۆم بۆ خەڵکەکە بە شێوەیەکی گشتی و عادیلە خانمیش بە شێوەیەکی تایبەتی دەردەخەم، هەندێ پارەم دا بە جولەکەیەك تا بچێت بۆ جوانرۆ چوار باری هێستر لەو شتە بەنرخەم بۆ بهێنێت کە پێیدەوترێ "رۆن" یان کەرەی پاڵاوتە، کە لە کوردستان بۆن و بەرامەیەکی نایابی هەیە و چێژی تا بڵێی بەتامە و کەس لە وەسفکردنیدا قەشمەریی ناکات کە دەڵێت " رۆنەکەی جوانرۆ مەرەکەی لەسەر گوڵی بۆن خۆش لەوەڕاوە."

بەم جۆرە ئەو هۆیانە کەم نین کە تەمەنای ژیانێکی بێ کێشە دەکەم لە هەڵەبجەدا، تا ئەو ماوەیەی دیاریمکردووە بۆ مانەوە. بۆیە هەندێ نەخشە بە بیرمدا دێت کە داینێم پێش گەیشتنی شێخ- ول- ئیسلام و بەر لەوەی خەڵکی بزانێت و ببێتە دوژمنایەتی کاتێ ئەو سەرسامی و گومانی خۆی دەربخات.

تاکە شتێك کە بتوانم بیری لێ بکەمەوە بچم بە بێدەنگی بیبینم، بڵێم کە خەریك بوو بچم بۆ دیدەنیکردنی بیارە، کە ئێستا شوێنێکی باوە بۆ گەشتوگوزار و زۆر جار بە گەشتوگوزار دەوترێت زیارەت- حەج. چەند رۆژێکم پێچوو تا بکەومە سەر ئەو ئاراستەیە، چونکە نە دەمویست پەلەبکەم

و نە زووتر لەوەی پێویستە بچم و لە هەمان کاتدا ڕۆژەکە بە بێ ئیشوکار تێدەپەڕی، لە دیوەخانەکانی عادیلە خانم و تاهیر بەگدا ئامادەدەبووم و لەگەڵ مەنسووری مەسیحیدا پاش نیوەڕوان درەنگ پیاسەماندەکرد بۆ ناو باخێك لە دەرەوە، کە چوارمەشقی لەناو گیاکەدا دادەنیشت و بوتڵێکی بچووکی لە گیرفانی دەردەهێنا، عەرەقەکەی بە مەزەی چەرەسەوە یان ناوکە کاڵەکەوە دەخواردەوە، کە ئەو خواردنەوەیە لە ئێراندا باوە. هەوڵێکی زۆری لە گەڵمدا تا لەگەڵیا بخۆمەوە، بە دڵنیاییەوە بێ هیوابوو کە بە تەنیا بخواتەوە، بەڵام من نەمدەویست هیچ کەناڵێك بکەمەوە لەبارەی بیروباوەڕی ئیسلامیمەوە، کە لەوانەیە ببێت بە قسە و قسەڵۆك.

کاتێ ئەوەم لای حەمە باسکرد کە دەمەوێت شێخ- ول- ئیسلام ببینم، تا ڕادەیەك حەپەسا و زۆر بریندار بوو چونکە من پێینالێم کارم چییە، ئەوە ونکردنی بڕوایە وەك ئەو وتی کە دەبووایە لەنێوانی گەورە و خزمەتکارەکەیدا ڕوینەدایە، کە دواجار پێچەوانە دەبێتەوە لەسەر سەلامەتی ئەوی دواییان. بۆیە بە نهێنیەکی گەورەوە وابەستەمکرد و پێموت کە شێخ- ول- ئیسلام پارەی منی لەلایە و من دەچم هەوڵدەدەم لێی بسێنمەوە، بەڵام نامەوێت چاوەڕێکەم تا بێت بۆ ئێرە، وەك پیاوێکی میزاژی و سروشتێکی ئاڵۆزی هەیە و لەوانەیە دووچاری ئازارم بکات، ئەگەر قەرزارەکەی بینی بەر دەرگاکەی پێگرتووە. ئەوەش دەنگی هەستی دروستی کوردە و حەمە پێشوازی لە هۆکارەکەم کرد و ئامۆژگاری کردم کە چوار کەللە شەکر بکڕم وەك دیاری بۆ شێخەکە، چونکە نەشیاوە پیاو بە دەستی بەتاڵ بچێت بۆ لای کەسێکی وەها. بەیانیەکی خۆش، هێسترێکمان بەکرێ گرت بە چوار قڕان، یان (یەك شلنگ و هەشت پێنس)، چوار کەللە شەکرمان خستە ناو خورجی زینەکەوە و نان و جگەرەی ئاساییان بۆ قوتی ڕێگا هەڵگرت. ڕێگاکە دەکەوتە ڕۆژهەڵاتی هەڵەبجەوە، بەرەو دیوارە مەزنەکەی هەورامان و لەسەر بنکەی بەرزاییەکانی باشووری شارەزوور. بۆ ماوەی نیو سەعات بە درێژی ڕێگایەکی تەختدا تێپەڕین، بەلای چەپماندا بەناو نزماییەکی گەورەدا ڕوانیمان، بیرمدەکردەوە کە ئەم دۆڵەی ناو ئەم پشتێنە گردەی دەشتێك کە دەبێت ئەنەوشیروانی دادپەروەر فرمانڕەوایی خاکەکەی کردبێت، باخەکان و شارۆچکەکان داپۆشیووە و هێشتا هەر دیارە. بۆ باکور، لە مەودایەکی شیندا کە بەم نزیکانە تیشکی بەتینی خۆر لەناویدەبات، کۆمەڵە شاخەکانی ئەزمڕ لە پشتی سلێمانیەوە چین بە چین بەرزدەبێتەوە، کە دوکەڵێکی شین لە ئەنجامی سوتاندنی پوش و پەڵاشەوە بەرزدەبێتەوە بۆ خۆر، وەك سەلماندنی بوونی ئاینێکی کۆنی زەردەشت، کە ئاگرەکانی لەسەر لوتکەکانی هەمان چیا کرابوونەوە، فرمانێکی وەفادارانە لەلایەن مرۆڤەوە

# دزییەك

بیرچۆتەوە و لەلایەن سروشتەوە درێژەی پێدراوە. ڕێگاکە بەناو ئاوایی عەنەبدا تێدەپەڕی، لەوێدا لەژێر باخە چنارێکدا کۆمەڵێك کورد لە تەنیشت ئەستێلێکی گەورە کە جۆگەیەك تێیدا بلقیدەکرد جگەرەی بەیانیان دەکێشا. لەوێدا پیاوێکی بەساڵاچوو هاتە لامان و بە تورکی بەخێرهاتنی کردین، پرسی ئێمە بۆ کوێ دەچین و کوردی نەدەزانی و وتی منیش وەك ئێوە دەچم بۆ بیارە بۆ زیارەتی شێخ. ئەو خەڵکی ڕۆمانیایە و لەژێر سەرپەرشتی روسیدا بوو. بەپێ چووە بۆ مەککە، ئینجا بۆ دیمەشق و بەغدا. ئێستاش هاتووە بۆ کوردستان و سەری لە هەموو مەرقەدێکی بچووك و شوێنە پیرۆزەکان داوە، دوای ئەوەش دوبارە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆمانیا.

ناوەکەم کە لەناو فارسەوە هاتووە- غولام حوسەین- بۆ ئەوانی تر کەمێ کێشە دروستدەکات بەتایبەتی یەکەم وشە، بۆیە بۆ خۆی دەگونجێنێت و بانگیکردم حوسەین ئەفەندی. بە ڕێی خۆماندا سەرکەوتینە سەر ژمارەیەك گردۆڵکەی یەك لەدوای یەك، تا لە دۆڵێکی بچووکدا گەیشتینە چەم و درەختێك. لەوێدا بۆ ماوەیەك ماینەوە و ئەو نانەی پێمانبوو بەشمانکرد، ژەمێکی هەرزانبەهامان خوارد. پیاوە بەساڵاچووەکە لێرەوە زیاتر دۆستانەیە و لە پاداشتی ئەو تۆزە پەنیرەی من دامێ، چوار نوشتەی بچووکی چاوەزاری دا بە من و حەمە، کاغەزی نوشتکراو لە سێگۆشەی قوماشدا هەڵدووورابوو. ئەوانەی لە سلێمانی لەجۆرێ لە کەسانی ئاینی کڕیبوو، کە سەفەریکرد و وتی دەیانپارێزم و هەندێ جار دانەیەکی دەفرۆشم بە گوندیەك، یان لە جیاتی خواردن یان شوێنی حەوانەوەی شەوێك. حەمە، کە وایدەزانی لە خزمەتی پیاوێکی زۆر باشدایە، نوشتەکانی بە مەمنونیەوە وەرگرت کە خاڵی نەبوو لە سادەو ساکارییەکی بەرچاوی کوردێکی سادە وەك ئەوەی لە پەیوەندیدایە لەگەڵ بازرگانی ئاییندا. دوای ئەوەی پشوماندا گەشتەکەمان دەسپێکردەوە و نەخشەی نزیکبوونەمان لە دیواری شاخە مەزنەکەوە کێشا و بە سەر بەرزاییەکاندا تێپەڕین کە لەگەڵ چوونەپێشەوەماندا گەورە و گەورەتر دەبوون، شۆڕبوونەوە بۆ هەندێ لە دۆڵەکان تا ڕادەیەك تەواو لێژە. لەسەر بەرزاییەکە کۆمەڵێکی کەم خەڵکمان بینی، چوار سەرباز، بارچاوشێك و وڵاخدارێك. لە نەریتی گومانکرد لە کوردستاندا پرسییانکرد بۆ کوێ دەچن و خۆیان ئاشکراکرد بە شێوەزارەکەیان وەك تورکومانی کەرکوك. دوای بەخێرهاتن ئێمە تێپەڕین و هەر یەکە شۆڕبوونەوە بۆ دۆڵێکی جیا، کاتێ کە گوللەیەك شریخەیکرد بە لاماندا و بینیمان یەکێ لە سەربازەکان

# بیارە

بەخێرایی بەرەو لای ئێمە رادەکات، ئێمە خۆمان چەکێکی بەرگریکردنمان پێنەبوو، نەشماندەتوانی هەڵبێین، خۆمان دایە پاڵ هێسترەکەمان و ئەو دەیتوانی راستەوخۆ بچێتە سەر لای گردەکە. بۆیە راوەستاین و ئەویش بە راکردن هات، بێ ئەوەی یەك قسە بکات جڵەوەی ولاخەکەی منی گرت و بە دەستەکەی دی کەوتە پشکنینی گیرفانەکانم. ئەوەی دۆزییەوە سەعاتێك و بیست قران بوو، بەدڵنیاییەوە زۆر نییە، بەڵام بەسبوو بۆ هەژاندنی هەوڵی بەرگریکردن لەسەر خۆم و بەشەکەی حەمەش. ئەوە دزەکەی تورەکرد، یان خەریك بوو تورەبێت، چونکە خەنجەرە درێژەکەی هەڵکێشا و دای لە باڵم و بە خراپی برینداریکرد. ئینجا قۆناغە تفەنگێکی بە توندی دا بە لوتی حەمەدا. لە هەمان کاتدا پیرەی رۆمانی هاواری خوای دەکرد.

ئیدی تورەکەی زینەکەی بینی، بەڵام لەلایەن پیرە پیاوەوە پێیوترا کە ئەوە شەکرە و شێخی بیارە داوایکردووە، کەسێکی زۆر کاریگەرە کە تەنانەت سەربازێك ناتوانێ سەرپێچی بکات، بۆیە جێیهێشت و دەستیکرد بە گەڕانەوە. حەمە نەیدیبوو کە سەعاتەکەی بردووە، کە من پێم وت، رایکرد بەدوای سەربازەکەدا، کە ئێستا ماوەیەك دوورکەوتبۆوە. گوێی لێبوو دەهات، دزەکە وەستا و حەمەش بە شارەزایی راستەقینەی کوردانەوە خۆی هەڵدا بۆی و دای بە زەویدا، بەبێ ئەوەی حساب بۆ خەنجەرەکە بکات لە کێلانەکەدا. نەمدەتوانی گوێم لێبێت کە چی پێوت، بەڵام ئەو سووربوو لەگەڵ سەربازەکەدا و دوای هەندێ، سەعاتەکە و پارەکەی لێ سەندەوە و گەڕایەوە، کاتێ دزەکە خۆی دا بە زەویدا و نیشانەیەکی وردی گرتەوە و تەقەیکرد. گوللەکە بەسەر سەریدا تێپەڕی و کەمێ لە کڵاوە قوچەکەی گرت، بەڵام حەمە نە رەوتی خۆی تێکدا و نە بەهیچ شێوەیەکیش شڵەژا. پیاوە پیرەکە کەڵکی لە رووداوەکە وەرگرت تا رابکاتە سەر بەرزایی گردەکە و ئیدی دیارنەبوو، کە حەمە هاتەوە ئێمەش کەوتینە سەر رێی خۆمان، سەربازەکەش لە لاکەی تری دۆڵەکەوە تەماشای دەکردین. لەسەر یاڵەکە چووین بەسەر پیرە دەروێشدا، لەپاڵ بەردێکدا دانیشتووە، زۆر شڵەژاوە، بەڵام زۆری پێخۆشبوو ئێمەی بینیەوە کە جگە لە برینداری تیغەکە شتێکی ئەوتۆ نەبوو. ئێمە ئێستا وابەستەی ئەو کاروبارەین و کاتێ حەمە تا رادەیەك خوێنی لووتی گیرسایەوە، کەوتینەوە رێ.

## شێخ- ول- ئیسلام

دوای سەعاتێکی دی گەیشتینە ئەو شوێنەی کە دیواری چیاکە لەبەر دەماندا بەرزبۆوە، بۆ ئەوێ کە دەمانتوانی کێڵگەیەکی گەورەی بەفر ببینین و پێچمانکردەوە بۆ لای راست تا بە تەسکایی دۆڵەکەدا سەرکەوتین، یان نزمایییەك، لە داوێنەوە. چەمێك لەوێدا دێتە خوارەوە و هەردوو بەرەکەی بەچڕی بە باخ و درەختی میوە داپۆشراوە. ڕێچکەیەکی بچووك بەناو ئەوەدا دەڕوات و وردە وردە سەرکەوتین، پلەی گەرما تا بەرزبینەوە دادەبەزێت. هەرکە توزێ ڕۆشتین ژەمێکی باش لە تووی ڕەش و سپیمان لە درەختەکە کردەوە، ئەوەی کە تازە پێگەیشتبوو. چەند میلێك سەرکەوتن دۆڵی تەسك و قووڵمان پێشهات، ئەگەر ڕێك بڕۆیت بەرەو چیای هەورامان و ئێمەش پێچماکردەوە بۆی. لێرەدا درەختەکان چڕترە و باخەکان، کە بە لاپاڵی گردەکاندا هاتۆتە خوارەوە بە دیواری چینە بەرد بەش بەش کراون، تولەڕێکان لە نێوانیاندا زۆرجار جۆگەلەیە کە سەرەوخوار دەڕوات تا تێکەڵ بە جۆگە سەرەکیەکە بێت.

لەناو قوڕەکەدا پەلەقاژێمان دەکرد و لە شوێنە زۆر خەستەکاندا، بۆ ماوەی سەعاتێك یان نزیکەی، ئینجا بە پردێکی دروستکراو لە کۆتەرەی درەخت بەسەر چەمەکەدا دەپەڕینەوە، گەیشتینە لای خانویەکی بەردین کە لە لایەکی گردەکەدا کراوە. لە سەرومانەوە دۆڵەکە هێشتا تەسکدەبۆوە، گوندێکی بچووك بەلایەکیدا هەڵواسراوە و لەسەرو ئەوەوە چارەکە سەعاتێك دوور نەبوو، ئیدی بوو بە هێڵی لاپاڵی چیایەکی گەورە _ و خاکی ئێران. نەمانتوانی هیچ ببینین لە ماڵەکە، بەڵام دیواری بەردی ئەستور بەسەرمانەوەیە و دەبووایە لە دەرگا بچووکەکەی بۆیکراوە هاوارمان بکردایە و حەمە بانگیکرد میوانی شێخ- ول- ئیسلام، ئیدی ڕێدراین بەسەر قاڵدرمە بەردەکاندا سەرکەوتین. خۆمان لەبەر هەیوانێکی فراواندا بینیەوە، دیواری پاراستنەکەی دەقیقەیەك لەوەبەر بەسەرمانەوە بوو. پیاتێپەڕین و چووین بۆ ئەستێرکێکی مەرمەڕی زبر لە ڕێچکەکەدا جێگیرکراوە، کە لەهەمان بەردە و بینیمان لە قەراغەکەیدا هەموو پێڵاوەکان لەپێ داکەنراوە، ئێمەش بە هەمان شێوە و چووینە ناو ژوورێکی بچووکەوە لە کۆتایی ماڵەکەدا. لەوپەڕی ئەمەوە یەکەیەکی بچووکتر کرایەوە و پێشانیاندام و سڵاوەکەم "سەلامون عەلەیکوم" بەر گوێی دانیشتوی ژوورەکە کەوت کە شێخ- ول- ئیسلامەوە لەلای پەنجەرەیەکی بچووکەوە بە چوارمەشقی دانیشتووە جگەرە دەکێشێت. وەڵامی سڵاوەکەی دامەوە و فەرمووی لێکردم دابنیشم، ئینجا ناسیمیەوە، هاواریکرد،" تۆی، ئەوە تۆی!"

دانیشتم و دواتر هەواڵی تەندروستییم پرسی، کە بەشێوەیەکی وشك وەڵامیدایەوە، بەردەوام راناوی کەسی دووەمی تاکی بەکاردەبرد، کە شێوازێکی گونجاو نییە تا رادەیەك لە مامەڵەکردن لەگەڵ میواندا و ئیدی گۆڕی بە بێدەنگیەك، کە دەرکەوتنی حەمە بە چوار کەللە شەکرەکەوە بێدەنگیەکەی رەوانەوە، لای نزیکی دەرگاکەوە پێکەوە لەگەڵ خورجەکەدا داینا.

شێخ- ول- ئیسلام پرسی "ئەوە چیە؟" و حەمە وەڵامیدایەوە، تۆزێ بە ئاوازێکی ناڕەحەتی، ئەوانەمان وەك دیاری بۆ پێشوازیت هێناوە، نرخێکی ئەوتۆشی نییە، بەڵام شێخەکە ئاوڕی بۆ من دایەوە و لەگەڵ روویەکی گرژی قورسدا رەقترین شتی شیاوی وت: " بیبەرەوە بۆ ئەو شوێنەی لێوەی هاتووە، خۆتان بەکاریبێنن، لە هەڵەبجە بیفرۆشن، من پێویستم بە شتی وەها نییە، نە دۆستایەتیشمان هەیە لەگەڵ ئەو شێوازە ناسکەدا."

جارێکی تر لە حەمەی پرسی:

"ناوی ئاغاکەت چییە؟"

"ئاغا میرزا غولام حسێن شیرازی،" کابرای هەژار وەڵامیدایەوە، سەرسوڕمان و تۆقین لە هەموو هێڵێکی روخساری مەزنیدا دەرکەوت.

"ئەی تۆ ناوت چییە؟"

"حەمە."

"خەڵکی کوێی؟"

"موکریان، سەوج بولاق- سابلاخ،" و لێرە ئەو کەمێ لغاوکراوە، وەك ئەوەی پیاوێك بێت لە تیرەیەکی مەزن.

لە منی پرسی، " لەکوێ دۆزیوتەتەوە؟"

وەڵامدایەوە، "لە هەڵەبجە."

عەبایەکی نوێ، یان لە توکی وشترم لەبەردابوو، ئەوەش لە دوایدا سەرنجی راکێشا:

" ئەوە وەك نیشانەی رێزگرتن لەلایەن عادیلە خانمەوە پێشکەشتکراوە؟" ئەوەی بە توڕەییەوە پرسی.

"نەء" حەمە وەڵامی بۆ من دایەوە، توڕەیی هەڵچوو،" گەورەم پیاوەتی کەس قبوڵ ناکات و هەرچیەك بە دەستبێنێت خۆی پارەیەکی باشی ئێرانی پێدەدات."

"جارێکی تریش دەڵێم، ئەوانە دوورخەنەوە، شەکرم ناوێت، بیانبە و تۆش"- بە خزمەتکارەکەی خۆی- برۆ دەرەوە، ئەوە پەیوەندی بە تۆوە چییە؟"
هێشتا حەمە نەیدەویست شەکرەکە هەڵگرێتەوە، تا من ئاوڕم بۆ دایەوە و پێموت بیبە و بیدە بە هەژاران، بە واتایەکی باو ئەوەیە کە هیچ کەسێك لە نەویستنی دیاری کەڵك وەرناگرێت.
خزمەتکارەکان لە ژوورەکە چوونە دەرەوە و شێخ- ول- ئیسلام ئاوڕی بۆ دامەوە و دەستیکردەوە بە تێبینیە بۆگەنەکانی:
" کەواتە تۆ ئەو پیاوە ئینگلیزەی ئەستەنبووڵیت، چۆن ئەورووپیەك بەم جلوبەرگەوە رێی خۆی لەوێوە بۆ ئێرە دۆزیوەتەوە، بێ سەروکاریکردن، بە کوردی دەدوێت و فارسیش وەك زمانی خۆی بەکاردێنێ؟ من کاتێ لە ئەستەنبوڵ بووم تۆ لەوێ میوانم بووی نەمدەتوانی هیچ بڵێم، لەگەڵ ئەوەشدا کە دەمزانی چۆن و چی بوویت، بەڵام لێرە دەتوانم بە سەربەستی بدوێم، چونکە ئێمە لێرە وەك یەك بێگانەین. ئەمەش ئەوە روونەدەکاتەوە کە بۆچی من ناتوانم دیاری لە تۆ قبوڵ بکەم، من ناخوازم بێ ئەدەبی بە تۆ بکەم، بەڵام من لێرە لە داڵدەی دەروێشاندا دەژیم، کە سیستمی خواردنمان تەنیا نان و ماستە، نە هیچ چێژێکیان لێدەبینم، لەگەڵ ئەوەشدا من میوانم لە ماڵێکی تردا ناتوانم دیاری لە هیچ کەس وەربگرم. هەرچەند من ناحەزیەکم بەرامبەر تۆ نییە، سەرەڕای ئەوەی تەفرەت خواردووە و بە هەڵە هاتوویت بۆ لام، لێرەش هەروەها لەوانەیە داوات لێبکەم راستگۆییت لەگەڵم و پێمبڵێ تۆ کێی و چیت، دوای بەدواداچوونی تایبەتیت لە ئەستەنبوڵ لەبارەی ئیشوکارەوە، ئیشەکەت لێرە لەسەر سنوورە."
"ئەوە ئاشکرایە" من وەڵامدایەوە،" لەوەی دەیلێیت، تۆ لە ئەستەنبوڵ گومانت دەبرد کە من فارس بم و مەزەندەکەت راستبووە و منیش وەك بەڵگەیەك نامەکانی ماوە دوور و درێژەکەی کە لە شیرازی زێدی خۆمەوە بۆم هاتووە دەتدەمێ کە قۆناغێکی درێژ دەگرێتەوە." تەماشایکرد و بۆی گەڕانمەوە.
"بەڵێ،" وتی، " ئەوە هەمووی بە رووکەش زۆر جوانە، بەڵام من چۆن بزانم کە ئەوانە دروستکراو نییە. بەهەرحاڵ، چی تۆی هێناوە بۆ ئێرە تا ببینیت؟
"کاتێ لە ئەستەنبوڵ بووم،" وتم، " لەوێ تۆ بەبەزەیی بووی لەگەڵم و رۆژانی تاریکمت لەوێ رۆشنکردەوە، ئەوە شتێکی ئاساییە کە بیستم ئێستا تۆ لێرەی دەبێت بێم بۆ دیدەنیت.

# لەژێر گوماندا

"نا، نا،" ئەو وەلامیدایەوە، لەگەڵ هەوای پیاوێك كە بێ هیوایە لە دەرخستنی راستیەكە،" ئەوە نەبوو، پێم بڵێ ئەی چی بوو. بیركەرەوە، تۆ خۆت خستبووە ئاستێكی نەگونجاوەوە. ئەگەر من حەزكەم، ببم بە پیاوێكی ئایینی و پێگەیەكی داوەریم هەبێت، دەبە هۆی ئەوەی تۆ دەبێ تاقیكرێیتەوە و ئەگەر راستی وەك ئەوە بێت كە من بەگومانم، بەگوێرەی تۆوە زۆر نالەباردەبێت. ئیدی بێسوودە پێم بڵێیت من ئەمەم یا ئەوەم، چونكە بەشێوەیەكی خراپ ئەوسا یان ئێستا درۆتكردووە. لە ئەستەنبوڵ بەلای منەوە تۆ ئەوروپایی نەبووی و سەرەتا هەستمدەكرد كورد بیت، لەبەر هیچ، بەلام وەك زانینی ناوەكانی شوێنەكان و تیرەكان وەك ئەوەی دەتزانی، بەلام تۆ وەك فارسێك قسەت بە فارسی دەكرد و نەك وەكو كوردێك- وەك ئێستای من. دوای ئەوە گومانمدەبرد كە هەندێ هاندەری نهێنیت ئەوسا و ئێستاش هەبێت، ناتوانی ببینیت كە بوونی تۆ چۆن گۆمانلێكراو دێتە بەرچاو؟ بە گوێرەی نامەكانی تۆوە، ئایا راستە یان راست نییە. یەك شت دەمێنێتەوە، تۆ خەلكی ئێرانی، كە من هەست بەدڵنیایی دەكەم و ئێستا ئەگەر بتەوێ من بكەی بە هاورێی خۆت، پێمبڵێ چیت كردووە كە بۆتە هۆی دەركردنت لە ئێران. كورم واز لە هەموو درۆكان بهێنە و پابەندبە بە راستیەكەوە."

نەمدەتوانی هیچ بكەم جگە لەوەی گاڵتە بە گومانەكەی بكەم، بۆیە باسی ئەوەم كرد كە چۆن لە تاران لە سەردەمی محەمەد عەلی پاشادا تێكەلاوی سیاسەت بووم و هەڵهاتم بۆ لەندەن. هەرچەند نازانم باوەری بەوە كرد، یان نا، بەلام لەوە دەچوو پەسەندیكردبێت.

" بەو جۆرە هەڵهاتی تا دەربازبیت لە بەندكردن یان مەرگ كە چارەنووسی هەندێ لە هاوولاتی ئێوە بوو لەو كاتەدا"، بە زەردەخەنەیەكەوە ئەوەی وت.

وتم، "بەڵێ" و ناتوانی بەرگریبكەیت و دانی بۆ رۆكەیت زیادەی بنێتە سەر،" وەك خۆت لە سنەوە ماوەیەكی درێژ نییە."

"سەگەكان" هاواریكرد، " فارسەكان، لەگەڵ زمانی لوسیاندا، تۆش یەكێكی لەو نەژادە نەفرەتیە، چونكە زمانت هەیە، چۆن تەمەننادەكەم هەموو ئەو فارسانە یەكتری سەرببڕن لەسەر شتە هیچ و پوچەكانیان."

"باشە،" وەڵامدایەوە، "وەك ئەوە بیروباوەڕتە لەبارەی ئێمەوە، پێویست ناکات هیچ دەربڕینێك بەیانبکەیت و من هیچ ناڵێم، ئەگەر تۆ لێم بپرسیت دەبێت ئەوەی دەیڵێم پەسەندیکەیت، یان نابێ لەبارەیانەوە بپرسیت.

من بەرپەرچی مافی لێپرسینەوەت دەکەم، من نە تورکم و نە هاووڵاتیشم، وەکو هەموو مرۆڤێکی وڵاتەکەم شیعەم و بڕایەوە. هاتم پەیوەندیت پێوە بکەم، خۆم بینییەوە گومانلێکراو و هاووڵاتیانیشم سوکایەتی پێکرا!"

وتی، "ئەوە زۆر باشە،" بەڵام تۆ نازانی لەم بارودۆخەدا، لە تەکیێی دەروێشان و کەسە ئایینیەکاندا، من گەر تەنیا بەوێ بڵێم کە من بڕوام وایە تۆ ئەرمەنیت یان تەنانەت شیعەی، ئەوا تۆ بە زیندویی ناگەیتە کۆتایی دۆڵەکە.

وەك ئەوە، من بڕوام بە پێناسنامەکەت هەیە و پێویست ناکات کەس باسی بکات. من نازانم تۆ چۆن بوونی خۆت لێرەدا لێکدەدەیتەوە و نابێ پرسیاربکەم، لیمگەڕێ با تەنیا ئەوەت پێبڵێم، کە ئەگەر تۆ داوای پیاوەتی لە بنەماڵەی هەڵەبجە دەکەیت من بەرهەڵستیت دەکەم، لەبەرئەوە گشت گومانێکم هەیە. لێمانگەڕێ ئێستا با واز لەو بابەتە بێنین. تا تۆ لە هەڵەبجەدا بمێنیتەوە من دەبێ دۆستانە مامەڵەت بکەم، چونکە ئێمە هەردووکمان بێگانەین و هەریەکەمان پێویستە لە خاکی غەریبیدا یارمەتی یەکتر بدەین. ئەگەر دەتەوێ شەو لێرە بمێنیتەوە، ئەوە بکە، بەختیاردەبم کە میواندارێکی تایبەتی بە ئەرك هەستم. ڕێگەی گەڕانەوە بۆ هەڵەبجە دوورە و تۆ لەوانەیە تا خۆرئاوابوونیش نەگەیت."

"نەخێر،" من وتم، " دەگەڕێمەوە و هیوادارم بەسەلامەتتر بگەڕێمەوە وەك لەوەی کە لەوێوە هاتم، چونکە لە ڕێگەی هاتنم بۆ ئێرە لەلایەن سەربازێکی تورکەوە رووتکرامەوە."

بانگی خزمەتکارەکەی کرد و پێیوت خواردن بێنە، سووربوو لەسەر ئەوەی یەك جار نانی لەگەڵ بخۆم، منیش دەستم نەنا بە روویەوە. چونکە ئەگەر بە ڕاستی کورد بێت، ئەرکی میوانداری دەخاتە سەر شانی خۆی و لە ڕاستیدا بە نانخواردنی من لە ماڵەکەیدا هەست بە بار سوکی دەکات چەند هەست بە دوژمنایەتیش بکات. بۆیە کاتێ ژەمە خواردنێکی سادەیان هێنا، کە بریتی بوو لە نان و ماست، لەگەڵیدا دانیشتم، لە هەمان کەمۆڵە هەڵماندەگۆزی. داوای لێبووردنیکرد لە سادەیی ژەمە خواردنەکە، وتی لێرە ئەوە خواردنمانە و دوای ئەوەی تەواوبوو ڕێیدام خواحافیزی بکەم. لەبەر

دەمیدا راوەستام، دوعاخوازی دووردرێژ بە وشەی فارسی لەگەڵدا دەکەم و ئەویش دەستەکانی خستە ناو دەستی خۆیەوە و بۆ ماوەیەك روانیە ناو چاوەکانم، وەك ئەوەی لەوێدا راستی بەدیبکات.
ئینجا زەردەخەنەیەکی کرد و وتی، " کوڕم، رێگاکانی جیهان سەختە و بێگانەیەك کە بێت بۆ شوێنێکی نادیار ئازایە، وەك تۆ کردووتە. ئەوەیە لە تۆدا کە من حەزم لێیەتی، چونکە تۆ ناترسیت، بەڵام تۆ درۆدەکەیت، وەکو هەموو خەڵکی وڵاتەکەی خۆت. من بەداخم بۆت، بەڵێ من بەڕاستی بۆت غەمگین بووم، هەرزەکاری هەژار!" و لەگەڵ ئەوەشدا لێمگەڕا برۆم.
لە قەراغەکەدا، بەهەرحاڵ، بە دەنگە نەرمەکەی بانگیکردمەوە، فارسی بەکارنەدەهێنا و منیش لەبەر دەرگاکەدا وەستام. چوو بۆ لای بەرامبەری ژوورەکە و خێرا گەڕایەوە و برێ پارەی کەمی خستە ناو دەستمەوە، وتی، " ئەوە وەرگرە، تۆ لە سنووری ئێمەدا رووتکراویتەوە و ئێمە بە هەر شێوەیەك بێت دەتوانین بیگەڕێنینەوە."
"بەڵام بۆ من نا،" من وتم، " تۆ دیاری وەرناگریت هەوڵدەدەی دیاری بدەیت؟ نە، من نە برسیم و نە دەگەڕێم بەدوای پیاوەتی هیچ کەسێکدا، نامەوێت، ئەوە لەباتی کەللە شەکرەکانە." پیاوە ئاینیەکە زەردەخەنە گرتی و دای بە شانمدا.
" تاقیکردنەوەیەکی باشە، تاقیکردنەوەیەکی باشە،" هاواریکرد، " فارسی، ئای ! فارسی ئێرانی، شکۆت رێگیریت دەکات وەریگریت. تۆ خەڵکی باشووری و وەك تارانی نیت ـ کە قڕانێك لە بکوژی ژنەکەی وەردەگرێت لەبەرئەوەی پارەیە. ئێستا بۆ منی بدە بە هەژاران و ئێمە هەردووکمان پاداشت وەردەگرین، بیر لەوە مەکەرەوە کە من بۆچی داومە."
حەمەم بانگکرد، کە باڵا کەڵەگەتەکەیم لە گۆڕەپانەکەدا بەدیکرد و پارەکەم لەبەردەمی شێخەکەدا دایە، پێموت بیبەخشەرەوە بەسەر هەژاراندا و بەو جۆرە جارێکی تریش گۆڵمکردەوە، چونکە من چاوبەستە کۆنەکەم دەزانی، هەوڵیدا من پارەکە وەربگرم و بچمەوە سەر چاوبرسێتی بنەچەی خۆم، لەگەڵ باوەڕپێکردندا پێشانیدام کە هێزێکی پێدام بۆ پاراستنی نەختی. بینی کە من پارەی نەختیم بینیبوو و بە بێدەنگی زەردەخەیەکی کرد، بە شێوەیەکی ناوێزە تەماشای کردم و ئیدی چاوەڕێی سەرنجی زیاترم نەکرد و جێمهێشت.
دیسانەوە لە دەرەوە سواری هێسترەکەم بوومەوە و بەتاڵبوونی خورجەکە بیری هێنامەوە کە ئەو شەکرەکەی وەرنەگرت، لە حەمەم پرسی ئەی چی لێکردووە.

## گەڕانەوەی عوسمان پاشا

"بۆچی،"ئەو وتی،" کاتێ سەگەکە نەیویست، بردم بۆ قاوەخانەیەك لێرە و خۆم وا دەرخست کە لە هەڵەبجەوە بۆ فرۆشتن هێناومە. بە حەڤدە قران کڕییان و ئەوەش پارەکەیە" و قڕانەکانی لەناو دەستیدا پیشاندام و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی بەوەی کە لە کۆتاییدا قازانجی کردووە. هێشتا ئەو دەکولا لەگەڵ توڕەیی ئەو پێشوازیەی کە لە شێخ- ول- ئیسلامم بینی و دڵی لای من بوو بۆ ئەوەی کاتێ خۆم بەو جۆرە کەسانەوە بەسەردەبەم، ئامۆژگاریکردم لەجیاتی ئەوەی بە توڕەیی ئازاریکێشیت واز لەو قەرزە بهێنە کە نەدراوەتەوە- منیش پێموت ئەوە بە خۆشحاڵیەوە وەك کەمێك ئامۆژگاری وەردەگرم.

کاتێ لە ئێوارەدا گەیشتمە هەڵەبجە، زانیم عوسمان پاشا لەگەڵ هەموو دەستوپێوەندەکەیدا لە سلێمانیەوە گەیشتووە و هەروەها شێخ عەلی تەوێڵەش بەخۆی و نمایشێکی گەورەوە لە دواکەوتووانە و لە گوڵعەنبەرەوە هاتوون و لەوێش دەمانەوە. ئیدی شوێن نەماوە و منیش کامەرانم کە دوو رۆژ لەوەبەر لە ژووری پێشوازیەکەی عادیلە خانمەوە گواستمەوە بۆ ژوورێکی ژێرەوە، کە لە بەرهەیوانی پشتەوە ژیانێکی تەنیای ئاسودە دەژیام، بەبێ کەندوکۆسپ لەلایەن هەرکەسێکەوە جگە لە خەڵکەکانی عادیلە خانم کە ئەرکە رازگریەکانیان بە شێوەیەکی رێکوپێك لە کاتی خۆیدا بۆ دەهێنام، کە تا رادەیەك ئێستا بە رێکی خۆم بۆی دەبەمەوە.

تا ئەو کاتە تەمەننای ئەوەم دەکرد، کە بە زووترین کات بتوانم لە هەڵەبجە دەربازم، چونکە لەوێ شتێیەك نەبوو رزگارمکات لەوەی کە نووسەرێکی فارسی بم بۆ عادیلە خانم و پاشا، کە بەتایبەتی ئەوەم نەدەویست بیکەم، چونکە بە تێپەڕبوونی کات زیاتر و زیاتر کێشە دەبوو بۆ دەرچوون. بەدواداچوونمکرد بۆ توانای بەکاربردنی گۆشەیەك لە کاری "رۆن" و تا رادەیەك سەرکەوتوبووم و ئێستا بەشێکی زۆری ئەو کاڵایەم لە ناوچەکەدا بەدەستهێناوە. هەرچەند هێشتا وەرنەگیراوە، بۆیە مەنسووری مەسیحیم کرد بە بریکاری خۆم و دەستمکرد بە گەڕانێکی تازە بۆ شوێنی بەگەرخستنی نوێ لە شوێنی تر. کاتێ ئارەزووی رۆشتنی خۆم بۆ عادیلە خانم ئاشکراکرد، بە دەنگی بەرز قیژاندی، هەرچۆن تاهیر بەگیش و سوێندی خوارد کە ناهێڵێت بڕۆم. دەیویست فارسی بە دوو کوڕە لاوە دەنگ زلە دوانزە و شانزە ساڵانەکەی بڵێم- کە هەرگیز رۆژێك لە ماڵەوە ئاسودە نەبوون، هەمیشە یان بەسەر ئەسپەوە یان لە چیاکاندا بوون.

# جێهێشتنی هەڵەبجە

ئینجا تاهیر بەگ، هەروەها ئەویش لە جێی خۆیەوە کوسپ بوو لەرێگاکەدا. وەك دوا هەوڵ کە عادیلە خانم دەیویست بمهێڵێتەوە بە مەبەستی رێکەوتنێکی پێشوکار لەگەڵ عوسمان پاشادا، چەشەکردنێك کە هەروەها ئەویش سەرنەکەوتبوو، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر باشە، لەبەرئەوەی نەمدەتوانی لێی رزگاربم بۆ بنیاتنانی بەرپرسیارێتیەك لەلای خۆمەوە بۆ کەسانی تر، کە بەرگریم بکات کاتێ ویستم وڵاتەکە جێبهێڵم. بۆیە هێسترێکم لە کاروانێکدا گرت کە بەم زووانە دەردەچێت بۆ سلێمانی و دەستمکرد بە خواحافیزی لە ناسیاوەکانم. زۆر ئارەزووی رۆشتنم دەکرد، ماوەیەکی کورت لەوەبەر بیرم لە چوون بۆ خانەقین دەکردەوە بۆ کڕینی شەکر بە کۆمەڵ، بە هەمان مەبەست دژی ئەوەش بووم کە لەوانەیە لە سلێمانیدا بمهێڵێتەوە. بەڵام کاروانەکە هەر دوادەکەوت و دوادەکەوت و هەموو بەیانیەك بەڵێندانی دەرچوون لە نیوەڕۆدا دەبوو بە کات بەفیڕۆدانێکی نوێ. لەو کاتەدا شێخ- وڵ- ئیسلام کوتوپڕ دەرکەوت و هات بۆ بینینی من. نەمدەتوانی لە رووی شارستانیەوە وەریگرم و حەمەش بە ئاشکرا سوکایەتی پێکرد، بەڵام ئەوە بە راستی شیاوی پەسەندکردن نەبوو، بۆیە بەوپەڕی خۆپاراستنەوە یەکتریمان بینی. چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد بە میزاژی تۆڵەسەندنەوە ببینم، چونکە ئەو ئێستا بیستوویەتی کە من چۆن هاتوومەتە هەڵەبجە و ئێرەییکردنی- ئەگەر دوژمنایەتیەکەی پاڵی پێوە بنێت بەو هەستەوە- بلێسەی دژایەتی لەوانەیە بکرێتەوە.

بەڵام من تەواو وەك هەنگوین و پڕ بەخەندە بینیم، ئەو هێمن و کەمێ ئارام بوو. بۆچی ئەو هەڵوێستەی وەرگرت من نەمبینیوە، جگە لەوەی کە دەبێ ئەو بە نرخی خۆمەوە منی پەسەندبێت و جەماوەریم بەدیکات، پێشکەشی رای گشتیم کرد. هەرچۆنێك بێت شایانی ئەوە نییە بچێتە ناو ئەو لێکدانەوە و بیردۆزانەوە، وەك ئەوەی کە من دەڕۆشتم و ئەوەم پێوت. دەستبەجێ سەدان بەرهەڵستی راستکردەوە: من لەوانەیە بازرگانیەکی نالەبار لە سلێمانیدا بدۆزمەوە، لەلایەن حوکومەتەوە لەوانەیە سەغڵەتکرێم، دەبێ دووچاری زیان ببیت لەمامەڵەکردن لەگەڵ خەڵکدا تیبینیکراوە لە ئیشوکار و هەڵخەڵەتاندنیاندا، هەرگیز ناتوانم لەناو دانیشتوانێکی ئاوا سەرسەختدا بژیم و بەو شێوەیە بەردەوامبوو، کە من هیچ وەڵامێکم نەدایەوە. هەرچەند حەمە وەڵامێکی دایەوە بە شێوەیەکی بەهێز کاتێ سندوقێکی دەبەست، تا لە دواجاردا پیاوە ئایینیەکە رۆیشت و

منیش رزگاربووم. هەر ئەو چووە دەرەوە ولاٌخدارەکە هاتە ژوورەوە و سوێندیخوارد سبەینێ بەیانی زوو ئەگەر نیوەی شتومەکەکانی جێهێشتووە دەردەچێت. من چەند بارێك "رۆن"م دەبرد بۆ سلێمانی کە نرخیان هەموو پێکەوە نزیکە پەنجا پاوەند بوو، لە پێستەی مەڕدا- هیزەدا بوون. چونکە کەشوهەوا گەرم بوو، رۆنەکە نیمچە شل بووبۆوە، هەروەها دەبێت ئەو هیزەیەی چەورە لەناو گونیەکاندا بیدورینەوە بۆ گواستنەوە. هەر هیزەیەکی خرایە ناو گونیەیەکی زبرەوە و دەمەکەی هەلدٌوورا. ئینجا قەراغی هەر دوو گونیەیەك بە شریتێکی بەهێز هەلدٌوورا و شێوە خورجێك پێکهێنرا، کە دەگونجا بۆ بارکردن لەسەر پشتی هێستر. ئەو کارە تا ماوەیەکی زۆر درەنگی خایاند، کاتێ شێخ- ول- ئیسلام بە پەلە وەك شێت پەیدابوو.

وتی: "وام هەستدەکرد راوێژەکانم سەرکەوتووە،" و بیرمدەکردەوە تۆ بمێنیتەوە، کەچی من ئێستا بیستم کە تۆ بەیانی دەردەچیت. باشتر وایە تۆ لێرە بمێنیتەوە، بۆچی ئارامی و ئاسایش بۆ جەنجالٌی سلێمانی جێدەهێلٌیت؟ ئایا نامێنیتەوە؟ راوێژەکان نابنە هۆکاری رازیبوونت دژی هەلٌچوونی تۆ؟

منیش وتم: "نا" " چونکە من هەر دەڕۆم. من ولاٌخم بەکرێ گرتووە و مەحالٌە بمێنمەوە."

لە کاتێکدا دەدوام، خورجێکی "رۆن"م بەرزدەکردەوە و ئەویش لەدوامەوە وەستاوە. ماوەی دوو یان سێ دەقیقە راوەستا، پاشان مالٌئاوایی کرد و چۆن هات ئاوا بەخێرایی رۆیشت. ولاٌخدارەکە پێیوتین دوای ئەوەی هەولٌێکی زۆری داوە کە بەهەر شێوەیەك بێت واز لە بیری رۆشتن بهێنم، یان ئەو ولاٌخانەی بەکرێتگرتوون نەتاندەمێ.

هۆی چی بوو دەیویست بمهێلٌێتەوە هەرگیز بۆم دەرنەکەوت، تەنانەت حەمەش نەیدەزانی، کە بە ئاسای هۆشیاری ئەوەی هەبوو هۆی هەموو شتێك بزانێت، چارەسەرێ بۆ هەر مەسەلەیەك دادەنێت.

ئیدی سبەی بەیانی زوو هەلٌساین و شتەکانمان لەبەر تیشکی مۆم کۆکردەوە، بردمانە قەراغی هەیوانێکی فراوان، ئینجا خستمانە سەر پشتی هێسترەکان. مەنسوور کە پەسەندیکرد چاودێری ئیشوکارەکانم بکات، هاتە نزیك دەروازەکە و دلٌنیایکردم لە هەولٌدانی لە کارەکانمدا و لەدوایدا تەواو روناکبووبۆوە کە جولاٌین. لە دەروازەی سەرەکیەوە چووینە دەرەوە، حەمە سەرنجی بەلای شێخ- ول- ئیسلامدا برد، کە لەسەربانەکە راوەستاوە، لەناو مالٌی تاهیر بەگدا دەنووست، تەماشای ئێمەی دەکرد. ئیدی هەلٌەبجەمان جێهێشت.

# هەمەوەندێکی تاراوگە

وەك نیشانەی ڕێز یان ئەوپەڕی ڕەوشتیەوە، عادیلە خانم چوار سواری وەك پاسەوان لەگەڵمدا نارد، دووان لە تیرەکەی خۆی لەژێر دەستی پیاوێکی گچکەدا، یەکێکیان ناوی ڕەسوڵ ئەحمەدە، کە لە هەڵەبجەدا بە کەسێکی ئازا و پاك ناسراوە.

سیانەکەی ژێر دەستی پیاوی تێکسمراو و بە هەیبەت بوون، سوارچاکی کوردی باشوورن، لەگەڵ کەوای شۆڕ، کە لەسەر ئەسپەکانیان سواردەبوون تا قولەپێیانی لە تیشکی خۆر دەپاراست. ڕەسوڵ ئەحمەد بە تەنیا پووتی سووری سوارەی ئەم ناوچەیەی لە پێدایە، تێبینی ئەوەم کرد کە یەکێکیان بە شێوە و ڕوخساریدا زۆر هەژارە، ئەسپەکەشی بەڕاستی لەڕە و وەك خۆی هاوئاهەنگیەتی. کونێکی گەورە لە کەواکەی بەریدا بوو، کە قۆناغی تفەنگەکەی لێدەخشا کاتێ لەسەر شان هەڵیگرتووە، چەرمی زینەکەی بەهۆی بەرکەوتنی تفەنگەکەیەوە بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەناو ئەژنۆکانیدا بەداخەوە زیانی پێگەیشتووە. ئەوانە ئەو دوو ئاستەیە کە کورد چەکی تێدا هەڵدەگرێت، یەکەم کاتێ کە بزانێت بۆ ماوەیەکی کورت پێویست نییە، ئامادەسازی دووەم هەڵگرتنی ڕێك لەسەر زینەکە. پێی پەتی، بێ پێڵاوەکانی دەخزانە ناو ئاوزەنگیە ژەنگاویەکانەوە. تفەنگەکەشی لە جۆری "سنایدەر"ی کۆنە، نەك تفەنگی مارتینی گوللەپرژێنی هۆشمەند، وەك ئەوەی ئەوانی دی پێیانە و لەوە دەچێت ڕوخساری پەژاراوی سادە و ساکاری شێوەی کڵۆڵی لە کەلوپەلەکانیدا دەردەکەوت. چەناگەیەکی چوارگۆشەی گەورە و چاوە شینە بچووکەکانی کوردەکانی شوان و هەمەوەندی هەبوو، زۆر کەم لەگەڵ هەر یەکێ لە هاوەڵەکانی دەدوا. جارێك، بەهەرحاڵ، یەکێکیان نوکتەیەکی لەسەر ئەو کرد و سوارەی غەمگین تفەنگی لێهێنایەوە، بەڵام وەك ئەو تەقەیکرد، ڕەسوڵ ئەحمەد چەکی کرد و کەس زیانی پێنەگەیشت، ئەم ڕووداوە لە ئەنجامی گاڵتەیەکی ناخۆشەوە بوو.

بینیم بە تەنیشتمەوە دەڕوات، لەبارەی خۆیەوە لێمپرسی، کاتێ پێیوتم کە ئەو لە تیرەی هەمەوەندە و جاف نییە، هەرچەندە لەگەڵ ئەواندا لە خزمەتدا بووە و هۆکەی شیکردەوە. لەوە دەچوو کە دوای چەند هێرش و پەلاماردانێك بۆ سەر کاروانەکان لەگەڵ تیرەکەیدا، هەوڵیداوە هەندێ لە کاروانیەکان بەبێ یارمەتی کەس بگرێت. لەوەدا سەرکەوتوونەبووە و گوللەیەك لەناو شانی ئەسپەکەی دەدات و دەکەوێتە سەر زەوی و دەستگیر دەکرێت. ئەوەی کە مەسەلەکەی زیاتر ئاڵۆزکرد، دەرکەوت کە

قوربانیەکانیش لە تیرەی هەمەوەند بوون و خزمی سەرۆکەکەی بوون. ئازاری بە گاڵتەپێکردەکانیانەوە دەچەشت، چونکە مەسەلەکەیان وەك نوکتە دەگێڕایەوە و ئەویش لە سزای دوایی دەترسا، ناچار بە پێ هەڵهاتووە بۆ وڵاتی جاف و بووە بە تەتەر و پاسەوان. غەم و پەژارەی ئەو زیاتر کە باسیدەکرد، ئەوە بوو لە بەرزاییەکانی خۆی و ژن و خێزانەکەی دوورکەوتۆتەوە و ئەو تاڵانیەشی لە کیس چووە کە لەبەرئەوەی لەناو تیرەکەدا نیە پشکی نابێت. ئیدی ئاوڕیدایەوە لەو بەراوردە پڕ بەزەییەی خۆی کە لە گەرمای شارەزووردا دەسوتێ، لە کاتێکدا ژنەکەی لەسەربانی گوندی بنار دانیشتووە، بەرگی حەریری پۆشیوە و فەرشی ئێرانی لەژێردایە و بەدەوریدا قوماشی نایاب کە خۆی بەگەنی کردووە، لە کاتێکدا گوێ لە زیکەزیکی سەماوەری چاکە دەگرێت و روخساری کردۆتە شنەی بای فێنك.

بەم جۆرە قسە و باسانە کاتمان بەڕێکرد و بە قۆناغێك نزیکی سلێمانی بووینەوە، لە کاتی شەودا بۆ چەند سەعاتێك لاماندا تا وڵاخەکان بحەسێنەوە و لەسەر ئەو زەویپە رەقە سەرخەوێکمان شکاند.

هەندێ شڵەژان لەکاتی نیوەڕۆدا روویدا، لەلایەن کۆمەڵێکی سەرگەرم لە گوندێکی دەوارنشینەوە کە بە هەڵە لە ئێمە گەیشتبوون و بەچەتەیان زانیبووین و ئێمە بینیمان کوردەکانی گوندەکە هاواری ئەسپیان دەکرد. گوندەکەمان بینی ئارام و بێدەنگ بوو لە گەرمای دوانیوەڕۆدا و چرکەساتێ دواتر پیاوەکانی کە تۆزێ لەوەبەر نووستبوون، بە پەلە دوو دوو، سێ سێ خۆیان هەڵدەدایە سەرکۆڵی ئەسپەکان تا چواردەوری ئێمە بگرن و بەرگری هێرشەکەمان بکەن. رەسوڵ ئەحمەد توانی لە دوورەوە هاواریان لێبکات و بڵێ ئێمە پیاوانی پاشاین، ئیدی هاتنە خوارەوە و فەرمووی چاخواردنەوەیان لێکردین.

عادیلە خانم منی کردبوو بە بەرپرس لە رەسوڵ ئەحمەد، من زیز بووم لەوەی کە لە شەودا لای سلێمانیەوە لاماندا و پێشنیاریکرد کە لە ماڵە گچکەگەی پیرۆزی خزمیدا بمێنینەوە. ئەوەش هەروەها شوێنێکی لەبار بوو لە قەراغ شاردا و شوێنی حەسانەوەی خۆی بوو، کاتێ کە لە سلێمانی بووایە.

هەرچەند خانوو ماڵەکە جۆرێك بوو لە ماڵێکی سادەوساکار لە کوردستاندا، بەڵام لێرەدا بە باشی دەکرێت وەسفێکی کورتی بکەین.

بەدەوری سێ لای حەوشەیەکی چوارگۆشەدا ژوورە قوڕینەکان بیناکراوە، سیانیان لە رووکاری حەوشەکەدا دیواری نییە، کە شوێنێکی سێبەرگر، فێنك بۆ دانیشتن لە وەرزی ئاویندا.

# گەڕانەوە بۆ سلێمانی

ژووره زستانەکان لەگەڵ دەرگای کردنەوە لەم هۆیانەوە، کە هەر یەکەی پێنج پێ بەرز و لەبەشی سەرەوەی شوشەبەندە. دانەیەك لەوانە کە باشترینیانە، بە گەچ سپیکاری کراوە و ئەوانەی دی بە قسڵ و قوڕ و کا سواخدراوە، کە لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا توخمێکی سەرەکی بازرگانی بیناسازیە. ناو ژوورەکان قوڕی بێ کایە، سافە و هەروەها بە پێی رووت بەسەریدا بڕۆی لەوانەیە نیشانە جێبێڵێت. لە ناوەڕاستی حەوشەکەدا جۆگەیەکی سارد، ئاوێکی روون و سازگار لە چاڵەکەوە هەڵدەقوڵا، لەسەر زەویەکەش عەماراوێکی دروستکراو لە خشت و گەچی پڕەکردەوە، لەژێر دارێکی گەورەی بیدا، کە سێبەری بۆ شوێنەکە کردووە بۆ خواردنەوەی چایی بەیانی و پاشنیوەڕۆ. خانمە خاوەندارەکە، وەك خاوەنی ئەم کۆشکە، کە نرخی پەنجا پاوەندە، بە بۆچوونی کورد دادەنرێت بە دەوڵەمەند. ژوورەکانی داوە بەکرێ بە دوو خێزان، مانگی بە کۆی نرخی نیو کراون،[70] خزم و دۆستیشی هەیە کە بەردەوام ئارد و رۆنی بۆ دەهێنن و بە خۆشی دەژی. لێرە، نان لە ماڵەوە دروستدەکرێت و لە خواردندا مادەیەکی سەرەکیە، ژیان لەسەر ئەوە زۆر هەرزانە.

لەوێدا کەمێ پشوماندا، کاتەکەش بە دەمەتەقێ لەگەڵ ژنی خاوەن ماڵەکەدا تێدەپەڕی، ژنێکی کوردی جوان کە سی ساڵ زیاتر نەدەبوو، بەپێی نەریتی رێکوپێکی کوردستان سەربەستە روخساری دەرنجات و هەموو مامەڵەیەکیشی لەگەڵ پیاواندا دەکرد وەك ئەوەی کە چۆن بیردەکاتەوە وابێت، هەموو کاروبارەکانی، خۆی دەیبرت بەڕێوە، جۆرێك لە تاکە رەگەزی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کە ژنانە، تا رادەیەك وەك ژنانی ئەوروپا سەربەستن، تەنیا یەك شت سنووردارە، ئەویش ئەوەیە کە ناچن بۆ بازاڕ، خۆ ئەگەر چوون، دەبێ سەرو قژیان داپۆشن. لە ئێران، یان لەناو موسڵمانەکانی تردا، بۆ دوو پیاوی غەریب لەماڵێکدا بژی پڕی لە ژن بێت، وەك ئەم ماڵە، بەبێ هیچ مەرجێك تاوانە، بەڵام لێرەدا لەوە زیاتر نیە کە لە ئینگلتەرادا هەیە.

دوای ئەوەی نیوەڕۆ خوانێکمان خوارد، کە نانەکەی تازە لە تەنوورەکە دەرچووبوو، دوو پێیەك لەو بەرەوە، لەگەڵ هەندێ "کەباب"دا حەمە لە بازاڕەوە هێنای، چوومە دەرەوە بۆ دۆزینەوەی مەتی مەسیحی، کە لەوەبەر زۆر خۆی دۆست پیشاندا و لە نوسینگەکەیدا دۆزیمەوە لەگەڵ ئیسماعیلی برا گەنجەکەیدا کە یارمەتیدەری بوو.

---

[70] پارەیەکی ئینگلیزیە، کە تاجی لەسەر نەخشکراوە.

## بەکرێگرتنی خانویەك

چەند دەقیقەیەك نەبوو لەوێ بووم، کە حەبیب بەدریە دەرکەوت و شوێنی خۆی گرت لەو ریزە کورسیەی دەرەوەی نوسینگەکە، کە دەیتوانی لەوێوە قسە لەگەڵ هاورێکانی بکات و منیش بە پیاوێکی پیر ناسێنرام کە ناوی ئەنتوان و یەکێکی لاو بەناوی بیهنان، کە فەرەنسیەکی زۆر باش دەدوا. ئەوانە هەمووی مەسیحی موسڵ بوون لەناو کاروانسەراکەدا و وەك هەموو خەڵکەکەی تر ئەوانیش حەزیان بە پرسیارکردن دەکرد، یەکەم هەل دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی نامۆیەك بناسن. ئەوانە پیاوانێکی باش بوون و زانیان من خەریکی بازرگانیم، چوونەوە بۆ دوکانەکانی خۆیان، جگە لە حەبیب بەدریە، کە مایەوە، چونکە هاورێی تایبەتی مەتی بوو.

هەردووکیان ئامۆژگارییانکردم، هەروەك ئەوەی شتومەکم هەبوو، خانویەکی بچووك نزیکی بازار بۆ ماوەیەکی کورت بگرم و لەگەڵ شتومەکەکانمدا تێیدا بژیم، ئیدی هەردووکیان دوکانەکانیان داخست و خۆیان سازکرد بچین بگەرێین بەدوای ماڵێکی گونجاودا. لەوە دەچوو ئەوان شارەزاییەکی باشیان هەبێت، چونکە لە کاروانسەراکە چووینە دەرەوە و بازارمان جێهێشت، پێچمانکردەوە بۆ کۆڵانێکی تاریك، لە کۆتاییەکەیدا گەشتینە ئەو خانووەی کە دەیانویست پیشانی منی بدەن و منیش پەسەندمکرد بیگرم. خانووەکە بەهۆی مردنی خاوەنەکەیەوە چۆڵکراوە، کە بازرگانێك بوو، لە رێی چوونی بۆ بەغدا لەلایەن عەرەبەکانەوە کوژراوە. کاتێ کە رۆشتووە دایکە پیرەکەی کردووە بە بەرپرس، کوردی رەسەنی پاك بوو، شانازی بە بنەچەی خۆیەوە دەکرد کە ناشیرین نەبووە، بەردەوام دڵنیایی ئەوەی دەدا کە جولەکەیەك نیە گۆڕابێت وەك زووربەی سلێمانیەکان.

خانووەکەی لەسەر شێوازی بیناسازیی کوردی ئێران دروستکردووە، کە جۆرێکی باوە و لە هەموو ئێراندا بڵاوە.

دەرگاکە لەسەر شەقامەکەوە دەکرێتەوە بۆ گۆشەیەکی بەردرێژکراوی حەوشەکە و یەکێکی دەچووە ژێر نوواکەی پانتاییەکی دوو یارد چوارگۆشەیە و بە قوڕ سەری گیراوە و کۆڵەکەکان رایانگرتووە. لەپشتی دەرگاکەوە چەند پارچە گۆزە و گلێنەی نەخشکراو لەسەر زەویەکە دانرابوو. ئەوە چێشتخان بوو. لێرەوە پارچە خاکێکی باریك و درێژ بۆ بەری پێچەوانەی حەوشەکە، کرابوو بە شوێنی گوڵ و گوڵزار، کە بریتین لە گوڵە هێرۆ و گوڵەباخەکان و عەمارێکی ئاو پێیەك لە ئاستی زەوییەکەوە بەرزبوو.

ماڵەکە لە بەرامبەردایە، بریتیە لە دوو نهۆم، یەکەکەی خوارەوە سێ ژوورە، هەریەکە دەرگاکی بەسەر حەوشەکەدا دەکرێتەوە، زۆر نزمە بۆ کوڕێکی دوانزە ساڵان بەرێکی بچێتە ناوی. باشترینی ئەو ژوورانە ناوەڕاستینەکەیانە، دەرگای دووەمی بۆ کراوە و شوشەبەندە و سەربانەکەی بە تەختەی کورت کراوە، کە پاشماوەی سندوقە شەکرەکانە. ناوەکەی بە قوڕی شێوە پەمەیی لەسەر زەرد لەژێرەوە سواغدراوە و زەویەکەشی وەك شۆستە باریکەکەی دەرەوە وابوو.

لە نهۆمی سەرەوە، بەهەرحاڵ، پسپۆڕیی ئەندازیاری بیناسازی دەردەکەوێت. باشترین ژوور، کە بە شەش پێیەك لە هێڵی پێشەوە دەرچووە، سپیکاری کراوە بە گەچ و نەخشکاری و دیواروێنەی لە ئاستێکی بەرزدا بەهەمان مادە بۆ کراوە.

کۆڵەکەکانی نێوان کون و قوژبنەکانی دیوارەکان ئاوێنەبەند کراوە و بنمیچەکەش وێنەی گوڵ و ئەستێرەکان و پارچە ئاوێنە لێرەو لەوێ بە شێوەیەکی هەمەجۆری لەسەر نەخشکراوە. سێ جووت دەروازەی شوشەبەند لەگەڵ سێتێ شوشە لە نەخش و نیگارێکی مەزندا دەیڕوانی بەسەر حەوشەکەدا و چوارەم، دەرگایەکی دار گوێز و بەڕو، دەکرایەوە بۆ سەر ژووری ناوەڕاست یان هەیوانەکە، کە لەوێوە چەند پلەیەکی نایەکسان شۆڕدەبۆوە بۆ سەر حەوشەکە. کۆڵەکەکانی پشتیوانی سەقفەکەی دەکرد لەو دالآنەدا- کە جێی چوارەم دیواری پڕکردبۆوە- قەدی درەختەکان بوو بە تەختەداری باریکی گوێز دەوردراوە، هەشت گۆشەییەکی دروستکردووە لەگەڵ ئاوێنەیەکی درێژی باریك پێیەك لەسەرو ئاستی چاودا بوو. بنمیچەکەش تەختەرێژ کراوە. ژووری سێیەمیش وەك یەکە باشەکە دەبوو، خاوەنەکەی نەیتوانیوە خانووەکەی تەواوبکات پێش ئەوەی بمرێت و هەر بە قوڕە زەردەکە و بنمیچە دارەڕاکەوە ماوەتەوە، دەرگاکانیشی دوای ئەوە تێکراوە، کە تەنیا لە شوشەی سپی ئاسایە.

باجی رەیحانی خانمی بەساڵاچوو، رێیداین تەماشای شوێنە بچکۆلەکە بکەین و سێ ژووری داناوە بۆ کرێ، دووان لە خوارەوە و یەکە بێ راخەرەکە لە سەرەوە؛ بە بڕی حەوت شیلینگ بۆ مانگێك، کە کرێیەکی گران نییە، وەك ئەوەی کە خانووەکە نزیکە لە هەموو بازاڕ و کاروانسەرای بازرگانییەوە. ئەو خۆی ژوورەکەی ژێر یەکە تەواوەکەی نهۆمی سەرەوە بەکاردێنێت و بەردەوامیش دەبێت، بۆیە ئێمەش بە گونجاومان زانی، بڕیارماندا لەسەر شوێنەکە و بەرەو قاوەخانەیەك کەوتینە رێ. ئەوەش وەکو هەموو قاوەخانەکانی کوردستان، بریتیە لە بینایەك بە تاقی بەرز و گومەزەکان کە بە کۆڵەکە سەنگینەکان پشتیوانی کراوە، لە هەموو لایەکەوە دەچێتە ژوورەوە. کورسی بەرز بەدەوریدا دانراوە

و له گۆشەیەکدا دەزگای دوکانەکەیە، دوو سەماوەری گەورە و پیالە و ژێرپیالەی چا، لەسەر ڕەفەیەك دانراوە کە لە خشت و قوڕ دروستکراوە. زەویەکە خشت بوو، هەروەها ئاوگێڕێك مەشکەکەی بەسەر شانیەوەیە، هەموو دوو سەعات جارێ دێت و زەویەکە ئاوەڕشێن دەکات بۆ ئەوەی شوێنەکە فێنك بکاتەوە. لەوێدا ژمارەیەکی زۆر بازرگانمان بینی. مەسیحی و کورد و منیش لەسەر نەریتی کوردستان ناسێنرام، ناوەکەم بەو کەسانە وترا کە پرسیاریاندەکرد، دوای ئەوەی مەرحەبایان لێکردم لەسەر شێوەی ئەم ناوچانە.

دەنگوباسەکە بەزۆری لەبارەی سزادانی هەمەوەندەکان و (کە دەبووایە تورکەکان سوپایان لە چەمچەماڵدا کۆبکردایەتەوە) سیاسەتی ناخۆییەوە بوو، یان هیوا و خۆزگەی باشی خەلەوخەرمان. لێرە لە قاوەخانەکەدا، دەنگوباسەکەی شوێنەکە ئاڵوگۆڕدەکرێت، نرخی شتومەك تاووتوێ و جێگیر دەکرێت، مامەڵە دەکرێ، فرۆشتنەکان و کڕینەکان جێبەجێدەکرێت. لەلایەن مەتیەوە بڵاوکرایەوە کە من ڕۆنی تازەی جوانرۆم هەیە، پیاوێکی بچکۆلە، کە مەتی ئاگاداریکردم بەقالێکی بەڕێزە، هاتە پێشەوە و ژوانێکی بۆ سبەینێ کرد تا شتەکە ببینێت. بۆ ماوەیەك دانیشتین و بیرێکم وەرگرت لەسەر گرانی شێوەزاری کوردیی سلێمانی، یەکێ لە سەیرترینی هەموویان.

ئیدی جیابووینەوە هەرکەس بۆ ماڵەکانی خۆمان و حەمەم بینی لە خانووی بێوەژنەکەدا چای تێدەکرد، کە من پێویستم پێی نەبوو، دای بە ژنەکە. وەك ئەوەی ئێوارە نزیك بوو، ڕاخەرەکەم لە حەوشەکەدا لەسەر زەوی ڕاخست و شێومکرد، خۆرئاوابوون کاتێ شێوکردنەوەیە لە سلێمانی، لەسەر پێخەفەکەم دانیشتبووم جگەرەم دەکێشا و دەمەتەقێم لەگەڵ ژنەکە دەکرد، پێخەفەکەی لەسەر سەربانەکە ڕاخستووە، کە بە پەیژەیەکی ناڕێکوپێکدا بۆی سەردەکەوت. گفتوگۆکانیان لەبارەی شێخەوە بوو، بەڵام وەك دەردەکەوێت نزیکەی هەموویان پەیوەندیان بە بنەماڵەی شێخەوە هەبوو، هەرچۆن بەداخ بوون بۆ کوشتنی ئەم دواییەی شێخ سەعید و بۆیە من ناچاربووم بچمە ناو ڕیزەوی دوعای خێر و بەداخ بوون. ئەوان چوونە سەر باسی مەسەلەی هاوسەرگیری، بەڵام من بەو باوەڕە گەیشتم کە شیعە ناتوانێ بەبێ کێشە لەگەڵ ژنێکی سونییدا هاوسەرگیری بکات. بەهیچ شێوەیەك ناگونجێت، بیر لە پێشنیارێکی تریش ناکەنەوە بیکەن، لەوەی کە من دەبێ ببم بە سونی، یەك کار کە وەك شیعەیەکی باش دەبێ جێبەجێیکەم ئەوەیە هەڵسم نوێژەکانم بخوێنم، هەروەها دەمەتەقێکەش کۆتایی پێبهێنم تا باوەڕیان بە ڕاستگۆیم هەبێت.

پشودان، بەهەرحاڵ، بە ناقۆڵایی تێکچوو بە بایەکی گەرمی کوتوپڕی باکووری رۆژهەڵاتی، کە لێرە پێیدەوترێ "رەشەبا" کە لە بەرزاییەکانەوە وەك زریانێك هەڵدەکات. ئەوە دەستبەجێ بەسەر کێڵگە تازە درووێنەکراوەکاندا دێت و کا و پوش و تەپوتۆز دەکات بە قورگماندا، کە بارانێکی تیژ بەدوایدا دێت و دەمانکاتە ژوورەوە، ئیدی نەمانتوانی بنووین تا لە دەوروبەری نیوەشەودا ئاسمان روونبووەوە.

## بەشی دوانزەیەم

# ژیان لە سلێمانیدا

بەیانی ڕۆژی دوایی مەتی هات و لەگەڵ دوو کۆڵهەڵگردا شتەکانمان گواستەوە و خستمانە ناو ماڵێکی نوێوە، کە دوو سێ کڕیاری شتەکانم لەوێ چاوەڕێ بوون. هیزە ڕۆنەکانی دەیانویست، هەڵیانبژارد و لە دوایدا نرخەکەی دیاریکرا کە قازانجی لە سەدا بیست و پێنجی٪25 بۆ من تێدابوو، ئیدی چووین بۆ دوکانی یەکێکیان تا بە قەپانی گشتی ڕۆنەکە بکێشین. کە گەیشتینە ئەوێ ڕوانیمان هێشتا قەپانچیەکە نەهاتووە، لەبەرئەوە لە دوکانی بەقاڵیەکدا دانیشتم، کە مێووژ و بایەم و گوێز و بەهاراتی هەڵدابۆوە و دەیفرۆشت و جگەرەیەکم کێشا لەکاتێکدا خاوەنەکەی هاتە پێشەوە و هەوڵیدا بە فارسی قسەم لەگەڵ بکات، کە کەمێکی دەزانی. زۆر جار ئەوە لای من شاراوە بوو، کە وردەفرۆش چۆن پارە پەیدادەکات، بەڵام ئێستا، وەك بازرگانێکی کۆفرۆش لە کاڵایەکدا کە بە وردە دەفرۆشرێت، یاریەکەم بینی، کە تەواو ڕاست و ڕەوانە بۆ پێشاندان. سەرەتا تەرازوەکەی ڕاست و دروست نیە، کە دەستی پێدەکات و دەیکێشێت، کاتێ بگونجێت کەوچکە دارە قورسەکە لەناو مەنجەڵەکەدا جێدەهێڵێت، کە ڕۆنەکەی پێ دەردەهێنێت. ئەگەر بڕەکە زۆر بوو، ئەوا لەسەر نرخەکەی ڕێدەکەون و کڕیارەکە کێشانەیەکی شیاو بەدەستدێنێت، بەڵام کڕیاری بچووك کە بۆ چەند گرامێك هاتبێت هەمیشە فێڵی لێدەکرێت، یان بە ئەژمارکردنی نرخەکان، کە ئەو لەوانەیە بەسەریا نەچێتەوە، یان بەهۆی کەمی کێشەکەوە کە پێیدراوە. بەو جۆرە نرخی سێ شایی مێووژ، یان نرخی قرانێك بادەم، کە وردەفرۆشەکە دەیدا بە کڕیارەکە لە کەوچکێکی درێژدا، کە دەگاتە دوورترین تەشت بێ ئەوەی پێویست بکات بۆی بجوڵێت. لە هەموو دوکانێکدا لە کوردستان، جگە لە دوکانی داوودەرمان و بەهارات فرۆشەکان، هەر شتێك دەپێچرێتەوە و ئەو نەریتە دەستەسڕی کردووە بە بەشێکی گرنگ لە پێداویستی پیاو. بۆ شتومەك کڕین لەبازاڕ کەسێ دەبێ بەلایەنی کەمەوە سێ دەستەسڕی پێبێت، ئەگەر دوورکەوێتەوە لە تێکەڵکردنی خورما، گۆشت و میوە لە یەك دەستەسڕدا.

لە کۆتاییدا حەمە پیاوە قاپەنچیەکەی پەیداکرد، کە لەگەڵ قەپانێکی گەورەدا لەسەر دارێکی درێژ دەرکەوتن، بۆ هەڵگرتنی دەبێ دوو کۆڵهەڵگر بانگبکرێن، تا هەر یەکەی جەمسەرێکی بخەنە سەر شانیان.

## مودیر ئەفەندی

ئینجا کێشانەکان لە دەفتەرێکی بچووکدا تۆماردەکرا و ناوی کڕیار و فرۆشیارەکان و مادەکەش لە ژێریاندا. ئیدی ئەژمێرکرا و پارەی کێشانەی قەپانەکەمان دا، هەر لایەك نیوەی، دانیشتین بۆ حسابکردنی 1200 قڕان بە دوو قڕانی، ئەو کارەش نیو سەعاتی خایاند لەگەڵ گەڕان بەدوای پارەی شکاو و خراپدا. ئەوەمان کرد و ئێمە ڕۆشتین، لەگەڵ دەربڕینی ڕێزدا لە هەردوو لاوە، پارەکە لە دەستەسڕێکی پێویست لە هەر کاتێکی رابردودا پێچرایەوە.

لەلای مەتی دامانانا، کە لەگەڵ هەموو ماڵەکانی ترمدا خستیە قاسە ئاسنەکەیەوە و ئیدی ناردمان بۆ "کەباب"- گۆشتی وردکراوی برژاو لەسەر ئاگری خەڵوز- و لەگەڵ ئەوانە و نانخواردنێك پێکدەهێنێت کە پێیدەوترێ "نیوەڕۆخوانی بازرگان." هەموو پاشنیوەڕۆکە لە دەرەوەی نوسینگەکە دانیشتبووم لەگەڵ بازرگانە کوردەکانی ئەو ناوەدا کە یەکتریان دەناسی. یەکێ لەوانە بە دڵنیاییەوە حەمە عەلی، فارسی زۆر بە باشی دەدوا و شادمان بوو بەوەی کە چووە بۆ کاشان لە ئێران، کە هەوڵیداوە لەوێ مامەڵەیەکی بازرگانی دژی کۆمەڵێك بازرگانی ئێرانی بکات، بەڵام سەرکەوتو نەبووە، لەم میانەیەدا جنێویدەدا بە مامەڵە و کارو پیشەیان، لەو لاشەوە ستایشی میوانداری و ئاکاری باشی دەکردن، چونکە خۆی سونیە، قینی لە شیعەی ئێران بوو.

ژەمی ئێوارەکە هەرزان و بریتی بوو لە برنجی کوڵاو و گۆشت و خەیارێك یان دووان، کە لە لایەن ژنە بەساڵاچووەکەی ماڵەکەوە لە بازاڕ بۆی کڕیبووم، سەعاتێك دوای نانخواردن چوومە سەر بەردەکانی حەوشەکە، کە فێنکترین شوێن بوو بۆ ئەو شەوانەی خنکێنەر بوون.

بەیانی زوو "مودیر ئەفەندی" مستەفا بەگی بەساڵاچوو هات بۆ دیدەنیم، کە سەرەتا گەیشتمە سلێمانی لە کاروانسەراکەدا بووە هاوڕێم. زۆر شادمان بوو بە دووبارە بینینەوەم و بۆ ماوەی سەعاتێك یان دوو سەعات مایەوە و چایی بەیانیمان پێکەوە خواردەوە.

داخ و پەژارەی خۆی دەربڕی، وەك هەموو جارێك، کە دانەمەزراوە و نەفرەتی لە بەخت و ناوچەوانی خۆی دەکرد، کە لە تەرابلسی ئەفریقاوە گەیاندوویەتیە سلێمانی. کوردی فێرنەبووە، هاوڕێی تازەی نەگرتووە، ڕۆژەکانیشی وەك چۆن لەرابردوودا بووە بەو شێوەیە بەڕێیدەکات، سەردانی بەرپرسە تورکەکان دەکات، لە پۆستەخانەدا دادەنیشێت، لە ماڵی شێخیشدا شێودەکاتەوە. پەنجە پیرە سپیەکانی باش ماوەتەوە، زۆر دەلەرزین کە بە زەحمەت دەیتوانی قۆپچەی کراسەکانی لێبنێتەوە، ئەو شتەی کە هەمیشە پێوەی خەریکە و شانازی پێوە دەکات، کە ڕێزدار و خاوێنی کردووە، شەوان

به ئاگایه بۆ شۆردنی جلوبەرگە تایبەتیەکانی خۆی لەبەر ئەستێرکی کاروانسەراکە، چونکە ناتوانی ببینیت کاتێ ئەو کارە دەکات، یان کە جلوبەرگەکەی دەگۆڕێت.

ئەو ئەوەی دەرخست کە بە بڕێکی پێویست پارەی نەختینەی پێیە بۆ کڕینی جلوبەرگی زیاتر و بەدرێژی ئەو ماوەیە هەوڵمدا لەگەڵیدا بۆ کڕینی کراس و پانتۆڵێکی دی، ئیدی چووین بۆ بازاڕ.

جلوبەرگەکەی ئەو رۆژگارەم لە شار جۆرێك بوو کە لەناو خەڵکیدا رێزی لێدەگیرا و لەوانەیە لە ناخی خۆمدا خۆمم کەمکردبێتەوە.

من لەژێر کەواکەی لە کەرکوك کڕیومە دەستێ بیجامەی کۆنم لەبەردایە و عەبایەکی باشیشم کردووە بەسەریدا کە شێوەیەکی وەهای پێداوم کاتێ بەناو سلێمانیەکاندا تێدەپەریم دەناسرامەوە.

ماوەیەکی زۆرمان لە بازاڕ بەسەربرد تا پیرە پیاو بڕیاری لەسەر جۆرێتی قوماشی لۆکەی سپی دا بۆ کڕین و لەناو خاوەن دوکانەکاندا خولیایان بوو کە بزانن ئەوە دەبێ کێ بێت، ئەویش بە دەنگی زل و رەق ئاشکرای کرد کە زمانی عەرەبییە، کە لە دیالێکتی عەرەبی بەغداد جیاوازە، کە تەنیا عەرەبیەکە لە سلێمانیدا ناسراوە. ئیدی لەکاتێکدا ئەو بە نەشارەزایی سەودایدەکرد، من داوەتی خاوەن دوکانێکم پەسەندکرد لە بەرەکەی تری راستە بازاڕەکەدا و سەرو جگەرەمان پێکەوە کێشا، وەڵامی پرسیارەکانی وەك سوپاس بوو بۆ میوانداریەکەی. بە دەنگی بەرز مامەڵەکردنی پیرە پیاو بووە هۆی ئەوەی هەندێ گاڵتە و گەپی لەلایەن ئەوانی ترەوە پێکرا و لەبەر نەزانی شێوەزمانی کوردی ناوچەکەش رێکەوتنی نێوانیانی گرانکردبوو، لەبەرئەوەی نیشانەیەکی تورکی پێوەبوو، بۆیە وەك ئەوان نەفرەت لێکراو بوو.

لە کۆتاییدا، بەهەرحاڵ، کڕینەکەی تەواوبوو، گەڕاینەوە بۆ ماڵەوە و لەلایەن باجی رێحان، پیرەژنەکەی ماڵەکەوە ژنێکی بەرگدرووی بۆ دۆزینەوە. بە نرخی نۆ "بێچوو" یان (نۆ پێنس) لەگەڵ ئەو کچە شۆخ و شەنگەدا رێکەوتین، کە سەروپێچێکی گەورە هاتبووە سەر چاوێکی، بۆ دروونی کراسەکان.

ئێستا کاتی نیوەڕۆیە، لە نهۆمی سەرەوە نیوەڕۆخوانمان کرد و پیرە پیاو گەڕایەوە بۆ کاروانسەراکە، لەکاتێکدا منیش وەك نەریتی وڵاتەکە راکشام بۆ نووستن بۆ ماوەی سەعاتێك یان دوو سەعات.

بەو شێوەیە چەند رۆژێك تێپەڕی. هەموو بەیانی یان پاشنیوەڕۆیەکم لە نووسینگەکەی مەتی- دا بەسەردەبرد، باسی بێ بازاڕیمان دەکرد، چونکە هەمەوەندەکان رێگایان گرتووە و ئیش راوەستاوە.

حەبیب بەدریە وەك ئەوەی دادەنرێت بە مەسیحیەکی موسڵاوی زۆر پێشکەوتو، کە دەستبەرداری

## پەیمانگای سەربازیی

مێژەری مەسیحی بووە و گۆڕیوێتی بە فێست، خۆشحاڵە بە دەمەتەقێ لەبارەی ئەوروپاوە و باسی ئەوە دەکات کە چۆن بتوانێت لە پاریس بژی- دوا ئامانج و ئارەزووی بوو. دوای ماوەیەك گرنگیەکی زۆری دەدا بە کاروباری شارەوانی و بە سەعات باسی ئۆتۆمبیلی زبڵکۆکەرەوە، زێرابی ژێر زەوی و ئەو شتانەی دەکرد، هەرگیز سلێمانی خەویشی پێوە نەبینیوە تا ئەو لە منی بیست. ئاسان نەبوو باوەڕی پێ بهێنی، کە لەندەن لە پاریس گەورەترە و لەو بڕوایەدا بوو تەنانەت بە دەگمەن شتی وا وترابێت، لەکاتێکدا بە ئاشکرا لێدەبوورا کە من لەژێر سەرپەرشتی میللەتێکی وەهادا بوو، لەگەڵ ئەوەشی کە من وەك غولام حسێن- ی فارسیش ناسراوم و هاوڵاتی بوونی خۆم وەك بریتانیەك ناساندووە، تا لە سەغڵەتکردی دەستی تورکەکان رزگارم.

مستەفا بەگ وەك دەستورێك لە مەسیحی دووردەکەوێتەوە و هەرچەندە بەتەواوی بەگوێرەی ئەوانەوە دۆستبوو، ئەوەی لەبەرچاو نەدەگرت، کە کەرامەتی رێی نادا لەگەڵ ئەواندا ببینرێت دابنیشێت. ئەو لەو بارەیەوە تارادەیەك دژی من دەوەستا، بەڵام خۆی دەگرت، دەیوت تێبینی دەکەم کە تۆ ریاکار نیت و "زۆر باش نوێژەکانت وەك موسڵمانێکی باش دەکەیت، چونکە زۆر جار من تۆ دەبینم و زیانی چییە ئەگەر کافرێك خێرێکت پێ بکات."

پیرە پیاو هەموو بەیانیەك دەهات بۆ چا خواردنەوە و جگەرەکێشان و رۆژێ بەبیرما هات لێی بپرسم ئەگەر یەکێ لە تورکە ناسیاوەکانی حەزبکات دەمانچەیەکی ماوزەر بکڕێت من هەمە. تەماشای چەکەکەی کرد و بینی شێوەیەکی خاوێن دیارە، پەیمانیدا ئەوپەڕی هەوڵبدات. لە پاشنیوەڕۆدا گەڕایەوە، داوای لێبووردنی کرد لەوەی لە کاتێکی نەگونجاودا هاتووە، وتی سەرکەوتونەبووە لە دۆزینەوەی مشتەری بۆ دەمانچەکە، بەڵام هاورێیەکی نوێم بۆ دۆزیوەتەوە. بەردەوامبوو لە پیاهەڵداندا کە چۆن باسی شیاوی و شارەزای منی لە زمانەکانی فارسی و فەرەنسیدا بۆ بەڕێوەبەر کردووە، یان بۆ بەڕێوەبەری پەیمانگای سەربازیی لە سلێمانی، کە لەلایەن حوکومەتەوە بەڕێوەدەبرا و کوڕانی بەرپرسە تورکەکانی تێدابوو، کە لە سلێمانی بوون لەگەڵ ژمارەیەکی کەم لەو کوردانەی لە کاروباری ناوخۆی حوکومەتدا کاریاندەکرد. ئەو کەسە بە مستەفا بەگی وتووە، کە تەواو حەز بە بینی من دەکات و پەلەی لێکردم لەگەڵیدا بچم بۆ پەیمانگاکە، ئەو شوێنەی بەڕێوەبەرەکە هەموو رۆژێك لەوێ دەژی، ئەگەرچی وانەکان لە سەعات 11ی بەیانیان تەواو دەبێت. لەم کەشوهەوا گەرمەدا لە شەشی بەیانیەوە دەستپێدەکات.

پەیمانگاکە لە قەراغ شارەکە بوو، لەناو دیوارێکی بەرزدا. نیوەی ئەو ناوە باخێکی جوانی پێکهێناوە و باقیەکەی گۆڕەپانی مەشقکردن بوو، کاتێ خودی بیناکە بریتی بوو لە ریزێك ژووری بەسەریەکەوە بە دیوارێکی درێژ. لەسەر نەریتی شێوازی ئەوروپی بۆ رۆشنبیری و فێربوونی پێویست دەگوازرایەوە بۆ قوتابیەکان بەو شریتە ئاسۆییە بەرزەدا دەردەکەوت، کە نیشانەی ئەوەبوو مەشقی وەرزشی ژمناستیك هەرگیز نەکراوە. لەسەر دەرگاکان نووسراوە پۆلەکانی"برنجی، ئکینجی، ئوچینجی، دوردینجی بەیشینجی- واتە پۆلی یەکەم، پۆلی دووەم، پۆلی سێیەم، پۆلی چوارەم و پۆلی پێنجەم. لە قەراغی باخەکەدا عەماراوێکی ئاوی روون هەبوو، سێبەرگرێکی لە لقە درەخت بەسەرەوە بۆ کرابوو، شێوەی ئەوەی کە کورد پێی دەڵێت "چەرداخ."

لەوێدا "مودیر ئەفەندی" لەسەر کورسیەکی بەرز دانیشتووە، پیاوێکی قەڵەوی بچووك بە ئەستێرە تەنەکەکان و پانتۆڵی پشتێن لەسەر بەستوو رازاوەتەوە، تورکێکی بێبایەخی سیڤاسە، کە تەنیا زمانی خۆی قسەدەکات، بێجگە لە چەند وشەیەکی فەرەنسی. پیاوێکی گەنجتر لە نزیکیەوە لەسەر کورسیەك دانیشتبوو، یاری بە شمشێرەکەی دەکرد و بەناوی "ئیکنجی موعەلیم"ەوە بە منیان ناساند، یان دووەم بەرپرس لە قوتابخانەکەدا. شارەزایی زمانەوانی کەمێك لە زمانی فارسی و عەرەبیدا هەبوو، لەگەڵ کوردیەکی باشدا، چونکە خەڵکی ناوچەی کەرکوك بوو. بەڕیوەبەرەکە زۆر بەسۆزەوە پێشوازیکردم، نەیتوانی واز لە نەریتی تورکی خۆی بهێنێت لە دەستکردن بە پشکنینێکی فراوان لەبارەی رەگەزمەوە و هۆی هاتنم بۆ سلێمانی و چیم دەکرد و هەرشتێکی دی کە بتوانێ بیری لێبکاتەوە بۆ پرسیارکردن. بەهەرحاڵ، مستەفا بەگ سەرمایەیەکی لە پرسەکانی خۆی دروستکرد و کردنی بە بۆنەیەك بۆ دەرخستنی ئەو شتانەی بەدەستمهێناون و وەك دوا بەڵگەی باوەڕپێکراو خستیە پێش چاو، کە من چەند ساڵێك لە لەندەن ژیاوم و شارەکانی بۆمبای و ئەستەنبوڵ و تارانم بینیووە.

ئەو لێهاتوویانە راستەوخۆ ئاستێکی پێدام و دوای ئەوەی بە ئاسانی وەڵامی هەندێ پرسیاری بەڕێوەبەری قوتابخانەکەم دایەوە، لەبارەی دانیشتوانی لەندەن و پاریس و هێزی سەربازیی بریتانی، ئەوەم وەك دۆستایەتیەکی مەزن وەرگرتبوو. پیاوە بچکۆلەکە هەرگیز لە ئەستەنبوڵ نزیك نەبۆتەوە، لە سمیرنا بەولاوە و وەکو هەموو تورکێك لە کەشوهەوای ناجێگیری کوردستاندا، بەداخەوەیە کە لەوێیە. ئەو ئەوەندە باشبوو کە ستایشی منی دەکرد لەبارەی شارەزاییم لە زمانی کوردیدا، کە زمانێکە ئەو ددانی پێدانا کە هەرگیز ناتوانێ بەدەستی بهێنێت و تکایکرد کە زمانەکانی فارسی و

## مامەڵە بازرگانیەکان

فەرەنسی فێربکەم. وەك پیاوێکی سەربازیی، بیرەکانی دەچوونە سەر مەسەلە سەربازیەکان و پرسیارەکەی زوو لەبارەی بابەتەکە دەرکەوت. وتی ناتوانم تێبگەم لەوەی کە چۆن بریتانیا پێکەوە بەندە بەبێ خزمەتی زۆرەملی، سەرسوڕمانێکی گەورەی پیشاندا لەوەی کە من چۆن لەوە رزگارمبووە. ئەوەی لە شتەکانی دی زیاتر سەغڵەتی دەکرد، ئەو راستیە ئاشکرایە بوو، کە بەبێ خزمەتی سەربازی هیچ مرۆڤێك لە تورکیادا ناتوانێت"تەزکەرە"کەی هەڵگرێت، بەڵگەیەك کە هەموو پێویستە بیانبێت و بەبێ ئەوە خەڵکی خۆی دووچاری سەغڵەتی گومانکردن دەکات و ئیدی وتی نازانم هاووڵاتی بریتانی، کە بەرپرسیار نیە لە خزمەتکردن، چۆن دەتوانێت بەڵگەنامەیەك بەدەستبێنێت. لە راستیدا، داخی خۆی دەربڕی بۆ سیستمێك کە پاسپۆرت دەدات بە کەسێك کاتێ سەفەردەکات بۆ چەند وڵاتێکی بیانی و ئەوەی دانا بە لاوازی کۆنترۆڵکردن بەسەر تاکدا، کە ببێتە هۆیەکی زیندو لە ئاژاوە و یاخیبوون. دوای هاوبەشی چاخواردنەوە و هەندێ جگەرەی رێجیە کە لەبەرخاتری من دەریهێناوە، داوای لێبووردنمان کرد و مۆڵەتمان خواست" کە رێگا بدرێن." هەر کە خەریکبوو دەرچین، تێبینیەك لە حەمەوە گەیشت، کە لە هەڵەبجە بوو، بریتی بوو لەوەی کە بچم بگەڕێم بەدوای مەتی- دا، کە لە بازاڕ دۆزیمەوە.

هەر زوو دوای ئەوەی من هاتم بۆ سلێمانی، حەمەش رۆشت بۆ هەڵەبجە بۆ وەرگرتنی ئەو "رۆن"ە زۆرە نێرراوەی، کە رێکەتوم بیکرم.

ئەو جۆرە مامەڵەیە لەم ناوچەیەدا باوبوو. لەژێر بارمتەی مەنسووری مەسیحیدا، پێشەکیم دا بە "مەخا"یەکی جولەکە (بە قژێکی سووری ئەوتۆوە کە من هەرگیز لەوە پێش نەمدیوە بەسەر هیچ کەسەوە) برێك پارە تا بچێتە دەرەوە بۆ کوچە و کۆڵانی کوردستان و وردە وردە لە کوردەکانی بکرێت، کە رۆنی پوخت خەزندەکەن وەك لەوەی ئامادەی بکەن، چاوەڕێی کڕیارێکی وەهان.

لەبەرئەوە، کە گەیشتمە سلێمانی دەبووایە حەمە بنێرمەوە، چونکە کاتی گەڕانەوەی جولەکەکە نزیکبۆتەوە و پیاوەکەم دەبێ لەوێ بێت بۆ وەرگرتنی شتومەکەکان و رێکخستنی کاروباری گواستنەوە. بەهەرحاڵ حەمە حەزی لە بیری گەڕانەوەی نەبوو بۆ هەڵەبجە بە دەستی بەتاڵ، وەك هەموو کورد کە پەیوەندیان بە بازرگانی و ئیشوکارەوەیە، سوورە لەسەر تاقیکردنەوە، بۆیە دوای راوێژکردن بە مەتی و حەبیب بەدریە، کە لەوەبەر بەتەواوی بیری وا نەبووە، پێویستە بارێك لە پێڵاو و شتی دەگمەن لەگەڵ خۆیدا ببات، بۆ فرۆشتنی بە دوکاندارەکان لە هەڵەبجە. بەپێی ئەوە،

# ئاشنا کلدانیەکان

بەر لەوەی دەرچێت چووین بۆ بازاڕی پێڵاو دروستکردن. شەقامێکی دووروودرێژ لەگەڵ کوشکی پان و قووڵ لە هەردوو بەرەوە، کە بەتەواوی بۆ دروستکردنی پێڵاوەکان تەرخانکراوە. ئەوە سێ شێوەکارەکانە: پێڵاوی چەرمی سوور لوتە باریکەکەی هەڵگەڕاوەتەوە بۆ سەرەوە- کەوشی سوور، رەنگی رەش لە هەمان شێوەکار و پێڵاوی ژنانەش، بریتیە لە سەرپاییەك کە تەنیا پەنجەکان دادەپۆشێت و بە گوڵنکەی زیوی رازاوەتەوە و پاژنە بەرز، کە دوای کڕینی پێڵاوەکە ئەوەی بۆ زیادکرا و ئەوەش لەلایەن پیاوێکەوە ئەو کارە دەکرا کە تەنیا ئەو بەشەی پێڵاوی دروستدەکرد.

لێرەدا لە یەکێ لە دوکانەکاندا دانیشتین و چاوەڕێ بووین تا دوکاندارەکە ئەو ژمارە پێڵاوە داواکراوەی لای خۆیی و دراوسێکانی کۆکردەوە. بەڵام تا رادەیەك ئەو ناکۆکیە کەمدەکاتەوە، مەسحیەك کە ناودەبرێت بەوەی لە ئایینی ئێمە نییە، ئەو سەربەستە لەوەی دژ یان لە بەرژەوەندی هەر لایەکمان بێت. ئەو پێڵاوەکانی تاقیدەکردەوە و دەیپشکنین و لە میانەی ئەوەوە هەموو دانوساندنەکانمان کرد. وەك ئەوەی هەر جووتە پێڵاوێك دەبێ رێکەوتنی لەسەر بکرێت و ئەو کارەش ماوەیەکی خایاند. هەروەها نەریتیش داوای رێنمایی شێوازێکی دیاریکراو دەکات. خاوەنەکە سەرەتا نرخێکی خەیاڵی داوادەکات و بۆ کات بەفیڕۆنەدان ئەوی تر لەجیاتی ئەوەی بەرەنگاری بوەستێتەوە دەڵێت "وەرە خوارەوە" واتە "دابەزە"، ئەوە دووبارە دەکرێتەوە تا دەگاتە سەر نرخی راستەقینەی خۆی، کاتێ ناوبژیکەر دەکەوێتە بەینەوە و پاش تاووتوێکردنێکی کورت ئیدی لە دەوروبەری نیوەی رێدا لەنێوان کڕیار و فرۆشیاردا لەسەر نرخەکە رێدەکەون و دەبێت هەردوولا پەسەندیکەن.

بەو شێوەیە، لە ماوەی پێنج سەعاتدا نزیکەی پەنجا جووت پێڵاومان کڕی و پارەکەمان دا، حەمە هەموو پارچە پێڵاوەکانی لە کیسەیەکدا هەڵگرت. ئەوانە، لەگەڵ نمونەی وەرەقەی جگەرە و دەرزەنێك تەسبێح شتەکانی پێکهێناوە و بەیانی رۆژی داهاتوو دەرچوو.

من ئێستا نامەیەکم لەو و مەنسوورەوە پێگەیشت. یەکەمیان باسی سەرکەوتنەکەی دەکات لە فرۆشتنی پێڵاوەکاندا، کە ئەوەی پێیبووە زۆر نەبووە، شیاوی رەزامەندیە و دواتریش باسی ئەوەم پێدەڵێت، کە بۆچی مەخای جولەکە لەگەڵ "رۆن"دا لە جوانرۆ نەگەڕاوەتەوە. مەتی لەجیاتی ئەوەی کە هەوڵەکەی من بە ناپەسەند دابنێت و من لەو بڕوایەدام هەوڵێدەدا ستایشم بکات، لەبەرئەوەی دەیزانی من شارەزاییەکی ئەوتۆم لە بازرگانیدا نەبوو. لەو لاشەوە حەبیب زۆر سوورە لەسەر ئەوەی

له کاروانسەراکەی لای ئەواندا دوکانێك بکەمەوە و بۆ ئەوەش لەلایەن "ئەنتوان"ەوە پشتگیری دەکرا، کە بۆ ماوەی بیست ساڵە لە سلێمانیدا بازرگانە و دوو جار لەو ماوەیەدا مایەپووت بووە، ئەوەش تایبەتمەندێتی بازرگانی رۆژهەڵاتە، هەندێ جار زیرەکی و بلیمەتی کاری نییە بەسەر ناجێگیری بازرگانییەوە. ئەنتوان هەندێ کاڵای بازرگانی لە بەغدا و موسڵ دەکڕی و کاتێ من ناسیم، کەتیرەی دەکڕی. ئێستا منیش تەواو ئامادەم بنچکی رووەکی کەتیرە بکڕم، بەڵام ئەو بە ئاگاهاتبووە و توانی بازنەیەکی بچووك پێکبهێنێت کە کەمێ کێشەی دوورەپەرێزم چارەسەربکات.

من تەنانەت هەوڵمدا ئەنتوان وەك بریکاری من کاربکات و لە دیدارێکدا کە مەتی- ش وەك شایەت ئامادەبوو، بەزۆر بەڵێنم لێ وەرگرت، بەڵام دواتر پەشیمانبۆوە. لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوام دێت وەك من لە دەرەوەی دوکانەکەی مەتی- دا دادەنیشین و بە فارسیە سەیرەکەی هاندەدا پێستە یان دانەوێڵە بکڕم و دڵنیایە لەوەی کە لە مامەڵەی ئەوەدا قازانجێکی باش بە دەستدێنێت. برایەکی لە خۆی گەنجتری هەبوو کە یارمەتیدەری بوو، کوڕێکی زۆر سەرڕاستە، پێشتر بەرهەڵستی رێبازە فێڵبازیەکانی کردووە. چونکە ساڵانێك لە نزیکەوە لەگەڵ بازرگانی موسڵماناندا خەریکبووە و لەلایەن هاوئایینانیەوە خۆشیان لێ نەدەهات، چونکە رۆژانی یەکشەممە وەك خویەك کاروباری بازرگانی تێدا دەکرد- کە رۆژێکە لای عەرەبی مەسیحی و کلدانەکان وەك ئەوەی لە سکۆتلەندەدا دەکرێت و رۆژی پشووە و بە تەمەڵی بەسەریدەبەن.

هەروەها مەتی- ش برایەکی گەنجتری یارمەتیدەدا، کە کوڕێکی زۆر ساویلکەبوو، بەڵام تەواو دڵ و دەروونی باشە و خواردنی ئەویش لە دەرەوەی دوکانەکەدا ئامادەدەکات. چونکە ژیانی شەو و رۆژی کلدانەکانی موسڵ لە ژوورەکانیاندایە، کە نووسینگە وماڵیشە پێکەوە و پیاوانی وەك مەتی و ئەنتوان بۆ ماوەی دوو دەیە ساڵ لە شوێنێکدا دەژین، کە ئێمە دەبێت پێیبڵێین ژێرزەمینی تاریکی پڕ لە کەلوپەل. لە کاتە ئاساییەکاندا، ئەو کاتانەی کاروبار باش بووە و هاتوچۆ بەسەر شەقامەکاندا مەترسیدار نەبووە، مەسیحیەکان پێنج و شەش بەش دەبوون و هەریەکە بە نۆرە خواردنیان دروستدەکرد، بەڵام ئێستا، لەگەڵ نەمانی ئاسایشی گشتیدا کە بۆتە هۆی نەمانی پەیوەندی لەنێوانی کاروانسەراکەی مەتی و خانەکەی عەجەم و کاروانسەراکەی دی، کە بازرگانەکانی تری تێدا دەژیان و سامناکی سستی ئابووری لە بازرگانیدا هەموویان گەڕاونەتەوە جگە لە مەتی و حەبیب، کە هێشتا پارێزگاری لەو خووە دەکەن، هەریەکە بۆ خۆی کردووە و حەبیب لەوانەیە هەموو رۆژێکی دی ببینرێت بە پەرۆشەوە تەماشای مەنجەڵی چێزەچێزەکە دەکات،

## نەریتی کلدانەکان

لەکاتێکدا ئەو لۆکەی دەفرۆشت، یان کۆمەڵە خەیاری نیوە مەحشیکراوی لە دەرەوە دادەنا بۆ ڕاکێشانی کڕیاری کورد.

هەروەك زۆرجاریش چەندە دەیانتوانی هانیاندەدام بۆ مانەوە، دەمویست لەگەڵ مەتی و حەبیب- دا شێوبکەم، بەڵام لەسەرەتاوە مەتی زۆر شەرمن بوو، لە پێناوی ڕازیکردنی خودی خۆیا لەسەر خاڵێکی دیاریکراو، هەندێ نیوەڕۆخوانی داوادەکرد، ڕۆژێك کە من ئامادەبووم و داوایدەکرد هاوبەشیبکەم. منیش ڕەتمدەکردەوە، بەڵام ئەو بەردەوام زۆری دەکرد و منیش بەردەوام پۆزشی خۆم دەهێنایەوە تا لەکۆتاییدا ئەو ئاخێکی هەڵدەکێشا و بە تووڕەییەوە دەیوت تەنیا تۆزێ بخۆ.

" هەستمدەکرد کە تۆ موسڵمانێکی بیر ئازاد بیت و من بە گڵاو دانەنێیت، بەڵام دەبینم ڕاستە کە فارسەکان لە سونی زیاتر وابەستەترن و لەگەڵ مەسیحیدا نان ناخۆن."

ئەو پیاوە باشە لەوە دەچوو زۆر ئازاردرابێت لەو ڕوونکردنەوەی خۆیدا و ئەوەش تەواو بێ ئەمەکی بوو بۆ من داخوازی ئەو پیاوە ڕەتکەمەوە، کە زۆری بۆ کردووم، ئیدی بەخێرایی ئەو بیرتەسکیەم ڕەتکردەوە و دەستمکرد بەقاپەکەدا لەگەڵیدا، لەبەرخاتری ئەوەی دڵخۆش و ئاسودەی بکەم.

لەدوای ئەوەوە دەبووایە هەموو شێوکردنەوەیەکم لەگەڵ ئەودا بێت و کە زۆر زەحمەت بوو ڕەتیکەیتەوە، بەڵام ئەوە سیاسیانە نەبوو بۆ موسڵمانێك، لەگەڵ ئەوەی شیعەیە و لەسەر باوەڕی سونەی کوردەکان نییە، بەوە بناسرێت کە لەگەڵ مەسیحیەکدا نان دەخوات، من خۆمم سنووردارکردبوو کە هەفتەی جارێك نانیان لەگەڵ بخۆم. کوردەکان کێشەیەکیان نەبوو، بەگوێرەی حەمەی پاسەوانی کاروانسەراکەوە کە خەڵکی هەورامانە، ڕەشەوڵاخی، خزمەتی مەسیحیەکانی زۆر بەدڵسۆزی کردووە، بە ئاسایی ئەو لەو پاشماوە زۆرەی لە ژەمەکانیان دەمایەوە دەیخوارد.

لە سەرەتاوە سەرسامبووم بەو بڕە زۆرەی لە شێودا خواردیان. لە ڕۆژئاوابوونیشدا کاروانسەراکە دادەخرێت و کورسیەکان دەخرێتە ئەو باخەی کە لە حەوشەکەدا دروستیانکردووە. لەسەر کورسیەکان پشتی و دۆشەکی ئەستوور دانراوە و لەوێدا مەتی و ئەنتوان و حەبیب، بەساڵاچووان، شوێنی خۆیان گرت، مێزەرە قورسەکانیان داگرت و پشتێنەکانی سەر کەمەریان شلکردەوە. لێرەدا بەئاسایی لەلایەن جولەکەیەکی بەغداوە هاوبەشیدەکران، هاوڕێیەکی قۆزی مەزن، کە هەمووانی لەمیانەی نوکتەکانیەوە خۆشحاڵکردووە. ئیدی هاواریدەکرد، "جیب ول پیالە" واتە پیاڵە بێنە، برا گچکەکەی هەموو شوشە بچووکەکانی دەهێنا، بە دەستەسرێکی تەڕ پێچراوەتەوە تا بە ساردی

بێنێتەوە. تاریکی داهات، هەمان برا لاوەکان، کە بەردەستییان دەکرد، راخەرێکیان لە حەوشەکەدا راخست و سفرەیەکی رەنگینیان دا بەسەریدا. هەرزوو ئەوەی دەخورا کرایە ناو قاپەکانی برا بە تەمەنەکانەوە و ئەوانیش قەنەفەکانیان جێهێشت و بە چوارمەشقی بەدەوری قاپەکاندا دانیشتن، هەموو دەستەیەك بەشێوەیەکی نمونەیی لەسەر شێوازی شێوکردنەوەکانی رۆژهەلات خەریکن، کەم دەدوێن تا ژەمەکە تەواودەبێت. ئەو برە گۆشتەی ئەو مەسیحیانە خواردنیا سەرسامیکردوم و بووە هۆی ئەوەی توانجێکیان تێگرم. حەبیب، کە هەمیشە بیر و بۆچوونی ئەوروپی دەردەبرێت، تا رادەیەك دەیبوغزاندم، چونکە تاوانباریکردم بەهەڵەبردنی ئەوروپی، کە پیاوێك مەگەر مەشق بکات، ئەگینا نابێت ئەوەندە زۆر گۆشت بخوات و هێمایکرد بەوەی کە پێویست ناکات بە بەڵگە هێنانەوە ئەگەر سەرنج لە حاڵەتی تەندروستی باشی ئەو و مەتی بدرێت.

نیو سەعات دوای خۆرئاوابوون شێوکردنەوە تەواوبوو، دوای ماوەیەکی کورت لە گفتوگۆکردن زووربەی بەشداران نووستن، بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆرهەڵاتندا بەیانی هەستێت. شەوێك یان دوو شەو من لەوێ لەسەر یەکێ لە کورسیەکانی دەرەوە دەنووستم، بەڵام مێشوولەی زۆر زۆربوو، بۆیە سەربانەکەی خۆمم بەلاوە چاکتربوو، کە بە ئاسایی شنەیەکی فێنکی هەیە.

بەیانی رۆژێك لە ژووره بچکۆلەکەی سەرەوەمدا دانیشتبووم، لەسەر فەرشەکەم دەمنووسی، کاتێ دەرگای حەوشەکە کرایەوە و مستەفا بەگ لەگەڵ نیو دەرزەن کورد- دا هاتە ژوورەوە و بە فەرمووی من سەرکەت.

هەموویان بەو قەرەباڵغییە هاتنە ناو ئەو ژوورە بچووکەوە و مستەفا بەگ بانگی لاوێکی کرد بۆ بەرزترین شوێن. ئەوانی دی لە هەر شوێنێکدا دانیشتن و دووان لەدەم دەرگاکەدا راوەستان، چونکە خزمەتکارن. پیرە پیاوەکە کورێکی وەك سەید نووری، کوری شێخ ئەحمەد پێشکەشکرد، کە ئەندامێکی دیاری بنەماڵەی شێخە نەفرەتیەکانە. ئێستا، لە سلێمانیدا پیاوێك کە لە سەرنجی ئەو بنەماڵەیە سوپاس بۆ خوا رزگاری بووە و دوعا دەکات لە پێناوی سەربەستی بەردەوامدا لە ناسینەوەیان. بەیەکسانی ئەمرۆ نەفرەت لەو بنەماڵەیە دەکات کە نائومێدیەکە ئاشکرابکات. هەروەها شانازی بوو بۆ ناوچەکە، کە تا ئەو چرکەساتە شێخ دووپێی نەناوەتە سەر شەقامەکانی، چونکە ناوچەیەکی بازرگانی بەرێزە، پاسەوانیەکی باش دەکرێت و شەوانەش زۆر هۆشدارن بەرامبەر هێرشی دەستوپێوەند و چەتەکانی شێخەکان. کەواتە هاتنی سەید نووری دەبێتە هۆی شێواندنی

# میوانێکی زانخواز

ئاسایشی گەڕەکە و منیش ناخۆشەویست دەکات، چونکە کەس باوەڕی بەوانە نییە کە دۆستایەتی شێخان ناکەن.

سەید نووری خۆی مامناوەندیە، بەڵام گەنجێکی زیرەك دیارە، لە جۆری تێکەڵەی تورکمان و کوردە، کە لەو شێوەیە لە سلێمانیدا دەبینرێت، سیمایەکی خۆهەڵکێشانەی هەیە و سمێڵێکی تەنکی درێژ، لوتی شەپۆلاویی و قۆقز. لە ئاوریشم هەڵکێشراوە و گۆرەوییەکی لۆکەی جوانی لە پێدایە. خەنجەرێکی گەورە بە بەر پشتێنەکەیەوە بوو، دەمانچەیەکی تۆپلی لە کیفەکەیدا لەژێر چاکەتە زەواڤەکەیدایە. لەگەڵ ئەوەشدا، بەگوێرەی هەموو شێوە ناوێزەکانیەوە، بۆ ئەندامی بنەماڵەیەکی لوت بەرز و ئەو هەموو بەرهەڵستییە ئەوە پێشبینی دەکرێت، بەڵام زۆر بەرەوشت بوو.

مستەفا بەگ لەوە دەچوو وا هەستبکات کە بە هێنانی ئەوە خزمەتێکی گەورەی منی کردووە و دانیشتووە بۆ هەردوو لامان دەخەنێتەوە و گوێ لە کوردی دەوروبەری خۆی دەگرێت. کوڕەکە تورکیەکی باش قسەیدەکرد، چونکە وەك ئەو روونیکردەوە، بنەماڵەکەیان مامەڵەی زۆری لەگەڵ تورکەکاندا هەیە. کاتێ تێگەیشت کە مستەفا بەگ هەڵە نەبووە لەوەی منی وەك فارسێك ناساندووە، زۆر شادمان بوو، لەبەرئەوەی هەموو ئەوەی دەیویست بیکات ئەوە بوو، کە زانیاری خۆی لەو زمانەدا بەدەستبێنێت، کە زیادە نەبوو.

لە یەکەمەوە، بەهەرحاڵ، ئەو ناتوانێت کۆنترۆڵی سروشتی حەز بەشت زانینی خۆی بکات، کە رابەریکردووە بۆ چارەسەرکردنی هەموو شت و روونکردنەوەی زیاتر بدات بە شتەکان لەگەڵ پرس و رادەربڕین بەگوێرەی بەکارهێنانیانەوە. لە شوێنێك بیستویەتی کە من پزیشکم، بێبەختانە بووم بەوە، لە ژوورەکەدا کۆمەڵێك شوشەی بچکۆلە کە نۆ یان دە دانە دەبوون بە رێکی دامنابوون، کەمێك دەرمانیان تێدابوو کە بە دەم رێوە لە ئەستەنبوڵەوە کۆبووبوونەوە، ئەوانەی هەموو پێکەوە بینی، راپەڕی و یەکە یەکە رایکێشان و تاقیکردنەوە و بۆنیکردن و لەگەڵ پشکنینی هەر یەکەیاندا، بڕوای زیاتری کرد و رەتکردنەوەی ئەوەی من دەیڵێم درۆ و دەلەسەیە و دەتوانم خەڵکی تریش چارەسەربکەم. مستەفا بەگ، بەهەرحاڵ، هاتە ناوەوە بۆ ئەوەی رزگارمبکات، بەوەی منی وەك پزیشك نەناسیوە، لەگەڵ ئەوەی هەندێ شارەزایی لەبارەی زانستەوە هەیە. ئەوەش بە زەحمەت سەید نووری رازیدەکرد، بۆیە جووتێ حەبی رەوانی هەڵگرت و منیش دوو حەبی کالۆمێلم بۆ

خستەسەر، وتی بەکاریاندەهێنم و ئەوسا دەزانین دوای ئەوە من پزیشك بووم بە جۆرایەتی حەبی ڕەوانیەکەدا!

ئیدی ئیسفنجێکی سووری هندی دۆزییەوە کە لەم کاتەدا زۆر باوە و بە هەر شێوەیەك بێت لە میانەی گەشتەکەمدا ونمکردبوو. ئەوە تەواو زیزیکرد. کە زانی بەکارهاتووە، منیش هێمامکرد ئەوە لە گەرماودا بەکاردێ بۆ خۆشتن و پێست سوینەوە. بەڵام بە ڕێکەوت بۆنێکی کرد، ئەو بۆنەی لە سفنجەکە دەهات زۆر ناخۆش بوو، بۆیە یەکسەر لێیگەڕا. بەڵام ئەوەی ئەو بۆی هاتووە بیبینێت دەمانچە ماوزەرەکە بوو، بۆ ئەوەی بە بێدەنگی بێنێتەوە، بەناو ژوورەکەدا دەگەڕا و هەرچی کاغەز و کتێبەکانی من بەرهەمم هێناوە هەڵیگێڕایەوە. چەکەکە، بەهەرحاڵ، من تەمەننامکرد ئەوە نەبێت بۆ ئەو شیاوبێت، چونکە وتی دانەیەکم بینیوە و لەوەبەر دانەیەکیشم هەبووە. ئەو زۆر کەیفی هات بەو گوللە پلاستیکانەی لەلایەن فرۆشیارەکانەوە لەگەڵیدا هاتووە، کە بەو گوللانەوە یاریکردن بە چەك مەترسیدار نییە. هاوڕێکانی بێ ئاگابوون لەوەی کە زیانیان نییە و بە دیقەت تەماشای جوڵەکانیان دەکرد. دوای ئەوەی فیشەکی تێکرد، کردیە ئەو پیاوەی بەرامبەری دانیشتبوو، رایدەبوارد بەوەی کە پیاوەکە خۆی دەخست بەم لاو لادا تا بکەوێتە دەرەوەی نیشانگەوە. مستەفا بەگ ئەو کردەوانەی بە ناخۆشی لەبەرچاوگرت و بە ئاشکرا هەستیدەکرد سەید نووری لە ماڵی پیاوێکی تردا دوژمنێکی تری بەگیرهێناوە، دەیکوژێ و لەوێدا جێیدەهێڵێت و مردووەکەی لەبەر دەرگاکەمدا دەکەوێت، بە دەنگێکی پاڕانەوە داوایکرد کە دەمانچەکە دانێت. هاوڕێکانی زانیان بەقسەی ئەو ناکات، ئەوانیش کەوتنە نارەزایی دەربڕین و ئەویش داینا و پاشان دەستیکرد بە باسی چێژوەرگرتن لە سروشتی گوللەکان. دوای ئەوەی لە گاڵتەکردن ماندووبوو، ئیدی باسی ئەوەی دەکرد کە چی لە دەستچووە و بێتاقەتیکردووە، چونکە هێمای بەوە کرد، کوڕی شێخ ئەحمەد پارەیەکی زۆری هەیە کە بتوانرێ خەرجکرێت- ئەوە بەتەواوی ڕاستە- و هاتۆتە سلێمانیەوە. ئەو دەیڕوانییە کەرکوك و بازاڕە گەورەو جەنجاڵەکەی و نزیکی لە بەغداوە کە تەنیا ئامانجی ئەو بوو، وەك یەکەم شار لە جیهاندا دێتە بەرچاوی. پرسیارەکانی لەبارەی ئەستەنبوڵەوە کەم بوون و زیاتر لە میانەی هەستکردنی بەدواداچوونەکانیەوە بوو لەوەی ئارەزووی زانیاری هەبێت و هەستیدەکرد لە بەراوردا بە مووسڵ تەنانەت شوێنێکی لاوازە. ماوەیەکی درێژی خایاند تا رازیبکەم بە چی هۆیەکەوە من لە سلێمانیم، دەمزانی ئەو باوەڕی بەوە نیە کە بۆ ماوەیەکی کورت دەمێنمەوە، نە بەوەش کە ئامانجم بازرگانی ئەوەیە کە پێوەی سەرقاڵم، چونکە لای ئەو بازرگان لە

نووسینگەکەی جیانابێتەوە و پیاوێك کە زمانی ئەورووپی قسەبکات و داودەرمانی هەبێت، ئەوە بەڵگە نەویستە کە هەندێ هۆی تری هەیە. هێجگار باری شانم سوك بوو کە لەدوایدا لە کۆڵم بووەوە. پیرە مستەفا بەگ خۆی چاوەڕێی ئەو بێزارییەی نەدەکرد کە لە ئەنجامی سەردانەکەیدا پێشیهات، من دەمتوانی ئەوە بە ئاشکرا بە روخساریەوە بەدیبکەم، زۆر پەشیمان و خەمناکە، چونکە وەك شێوازی ژیانی خۆی ئەو بەرچاوتەنگ بوو، حەزی نەدەکرد کەسانی تر لە ماڵەکەدا سەربەست بێت، هیوایەکی بێهودە لە سلێمانیدا، لەو شوێنەی پیاوێکی بێ ژن، دەست دەنێت بە رووی ئازادیی رێدان بۆ هاتنەناوەوەی هەموان و هەمەجۆر داواکردن وەك شێتێك، یان خراپەکارێکی لەڕادەبەدەر، کە کردەوەکانی دەشارێتەوە دەبێت شەڕانی بێت، چونکە لەپشتی دەرگا داخراوەکانەوە ئەنجامیدەدات. ناڕەزاییەکانی دراوسێکان دژی ئەم سەردانانە درێژەی نەکێشا. پیرە خانمی ماڵ لە دەرەوە بوو لە ماڵی یەکێ لە هاوسێکان و بە سکاڵایەکی دووروودرێژی چەندینیانەوە گەڕایەوە، پوختەکەی ئەوە بوو کە ئەگەر من حەز بەم پەیوەندیانە دەکەم چاکتروایە بچم بۆ شوێنێکی تر چێژی لێببینم، دەرکەوتنی شێخ لە گەڕەکەکەدا پێشەنگی هەموو شەڕێك بوو. بەهەرحاڵ، بەرامبەر ماڵەکەمان، بازرگانێکی دیاریکراو دەژیا، ژنەکەی یەکێ بوو لە بنەماڵە ئاینیە کۆنەکانی هەکاری و وەك پیاو نازناوی "خان"ی هەڵگرتووە کە هێمایە بۆ بنەچەی ئەو.

پەیوەندی بە شێخان خۆیانەوە هەیە و منیش خۆم ئامادەکرد لەکاتی پێویستیدا پەنای بۆ ببەم. بۆیە چاوم بۆ مێردەکەی دەگێڕا و کاتێ گەیشت، بانگمکرد. پیاوێکی باش بوو، لەم گەڕەکەدا زۆر رێزدارە و لەسەر نەریتی کوردانە ماوە، کە خەڵکی تاراوگە دەبێ بپارێزرێت، باسی بارودۆخی سەردانەکەم بۆ کرد و ئەویش بەڵێنیدا کە خێزانەکەی بنێرێت بۆ ماڵی شێخ ئەگەر ئەو کوڕە دووبارە هاتەوە، پێیان بڵێت کە بوونی لەم گەڕەکەدا پێویست نییە.

کاتی بەفیڕۆنەدا لە پاکردنەوەی کەسایەتیم لە سەرزەنشتەکەی کە کراوە، بۆ ئەوەی ئەوە بکات، چونکە کاتی خۆرنشینە و ژنان جێگا لەناو "چیخەکەدا" رادەخەن، یان لەناو حەسیرەکەی سەربانذا، سەرکەوت و بە دەنگی بەرز وتی غوڵام حسێن زۆر بەداخە لەو سەردانانەی کراوە و بانگی کردووم تا شاهیدی نارەحەتی ئەو بم و داوای یارمەتی کرد لە بەربەستکردنی هەر بێزارییەك لە گەڕەکەکەدا. ئاخاوتنە یەکلاکەرەوەکەی و سەلماندنی مەبەستە باشەکانی من، رێزێکی لای خەڵکی دەوروبەرەکە بۆ پەیداکردم و ئەوەم بینی لەلایەن کارەکەم کە چنگمکەوتووە لە مەزەندەکردنی ئەوانەوە.

## سکاڵایەك لەلایەن دراوسێکانەوە

لە بازاڕ و قاوەخانەکان تەنیا بابەتێك باسوخواستی ئەو ڕۆژانە بوو- ئەویش هەمەوەندەکانە. پروپاگاندەیەکمان بیست کە نیازیان وایە هێرش بکەنە سەر سلێمانی و لە شەودا بە ئاشکرا سوارەکانیان هاتوون بۆ ماڵی شێخان تا فرمانەکەیان وەرگرن. ئەوان جارێك یا دووجار لەلای ڕۆژئاوای شارەکەوە بە راستی چەند ماڵێکیان تاڵانکردووە. کەس نەیدەتوانی سەرەڕۆیی بکات. مەتی پێیدەوتم ئەو ڕۆژانە زۆر خۆش بوو کە کوردەکان و مەسیحیەکان دەچوون بۆ دەشت و دەر بۆ سەر گردۆلکەکان و ڕۆژەکانیان لە هەوای سازگار و سەیران بە مۆسیقاژەندنەوە بەسەردەبرد- و منیش لە مەسیحیەکان بەگومان بووم کە "عەرەق"ێکی زۆریان خواردۆتەوە. بەڵام ئێستا جگە لە لای باکووری ڕۆژهەڵات بۆ چوونە دەرەوە لە سنووری ماڵەکان دووچاری رووتکردنەوە دەبیت، ئەگەر وێرانکاری نەبێت. ئینجا قسەی بێهودە لەبارەی "تاقیب"ەوە، یان سزادان کە دەبێت بە تیرەکە بگات. ئێمە هەواڵمان بیست- و ئەوەش لە راست دەچێت- کە سەربازان لە تورکیا و میسۆپۆتامیاوە دێت و لە چەمچەماڵدا گردیدەکەنەوە و بەپێی ئەو نامانەی لە مووسڵ و بەغداوە دێن، ئێمە دەتوانین پروپاگاندە وتیوتیەکان بپشکنین و بە دڵنیاییەوە نزیکەی سێ بۆ چوار هەزار سەربازی پیادە و "هێستر سوار" لەوێدا کۆبوونەتەوە بۆ دامرکاندنەوەی دووسەد سواری جەربەزە. هەموو ئەو هێزە لەلایەن کاربەدستانی مووسڵەوە راگیرابوو بۆ چاوەڕوانیکردنی فەرماندەیەك و تا پارە و ماڵ لەلایەن شێخانەوە بچێتە گیرفانی والی مووسڵەوە، فەرماندە بەردەوام سەرقاڵە بە فشارخستنە سەر ئیشوکار لە شوێنی تر و هەمەوەندەکان چاونەترسی خۆیان دووچەندانەکرد، پەلاماری خودی چەمچەماڵیان دا و هەندێ سەربازیان کوشت.

لەهەمان کاتدا بارودۆخی ناوچەکە نالەبارتر دەبوو، چونکە گەشتیاران تەنیا لەلایەن تاقمەکانی جاف و هەمەوەندەکانەوە نەدەچەوسانەوە، بەڵکو لەلایەن سەربازانی ناوخۆشەوە هەروەها هەڕەشەیان لێ دەکران، چونکە " بینباشیەکان" پارەیەکی کەم کە بتوانن لە بری موچەکەی خۆیان کۆبکەنەوە و " موحاسیبچیەکان" یان ژمێریارەکان ڕۆژانە سەرمایە دەست بەسەردا گیراوەکانیان پەرەپێدەدا. سەربازەکان بۆ زێدی خۆیان هەڵهاتن، یان دەکشانەوە بۆسەر سنووری ئێران — تفەنگە ماوزەرە نوێکانیشیان لەگەڵ خۆیان دەبرد و لە هەڵەبجەدا سەرهەنگێك فەرماندەی پێنج کوردی لیڤی دەکرد لەجیاتی پەنجا سەربازە ئاساییەکەی خۆی.

# پەلاماریکی هەمەوەند

ئیدی کارەساتێك روویدا، کە خەڵکی گەیاندە ئەو ئاستەی گاڵتە بکات و بێ هیواش بێت وەك یەك لە تورکەکانی ناوچەکە. چارەکە تابوورێك، یان دەوروبەری سەد پیاوێك، فرمانیان پێکرابوو جێگۆرکێ بە حامیەی سلێمانی بکەن، کە لە 500 کەسەوە دابەزیبوو بۆ 34 کەس. هەروەها ئەوانە بەکاردەهێنران بۆ پاراستنی نزیکەی حەفتا تفەنگ و ئەرکی گونجاو بۆ دابەشکردنی پۆستە سنووریەکان. لە چەمچەماڵەوە دەستیانپێکرد، لەلایەن (سەرهەنگ- بینباشی)ێك و دوو مەیجەر- یان (یوزباشی) و بەهاوڕێیەتی چەند "عەسکەر کاتیبی- سەربازی کاتب (ژمێریارەکان) و بەرپرسە حوکومیەکانی تر لەگەڵ ژنەکانیان و خێزانەکانیاندا. لە هەموو لایەکی دەشتی چەمچەماڵدا هیچ نیشانەیەك لە هەمەوەندەکانەوە دیارنەبوو، لەگەڵ ئەوەی سەربازی سۆسەکەریان ناردبووە دەرەوە و ئەوانەی نێرابوون بۆ پێشەوە، تا لە دەربەندی بازیان سۆسەبکەن، بەڵام کەسیان نەدیووە. لەئەنجامی ئەوەدا لە دەربەندەکە نزیکبوونەتەوە، کە شاخە شەقبردۆکە دەربازگەیەکی لە شێوەی پیتی ڤی ئینگلیزی پێکهێناوە بۆ دەشتی بازیان. شوێنەکە لەوێوە، لەلای چەمچەماڵەوە، مەحاڵە بۆ دوور بەرەوپێش هیچ شتێك بەدیبکەیت، چونکە زەویەکە بەرزدەبێتەوە و کەلێنەکە لە بنەوە تەنیا نزیکەی 10 یارد پانە، لێژاییە و تا دوور بۆ لوتکەی بەرزاییەکان. کاتێ لە چینە بەردەکان دەرچوون کە دەربەندەکەی پێکدەهێنا و دوا کەس چووە خاکی بازیانەوە، بەرزاییەکانی لای سەرویان، کوتوپڕ لە هاواری هەمەوەندەکان دەنگی دەدایەوە و لە هەر لایەکەوە بە راکردن بەوپەڕی چوست و چالاکییەوە دابەزینە داوێنی بەردەکان. لە ماوەی پەنجا یاردەوە تەقەیاندەکرد و یەکەم کەسێ کە کەوت "ئوزباشی" بوو. سەربازەکان بە دەستەیەك گردبوونەوە و ناجەنگاوەرەکانیان هەوڵیان دەدا بە دەربەندەکەدا بەپەلە بگەڕێنەوە، خۆیان لەبەردەم سێ یان چوار ئەسپ سواردا بینیەوە، بێبەزەییانە دایانپاچین و روتیانکردنەوە، وڵاخە بارکراوەکانیان دوورخستنەوە. تورکەکان تەقەیاندەکردەوە، بەڵام بە کەموکوڕییەوە، هیچ کاریگەرێنەکیان لەسەر چوست و چالاکی هەمەوەندەکان نەبوو، کە لە دەوری ئەوان دەسووڕانەوە، بەوجۆرە بۆ ماوەیەکی کەم خۆیان راگرت و هەوڵیاندەدا بۆ پێشەوە بجوڵێن.

لەبارەی ژمارەکانەوە تورکەکان باشتربوو، چەکەکانیان ماوزەری 10 گوللە بوون بەرامبەر تفەنگی مارتینی گوللەپرژێنی سوکە، بەڵام تەقەکردنیان دەبێت لەوپەڕی لاوازیدابێت، چونکە توانیان تەنیا یەك هەمەوەند بریندارابکەن. هەروەها زۆریان هەوڵیاندا دابڕێن و لەپڕ بەرەنگاربوونەوە. لە چارەکە

سەعاتێکدا "بینباشی"ەکە کەوت، گوللەیەك لە سنگی داوە و هەروەها دوانزە سەربازیش کوژراو و بریندار هەبوو. ئەوانەی مابوون چەکەکانیان فڕێدا، سەیریانکرد بەرەنگاریکردن بێکەلکە، کوردەکان پەلاماریاندان و کاروانەکەیان رووتکردەوە، هەموو تفەنگ و تەقەمەنیەکانیان کۆکردەوە و هەڵیانگرت، یان جلوبەرگە یەکپۆشەکانی سەربازەکانیان دەدڕاند و رێبوارە بێ چەکەکانیشیان تالآنکرد. ئاژاوەیەکی ئەوتۆ لەوێدا بەرپابوو کە شیاوی وەسفکردن نییە، سەربازەکان بەپێ و بەبێ چەك هەوڵیاندەدا بە هەر لایەکدا هەڵبێن و سوارە لەگەڵ هاواری گایەلی رەشەوڵاخ پێشدان دەوریان دەدان. دەستە هەمەوەندەکان هێسترەکانی کۆمەڵە بەزیوەکەیان دابۆپێش، هاواریان بەسەردا دەکردن و دیلەکانیان دوچاری ترس و تۆقین کردبوو. وەك سروشتیە لەم بارودۆخەدا، هەموو شتەکان بەوپەڕی خێراییەوە تەواودەبێت و هەمەوەندەکانیش بەو توڕەیی بەرەنگارییەی دووچاری هاتن، لەکاتی ئاسایی بۆ ئەوانەی روتکراونەتەوە بێبەزیانەتر بوون. پیاوەکانیان بە ئاسایی روتکردەوە و ژنەکانیان دەترساند بە لێدانی دڕندانە و دەرهێنانی خەنجەرە درێژەکانیان بۆ دڵنیابوون لەوەی هەر شتێیەکیان پێبێت بیاندەنێ، کە لەوانەیە شاردبێتیانەوە.

یەکێ لەو ژنانەی دووچاری روتکردنەوە هاتبوو، پێی وتم کە هەندێ لە هەمەوەندەکان ژنەکانیشیان دێنن لەگەڵ خۆیاندا و لەپشتی بەردەکانەوە دایاندەنێن لە کاتێکدا کە شەڕ بەردەوامە و دوای ئەوەش بانگیان دەکەن تا جلوبەرگی ژنە دیلەکان بپشکنن، کە زۆر باشترە لە پیاوێك ئەو کارە جێبەجێبکات، لەبەرئەوەی لەم سەرزەمینی ئیسلامەدا تەنانەت لەناو کوردە شاخاوییەکانیشدا، پیاو بەدەگمەن ئازاری ژنی بەستەزمانی موسڵمان دەدات و هەمەوەندیش تیرەیەکی زۆر خواپەرستە، لە کاتی هێرشدا لەلایەکەوە دەوەستێت تا نوێژەکەی لەکاتە دیاریکراوەکەی خۆیدا بکات.

پیاوەکان کە رۆشتن، کراسێك زیاتریان لەبەردانەبوو- لەپڕ لەبەرچاو دیارنەمان، هەمەوەندەکان ژن و کچەکەی یەکێ لە نەقیبەکانیان لەگەڵ خۆیادا برد، کە بۆ ماوەیەك لەلای ژنانی سەرۆکەکانیان لەژێر چاودێریدا بوون. پاشماوەی کاروانەکە، دوو دوو، سێ سێ لە پیاوە نیوە روتوقوتەکان و ژنانی چاوبەگریە، بەپێ بەردەوام دەڕۆشتن و بۆ رۆژی دوایی بەبرسێتی و شەرمەزارییەوە گەیشتنە سلێمانی.

ئەگەری روودانی ئەم جۆرە کارەساتانە نائاسایی نەبوو، کە زیانێکی زۆری گەیاندووە بە ناوی تورك، بەڵکو لە قاوەخانەکاندا بیروڕا بەئازادانە بەیاندەکرا. گاڵتە بە تورکەکان دەکرا و بە سەربازانیشیان

پێدەکەنین. شێخان بوونە مەترسی بۆ سلێمانی. شەوێك بەبێ کوشتن تێنەدەپەڕی و لە هەموو بارودۆخێکدا پیاوکوژەکان ناسراوبوون و پیاوانی شێخان بوون. شەوێك هەوڵێك بۆ خانی عەجەم درا، کە مەتی و ناسیاوە مەسیحیەکانی ترم لەوێدا دەژیان. هەندێکیان لە سەریان دەنووستن، کاتێ دەنگی کڕاندنی دیوارەکانی دەرەوەیان بیستبوو بەئاگاهاتبوونەوە. بۆ ماوەیەك چاوەڕییانکرد و حەبیب تفەنگە سنایدەرە کۆنەکەی دەرهێناوە. دوای تێپەڕینی ماوەیەك یەکێ لە دزەکان تا رادەیەك سەرکەوتووبووە لە بڕینی بینا ئەستوورەکە و لە چرکەساتێکی دیاریکراودا، لەسەر نیشانەیەك نیشتەنیەکانی کاروانسەراکە پێکەوە هاواریانکرد و تەقەیەك بە تاریکیدا کراوە، کە دزەکان هەڵهاتن. بەهەرحاڵ، لەولاوە سەرقاڵبوون لەگەڵ کاروانێك کە تازە گەیشتبووە سلێمانی و هاوار لە وڵاخدارەکان بەرزبۆوە. خەڵکی دەوروبەرەکە کە لە سەربانەکانیان نووستوون، لە دەنگە دەنگ بەئاگاهاتنەوە و لە سەرسوڕمان و شڵەژاندنی ئەو چرکەساتە، وایان هەستکردووە کە هەمەوەندەکان لە رابردوودا هەڕەشەی هێرشیان بۆ سەر سلێمانی کردووە، ئیدی دەستیانکرد بە تەقەکردن لە کاروانەکە، چەند هێسترێك کوژرا و یەك دوو وڵاخداریش بریندار‌بوون، کە نەیاتوانیبوو هاووڵاتیان رازیبکەن زیانیان پێنەگەیەنن لە کاتێکی گونجاودا. دزەکانیش کەڵکیان لەو ئاژاوەیە وەرگرت بۆ دوورکەوتنەوە و کاتێ کاروانەکە کەوتەوە رێ، نیوەی خەڵکەکە خەریکبوو لە هۆکە تێدەگەیشتن.

لەم جۆرە رووداوانە هەموو شەوێك هەیە و شێخانیش هەل دەقۆزنەوە بۆ تۆڵەکردنەوە لە دوژمنەکانیان و هاوار بەسەر حوکومەتی دەستووریدا دەکەن. بەدەگمەن دەمانتوانی بەبێدەنگی لە تاریکیدا تا بەرەبەیان بنووین، لەبەر تەقوتۆق لە دەوری ئێمە و گوللەکانی کە زۆرجار بەسەرماندا گیزەی دەهات و هەمیشە لە حاڵەتی ئاگاداریدا بووین.

دوای چەند رۆژێك تێپەڕبوون بەسەر هەوڵی بڕینی کاروانسەراکە، لە حەوشەکەمدا دانیشتبووم، کاتێ خەڵکێکی مۆرانە خواردوو لە جۆرێك یەکپۆشی شین لەگەڵ سەرشانی سوور لە دەرگاکەوە هاتەژوورەوە. ئەوە یەکێك بوو لە چوار پۆلیسەکەی شوێنەکە، سەردانێك مایەوەك بوو چاوەڕێمدەکرد، چونکە قۆمیسەرە پۆلیسە قەڵەوەکە حەبیب- ی سەغڵەتکربوو بە لێپرسینەوەکانی لەبارەی پێسنامە و هۆی مانەوەم لە سلێمانی و جارێکیان ئەوەش روودەدا و داوای پاسپۆرتیشم لێ دەکات. پۆلیسەکە ئێستا پرسیاریکرد لە کوێوە هاتووم و بۆ لە سلێمانیدا دەمێنیتەوە و

دووپاتمکردەوە کە لە ئەستەنبوڵەوە هاتووم و بۆ ئێران دەچم، بەڵام هەوڵدەدەم هەندێ ئیشوکار لە سلێمانیدا بکەم تا وڵاتەکە کەمێ ئارام دەبێتەوە، بەرێکی بەربەرچیدامەوە، پێیوتم من لە ئێرانەوە هاتووم و گومان لێکراوی و داوای پاسپۆرتەکەمی کرد. من بە تەواوی رەتمکردەوە و پێشنیارمکرد کە لەتەکتا دێم بۆ بینینی موتەسەرِیف- پارێزگار، داوای ئەوە دەکەم لەو جۆرە بێزارییە بمبەخشن، وەك ئەوەی لەژێر چاودێری بەریتانیدام و هێمام بەوە کرد کە من ماوەی شەش هەفتەیە لە سلێمانیدام و ئەگەر هەر مەبەستێکی نابەجێم هەبووایە، دەبووایە زووتر داوای بەڵگەکانی پێناسەکەم بکرایە. بەهەرحاڵ پیاوەکە رازی نەبوو، بەردەوام داوای ئەوراقەکانی دەکرد و منیش رەتیدەکەمەوە، لەو کاتەشدا وردە وردە دانیشتوانی گەڕەکەکە کۆدەبوونەوە، هەر یەکە، پیاو یان ژن وەك فێربوون، چوونە ناو ناڕەزایی رێزداری من و دڵنیاییان دا لەسەر راستگۆیی من. هەروەك پۆلیسەکە هێشتا لەوێ ماوە، ژنەکان دەستیانکرد بە دەربڕینی خۆیان تا رادەیەك بە سەربەستی لەوەی پەیوەندە بە هەڵسوکەوتییەوە و بەدرێژی، سەیریانکرد کە باش ناتوانرێ بکرێت بە مانەوە- تەنیا لەوانەیە زیان بگەیەنێت- ئیدی ئەو کەسانە زانیان کە کەڵکێکی ئەوتۆی نیە، وردە وردە بڵاوەیان لێکرد و چوونەوە بۆ بازاڕ. دراوسێ باشەکانم هانیاندام کە سکاڵا لای موتەسەرِیف- پارێزگار بکەم، یان بەهەرحاڵ مەسەلەکە لای سەرانی پۆلیس تاووتێ دەکرێت، یان پشگوێ دەنرێت، من دەبێت کێشەیەکی گەورەم لەگەڵیان هەبێت و بێزارییەك کە ئەوان بە ئەرکی خۆیانی دەزانن دووچاری منی بکەن.

بۆیە منیش بە ئامۆژگارییەکانی ئەوانم کرد و یەکەم، چووم بۆ بینینی پیرە مستەفا بەگ و داوای بۆچوونیم لەو رووەوە کرد. ئەوم لە زیندانەکەیدا بینی، فنجانێك قاوەی دەخواردەوە کە تازە دەمیکردوە و بەبینینی من گەشایەوە و سڵاوێکی تەواوی لێکردم، وەك ئەوەی لەسەری راهاتووە، بە دەنگێکی گەورە وتی "سەلامون عەلەیکم وە رەحمەتوڵڵاهـ وە بەرەکاتو." "Salamun 'alaikum wa rahmatu'llah wa barikatahu"

ئەو سووربوو لەسەر ئەوەی قاوەکەی لێ وەرگرم، چونکە ماوەیەکی درێژی دەخایاند تا دروستیدەکردەوە، دەبێ لەسەر کورەیەکی بچووکی خەڵوز دروستیکات و کە دروستیشکرا، دەبێ فنجانێکی دی بدۆزێتەوە، لەبەرئەوەی ئەو تەنیا یەك فنجان و دەورییەکی بەکاردەهێنا، ئیدی لەناو تورەکەکەی کە هەموو شتێکی هەمەجۆری تێدابوو دۆزییەوە.

## بێزارکردن لەلایەن پۆلیسەوە

ئینجا پێم وت چی روویداوە و لە گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە بەردەوامبووم، تورەیی ئەویش هەڵچوو، دەستیکرد بە بەکارهێنانی دەستەواژەی وەك: "ئەدەبسیز- بێ ئەدەب"، "کیوپیك ئۆغلۆ- کوڕی سەگ"، "تەربیتسز- بێ تەربیەت" و دووپاتیکردەوە قۆمیسەری پۆلیس دەبینێت و داوای لێ دەکات کە داوای لێبووردن بکات. بەهەرحاڵ، دووەم بۆچوونی، وتی باشتر وایە داوای یارمەتی لە بەڕێوەبەری قوتابخانەکە بکەین. ئەو شپرزانە بەو ناوەدا دەگەڕا و پانتۆڵ و چاکەتەکەی گۆڕی- چونکە جلوبەرگە باشەکانی لە لایەکەوە دادەنێت کاتێ لە ماڵەوە بێت تا بیانپارێزێت- دەرگاکەی قوفڵکرد و چووین بۆ قوتابخانەکە، لەوێ بەڕێوەبەری قوتابخانەکەمان لەسەر کورسیەکەی خۆی لە باخچەکەدا بینی. پیرە پیاو بۆ ئەو بە تورکیەکی رەوان دەستیکرد بە گێڕانەوەی چیرۆکەکە، لە هەمان کاتیشدا ئەفەندی سەری دەلەقاند و یاری بە دەنکە تەسبێحەکانی دەکرد و کە ئەو تەواوبوو، پیرە پیاو بە کۆچانەکەی دەیدا بەسەر زەویدا و جارێکی دی جنێوی بە پۆلیسەکە دایەوە. ئینجا مودیر ئەفەندی پرسی بەڕاستی بۆ هاتوویت بۆ ئێرە، منیش هێمامکرد بۆ ئەوەی کە ئەگەر وەك "سەیاح- گەشتیار"ێك هاتبم بۆ ئێرە، کە نابێ هیچ بەرهەڵستیەك بەرامبەرم بەرزبێتەوە، تا ئەوە بسەلمێنن کە من بەشداری هەوڵی ناحەز، یان زیانبەخشم کردووە. لەسەرو ئەوەشەوە، ئەوەندەی بارودۆخەکە رێیدات من خۆم بە کاروباری بازرگانیەوە سەرقاڵکردووە، بەڵام ئەوەش تا رادەیەك گرانە لە شوێنێکدا بازرگانی بکەیت کە رێگاوبان بۆ ناوچەکانی دەوروبەری واڵانەبێت. ئەویش لەمەدا هاوڕایە و داوای لێکردم کە بڵێم من لەژێر چاودێریی بریتانیادام، وتی منیش لەگەڵ پۆلیس قسەدەکەم. هەروەها وتی مافی ئەوەیان هەیە داوای "عبور تەزکەرە- پاسپۆرتی گەشتیاری تورکی" بکەن، بەڵام هەر یەکێ بۆ کوژانەوەی پاسپۆرتەکانی دی رێدراو نییە، نەك تەنانەت لە ماڵی خۆیدا بێزاربکرێت.

وەك ئەوەی لەوە زیاترم لەو چاوەڕوان نەدەکرد، سوپاسمکرد و رۆشتم و ئەویش لەگەڵ مستەفا بەگ چوون بۆ سەرا یان ماڵی حاکم بۆ بینینی سەرۆکی پۆلیس، کە ئۆفیسەکەی لەوێیە.

## بەشی سیانزەیەم
## ژیان لە سلێمانیدا ( بەردەوامی )

لەمیانەی ئەو کاتەدا حەمە جارێکی دی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە هێستر بە بارە رۆنەوە لە هەڵەبجەوە گەڕایەوە و بە پرۆژەیەکی گەورەی چوون بۆ بەغدا بۆ کڕینی شەکر. رێگا بۆ ئەو شوێنە هێشتا گیراوە و تاکە هۆی گەیشتن بۆ باشوور بە هەڵەبجە و خانەقیندایە، کە شارۆچکەیەکی گەورەی سنوورییە لەسەر رێگای بەغدا و کرماشان. هەموو بازرگانانی ناوچەکە ئالۆشی دابڕان و دووری بەغدا لێیدابوون، چونکە کەللەیەك شەکر لە مانگی نیساندا بە دوو قڕان بوو، ئێستا بە پێنج قڕان دەیفرۆشن و رۆژانێکە لە قاوەخانەکاندا کەس ناتوانێ چایەك بخواتەوە، چونکە شەکر نەماوە و خەڵکی وەك خویەك، لەوێ هەر دادەنیشن و بەبێ چایی، جگەرە دەکێشن و دەمەتەقێی سیاسی دەکەن.
بەڵام لە نەخشە بازرگانیەکانیدا، حەمە لەگەڵ هەموو تایبەتمەندیەکی کورد بۆ پێشەوە، تەواو بیریچووە کە لە هەڵەبجەدا قەرزێکی زۆری جێهێشتووە و دەبێ وەریانبگرێتەوە بەر لەوەی پارەی زیاتر بخاتە مەترسییەوە و تەمەننای ئەوەی دەکرد کە لە پەیمانە نوێکەدا خێرێکی باشی دەسکەوێت، لەهەمان کاتدا گوێی نەدەدا بە زەرەر و زیانە کۆنەکە. کەواتە دەبێ من بینێرمەوە بۆ هەڵەبجە، بۆ ئەو پەنجا جووتە پێڵاوەی کە زووربەی داوە بە قەرز و بەڵام بیرێکی نادروستی لەبارەی کڕیارەکانیەوە هەبوو. لەسەر لێواری تانکیەکە دانیشتووە و پەنجەکانی دەنوشتێنێتەوە و مێشکی خۆی دەگوشێ بۆ بیرکەوتنەوەی ئەوەی کە پێڵاوەکانی بە کێ داوە، لە کاتێکدا هەوڵدەدات لیستێك بکات، کە بە وردی دەرکەوت ناتوانێت ناوەکانی بەتەواوی بیربکەوێتەوە. کەسێك جووتێکی بە دوانزە قڕان بردووە، " کە دووەم سوارەی پیاوەکانی مەجید بەگە لە نارینجەلان"، کەسێکی دی، " پیاوێکی زل کە لە بازاڕ لە گۆشەکەی لای دوکانەکەی شاولی جولەکە دادەنیشت،" یەکێکی دی، " پیاوێك لە قاوەخانەکە بینیم، کە قسەی لەگەڵ حەمە رەشەی عەبابەیلێدا دەکرد"، بەو شێوەیە بەردەوام بوو. عادیلە خانم خۆی هەندێکی کڕیوە و ژمارەیەکی زۆر خزمەتکارەکانیشی پێڵاویان کڕیوە و بەپێی قسەی حەمە ئەو بەرپرسە بەرامبەریان، لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دەچێت رازی نەبێت کە پارەکەی بدات. جارێکی دی ناردمەوە بۆ هەڵەبجە و لەجێی ئەو کوڕێکی بچووکم خستەکار، کوڕی حەمەی پاسەوانی کاروانسەراکەی لای مەتی. ئەو کوڕە سێ رۆژ بە قورۆشێك و نانخواردن

## کوردێکی بزێو

کاردەکات. کوڕێکی تا بڵێی زیرەك و هۆشیارە. لە بازاڕەکاندا فێری هەندێ فارسی بووە و توانایەکی زۆریشی پێشاندا بۆ فێربوونی زیاتر کە قسەم لەگەڵ کرد. بەڵام ئەگەر ژیری خۆی یارمەتی بدات بەوە، هەروەها یارمەتیدەر دەبێت لە دروستکردنی ئەو وەك ئەوەی بارێکی گەورە بێت بۆ باوکی و مەسیحیەکان لە کاروانسەراکەدا. چونکە سەرۆکی ژمارەیەك چەتە و شەقاوەی هاوتەمەنی خۆی بوو، بەردەوام شەڕیدەکرد و زۆر کەم بە قسەی باوکی دەکرد. دایکی مرۆڤێکی زۆر بەڕێز بوو، ئەوەی نانی بۆ من دروستدەکرد، لێی بێ ئومێد بوو، چونکە تەواو لە دەستی دەرچووە و چۆن شادمان بووە لە گەڵیدا. خۆی کردووە بە گەورەترین ئازاردەری مەسیحیەکان، جۆرە سەرانەیەکی لەسەر داناون، کە داوایدەکرد و وەریدەگرت جارێ دوو جار لە هەرکاتێکدا. بۆ نمونە دێ بۆ لای حەبیب، داوای کرێکەی دەکات و ئەگەر ڕەتکرێتەوە، وەك ئەوەی هەندێ جار ڕوودەدات، خۆی هەڵدەداتە سەر کۆڵی ئەو پیاوە کولۆڵە و نیوە خنکاوی دەکات، یان بەناو دوکانەکەیدا رایدەکێشێت، کاتێ کە دەڕوات هەموو شتەکانی تێکومەکان داوە. ئەگەر سزا بدرایە، بە توڕەییەوە دەهاتەوە بۆ شەڕکردن و باشترین مامەڵە لەگەڵیدا ئەوە بوو دوو پێنسەکەی بدەیتێ. کاتێ هات بۆ لای من، بە ئاسایی من دۆستایەتیم لەگەڵ هەموو قوربانیەکانی ئەودا هەبوو، بەڵام ئەو هێشتا کاتی دەدۆزیەوە بۆ دەورەدانی کاروانسەراکە و پەیداکردنی نەفەرێك یان دووان لە دانیشتووەکان. ئەو منداڵێکی هەورامی بوو، کە تیرەیەکی کوردستانیە و کورد نییە، کە دەڵێن لە نەوەی خودی ڕۆستەمن و شوێنی بنەڕەتییان دەبێت دەماوەند بێت. دەرودراوسێکان شادمان نەبوون بەتایبەتی لە هاتنی ئەو، چونکە ئاژاوەی دەخستە ناوچەکەوە و لە هاویندا سەربانەکانی دەکرد بە شوێنی یاری منداڵان، هێرشی دەکردە سەر حەوشەکان و هەموو منداڵە بێدەنگەکانی فێری ئەو یارییە دڕندانەیە دەکرد کە خۆی حەزی لێیەتی. ژنەکان لە ترسی ئەو ڕاوەستان، چونکە کاتێ ڕاسپاردەیەك دەنێرێت بۆ خواستنی قاپێك یان مەنجەڵێك، کە ئەوە تەواو ڕاسپاردەیەکی شیاوە لەم ناوچەیەدا، بۆ ماوەی یەك سەعات بە گاڵتەپێکردنەوە دەمێنێتەوە.

بەپێی نەریتی سلێمانی، لەکاتی ڕۆژدا تەنیا ژنان لە ماڵەوەن و لە گەڕەکەکەی ئێمەدا، کە وردە بازرگان و دوکانداران دەژیان، پیاوەکان بەیانی زوو دەردەچوون تا ئێوارەیەکی درەنگ.

منیش ئارەزووەکانم سەرقاڵی دەکردم و کەم دەچوومە دەرەوە لە هەندێ ڕۆژدا لە هەفتەکەدا و وەك ئەوەی ناسراوم و بوونی پیرەژنێك لە ماڵەکە ڕەفتار و ڕەوشتمی نەدەبووغزاند، هەندێ لە ژنانی

# نانکردن

دانیشتوانی دەوروبەر کە زۆر سەرقاڵ نین و بەشێك لە کاتی خۆیان بە دەمەتەقێوە بەسەردەبەن. زوربەشیان خەڵکانی خۆشحاڵ و شادمانن، وەکو هەموو ژنانی کورد، ئازادن لە هەر کاریگەرییەکی قسەکردن یان رەفتارێك، ئەوەی مەبەستێتی دەیڵێت بەبێ شاردنەوەی گۆشە رەق و نەرمەکانی بابەتەکە- دەیڵێت کاتێ رێك تەماشای چاوی یەکتر دەکەن، ئینجا دەدوێت- و لە دڵەوە پێکەنین و گفتوگۆکردن بە میهرەبانی لە وتوێژی کوردیدایە، بەبێ نیشانەی ئەوەی کە ئێمە پێیدەڵێین "چاوباشقاڵی" نە هیچ جۆرە فێڵ و تەڵەیەك.

رۆژانی نانکردن کاتێکی گونجاو بوو بۆ کۆبوونەوەیەکی رێکوپێکی ئاوا و کاتێ لە ماڵ بوومایە دەچوومە ژوورەکەی خۆم. ژنە نانکەرە پسپۆڕەکە بەیانی زوو لەگەڵ کیسەیەك ئاردا دەهات، ئیدی غەفوور، منداڵە تورە و ترۆکەیان دەنارد بۆ ئەو دەوروبەرە تا تەشتێکی مس لە یەکێ لە دراوسێکان بخوازێت، یەخسیرکراوەکەی کە ئەو بە ئاسایی نیشانەی دەنارد بە لێدانی ئەو لایەی کە دەزرنگایەوە بەدرێژایی رێگاکە تا شەقامەکە. ژنە نانکەرەکە لەم کاتەدا لای پیرێژنەکە چایی دەخواردەوە و گوێی لەو چیرۆکە دەگرت کە زۆرجاری تر بیستوویەتی لەبارەی مردنی کوڕەکەی لە رێی بەغدا و هەڵڕشتنی فرمێسکێك یان دوو لە هاوسۆزیدا. بە دەرکەوتنی غەفوور، ژنە چاکەی وازلێهێنا- چونکە ئەو کە هیوادارم هێشتا وابێت ژنێکی سەرقاڵ بوو- و دەستیکرد بە تێکەڵکردنی ئاردەکەی. ئەم پرۆژەیە هەمیشە لەو تەنوورییانە بچووکەدا لەناو دەرگای حەوشەکەدا جێبەجێدەکرا، ئیدی کاتێ دراوسێکان، کە لە کاروباری ماڵ دەبوونەوە، دەهاتن و ئاسایشە کە حەزیاندەکرد یارمەتی بدەن. ئەگەر ئەوەیان نەکردایە، غەفووریان دەنارد بێزاریان بکات، کارێك کە ئەو بەتەواوی پێیدەزانی، چونکە بۆ نانکردی نانە باشەکەی دوو یان سیانی دەویست و وەك ئەوەی ئێمە تەنووری ناو زەویمان نەبوو، یەکێکی تر دەبووایە گەرمیکردایە و ئینجا هەڵبەتە ئەوانیتر کە کەمێك نانیان هەیە بیکەنەوە، داوای پیاوەتیان دەکرد، کە لەوێ پێوەبیدەن دوای ئەوەی ئێمە، لە تەنوورەکەی هێشتا گەرمە، چونکە بۆ گەرمکردنی پارەی تێدەچوو، هەلی نانکردن بە ئاگری کەسانی تر هەرگیز لە کیسی ژنی ماڵی باشی کورد ناچێت.

وەك دەستورێك چەند یارمەتیدەرێکمان هەبوو لە کارەکە بۆ شێلانی هەویرەکە و گونك کردن، ئامادەیە بۆ پانکردنەوە و بەتەنکی، ژنی دارتاشەکەی بەرامبەرمان، کەسێکی پتەو، ئیشکەرێکی بەهێز و کاری گرانیشی دەکرد، پێنج منداڵی هەبوو، کە بە خاوێنی و رێکوپێکی پاراستبوونی،

# گوڵچین

دووانیان زۆرکات لەگەڵیدا بوون، سەر و قژیان زەرد و لول لەگەڵ چاوی شین باو و گۆنا سوور هەڵگەڕاو کە تەنیا لەناو کورد و فارسدا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لەو خەڵکانە بەدیدەکرێت. ئینجا دوو خوشکیش لە تەنیشتمانەوە بوون، خێزانی دوو برا بوون کە قاوەخانەیەکیان هەبوو، خەڵکانێکی تەمەڵ کە لەو ناوەدا دادەنیشتن و جگەرەیان دەکێشا. زۆر جار یەکێ، عادیلەی ژنی بەرپرسی قاوشی منداڵان کە لەو ماڵەدان منی تێدا دەژیم، تەماشا دەکات، بەڵام کەسێکی لوت بەرزە، لە قەیفە و ملوانکەی زێڕ و ئەنگوستیلەی ئەڵماس، نازدارەکەی گەڕەکەکەیە، کە ناوبانگی خۆی بیستۆتەوە. بە دڵنیاییەوە زۆر جوان بوو، هەروەها سیفەتێکی تری هەبوو وەك زۆر ژنانی کورد کەڵەگەت تر بوون بەسەر هاونەژادانی هاوسێکانیاندا، هەروەها باڵا بەرز و رێك بوو.

بەڵام باشترین لەو ژنە جوانانەی سلێمانی- لەبەرئەوەی خەڵکێکی زۆر باشە- گوڵچین بوو، گوڵچین رۆح سوك و دڵسۆزە. کچێکی کەڵەگەتی نزیکە هەژدە ساڵان بوو، کەمێ لە جوانیدا رەنگ کاڵ بوو، بەڵام سەروسیمایەکی رێکوپێکی هەبوو. لە پاشەملە لە گەڕەکەکەدا باسیاندەکرد لەبەرئەوەی رۆح سوکە و لەم ماڵ رایدەکرد بۆ ئەو ماڵ، زۆری لە غەفووری خزمەتکارم دەچوو، دەمە دەمێ و گاڵتەوگەپی دەکرد. هەروەها کورتە مێژوویەکی تەواو غەمگینی هەبوو، بەڵام لەژێر رەفتاری لامسەرلاییدا پەژارەکەی شاردبۆوە، کە زۆرجار فرمێسك لە چاوەکانی دەباری کاتێ ژنە بێ رەحمەکانی تر تانەیان لێدەدا، ئیدی هەڵدەهات بۆ ماڵەکەی خۆی و لە گۆشەیەکدا دادەنیشت تا کەف و کوڵی گیانی دەنیشتەوە و کەمێ ئارام دەبۆوە، بەڵام هێشتا ئامادەیە کەسانی تر ببینێتەوە.

ژنی تۆفیق ناوێك بوو، کوڕێکی قۆزە کە شوێنێکی لە حوکومەتی ناوخۆدا هەبوو، ماڵێکی گەورەیان هەبووە و زۆر شادمانبوون پێکەوە و منداڵێکی بۆ هێناوەتە دنیاوە. بێبەختانە خەسوی و نەنکی لەوێ بوون، کە هەریەکەیان رقیان لە گوڵچینە، هەموو زیرەکی خۆیان یەکدەخست تا ئەو دەربەرێنن. بۆیە قسە و باسیان لەبارەی ئەوەوە بڵاوکردەوە، بۆ ئەوەی هۆیەك بدەن بە مێردەکەی و لە هەمان کاتدا بە یارمەتی پیاوێکی ئایینیەوە هەندێ لایەنی کەموکوڕیان لە پەیوەندی هاوسەریەکەدا دۆزییەوە. لەگەڵ ئەوەی لەبەر دەستیاندایە، بەردەوامن لە بڵاوکردنەوەی ئابڕوبەرییەکە، تا مێردەکە لە خەڵکانێکی ماقولی دەبیستێت، بە توڕەیی هاتە سەر گوڵچین.

ئەو کچێکی بەهۆش بوو، لەسەرو ئەوەشەوە بێ تاوانە، بەشێوەیەکی ئاسایی وەڵامێکی راستی دەدایەوە، شەڕێك لەو کاتەدا بەرپابوو یەك دژی ئەوی دی. پیرەژنەکە لەو کاتەدا هات بۆ لای تۆفیق لەگەڵ لکەی پەیوەست و لە چرکەساتێکی گونجاوی تورەیی و هەڵچوونی ئەودا و هانیاندا و ناچاریانکرد کە لە ژنەکەی جیاببێتەوە.

بەوشێوەیە دووچاری دەرکردن هات و لە جلوبەرگی باش و زێڕ و زیوەکانی داماڵڕاو، کە دەیتوانی لەگەڵ خۆیدا بیانبات، بەڵام ئەو رەتیکردەوە، گوڵچین هات بۆ ماڵی پورە عاسیمە خانی دراوسێم، کە نەوەی بنەماڵەیەکی ئایینپەروەری کۆنی هەکاریە و هەر لەبەرئەوەشە کە ناونیشانی "خان"ی پیاوانەی هەڵگرتووە.

لێرەدا گوڵچین ئاستەکەی دابەزی بۆ کارەکەرێکی پێشکەوتو، دەبوو کاروباری ماڵەکەی بکردایە، بەڵام مامی جلوبەرگی دەدایە و پارێزگاری دەکرد، چونکە عەبدوڵڵا پیاوێکی بەڕێز و ڕێزدارێکی بەتەمەنی گەڕەکەکە بوو.

ئەگەر رق و کینەی گوڵچین دژی مێردەکەی بەردەوامبووایە، بۆ ئەو زۆر باش بوو، بەڵام بێبەختانە، ئەو کچێکی ئەوەندە باش بوو قینی لە کەس نییە و ئەویشی بەڕاستی خۆشدەویست، بۆیە فرمێسکی پەشیمانی و یادەوەری دەڕشت. خراپترین حاڵەت بۆ ئەو ئەوە بوو لە چرکەساتی نەرم و نیانیدا گریی دڵی خۆی لای ژنانی تر دەکردەوە و بووبوو بە بابەتی گاڵتەپێکردن، بێگومان تەواو رووخۆشە، بەڵام ئازاربەخش هەمووی یەکە و ئەگەر ئەو بە ئاسایی رۆح سوك نەبووایە ئەو شتە بەرەو ژیانێکی پڕ پەژاراوی رابەریدەکرد.

ئەوەی کە رێزی لای هاوسێکانی لەناوبردووە ئەوەبوو، کە لە رۆژانی گەرمادا بەبێ سەرومێزەر لەماڵ دەهاتە دەرەوە، تەنیا سەرپۆشێکی تەنکی دەبەست، کە قژە چڕوپڕە درێژەکەی و دە دوانزە پرچە هۆنراوەکەی بە تەواوی دانەدەپۆشی و بەدەرەوە بوون. بەڵام ئەو بەتەواوی راستگۆ بوو، ژنی بێ ئابڕوو لە سلێمانی بەدەرە و ئەو گاڵتەی بەوانە دەهات کە قوربانیان بە ئاسودەیی داوە بۆ هەڵەی خاکێتی.

غەفوور سەرکەوتوبوو لە گەڕانەکەیدا بەدوای یەکێکدا تا جلوبەرگەکانم چاکبکاتەوە، ئەوی راگرت بۆ ئیشەکە و ئەویش هەندێ لە کاتی بەیانیانی خۆی لەگەڵ پیرەژنەکەدا بەسەردەبرد، زۆرجار دەستی لە ئیش بەردەدا تا یاری لەگەڵ منداڵەکە بکات.

# پزیشکی ساختە

شێوازە بنەڕەتیەکانی هەندێ جار وابوو، چونکە کەم ئارام بوو. بەیانیەك خۆی کرد بە حەوشەکەدا لەو چرکەساتەدا کاتێ من بینیم پارچەیەك دڕاوە لە قۆڵی کرسێك و بانگمکرد کە بۆم چاکاتەوە. وتی قوماشی سپی نییە و پارەشی پێ نییە تا هەندێ بکڕێت و غەفووریش لێرە نییە تا هەندێ لە بازاڕ بهێنێت، پارچەیەکی لە شتەکانی خۆی دڕی و ئیدی بەهۆی ئەوەوە پێستێکی سپی دەرکەوت، لە شەرما سوورهەڵگەڕا و رایکرد تا لە گۆشەیەکدا بیدورێتەوە.

ئەوەندە نەبوو دوای یەکەم سەردانم لە پۆلیسەوە، کە سەید نووری دیسان هاتەوە. ئەم جارەیان ئەو بەبێ ئاگاداریی پیرە مستەفا بەگە هاتووە و تەنیا جۆرێ یاوەری نەهێنی لەگەڵدایە، کە خزمەتکارێك و پیاوێکی پیری رەزاگران کە وەك هۆیەك بۆ سەردانەکەی پێشکەشیکرد، چونکە ئەو وتی دەیەوێت بە منی بناسێنێت لەبەرئەوەی پزیشك بووە و منیش شارەزاییەکی بەرچاوم هەیە لە زانستیدا. کەسێکی پیری رمۆزن بوو، لەگەڵ لوتێکی چەماوەی زل، بەڵام تەنیا سێ ددانی زەردهەڵگەڕاو لە چاوە بچووکەکانیدا و دیدێکی شەڕەنگێزی هەبوو. وەکو هەموو هاوشێوەکانی خۆی بە تایبەتی لەناو سلێمانیەکاندا، دەستیکرد بە ژمارەیەك پرسیاری پەیوەندیدار بە خودی منەوە، بەڵام گومانی بنەچەیی رێی نادات باوەڕ بە وەڵامەکانی زووربەی بکات و دواجار پرسی ئایا من پاسپۆرتم هەیە، کە وەڵامم بە ئەرێنی دایەوە. سەید نووری لێرەدا پێی بڕی و رەخنەی لەم پرسیارکردنە گرت، لەگەڵ ئەوەی ئەو خۆی بەدەرنییە لە پرسیارکردنی تایبەتی و دوژمنکارانە، بەڵام کاتێ کەسانی تر ئەوە دووبارە بکاتەوە ئەم تاوانباریان دەکات.

زەلامە پیرەکە لێیچووە پێشەوە و وتی، " ئەگەر ئێمە بتوانین پاسپۆرتەکەی ببینین، ئینجا دەبێ بزانین کە ئەو چییە"- بەڵام من قسەم پێ بڕی بەوەی پێموت من دمرزەنێك پاسپۆرت لە گیرفانمدایە، کە نابێت پیشانی ئەوی بدەم، تێبینیەکە بۆ سەید نووری رابواردنە و رەنجاندنی پیرە پیاوە. ئیدی وتی ئەو هاتووە بۆ ئەوەی پێشنیارێك بکات. لەوە دەچوو کتێبێکی عەرەبی کۆنی هەبێت، کە باسی زانستی پزیشکی دەکات و عەرەبەکان تێیدەگەن، بیردۆزەکەی یۆنانی کۆن بۆ گەرمی و ساردی، میزاژی گەرمی و ساردی، لەگەڵ پۆلێنکردنی هەموو نەخۆشیەکان لەژێر دوو ناونیشان و چارەسەرەکان لەلایەن ئەو داودەرمانانەی کە لەم بارودۆخەی لەشدا دژن. ئەو پێشنیاریکرد کە دەتوانێت ئەو کتێبە بە بەرهەم بێنێت و لەگەڵ گژوگیایەکی هەڵگیراودا کە لە جولەکەکانی کڕیوە، بە شەریکی لەگەڵ مندا، بەرەوپێشچوونی ئەو کارەش کە ئەو دڵنیایکردەوە"

گیرفانەکانمان زۆر بەخێرایی پڕدەکاتەوە، چونکە کۆمەڵێك لە بەهەرەی ئەورووپی و رۆژهەلاتی هەموو نەخۆشەکانی خەڵك دادەپۆشێت و دابینکردنی جێگرەوەیەك بۆ ئەو حالآتانەی کە ناتوانرێت ئێستا دەستکاری بکرێت، ئەوەش بەشێکی پارێزراوانی دانیشتوانە کە بەرپەرچی "پزیشکی نویێ" دەدەنەوە.

هەر کە ئەلوانی ئەو جۆرە یەکبوونەم زیاتر پێشاندا، کە بەشەکانی زۆر دژبەیەکە و تەنانەت دەبێت پێکەوە پیایدا نەچینەوە، زیاتر ئەو سوور بوو لەسەر روونکردنەوەی بۆچوونەکەی، کە من ترۆم، رێمداوە بە بەغیلی پیشەیی کە هەلی بەختم تێکبدات، منیش وەلآمدایەوە من تەنانەت پزیشك نیم- هەردووکیان پێکەنین بە قەشمەرییەوە و بوتڵەکانیان بەرزکردەوە بۆ سەر سەریان وەك نیشانەی سەلماندنێکی گومان لێنەکراو. "پزیشك"ەکە بەتەواوی سەرنەکەوت لە تێگەیشتنی ئەوەی کە من بۆ پەیوەندی پێوە ناکەم و توڕەییەکی بەرچاوی پێشاندا لە ئەنجامی رەتکردنەوەی بەردەوامی مندا، ناڕاستەی هەموو پۆزیشەکانی منی خستە لاوە- کە من رۆڵی تێدا نابینم، تەنانەت ئەگەر شتێشم لەبارەی پزیشکیەوە بزانیایە، کە برێکی کەم داوودەرمانم پێیە، هەروەها بەم نزیکانە من سلێمانی جێدەهێڵم و بەو شێوەیە.

"دەرمان نییە" ئەو وتی، " هەندێ خوێی ئیبسۆم و فیناسیتین بکڕە، کە باشە وەك شتێیەك لە بازرگانیدا وەك دەتەوێت و هەر شتێکی تر کە تۆ لەوانەیە بتەوێت، بۆچی ئێمە جۆرە رێکخستنێك نەکەین. ناوەکان زۆرن و لەوەناچێ یەك لەوی تر خراپتر بێت لە شوشەیەکدا بە هەمان شتەوە."

کابراکە بەشێوەیەکی ئەوتۆ فشاری دەهێنا کە من نەمدەزانی چۆن خۆمی لێ رزگاربکەم، کاتێ لادانێك لە سەید نووریەوە هات. بەناو ژوورەکەدا دەسوڕایەوە، شەشپالۆیەکی بچووکی لە خاکێکی زەردباو دۆزییەوە، وتی ئەوە بۆچی بەکاردێت، بۆم روونکردەوە کە ئەوە پارچەیەکە لە خاکی گۆڕە پیرۆزەکەی عەلی، ئامێرێکی نوێژکردنە و نابێت هیچ موسڵمانێکی شیعەی باش دەستبەرداری ببێت.

"چی! نوێژ بۆ ئەوە دەکەیت؟" هاواریکرد.

"نەء" من وەلآمدایەوە، " بەلآم لە بەردەمماندا دەیخەینە سەر زەوییەکە. وەك دەزانن، لەناو سونیەکاندا ناوچەوانتان لە نوێژکردندا دەنێنە سەر زەوییەکە، ئێوە لەسەر هەر خاك و تەپوتۆزێك سوجدە دەبەن. ئێمەش هەمان شت دەکەین، بەلآم بە خراپی نازانین ئەگەر پارچە خاکێکی پیرۆز لەنێوانی ناوچەوانمان و زەویەکەدا بێت، تا کە ئێمە دەست لە زەوی دەدەین لەوانەیە سەرمان زیاتر

ئاسودەبێت لەسەر خاڵە زۆر پیرۆزەکە لەوەی لەو شوێنەی تێیداین و لە هەمان کاتیشدا یادی پیاوێکی مەزن و پیرۆز و شەهیدیش دەکەینەوە کە لای سونەش بەرێزە."

"ئای" هاواریکرد، " نوێژکردنی شیعە ئاوایە! بۆچی، من پێت دەڵێم کابرا، ئەوە بتپەرستی و کافرێتیە. نوێژەکە بێ بایەخە و بەردەوام لەو شتانەی دەوت و تۆ لە مەترسی تۆڵەسەندنەوەی سامناك و هەمیشەییدا وەستاوی بۆ ئەم جۆرە تاوانە."

" ئێوەی شیعە" ئەوەی بە گەرمییەوە وت،" ئەو خەڵکەن کە نەفرەت لە ناوی عوسمان و عومەر و ئەبوبەکر دەکەن و سەرزەنشتی ئێمەش دەکەن، بەیانیان هەڵدەستن لەگەڵ شتی خراپ بە دەمتانا دێت دژی ئێمە و چاوتان ناچێتە خەو تا نەفرەت لە ئێمە نەکەن!"

کوڕەکە هێمنی خۆی لە دەستدا و دەستی دەگێڕا بۆ خەنجەرەکەی، بەڵام "پزیشکەکە" باشترین کارێك کە کردی ئەوی لە ژوورەکە بردە دەرەوە، پێی دەوت کە ئەگەرچی هەندێ لە شیعەکان ئەوە بکەن کە ئەو وتی، من لەو جۆرە سەرکێشانە نەبووم و بەهەرحاڵ نابێت من بەرپرسی کارو کردەوەی کەسانی تر بم.

" ئیدی لێیگەڕا دوویەرەکی ئایینی وازلێبێنێت،" ئەو بۆڵەی دەهات، بەڵام پیرە پیاو وەڵامی خۆی ئامادەبوو بۆ ئەوە:

وتی " ئەی نابێت دوای باوباپیری بکەوێت؟ و لەگەڵ ئەواندا نەفرەت لێکراو یان رەحمەت لێکراو بێت؟ ئێستا بۆ کوێ هەڵبێت، راستەوخۆ دەستبەردار بێت لە مەزهەبە نوێکەی و بڕوات. با ئەوە بێت کە هەیە، من دەڵێم، ئەو هەوڵی بڵاوکردنەوەی باوەڕەکەی خۆی نەداوە، لێیگەڕێ بەشێوەی خۆی نوێژبکات، تاوانکردنەکە دەکەوێتە سەر ئەو بۆ بەردەوامی و خێرەکەشی بۆ تۆیە، چونکە تۆ هێمات پێکردووە."

لەگەڵ ئەوەدا هەستاو جێیهێشت و کوڕەکەش حەزی لە مانەوە نەکرد و دوایکەوت، بە سپاردیەکی ناشرینەوە ماڵئاوایی لێ کردم لەگەڵ دوعای شەڕدا. ئەوە دواجار بوو کە هاتە ماڵەکەمەوە، چونکە رۆژێ یان دوو رۆژ دواتر، شێخ ئەحمەد دانرا بە قایمقامی چەمچەماڵ و کوڕەکەی لەگەڵ خۆیدا برد.

بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ لە ئاسایشدا نەبووم. تەنیا چەند بەیانیەك دوای ئەوە، دوو پۆلیس پەیدابوون، لەگەڵ پەیامێك لەلایەن قۆمیسەری پۆلیسەوە، کە دەخوازێت هەر ئێستا ببینێت. هەستمکرد کە ئەو مەراقی پاسپۆرتەکەمی هەیە، منیش دوایانکەوتم، سەیرە چی دەوێت. لە

دوكانی بەرگدروییەكدا لە بازاڕدا دانیشتبوو، پیاوێكی قەڵەو، لەگەڵ تیلایەكی فێلاویی لە چاوە شینە گچكەكانییەوە و دەمیشی لەژێر سمێڵێكی زەردی چڕدا شارابۆوە.

ئەو تەنیا توركی و عەرەبی دەدوا و هەر گەشتمە لای، وەك جاران گفتوگۆی لەگەڵدا كردم.

پرسی، " پەساپۆرتت هەیە؟" ئەگەر هەتە بۆچی پێشانی منت نەداوە؟"

" چونكە تا ئێستا تۆ داوای ئەوەت نەكردووە، نە هیچ شتێكی نایاسایم كردووە ئەوەتەی گەیشتومەتە ئێرە، بەشێوەیەكی ئاسایی داوابكەیت پێشانی دەدەم."

" باشە دەمەوێت بزانم چی دەكەیت لێرە- بۆ هاتویت، بۆ نارۆیت، لەكوێوە هاتویت، ناوت چییە، خۆتان---"

"ئەمانە،" و من دەستمپێكرد، " هەموو كەسێ لە سلێمانیدا جگە لە خۆت دەزانێت من هاتووم بۆ ئێرە بۆ ئیشوكاركردن و هەندێكیشم كردووە و زۆرتریشم دەكرد ئەگەر ناوچەكە كەمێ زیاتر ئاسایی و ئارام بێت. لە كەركوكەوە هاتووم و وەك خۆت لەهەمان كارواندابووی كە منیش پێی هاتووم تۆ دەبێت ئەوە بزانیت و هەروەها لە كەركوكدا پاسپۆرتەكەم بینراوە مۆریشكراوە، زانیاری ئەوەشت نادەمێ كە لەكوێوە هاتووم، چونكە كاری تۆ نییە، هەروەها بۆچی نارۆم، من تەمەنناەدەكەم بەم زووانە برۆم بۆ بەغداد- كاتێ سوپای توركیی ئازا بتوانێت پاشەكشێ بە هەمەوەندەكان بكات تا ڕێگاكە بكرێتەوە."

ئەم جۆرە گفتوگۆیە لە بازاڕێكی واڵادا و لەناو كۆمەڵێك لە كوردەكان، نیوەی لەوانە تێدەگەیشتن، ئەو چاوەڕێی ئەوەی نەدەكردو تۆزێ نەبرەی دەنگی گۆڕا، لەوەی كە لەسەری ڕاهاتبوو.

"وتی: "باشە" بەهەرحاڵ من دەبێت پاسپۆرتەكەت ببینم، باشتروایە بیهێنیت."

بۆیە، لەگەڵ پۆلیسێكدا چوومەوە بۆ ماڵەوە و پاسپۆرتە ئینگلیزیەكەم و پاسپۆرتە توركیەكەم هێنا كە دەدرێ بە هەموو ئەوانەی لەو وڵاتەدا سەفەردەكەن. كە دووچاری خراپی ببوو لەئەنجامی باش بەكارنەهێناندا، ناوەكە باش نەدەخوێنرایەوە، هەروەها وردەكاری ئاین و شوێنی لەدایكبوون.

ئەوانەم بۆ برد بۆ ئەوێ و دوای ئەوەی پاسپۆرتەكەی تاووتوێكرد و دوای ئحمكردن و منگە منگ كردن، وتی:

"بەڵێ، ئەمە زۆر باشە، بەڵام شتە بچینەیەكە پێناسەی پاسپۆرتە. ئەو لەكوێیە؟"

منیش پاسپۆرتی وەزارەتی دەرەوەم پێشاندا، كە هەروەها كوردەكانی ئەوناوە گرنگیان پێدەدا.

وتی: "ئەوە،" پەساپۆرت نییە، ئەوە تەنیا گوزەرنامەیەكە لە حوكومەتەكەتانەوە بۆ سەفەركردن."

## لێپرسینەوەیەکی پۆلیس

منیش وتم: "باشە،" دەتوانی بیخوێنیتەوە؟" تێبینیەك کە تریق و هوڕی لە گوێگران هێنا.

"نەء" وەلاّمیدایەوە، هەلّبەتە ناتوانم."

"کەواتە،" من وتم، " تۆ دەبێت قسەی من وەرگریت یان داواکە بەتالّکەیتەوە، ناتوانی لۆمەی من بکەیت لەبەرئەوەی تۆ ئینگلیزی نازانیت. من ئەوەم بەیانکرد کە هاوولاّتیەکی بەریتانیم و ئەوەش پاسپۆرتە بەریتانیەکەمە، لەگەلّ فیزەی قونسۆلّی تورکی لە لەندەن لەسەر پشتەکەی و ئەوەش ناوەکەمە "غلاّم حسێن" لەسەری و هێمام بۆ شوێنی ناوەکەم کرد بە زمانی ئینگلیزی.

وتی: " باشە، لەوانەیە وابێت" بەلاّم هێشتا ئەوە پاسپۆرتی کەسێتی نیە وەك ئەوەی هەموومان پێمانە و کە پێویستە بۆ دیاریکردنی ناسنامە."

منیش وتم: " وەك بەلّگەیەك،" " ئەوەتا لەبەردەمی تۆدا."

تا رادەیەك سەغلّەتە، ئەو دەستیپێکرد:

"نەء! نەء! ئەوە نییە، ئەمە پاسپۆرتی گەشتوگوزارە، کوا بەلّگەی ئەوەی کاتێ تۆ خزمەتی دیاریکراوی خۆتت لە سەربازیدا تەواوکردووە؟"

وتم: "باشە،" ئەوە من نیمە."

"ئۆی! ئۆی! بۆ نەء؟"

" بەسادەیی لەبەرئەوەی ئێمە شانازیدەکەین کە لەژێر چاودێریی تورکدا نین، نابێت خزمەتی سەربازی بکەیت تا خۆمان نەمانەوێت و داواشمان لێناکەن کە بەلّگەی خزمەتکردنی سەربازی لەگەلّ خۆماندا هەلّگرین، چونکە ئێمە ملکەچ نین دادگایکردن و پشکنین و سەغلّەتکردن لەژێر فرمانی تورکیدا و زۆر لە ئێمە لێرە هەیە و زۆر شتمان هەیە کەپێویستە بیکەین، کات و پارە بەفیڕۆدان بۆ رازاندنەوەی یەکێکی وەك خۆت بۆ ئەوەی ئازار و ئەشکەنجەی ئێمە بدات."

پۆلیسە ئەفەندیە هەژارەکە هەرگیز لەوەپێش ئاوا سوکایەتی پێنەکراوە و تورە بوو. کوردەکانیش چێژیان لە بارودۆخەکە وەردەگرت و یەکێ یان دوو کەس ئامۆژگاری پۆلیسەکەیان کرد کە واز لە من بهێنێت، چونکە ئەوە تەواو ئاشکرابوو کە من بەتەواوی سەرانە و رەشوە نادەم بەو.

پاسپۆرتەکانی منی لە دەستایە و بۆ چرکەساتێك بەنادلّنیاییەوە راوەستا، ئیدی بیری لەوە دەکردەوە کە کۆتایی بە کێشەکە بهێنێت، منیش وتم:

" چیت دەوێت؟- پێم بلّێ و لەوانەیە بتوانین ئاکام بگرین."

" چیم دەوێت؟" هاواریکرد، " بۆچی، رەزامەندی من لە بێ هیوایی من بە تۆ، بەڵگەی ناسنامەی تۆ و کەفالەتی ئەوە دەکەم کە تۆ کەسێکی دوژمنکار نیت، من دەبێت تاقیبکەمەوە!"

وتم: "باشە"، لێگەڕێ یەك چارەسەرم هەیە، بەڵام نەك پێش ئەوەی من موتەسەڕیفەکە دەبینم. وەك کەسێکی بێگانە داوای مافی خۆم لەو دەکەم لە چاوخشاندنەوە بە مەسەلەکەمدا و وەك ئەوەی دەزانن قونسۆڵی بریتانی لەماوەی چەند رۆژێکی داهاتودا دێت (ئەو پڕوپاگەندەیە لە بازاڕدا بڵاوبوو) و سکاڵا لەسەر تۆ تۆماردەکەم و رێگای تۆش ئەوسا ئاسان دەبێت."

" زۆر باشە،" ئەگەر دەتەوێت کێشەکانت زیاترکەیت، یاڵا دەی."

ئیدی پێکەوە بازاڕمان جێهێشت و بە شەقامێکی دووردرێژی جەنجاڵدا بۆ قەراغ شار رۆشتین. ئەو بوو بە دۆست. دەستی گرتم و ماوەیەك دەستمان لەناو دەستی یەکدا پێکەوە پیاسەمان کرد کاتێ دووبارە لێیپرسیمەوە و ئەم جارەیان وەك هاوڕێ و بە شێوەیەکی دۆستانە، بۆچی من ویستومە بێم بۆ ئێرە.

وتم: " بۆچی" " لە چەرخی کۆندا، کاتێ بازرگانەکانی هەمەدان لێرە بوون، ئێوە لییێتان نەدەپرسینەوە و بەم جۆرە پرسیار و گومانانە سەغڵەتتان نەدەکردن و ئەوان کڕیار و فرۆشیاریش بوون و وەك ئەوەی من دەمەوێت ببم، کە وڵاتەکە زیاتر ئاسایش بێت. لە هەمان کاتدا چی دەتوانم من بیکەم بەڵام چاوەڕێی چرکەساتەکەم کاتێ ئاسایش رێ بە پرۆژەی بازرگانی بدات؟"

ئەو وتی: " لەگەڵ چی شوێنێك تۆ بازرگانی دەکەیت؟"

منیش وتم: " لەگەڵ سەقز و بانە، کویە و کەرکوك، پێنجوین و سنە، هەروەك خەڵکانی تر دەیکەن."

" چۆن ئەو هەموو شوێنانە دەزانیت، ئەگەر تۆ بێگانەیت و لە کوێ فێری زمانی کوردی بوویت؟ من دەترسم تۆ لەبارەی رابردووی خۆتەوە راست ناڵێیت، برای من، باشتر وایە بۆ یەك جار پێم بڵێ بۆچی تۆ لێرەیت. پاسپۆرتەکەت نوقسانە. من هیچ دوژمنایەتیەکی تایبەتیم بەرامبەر تۆ نییە، حەزدەکەم زۆر بتبینم و بەڵام گومانێکی بەهێز هەیە و ئەگەر ئێمە رەزامەند نەبین لەوەی کە تۆ زیانبەخش نیت، ئێمە پێویستە بتنێرین بۆ مووسڵ."

وتم: "باشە" " من دڵم نەچۆتە سلێمانیەوە و ئەو هەنگاوە دەخاتە ئەستۆی ئێوەوە، چونکە من وەك کەسێکی بێگانە دەبێت پاسەوانم لەوێ بۆ ئامادەبکەیت و لەگەڵ گەیشتنیشم حکومەتەکەشت پێویستە زیانەکانی بازرگانیم بۆ ببژێرێت کە بەهۆی ئەوەی لێرە وازم لە کارکردن هێناوە، لەگەڵ

ئەوەشدا، بە یارمەتی قونسوڵ، من دەبێت بتوانم راستەوخۆ سکالاّ پێشکەشی والی بکەم لە تۆو لە رەوشی تۆ.

لەگەڵ ئەوەدا گەیشتینە سەرا، یان بینای حوکومەت و بردمی بۆ نوسینگەیەکی بچووک کە سێ یان چوار تورك لەسەر کورسی بەبێ ئیشوکار دانیشتون. بەخێرهاتنیان کردم و هۆی سەردانەکەمیان پرسی و لەلایەن پۆلیسەکەوە زانیاریان پێدرا، بەگومانەوە تەماشای منیان کرد و لەهەمان کاتدا هەوڵیاندا ژوانێکم بۆ دیاریبکەن، پرسیم ئەگەر من پاسپۆرتم نەبێت. من روونمکردەوە کە هەموو پێویستیەکانی پاسپۆرتم هەیە، بەلاّم نەفامی بەرپرسیارێتی لەوە دەچێت هاوبەشبن لە کێشەکاندا. لەمەدا لە شێلگیرو رەنجاو دەچوون و ئارامی خۆیان پاراست.

هەر زوو ئەفەندیەکە گەڕایەوە و بردمی بۆ خوارەوەی مەمەڕێکی تاریك بۆ نوسینگەیەکی گچکەی تر کە تورکێکی قەڵەو بەناوی "تابور ئاغاسی" تێدایە و لەبەردەمیدا دانیشتم. دوو یان سێ کورد لەوێ بوون و هەر دەمزانی یەکێکیان هەلی بەدەست هانی پرسی کێشەکە چییە، لەکاتێکدا پۆلیسەکە بە تورکی بۆ پیاوە قەڵەوەکەی روونەکردەوە. پێم وابوو بەوپەڕی ئازادیەوە من نەفرەتی خۆم دەربڕی، چونکە کوردەکان زۆر بە توندی پێدەکەنین و پۆلیسەکە کە یەك وشەی کوردی تێنەدەگەیشت، بەخێرایی ئاوڕیدایەوە و پرسی من چی دەڵێم، لەو کاتەشدا تابور ئاغاسی پاسپۆرتە ئینگلیزیەکەمی سەربەرەوخوار دەپشکنی و گۆڕی بۆ دەگەڕا. زۆر گرنگی بە مۆر و بەڵگە جیاوازەکانی سەر پشتەکە دا و دواجار ڤیزەی قۆنسوڵی تورکی لە کرماشان دۆزییەوە، کە ماوەیەك بەرلەوەی ئەو ناوە جێبهێڵم بۆ بەغدا لێیدراوە.

لەوە دەچوو مۆرە تورکیەکە دڵنیایکردبێت، بۆیە منیش ئاماژەمکرد بۆ مۆری قۆنسوڵی تورکی لە لەندەن، کە لە نزیکەوە ئەویشی پشکنی. ئەوانە لەوە دەچوو کە گومانەکەی کپکردبێتەوە و بە پەیوەندی لەگەڵ پاسپۆرتە تورکیەکەدا دەرکەوت کە ئەوانی ئاسودەکردبێت و ئەوەشی بە پۆلیسەکە وت. ئەو کەسە- کە نەیدەتوانی بەڵگە جیاوازەکان بخوێنێتەوە جۆرە تەریقیەکی بەسەرداهات، بەلاّم لەو بڕوایەدام بەو پرسیارەی کردی دەیویست کێشەك بەرپابکات کە پرسی چۆن من بە کەرکوکدا هاتووم بەبێ پشکنین و بەبێ مۆری پۆلیس لەسەر پاسپۆرتەکەم. پاسپۆرتەکەم لێ وەرگرت و مۆری پۆلیسی کەرکوکم پێشاندا، بەلاّم نەیدەتوانی بیخوێنێتەوە و بەیانیکرد کە ئەوە ساختەیە، بۆیە منیش دام بەکوردێك، کە ئەو نوسینەکانی سەر مۆرەکەی بۆ بخوێنێتەوە، بەوەش تەنانەت تابوور

ئاغاسیش زەردەخەنەیەکی کرد و کوردەکانیش پێکەنین، چونکە من دەتوانم بەیانی تەواوی توانای قۆمیسەرێکی پۆلیس بکەم کە ناتوانێت مۆری هاوکارەکانی خۆی بخوێنێتەوە و دەبێ پەنا بەرمە بەر کوردەکان ئەوەی بۆ بکەن. لەو کاتەدا ئەویش میزاژی تێکچووە، منیش هەروەها، چونکە بەردەوام بووم لە پێشکەشکردنی تێبینیە ناشارەزاییەکان و دەستمکرد بە ئاخاوتن لەگەڵیدا لە زنجیرەیەك لەو شتانەی ئەو رانەهاتووە گوێی لێبێت، بەدڵنیاییەوە نەك لەبەردەمی کوردەکاندا، ئیدی پاسپۆرتەکەی فڕێدا و دەرچووە دەرەوە. تابور ئاغاسیەکەش بەخێرایی تەماشایەکی ئەو ناوەی کرد، چونکە بەئاسایی رەزامەند نەبوو لەسەر ئەو رەوشتە، بەڵام پیاوێکی نارد بەدوای پۆلیسەکەدا تا پێی بڵێت مۆریکات و پاسپۆرتەکەم تۆماریکات و لێمگەرێت بڕۆم، چونکە بەکردەوە زیانێکی تەواوم بە شوێنەکە گەیاندووە.

لەماوەی پێنج دەقیقەدا بەڵگەکە بە مۆرکراوی گەڕایەوە و داوای نیو مەجیدی کرد، دوا هەوڵدان. منیش وەرەقەکەم لــێ وەرگرت، خواحافیزیم لە تابوور ئاغاسی کرد و هەر کە لە ژوورەکە چوومە دەرەوە بە کوردی وتم کە لە مووسڵ پارەکە دەدەم کاتێ کە من دوورخرامەوە. تا ئەو کاتەی بۆیان کرد بە تورکی من دوورکەوتبوومەوە. شوێنەکە هەمووی ئەم مەسەلەیەیان بیست و لەگەڵ ریزێ لە کوردە هاوسۆزەکاندا رۆشتین، کە تێبینیە ناشیاوەکانیان لەبارەی هەموو پۆلیس و بەرپرسە حوکومیەکانەوە باسدەکرد، ئیدی منیش بەیانی باشم لــێ کردن.

لەوێوە چووم بۆ کاروانسەراکە و حەبیب و مەتی- م لە بارودۆخێکی ترسناکدا بینی، چونکە بیستوویانە کە من لە زیندان توندکراوم و سزایەکی مادی زۆریش دراوم و لەلایەن ئەوان و بازرگانە کوردەکانەوە پێشوازی کرام لەگەڵ گەرموگوڕییەکی زۆر هەر کە چوومە ژوورەوە، وا دەردەکەوت لای ئەوان وەك چۆن یەکێ خۆشبەختانە لە کارەساتێکی دیاریکراو بە رێکەوتێکی دەگمەن هەڵهاتبێت.

ترسی حەبیب دووچەندانە بوو، چونکە پۆلیسەکە، پێش ئەوەی بنێرێ بەدوای مندا، لە دوکانەکەی ئەو بووە و دەم و دوی ئەوی تاقیکردۆتەوە، هێمای بەوە کردووە کە لە میانەی کردەوە دۆستانەکەی لەگەڵ مندا، گومانی لێکراوە و خۆی دووچاری سزادان و خەسارە کردووە. بەگشتی حەبیب لە میزاژێکی پڕ ناسۆردا بوو، چونکە هاوەڵێکی پێشکەوتوخواز بووە، تورکی قسەدەکات، دۆستایەتی لەگەڵ بەرپرسە تورکەکاندا پەیداکردووە و پۆلیسەکە بەر لە مەتی کە هەر عەرەبی کوردی دەزانێت ئەمی سەغڵەتکردووە، بەڵام لە حەبیب زیاتر مامەڵەیەکی گەورەتری هەبوو لە مندا بکات. لەگەڵ

ئەوەشدا، کوردەکان و مەسیحیەکان هەلێکی باشیان قۆزتەوە بۆ دەربڕینی ئەوەی لۆمەی حەبیب بکەن چونکە حەزی بە نزیك بوونەوەی بەرپرسان تورك و تێکەڵبوونیان کردووە و هەر ئەوەش بەم ئەنجامە مەترسیدارەی گەیاندووە.

لەگەڵ ئەو کۆتاییە دڵخۆشکەرەشدا بۆ مەسەلەکە، دەمزانی بەدڵنیاییەوە دوژمنایەتیم لەگەڵ بەرپرساندا لە شوێنەکەدا بۆ خۆم سازاندووە و هەر چۆنێك بێت دەبێ خەمی بخۆم. لای من سلێمانی شەیدایییەکی تایبەتی نیە و هەرچۆن ولاتەکەش رۆژ بە رۆژ ئاژاوەی زیاتر دەبوو- هەمەوەندەکان ئێستا پۆستەیان سوتاندووە- ئەگەری کارکردن بەهیچ جۆرێ نییە، بۆیە بیر لەوە دەکەمەوە دوور برۆم. مەتی، کە زووربەی کێشەکانی منی هەڵگرتووە، رەشبین بوو، وای هەستدەکرد کە بۆ کەس باش نییە لە سلێمانیدا بمێنێتەوە. دەیوت ئەگەر ئێستاش نەڕۆن، دواتر بەزۆر دەبێ جێیبهێڵن، چونکە لەگەڵ شێخان و تورکەکان پێکەوە، نرخ بەرزدەبێتەوە، باجەکان زیاد دەکات و ئاسایش هەمیشە گومان لێکراوە، بازرگانیش نامێنێت و بەم زووانە نان دەستناکەوێت بیکریت و پارەش نامێنێت پێیبکڕیت.

دوای ئەوە هەستی بە دڵتەنگی دەکرد، چونکە هەندێ فەرشی کڕی تا بە ڕێی کۆی سنجاقدا بینرێت بۆ مووسڵ، کە رێگاکە کرابۆوە، بەلام لە رێ تالانکراوە. ئێستا ئەو زۆر بە توندی ئامۆژگاریم دەکات سلێمانی جێبێلم ئەگەر بتوانم، بەلام بۆ گرتنەبەری ئەو هەنگاوە لە هەمان کاتدا وابەستەی چەند هۆیەکە. یەکەم، حەمە هێشتا لە هەڵەبجەیە، جولەکەکە دووەم جارە رۆنەکانی نەهێناوە و لە گوندەکان کۆکراوەتەوە، دووەم، کاروبارەکە بەو شێوەیە جێبێلم، مەتی- ش ناتوانێت بەرپرس بێت لە وەرگرتنەوەی پارەکە. چونکە وەك ئەو بەڕاستی وتی، " خاوەندارێکی ئامادەنەبوو نیعمەتێکە بۆ قەرزدارێکی ناڕاست و بێ هیواییە بۆ بریکارەکەش" و ئینجا لە هەمووی خراپتر رێگاش نییە بۆ هیچ شوێنێك، جگە لە ئێران و من تا ئەم چرکەساتە نەمویستووە بۆ ئەوێ بچم. ئەگەر بمتوانیایە بگەمە کرماشان، لەوانەبوو ئەوە بکەم، بەلام رێگاکە بە جوانرۆدا بەتەواوی مەحاڵە و ولاتی کەلهوڕ سەروژێر بووە، کەواتە بەوێدا رۆشتن پرس و ڕای ناوێت. دەمتوانی بگەمە مووسڵ، بەلام من ئامانجم بەغدایە و رێگەش بۆ ئەوێ بە کفری یان کەرکوکدا بەتەواوی داخراوە، هەمەوەندەکان نایەڵن کەس بەوێدا تێپەڕێت. پۆستیش ئێستا بەیناو بەین دەڕوات و هیچ شتێك کە لە نامەیەك گەورەتربێت هەڵیناگرن، کە دەتوانرێت لە باخەڵی جوتیاراندا هەڵگیرێت و تەنانەت ئەوکات

هەمەوەندەکان گرتویانن و زۆر جاریش لێیاندراوە و نامەکانیشیان سوتاندووە. بۆیە هەموو ئەوەی بتوانم بیکەم، وەکو مەتی و ئەوانی دی بێدەنگ دانیشم و چاوەڕێکەم.

بەیانیەك حەمە بەجۆرێکی چاوەڕواننەکراو لەگەڵ چوار بار رۆندا پەیدابوو، کە من چاوەڕێم نەدەکرد، پاشماوەی ئەوەی مابوو بگات. هەروەها هەندێ تەنیشی بەدەستهێنابوو کە لە حسابی پێڵاوەکان کۆیکردبۆوە. هەروەها هەندێ هەواڵی سەرنجڕاکشی لەگەڵ شێخول ئیسلامدا پێبوو، کە کەسێکی ناپەسەندە، من چووم بۆ بیارە بەتایبەتی بۆ بینینی ئەو کە لە هەڵەبجە بووم. لەوە دەچێت حەمە پاشنیوەڕۆی رۆژێك وەك ئاسای چووبێت بۆ دیوانی عادیلە خانم و لەوێ شێخول ئیسلامی بینیبێت. بێ ئەوەی سڵاوەکەی حەمە وەڵامبداتەوە، پرسیبووی چیت کرد لەگەڵ مەسیحیەکەی ئاغاتا. ئەوەش ئاژاوەکی گەورەی نایەوە و حەمە بە زەحمەت زانی چی بڵێت. عادیلە خانم و عوسمان پاشا، کە هەردووکیان لەوێ بوون، رونکردنەوەیان دەویست و شێخول ئیسلام راستبۆوە و تاوانباری کردبووم، دەیوت کە منی لە ئەستەنبوڵ بینیوە، لەوێ جلوبەرگی ئەورووپی پۆشیوە، کە لەوێ دانی پێداناوە کە ئەورووپیە، کەچی لێرە لە جلوبەرگی موسڵماندایە و دەڵێت ئێرانیم. لە ئەستەمبوڵ، من دڵنیابووم کە ئەو ئەورووپی نییە. سەرکەوتو نەبوو لە تێگەیشتنی ئەوەی من چی بووم، بەڵام ئەو وای هەستدەکرد کە من لەوانەیە موسوڵمان نەبم و من دەبێ کڵێشەیەکی شەیتانیم پێبێت بۆ دۆزینەوەی رێبازی خۆم بە شێوەیەکی بێ وێنە پەیدابکەم بۆ ناوجەرگەی باشووری کوردستان، بەلای ئێراندا کە من شارەزایم تێیدا هەیە. دەستیکرد بە تاوانبارکردنم وەك سیخوڕێك، دروستکەری زیان و مەترسییە بۆ وڵاتەکە و کۆتایی پێ هێناوە بە هێرش بۆسەر حەمە لەسەر ئەو پەیوەندیەی لەگەڵ مندا هەیەتی. بەڵام ئەو زۆر بەپەلەبوو، چونکە بەرپەچدانەوەیەکی چاوەڕواننەکراوی لە عادیلە خانمەوە پێگەیشت. ئەو لە زۆر بۆنەدا نوێژکردنی موسوڵمانانەی منی بینیووە و بەبڕی ئەو قینەی شێخول ئیسلام ئەو داکۆکی لێکردووم، دەیوت کە ئەو بەتەواوی دەزانێت من فارسێکی شیرازم، راستیەك کە هەروەها بەڵگەیە بە گفتوگۆکەمدا و لەوەدا لەلایەن مەنسوورەوە پشتگیری کرا، کە مەسیحی بوونی منی بە توندی رەتکردەوە، چونکە ئەویش هەروەها بینیومی نوێژم کردووە و لە ژوورە تایبەتیەکەی ئەودا. ئەوانی تریش گەواهی باوەڕپاشی منیان داوە و هەڵوێستی شێخول ئیسلامەکە لەوە دەچوو ناڕەحەت بێت، کاتێ حەمە کڵاوی کردبۆ سەر ناڕەحەتی بە بەڵگەیەکی نائاسایی.

## دزی بارێک

هێمای کردبوو بەو سەفەرەی من بۆ بیارە و وتی ئێستا من هۆی ئەو دوژمنایەتیەی شێخول ئیسلام بۆ من ڕووندەکەوە و بەردەوام بوو لە وەسفی ئەوەی چۆن لە ئەستەنبوڵ بڕێکی دیاریکراو پارەی بە قەرز پێ داوە تا یارمەتی بدات بگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی. ئەو قەرزە هەرگیز نەدراوەتەوە و من لە ڕێی خۆمدا بووم بۆ ئێران، بە ئەنقەست هات بۆ سلێمانی بەهیوای گەڕانەوەی قەرزەکە، بۆ ئەو مەبەستەش سەردانی شێخول ئیسلامی کرد لە بیارە. ئەو دەیخواست لەو قەرزە حەقە هەڵبێت، ئەوەی ڕەتکردەوە و هەڵوێستی دوژمنکارانەی وەرگرت لە پێناوی ترساندنم تا دوورخاتەوە و ئێستاش زانی لەو دەورویەرم، بێگومان بە هەژاندنی هەستی دوژمنایەتی بەگوێرەی منەوە، بۆ هاندانم تا ناوچەکە جێنهێڵم. بارودۆخەکە ئێستا تا ڕادەیەك هەڵگەڕایەوە و عادیلە خانم بەناوی خۆی و پاشاوە، لەسەر ڕازی نەبوونی بۆ بەکارهێنانی ئەو زاراوە ناشرینانە، بە شێخول ئیسلامی وت کە بەلایەنی کەمەوە لەوێدا داوای لێبووردن لە حەمە بکە، ئەگینا نەك لە ماڵەکەیان بەڵکو لەو خاکەکەشیان دەریدەکەن. ئیدی ئەویش بە پاڕانەوەیەکی خراپ ئەوەی کرد و حەمەش تاجەگوڵی سەرکەوتنی نابووە سەری و هاتبوو بەرێوە.

ئەو ئێستا داوەتنامە نوێکراوەکانی لە عوسمان پاشا و عادیلە خانم و تاهیر بەگەوە هێنابوو، بۆ مانەوە لە لای ئەوان لە هەڵەبجەدا و داوەتنامەکە پڕبوو لە نەخشەرێژی بازرگانی فراوان لەژێر سایەی ئەواندا. بەڵام هەروەها هەواڵی ناڵەبارێشی هێناوە، چونکە ژمارەیەك بارە ڕۆنی پێبووە و یەکێکیانی ونکردووە، کە بایی چل تومەن، یان حەوت پاوەنی ئیستەرلینی بوو. ئەو کاروانەی لەگەڵیان هاتبوو بەیانی زوو دەگاتە سلێمانی و هۆشی دەڕوات بەلای ئەو هێسترەوە کە کەوتووە، لەوانی دی گەڕاوە تا بڕۆن بەناو گوندەکانی دەرەوەی شاردا. لەوێدا یەکێك هەڵی لە دیارنەبوونی خاوەنەکەی بەدەستهێناوە و بەبێدەنگی گوێدرێژێك و بارەکەی بردۆتە ناو حەوشەکەوە و کاروانەکەش تێپەڕیووە، دیارنەمانی ولاخێك دیارینادات تا نەگاتە سلێمانی. حەمە بەیانیەکی بەسەربرد بۆ ئەوەی گەواهی دزییەکە ئامادەبکات، شتێکی تەواو گونجاوە، هەروەها کەسیش لەوانەیە نەیبینیبێت، تاوانەکە دەکەوێتە ئەستۆی هەندێ گوندنشین بە سازوبار لەگەڵ بازرگانێکی بڕکێکەردا لە ڕۆندا، ئەو دەچێت تا پۆلیس بدۆزێتەوە و تا بەدواداچوونی بۆ بکرێت. بۆ وا دەهاتە بەرچاوم کە هەرچیەك بکەم کەڵکێکی ئەوتۆی نییە، چونکە من دەزانم کێشەکە دەبێ بچێت بۆ لای قۆمیسەری پۆلیس و هەروەها دەزانم کە لەم کێشەیەدا هەنگاوی وەها دەنێت کە دوو ئامانج

بەدیبێنێت: یەك، کە من دەبێت جارێکی دی شتەکەم پێنەگاتەوە، ئەوی تریش ئەو بڕە پارەیە بەدەستبێنێت کە لەمیانەی شوێنکەوتنم بۆ نەخشەی مەسەلەی پاسپۆرتەکەم دەستیبکەوێت. لەگەڵ ئەوەشدا خاوەنی گوێدرێژەکە ئەوپەڕی هەوڵیدەدا یارمەتی حەمە بدات، ئەگەر شتەکە بدۆزرێتەوە، کە من گومانم هەبوو لێی، چونکە یەك لە هەزاردا تا ئێستا کە رۆنەکە کراوەتە کوپە و کەمۆڵەوە و هێزەکەش لەناوبراوە. بۆیە لێیگەڕام بۆ حەمە چی دەتوانێت بیکات. مەتی و حەبیب زۆر سەغڵەتن، سوێندیاندەخوارد کە هەموو مەسەلەکە بۆ تۆڵەسەندنەوە لەلایەن قۆمیسەری پۆلیسەوە رێکخراوە و هانیاندەدام کە کێشەکە بگەیەنمە لای موتەسەڕیفی کاتی یان حاکم، کۆلۆنێلێکی دیاریکراو ئەوەی کە جێی کۆنەکە دەگرێتەوە کاتێ لە چەمچەماڵە چاوەڕێی مەحکومکردنی هەمەوەندەکانە- کاتێ هەڵگیرسا.

هەروەها پیرە مستەفا بەگیش هات، کە هەرگیز نەوەستابوو لە سەردانی بەیانیان و سووربوو لەسەر ئەوەی رێی بدەم بچێت بۆ دیدەنی خودی قۆمیسەری پۆلیس و هانیبدات لە کێشەکەدا بجولێت. پیرە پیاو هەمیشە سەلیقەیەکی مەزنی هەبوو لە گرنگیپێدانی تایبەتی و نەیدەتوانی چی زۆر ئاشکرایە ببینێت، کە خراوەتە رەفەوە، دورخراوەتەوە بۆ ئەم گۆشە کەنارخراوەی ئیمپراتۆریای تورکیا تا وردە وردە بپوکێتەوە و بۆگەن بکات. چەند رۆژێکی کەم لەوەبەر پۆستێکی نوێی وەرگرت، کە هاوشێوەی ئەوەی پێشوی بوو، چونکە نەیدەتوانی بگاتە شوێنەکە و ئەگەر بگاتە ئەوێش کوردەکان دەریاندەکرد.

سووربوو لەسەر ئەوەی کە داوەتی بەڕێوەبەری قوتابخانەی سەربازی پەسەندبکەم بۆ ئەو ئاهەنگەی کە لەلایەن بەشی دانیشتوانە تورکەکەوە بەبۆنەی یادی دامەزراندنی حکومەتی میللییەوە لە تورکیا سازدەکرێت و کۆپیەکانی بروسکەکانی پێشاندام کە لەلایەن بەرپرسانی جیاوازەوە پێیگەیشتووە. فرماندرابوو کە لە سەد و بیست تفەنگ کەمتر نەبێ بۆ تەقەکردن، پێنج سەد لیرە لە داهات لە جەژن و رازاندنەوەدا خەرجکرێت. ئاگاداری هەموو کەسێکی بەئەمەك بکرێت لە شەودا چرا لەسەر سەربانەکانیان دابگیرسێنن و لە رۆژدا بەیداخ لەسەر دەرگاکان.

بڕیاربوو بازاڕ دابخرێت و تیپەکەش لە بەیانیەوە تا شەو دەهۆڵ و زوڕنا لێدەن، کاتێ بڕیاربوو ئاگربازیەکان لە گۆڕەپانەکەی بەردەمی سەرادا بتەقێنرێت.

تیپەکە دەیانژەند، بیرمە، بەپێی گونجاندن و دەستپێکردن، بەڵام تا رادەیەك کەموکوڕی هەبوو، چونکە سەرتیپەی مۆسیقاکە، کە موچەیەکی ناڕێك و کەمی هەبوو، ژمارەیەك لە ئامێرە مسە

# مردنی مستەفا بەگ

زەردەکانی بە بارمتە دانابوو، بیست تفەنگێك تەقەیانکرد، تابور ئاغاسیەکە، کە بەشێوەیەکی کاتی بەرپرسی ئەو مەسەلەیە بوو، دوای دەرکردنی بڕی تەواوی باروودەکە لە جبەخانە و فرۆشتنی بەشێکی زۆری بە چەکسازانی شارەکە، بۆیە کاروبارەکە زۆر کارانەبوو، بەتایبەتی کوردەکان رازینەبوون بازاڕ داخەن یان بیڕازێننەوە.

بەهەرحاڵ، مستەفا بەگ، پێشبینی ئەوە ناکات و هەستدەکات کە دەبێ کاروبارێکی باش بەڕێوەبچێت، دواتریش نەفرینەکەی بە دەنگی بەرز دەردەبڕێت وەك ستایشەکەی پێشوی. شەوێك یان دوو شەو دوای ئەوە، وەك نزیکەی هەموو شەوەکان لە تەقە بەئاگاهاتین، بەڵام ئەم جارەیان زۆر نزیکە و ئاژاوەی لەگەڵدایە. تارمایی دوو یان سێ کەس دەتوانرێ جیاکرێتەوە، کە بەدرێژایی سەربانی بازاڕەکە رادەکەن و لەو تەقانە هەڵدێن کە دانیشتوانی دەوروبەرەکە دەیانکرد، ئەوانەی لە سەربان نووستون و تفەنگەکانیان لە تەنیشتیانەوەیە. لەم هەموو جۆرە مەسەلانە، بەهەرحاڵ، کپدەبێتەوە بەبێ ئەوەی هیچ کەس بزانێ چی بووە و دووبارە نووستینەوە. لە تاریك و روونی بەیانی زوودا گوێم لە دەنگێك بوو لەسەر شەقامەکەوە بانگیدەکرد " ئاغا غولاّم حسێن!" و لە قەراغی سەربانەکەوە سەیرمکرد مەتی-م بینی، کە لە کاروانسەراکەوە رایکردووە و هێشتا خەریکی پشتێنەکەی بوو دەیبەستەوە.

وتی: " خێرا وەرە!"

پەلاماری عەباکەم دا، رامکردە خوارەوە و لەسەر شەقامەکە پێیگەیشتم. ئەو زۆر شڵەژاوە و لە وەڵامی پرسیارەکانمدا، بە هەناسەبڕکێ تەنیا دەیتوانی بڵێ " خانی غەفوور ئاغا"- واتە کاروانسەرای غەفوور ئاغا- کە تا رادەیەك بە راکردن دەڕۆشتین.

بەدەوری دەرگاکەدا کۆمەڵێکی بچووك کۆبوونەتەوە و لەلا دوورەکەشەوە، نزیکی ئەو ژوورەی لەوەپێش تێیدا دەژیام، تەنیشت مستەفا بەگ، تاقمێك، کە لەناویاندا کەسێك لە شارەوانیەوە و پزیشکی نەشتەرگەری سەربازیی، کە یۆنانیەکی بچکۆلەیە ناسیمنەوە. کە نزیکبوومەوە لێیان ئاماژەیانکرد و منیش رامکردە پێشەوە تا بزانم دەورەی چییان داوە.

ئەوەی لەوێدا کەوتبوو پیرە مستەفا بەگ بوو، روخساری هەمیشە سپی بوو، ئێستا رەنگێکی زەردەهەڵگەڕاو لە تاریك و روونی بەیانیدا، لەبەراوردا لەگەڵ لەئەندازەبەدەر ئەو رەنگی سوورەی جەستەی کە دەرکەوتووە. چەقۆیەك چووە بە سکیدا و نۆ ئینج چۆتە ناوەوە و مەودای دەدا هەموو

ناوسكی ببینرێت. لەناو حەوزێك لە خوێندا كەوتووە كە تەماشاكەرەكان بەناویا دەڕۆشتن و زەلكاوێكی لە دەوری دروستكردووە. بەئاگابوو، بەلام زۆر لاوازبوو كە بجولێت جگە لە چاوگێڕان و چرپە. داوای منی كرد ومنیش چووم و سەرم شۆڕكردەوە و گوێم لە دەمی نزیككردەوە، چرپاندی بە گوێما كە پشتێنەكەی بكەرەوە.

داوام لە پزیشكی نەشتەرگەر كرد كە ئەوە بكات و ئەویش زۆر بە نەرمونیانی پشتێنەكەی لێكردەوە. ئەوە هەمووی نەبوو، چونكە پیرە پیاو كەمێكی هەبوو بیلێت، كە دەیتوانی وردە وردە ئەوە بكات. وشەكان هەر كە لە دەمی دەرچوون من قۆزتمەوە: " جیوندیر تارابولوسدا، هار-... بیر شای...ڤار. ئەللا! ئۆغلو.، ئۆغلو... سان ئینسالیدن... باقی ... هەیڤانلەر. تاڤ... ئاكول... وللا، ئەللا، ئەل..."

ژیانی تەواوبوو، دوا هەناسەی هاواری خوای كرد.

"هەموو ئەوەی كە لەوێیە بینێرە بۆ ترابلس،" ئەو وتی، "خوایە، خوایە... كوڕ!...كوڕ! ... تۆ مرۆڤ جێدەهێلێت ... ئاسودەبە ... وەحشەتناك... من خۆم بۆ لای خوا دەگەڕێمەوە... خوا...!"

مەتی كە تۆزێ دوور وەستاوە، هەلێدەلوشی و دەگریا، چونكە دلێكی ناسك و رەوانی هەیە و یۆنانیە بچكۆلەكە وەك ئەوەی خەریكی ئامادەكردنی لاشەكە بوو بۆ ئەوەی دوورخرێتەوە. منیش لە شوێنێكی دوورا دانیشتم و فرمێسكم بۆ رشت، چونكە پیرە پیاوم خۆشدەویست. تەنیا كوردەكان بە پێوە لەو ناوە راوەستاون و نەهەژاون: دیارە لەوە ناخۆشتریان بینیووە و كە لەوانەیە رۆژانە ئەو گریانە بكەن یان پێوەی بتلێنەوە.

پزیشكی نەشتەرگەرییەكە، كە پیاوێكی كەم توانا بوو، تابووتێكی داواكردووە و ئەوە بە پەلە گەیشت و كاروانسەراكەمان جێهێشت بەرەو شوێنی مردو شۆردن، ئەویش گەیشت. كاتێ كارەكە جێبەجێكرا ئێمەش دەبێ بگەڕێینەوە. لەبەرئەوەی شوێنێكی تر نییە چاوەڕێی لێ بكەیت، چووین بۆ قاوەخانەكە و لەوێ بیستمان ئەوە چۆن روویداوە.

غەفوور ئاغا كە خاوەنی كاروانسەراكەیە، سەرۆكی شارەوانی بوو تا ماوەیەكی كورت لەوەبەر و لەكاتێكدا ئەو پۆستەی هەبوو لەگەل شێخاندا ناكۆك بووە. ئێستا ئەو لەو نوسینگەیە دوورخراوەتەوە و بنەمالەی شێخ كاتی خۆیان بەفیڕۆ نەدا و هێرشیانكردە سەر كاروانسەراكەی. لە شوێنێك یان دوو شوێنی بازرگانی، كە لەوەشدا حاجی فەتاح نێچیر بووە و تەمەننایان دەكرد

دەستی بەسەردا بگرن. هەروەها دزەکان دەیانزانی کە یەکێ لە بازرگانە جولەکەکان پێش ڕۆژێك هەزار تومەنی زیوی هێناوە و بەهیوابوون ئەویش تالآنکەن. چۆن گەیشتونەتە کاروانسەراکە، لەوەناچێت کەس بیزانێت، پاسەوانی دەرگاکە کە بەئاگاهاتووە سەیریکردووە دەروازە سەنگینەکان کراوەتەوە. دەنگە دەنگی شکاندنی دوکانەکەی حاجی فەتاح، مستەفا بەگ بەئاگادێنێت، کە لەناو باڵەکۆنیەکی کۆن لە هەیوانەکەی بەرامبەردا نووستووە و هەرچۆن هەمیشە تورە بوو، بەدەنگی بەرز هاواری حەسەنی دەرگاوانەکە دەکات. دزەکان هاتن بزانە ئەوە کێ بووە و بینیان لەوێ دانیشتووە و ئاگاداریانکردوە ئەگەر زیاتر دەنگە دەنگ بکات دەیکوژن. بۆ چرکەساتێك بێدەنگ بووە. بەڵام لە باڵەکۆنەکە دێتە دەرەوە، لەوە دەچوو بزانێت کە دەرگای ژوورەکە داخراوە و نەیدەتوانی خواستی تایبەتی خۆی بەوەی کە لەو کاتەدا چی ڕوودەدات بێدەنگ بکات. بۆیە بە دەنگی بەرز بۆ تەماشاکەرانی سەر شەقامەکە هاواریکرد، بەڵام پێش ئەوەی چرکەساتێك تێپەڕێت، تورکومانێك، یەکێ لە دزەکان ئامبازی ملی بووە و خەنجەرە درێژە چەماوەکەی تێدا نوقمدەکات و لەو شوێنەی کەوتبوو جێیهێشتووە.

لە قاوەخانەکەدا ئەوەمان لە خەڵك بیست، یەکێکی دی بیستویەتی کە دەرگاوانەکە لای پۆلیس گەواهیداوە و ئەوەشمان بە خۆشحاڵیەوە بیست کە دزەکان بەبێ دەستکەوتێکی بەنرخ دوورکەوتونەتەوە، لەبەرئەوەی پارەکەی جولەکەکە زۆر باش شاردرابۆوە و شتە بەنرخەکانی حاجی فەتاحیش لە قاسەیەکی ئاسنی سەنگیندا بووە و کاتێ پاسەوانەکانی شەو دێن و دوای کوشتنی مستەفا بەگ یەکسەر تەقە لە شارەکەوە دامەزرا، ناچاربوون بچنە سەر سەربانەکان و لەو ڕێگایەوە هەڵبێن. پیاوەکان لەلایەن دەرگاوانەکەوە ناسراونەتەوە، کە ناوەکانی داوە بە پۆلیس. ئەوەش بێدەنگی لێکراوە، بەڵام دەزانرا کە پیاوی شێخانن، یەکێکیش هات و وتی کە قۆمیسەری پۆلیس چۆتە سەر سەربانەکە بۆ شوێن پێ گەڕان، پێکەنینێکی گاڵتەجاڕی کرا، چونکە سەربانەکە بە چەشنی بەرد ڕەق و تەقە و هیچ شوێن پێیەك بەوێوە جێنامێنێت، ئەگەر جێشبمێنێت، ئەوا لەلایەن ئەو خەڵکەوە سڕاوەتەوە کە پێشتر چوون بۆ ڕێچکەی ئاڕاستەی هەڵهاتنەکە، چونکە لە سلێمانیدا ژنەکان سەربان وەك شاڕێیەك بەکاردەهێنن. هەرچەند کەس نەهات ئاگادارمان بکات لە ئامادەبوونی جەنازەکە، ئێمەش چووین بۆ نوسینگەکەی مەتی لەوێ چاوەڕێمان دەکرد. مەتی بەو کارەساتە خەماوییە دڵگران بووە و تەنانەت لەوە دەچوو ئەو بەیانیە ئارەزووی لە ئیشکردن نەبێت و گفتوگۆکردن بەرەو باسی ڕێگە دۆزینەوە و لە سلێمانی دەرچوون گۆڕا، جارێکی تریش هاتینەوە

سەر مەسەلەی دەرچوونی من و ڕێکمانخست کە ئەگەر بکرێت ئەوە بکەم بە زووترین کات هەلێك بدۆزمەوە، بە کاروانی بۆ کۆیە، کە لەوانەیە ئالتون کۆپریشم دەستکەوێت، یان لەلایەن ولاخدارێك لە تیرەی شوان، کە لە سلێمانیەوە دەگاتە کەرکوك بە ڕێگای دوورتردا بەناو ناوچەی خۆیاندا.

بەو ڕێگایەدا، شتەکان کە دواجار جێگیربێت، هاتە سەر ئەوەی کە مەتی خۆی خستە سەر خالێکی پرسیارکردن، کە من پێموایە زۆر جاری تر ویستوویەتی ئەو پرسیارە بکات.

"ئێستا، هەرچۆن تۆ بەم زووانە جێماندەهێلیت،" ئەو وتی: " دەمەوێت پرسیارێك لە تۆ بکەم، کە ئەگەر رازی نەبیت، دەبێت دلگران نەبیت و وەلام مەدەرەوە. ماوەیەك دەبێت کە تۆ یەکەم جار هاتی بۆ ئێرە و یەکتری باش دەناسین و من هەولی زۆرم داوە یارمەتیت بدەم. بەلام شتێکم بینیوە و ئەوەش ئەوەیە کە تۆ هەرگیز لەوەپێش لە کوردستان هیچ کارێکت نەکردووە و تەنانەت ئەگەر کردبێتیشت، تۆ گرنگی نادەی بەوەی کە سامانێکی ئەوەندە بەدەستبێنیت تا سەرکەوتوبیت. لەوە ناچێت گوێبەیتە ئەوەی قازانج بکەیت یان نەیکەیت و دەمەتەقێکانیشت لە قسەی بازرگان ناچێت، هەرگیز لەبارەی پارەوە نییە، بەلام لەو مەسەلانەی وەك ئەو قسەوباسانەی کە کێ پێویستی بەوە نییە بزاڤی بازرگانی نەخوێنێت. تۆ لەوە دەچێت زیاتر گرنگی بە زانیاری لەبارەی کورد و کوردستانەوە بدەیت لەوەی بە ئێشوکاریانەوە و خۆت زۆر دەخەیتە سەغلەتیەوە بۆ کڕینی کتێبێك لەچاو کردنی هەر شتێکی تردا. هەروەها حەبیب- یش تێبینی ئەوەی کردووە و زۆر جار پرسیاری هۆی ئێرانی و فارسی شیرازی و ئەو جۆرانەمان کردووە، هاتن بۆ ئێرە ، چونکە ئێرانی لە رۆژگاری کۆندا لێرە بووە، خەلکی هەمەدان بوون و شیرازی هەرگیز لێرە نەبینراوە. هێشتا، تۆ هەرگیز هیچ زانیاریەکت نەبەخشیوە و منیش سەرکەشی ئەوەم نەکردووە هیچ پرسیارێك بکەم، لە ترسیدلڕەنجاندن. پێویستە بلێم کە ئەوە زۆر تایبەتیە، ئەوە گوێنەدانە بە ئیشوکار بەو شێوەیەی تۆ لێرەی، کە بووە هۆی ئەوەی سەرنجی پۆلیسی بەلای تۆدا ڕاکێشا و ئەگەر لە دەستیان رزگارت نەبووایە دووچاری سەرئێشە دەبووی، حەبیب و خۆشم زۆر دلگران بووین، چونکە هیچ هەلی خوێنرشتنی کەس لە دەستنادەن و لەوانەیە خرابینە ژێر گومان و هەڕەشەی بێ بەزەییانەوە."

منیش وتم،"تەنیا وەلامدانەوەیەك بۆ ڕاستبێژی،" " ڕاستگۆیی خۆیەتی و من ئەوەی دەیلێم لەوانەیە سەرسام بن و لەوانەشە سەرسام نەبن، من تەمەننادەکەم، ڕابەریتان بکات بۆ ئەوەی کە وەك ساختەچیەك تێمنەڕوانن. ئێوە، وەك هەموو ئەوانی دی، هەلخەلەتاون بەوەی کە من لە سەرەتاوە چۆن خۆم دەرخستووە و من ڕەزامەندم لەو هەستەی کە کاتێ من دەڕۆم ئەوانی دی لە

گوماندا جێدێڵم، من دەتوانم بەشێك لەو قەرزی ڕێزگرتنەی خۆمت بدەمەوە بەوەی کە بەتەنیا بتخەمە ناو ئاستێکی ڕاستەقینەوە.

" بۆیە من دەبێت پێتانبڵێم کە من نەفارسم نە تورك، نە کورد و نە کلدانیم، بەڵام ئینگلیزم، لە باوك و دایکێکی ئینگلیز لە ئینگلاند بووم و لەو خاکەشدا پێگەیشتووم و ئەو ڕاستیە لەوانەیە خۆی لە خۆیدا بچێت بۆ بەشێکی ڕوونکردنەوەی بوونی من لێرە، چونکە ئێوە دەبێ بزانن کە خەڵکانی ڕەگەزی من بە هەموو زەویدا بڵاوبوونەتەوە بەبێ هیچ هۆیەکی دی لەوەی بۆ بینینی شوێنەکان و خەلکەکەی لایەنگیریان دەکات. نۆ ساڵی ژیانم لە ئێراندا بەسەربردووە و زمان فێربووم و شارەزایم لە داب و نەرتیاندا بەدەستهێناوە. لەپێناوی دۆستایەتیەکی دڵسۆزانەدا لەگەڵ خەڵکی ئەو خاکەدا، من بە سەرزارەکی بووم بە موسڵمان و کۆرسێکی دوورودرێژم لە مەسەلەی لاهوتیدا مەشقکردووە. دوو ساڵ بەر لە ئێستا خۆم لە کرماشاندا بینیەوە، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی کوردستان و لەناو خەڵك و زمانەکەدا گرنگیەکی سەرنجڕاکێشم پەیداکرد، نەخشەم بۆ دانا تا هەر کاتێ کە بتوانرێت دوایکەوم. بۆیە، دوای ئەوەی پار بۆ ماوەیەك لە ئینگلاند بووم، تەلیسمی کوردستان و شاخوداخەکەی کاری تێکردم و ویستم جارێکی تریش بۆ ماوەیەك سەردانی بکەمەوە. بەڵام وەك ئەوروپییەك مەحاڵە و ناپەسەند بوو، چونکە وەك دەزانن، ئەوروپی دەبێ بە بێگانەیەك، واتە نامۆیەکی نەناسراو، لە پێگەیەکی تەریك و مەترسیداردا، ڕێگری لە هاتوچۆی دەکات و زۆر جار ڕێنادرێت لە شوێنێکەوە بچێ بۆ شوێنێك. لەسەرو ئەوەشەوە، ئەگەر بمویستایە سەفەریش بکەم نەمدەتوانی بیکەم، چونکە پارەیەکی کەمم هەبوو، ئیدی تۆ دەبینی، هەموو شتێك هێمای ڕاستی دەکات کە ئەگەر من بمەوێت جارێکی تر کوردستان ببینمەوە، من دەبێ وەك هاووڵاتیەك بە سادەیی بچم. لەبەرئەوە لە ئەستەنبوڵەوە خۆم گۆڕی و لەوێوە وردە وردە هاتم بۆ ئێرە، کە هیواخوازبووم بمێنمەوە، لەپێناوی فێربوونی زمانی سلێمانیدا، کە تا ئێستا لای ئەوروپیەکان نەناسراوە. ئێستا من ئەوەم تەواوکردووە و دەمەوێت جارێکی دی بۆ ماوەیەك کوردستان جێبهێڵم. بەڵام ناتوانم سەیری ئەو مانگانە بکەمەوە کە لێرەدا بەسەرمبردووە، مەتی، بەبێ ئەوەی بزانم کە تۆ لێرەی، بە یارمەتی تۆ، دڵسۆزی تۆ، ئامۆژگاری تۆ و دۆستایەتی برایانەت- هەمووی ئەوانەت بۆ پیاوێك کردوە کە هیچیش لەبارەیەوە نازانی- من دەبووایە زۆر خراپترم بەسەربهاتایە، لەوانەیە سەخت تر بووایە، لەجیاتی ئەوەی بە ئاسودەیی بژیامایە لەگەڵ هەستی ئەوەی کە کاتێ هەر شتێك تێکچووایە هەمیشە مەتی بوو بۆی دەچوو. لەبەرئەوە براکەم، ئێوە ئێستا دەزانن من کێم و بۆچی

لێرەم و هەموو ئەوەی کە ماوە ئەوەیە کە داوای لێبووردنت لێ بکەم و پێتانبڵێم منیش وەکو خۆتان مەسیحیم و موسڵمان نیم."

" ئەڵڵاهو ئەکبەر!" مەتی هاواریکرد، دەستەواژەی موسڵمانانەی لە سەرسوڕمانەکەیدا بەکاردەهێنا، " سەیری کاری خوا بکە، ئەوە شیاوی رونکردنەوە نییە، غولام حسێن، تۆیەك کە غولام حسێن نیت، هەموو ئەوە و تۆ پێمدەڵێیت پیاوێکی ئینگلیزە و من دەزانم دەبێت راستبێت، چونکە راستی لە چاوەکانی تۆدا بەدیدەکەم، بەڵام کێشە چییە، ئەگەر هاوڕێ ئینگلیز بێ یان رووسی، تورك یان کورد. چی خۆشحاڵییەکی گەورەترم پێ دەبەخشێت لەوەی هەرگیز لەوەپێش هەستم پێکردووە، ئەوە لەو بڕوایەدام ئەوەبێت کە گیانی دۆستایەتی لە خۆماندا وەك میللەتێکی مەسیحی دۆزیوەتەوە.

" هێشتا، پێش ئەوەی بتناسم، چەندە یارمەتی تۆم داوە، چونکە ئەوەی ئەنجامداوە تەنیا مەبەستم چاکە و خزمەتی بێبەرامبەر و گیانی میوانداریە بۆ هەموو نامۆیەك هەر بڕوا و ڕەگەزێکی هەبێت. ئێستاش ئەگەر نیازی رۆشتن هەیە، من نامەت دەدەمێ بۆ خواجە سەلیم، باوەڕپێکراوم لە کەرکوك و بۆ مەتلوب لە بەغدا. بەڵام من پابەندبوونێکت لەسەر دادەنێم، بە گیانی خۆت کە تۆ لە جلوبەرگی ئەوروپیدا بیرەکان و یادەوەریەکانی کوردستان فەرامۆش نەکەیت، نەهێڵێت ناوەکانی ئێمەت لە یادت بچێت. چونکە ئێمە دڕ و دڕندەین، ڕێبازەکەی ئێمە ڕێبازی تۆ نییە- لەگەڵ ئەوەی تۆ ئەوەی ئێمە دەزانیت و لێرە وەك خۆمان دوایانکەوتویت- چی ئێمە بە ئاسودەی دابنێین تۆ دایدەنێیت بە دڕندەیی و ئەوروپیەکان (ئەوە دەزانم، چونکە لە بێروت و حەڵەب بووم و ئەوروپیم بینیوە) هەمیشە گاڵتەیان بە خاکی رۆژهەڵات دەهات، بەڵام ئێمە هێشتا مرۆڤین و ئەگەر ژیانمان لە پەستی و ناشارستانیدا بەسەربردبێت، ئەوە لەبەرئەوە نییە کە ئێمە نامانەوێت لێی دەرچین، بەڵکو لەبەرئەوەیە کە ناتوانین، لەوانەیە ئێمە دەبێت چەند خاڵێکی باشی خۆمان ونکەین لەناو تیشکی بەهێزی رۆژئاوادا و دڵفڕین بۆ ئاسودەییەکانی، لەقە لە پابەندبوونەکان دەدەن و بێ نرخ دەبێت- زۆرم لەوانە بینیوە کە چوون بۆ ئەوروپا و گەڕاوەتەوە وای لێهاتووە. بۆ تۆ ئێمەت سەرسامکردووە، وەك دوژمنێك لە بەرگی گۆڕاودا تۆ دیواری قەڵاکانی ئێمەت کونکردووە و من ناچم بە کەسێك لە بازاڕدا بڵێم کە کێ لە ناوماندا بووە.

ئیدی دەستیکرد بە پرسیارکردن لەبارەی ژیانی پێشومەوە لە ئێران و ئەو ڕێگایەی کە زانیاری تەواوم لەبارەی خاکەکە و ژیان بۆ تێپەڕبوون بە بازاڕ و مزگەوت وەك ئەوەی دەمکرد.

## ناشتنی مستەفا بەگ

لە میانەی ئەو گفتوگۆیەدا، یەکێك هات بۆ ئەوەی پێمان بڵێت کە خەریکە جەنازەکەی مستەفا بەگ دەهێننە ژوورەوە. بەوجۆرە دوایکەوتین، ئێمەش چووینە دەرەوە بۆ گۆڕستانەکەی سەر گردەکەی باشوور، کە لەسەر لێژگاییەکی بەردینی رووتەن سێ یان چوار درەختی تووی پێوەبوو، بەهۆی رەشەبای توند و تیژەوە دوو ئەوەندە چەماونەتەوە، شوێن پێی خۆمان لەناو مردووەکانی سلێمانیدا دۆزیەوە. لەوێدا تابوت هەڵگرەکانمان بینی، کە دارە مەیتەکەیان هێناوە و بەبێ رێورەسم خرایە ناو گۆڕێکی کەم قوڵدا، بە بەرد و خۆڵ داپۆشرا. تەنیا کەمێك لە ئێمە ئامادە بووین، بەڕێوەبەرەکەی قوتابخانەی سەربازی، مەتی و خۆشم، لەگەڵ ئەو کەسانەی بەکرێ گیراون بۆ ناشتنی جەنازەکە، نەماندەتوانی بهێنینەوە، چونکە هەمەوەندەکان لەو ناوەدا بەسەر ئەسپە قەزەمەکانیانەوە زۆر دوورنین.

پزیشکی نەشتەرگەری شارەکە پارەی ناشتن و پرسەکەی دا لەو شتە بێ بەهایانە و هەرچییەکی هەبوو لەگەڵ جلوبەرگەکانی پێکەوە، بەوجۆرە ئەوەی ماوە لە میراتی پیرە مستەفا بەگ چوار لیرە بوو لای من دایناوە بیپارێزم. ئەوانەم پاراست و دەیبەم بۆ بەغدا، کە لەوانەیە بتوانم لەڕێی حەواڵەی بەریدیەوە بینێرم بۆ تەرابلوس و کە تا رادەیەك دڵنیام لە گەیشتنیان بۆ شوێنی مەبەست.

کەمێك لە ئێمە کە جەنازە ناشتنەکەیان بینیوە کۆچی دوایی پیرە پیاو زۆر کاریگەربوو لەسەرمان، لەگەڵ ئەوەی هاوڕەگەز و هاوولاتیشمان نەبوو، کەسێکی بێگانە بووە و مەرگە ناخۆشەکەی لە شوێنێك کە بە ناخۆشی و بە تەنیایی تێیدا ژیا، بەجارێ بەشێوەیەکی ئاشکرا نائاسایشی دەرکەوت و کە مەترسی وەکو یەك بۆ مەتی و بەڕێوەبەری قوتابخانە هێناوەتە ماڵەوە کە تێیدا دەژین و وای لێکردون بەراوردی پێگەی تایبەتی خۆیان لە شارەکەدا لەگەڵ ئەوەی مستەفا بەگ بکەن.

لەگەڵ ئەوەشی ئەوان وەك ئەو بێ دۆست و هاوڕێ نەبوون، وەکو یەك بێ پارێزگارین و لەسەرو هەمووشیەوە ئەوانە بێگانە بوون لەم خاکەدا. هاوسۆزی کوردەکان و ئێران و کوردستان بەگشتی بۆ کەسانی بێگانە مایەی خۆشحاڵیە، لەم خاکانەدا، ئەگەر دووربی لە ماڵەوە واتە زیاد لە وڵاتەکان کە پەیوەندیکردن تێیدا خێرایە و خاڵە دوورەکان بەردەوام یەکدەگرنەوە. شوێنی بنەچەیی لە راستیدا لای تورك و فارس و کورد زۆر ئازیزە. ئەوە پەرۆشیەکی بێ گوناهانەیە کە هانیدەدات لە گوندێکدا نیشتەجێ بێت و بەدەست لەرزوتا و لەگەڵ ئاوی سوێردا بتلێتەوە، ئەو گوندە تۆزێ لە بەهەشت کەمتر دادەنێت، چونکە نارەحەتی ژیان لە خاکی نامۆیدا، دوور لە زمانی یان دیالێکتی

## ئامادەكاری بۆ ڕۆشتن

خۆی ئازاراوییە، شوێنەكەی ئەو جێیدەهێڵێت زیاتر باڵاتر دێتە پێش چاو و دووریش تەلیسمێك دەخاتە سەر دیمەنەكەی كە رابەریدەكات بۆ وەسفی نیشتمانەكەی بەشێوەیەكی خۆشەویست و ئەوپەڕی سۆزی تایبەتی هەیە بۆ شوێنی بنچینەیی خۆی. چەند جار پیرە مستەفا بەگ باسی جوانی تەرابلوسەكەی كردووە، میوەكەی، كەنار دەریا سەرگەرمەكەی، كەش و ئاووهەواكەی، سروشتی میوانداری دانیشتوانەكانی و چەند جار ئاخی بۆ گەڕانەوە هەڵدەكێشا و مانگانی دەژمارد بۆ ئەو كاتەی پارەیەكی تەواوی هەبێت بۆ گەڕانەوە و هەموو هیواكانی بە هیوایەك كۆتایی دەهێنا، بۆ دەربڕینی پەژارەی دەروونی كە بەلایەنی كەمەوە لەناو میللەتی خۆیدا بمرێت، بەڵام لێرە لاشەكەیان ناشت لە خاكێكدا كە قینی لێی بوو، كە خەڵكەكەشی دەبوغزاند و دوو وشەشی لە زمانەكەیان نەدەزانی.

وەك دوا خاكەنازی پڕ لە خۆڵمان بینی كرایە سەر گۆڕەكەی، چاودێران لەسەر تەوقەسەری گردەكەوە هاواریانكرد بەخێرایی دووركەونەوە بۆ ناوشار، چونكە بەناو دۆڵەكەدا كۆمەڵێكی بچووكی سوارەكان هاتن، هەمەوەندەكان، بە غاردانەوە تەقە لە نیشانەكان دەكەن و ئێمە دەبێ بە پەلە بگەڕێینە دواوە نەوەك زیندوەكانیش دوای تازە مردووە نێژراوەكە بكەوێت.

لە ماڵەوە حەمەم بینی، لە ناشاد دەچوو. سەركەوتو نەبووە لە دۆزینەوەی ڕۆنە دزراوەكە و بانگی پۆلیسی كردووە، كە زۆرتر ئامادەن دژی كاربكەن وەك لەوەی یارمەتی بدەن، چونكە بیستویانە كە خزمەتكاری منە و هەندێ هیوایان هەبوو لەم ئیشە برێ پارەیان دەستكەوێت كە نەیانتوانی لە مەسەلەی پاسپۆرتەكەدا دەستیانكەوێت. بەداخەوە من زۆر گرنگیم پێنەدا، چونكە دەمویست بەم نزیكانە لەوێ بڕۆم و دەمزانی مەحاڵە دڵخۆشی بەدەستبێنم. بەڵام وەك ئەو هانیدام، چووم بۆ دیدەنی جێگری موتەسەڕیف، كە لە باخچەیەكی بچووكدا بینیم لەگەڵ چەند كۆڵۆنێلكدا هەموویان قاوەیان دەخواردەوە. جارێكی تریش دەبوو بچم خۆم سەغڵەت بكەمەوە، هەمان بۆچوونەكان لەبارەی ئێرانەوە ببیستمەوە و وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەمەوە كە پەیوەندە بە وڵاتی بنەچەیمەوەیە، گەشتەكانم، بازرگانی و ئامانجەكانم. سیان یان چوار لەوانە فارسی دەدوان و شادمان بوون بەو هەلە بۆ دەرخستنی شارەزایی خۆیان بۆ هاوڕێ نەزانەكانیان، ئیدی لەگەڵ هەندێ ستایشەكان لەسەر زانیاریەكانیان، لەگەڵیاندا دۆستانە بووم. لە ناوەندی ئەوەدا قۆمیسەری پۆلیس هاتە ژوورەوە و منی بینی لەلای ڕاستی جێگری موتەسەڕیفەوە، دەم بە زەردەخەنە و ستایشەوە نزیكبۆوە. ڕێڕەوی

ئاسایی بۆ ئەو کاروبارە گیرایەبەر. جێگری موتەسەرپف فرمانی بە دەنگێکی شێرانە دەرکرد کە شتە دزراوەکان دەبێت دەستبەجێ بدۆزرێتەوە. قۆمیسەرەکە دڵنیایکردەوە کە ئەوە تاکە ئامانجە لە ژیانی چوار پیاوەکەی، هەموویان لەو مەسەلەیەدا کاردەکەن و سەری دانەواند و چووەدەرەوە بۆ تەواوکردنی ئیشوکارەکەیان. سەربازێك نێردرابوو بۆ شوێنی رووداوەکە لە شارۆچکەکە،" تا دڵنیابێت کە شتەکانی دەستبەجێ جێبەجێکراوە، " و منیش مۆڵەتی هاتنەدەرەوەم خواست بەتەواوی دڵنیابووم کە هیچ شتێیەك ناکرێت- هەمان شێوە کە دڵنیام هیچ نییە.

لەمیانەی دوو یان سێ رۆژدا بیرمکردەوە چۆن دەتوانم هەڵبێم و تا رادەیەکیش لەگەڵ کوردێکی تیرەی شواندا رێکەوتوم بە گوێدرێژ بەناو گوندەکاندا و لە لارێوە بۆ رووباری زاب، لە باکورەوە دەچێت بۆ کەرکوك. بەڵام من تازە ئەو رێکەوتنەمان بەشێوەیەکی کاتی کردووە، هەواڵی کاروانێك راستەوخۆ لە کەرکوکەوە گەیشت. هەمەوەندەکان بەرەو باشوور بە رێگای بەغدادا کەوتونەتە رێ و تورکەکانیش کە ناوێرن لەناو چەمچەماڵ بێنەدەرەوە، تا ئێستا لە وڵاتی ئەواندا ماونەتەوە، ئێستا بازیان بەرزاییەکانی دەپشکنن و لە مانگی ئازارەوە ئەمە یەکەم جارە رێگاکە بتوانی پێیدا برۆیت، ئێستاش کۆتایی مانگی تەموزە.

کاروانەکە لە رۆژێك یان دوو رۆژدا دەگەڕایەوە بۆ هێنانی هەندێ شتومەك کە کۆبۆتەوە لەماوەی چوار مانگی نەمانی ئاسایشدا. بۆیە منیش بە پەلە چووم تا کەڵك لەو هەلە وەربگرم و هێسترێکم لە ساڵح ناوێك بەکرێ گرت، تورکومانێکی کەرکوکی چوارپەل درێژ. کرێی خانووە گچکەکەمم دا و خواحافیزیم لەو خەڵکانە کرد کە هاورێیەتیم لەگەڵیاندا پەیداکردبوو. عاسیمە خان، ئەو خانمە لە کێشەکەدا یارمەتیدام کە بەهۆی سەید نوریەوە دووچارم هات، لەگەڵ ژمارەیەك هاوسەرانی دەرودراوسێکاندا هاتن و بانگی پیرێژنەکەی خاوەن ماڵەکەی کرد و ئەو هەڵەی قۆستەوە تا خواحافیزی لە من بکەن.

من بەداخ بووم بۆ جێهێشتنی گوڵچین، چونکە ئەو ئازادترین، قسەلەرووترین و کەسایەتیەی راستگۆ بوو لە هەموو شتدا و رێرەوەکانی بێباکی و دڵپاکی مەزنترین مامەڵەی کردووە بۆ ئەوەی ژیانەکەی لە سلێمانیدا خۆشکات. ئەمرۆ ئەو لە هاودەنگی عاسیمە خانی پوری زۆر دڵگران دیارە و رەنگ و رووی هەڵبزرکاوە و ملکەچ بەهۆی ئەوەی کچێکی تەلاقدراوە لە بەردەمی بەتەمەنان و سەرپەرشتیاراندا. ئیدی لەدوای ئەوە رەوشت جوانی نییە تەنانەت لە کوردستانی ئازادیشدا، گفتگۆیەکی دووردرێژ لەگەڵ کۆمەڵێك ژندا بەرێوەبەریت، سوپاسی رێز و خواحافیزیەکانیانم کرد و

## دەرچوون لە سلێمانییەوە

گەڕامەوە بۆماڵەوە لەوێ لەگەڵ حەمەدا دانیشتین، کە بە هەموو هێزی خۆی هەوڵیدەدا لەگەڵ خۆمدا بیبەم. بەڵام من ئەوەم نەدەکرد، چونکە دەمویست بەجارێك لە سلێمانی دەرچم مەسیحێتی خۆم ئاشکرابکەم و بزانین چۆن یەکێك لەسەر ئەو ئایینە لەناو خەڵکانی ئەم بەشانەدا دەژی و وابەستەیی حەمەش بە منەوە زیاتر بەهۆی ئەوەی وەك موسڵمانێك کەڵکی هەبوو. لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەر دەمی عوسمان پاشا و کۆمەڵەکەی دەوروبەریدا سوێندی لەسەر باوەڕداری من خواردووە، بۆیە من ناتوانم هەڵیخەڵەتێنم، بە چاو لێپۆشین لەوەی کە جارێکی تر ناگەڕێمەوە، تەمەنناى ئەوە دەکەم کە دووبارە وەك میرزا حسێن پێشوازی بکرێمەوە.

لە نەریتی سلێمانیدا، دەبووایە لە کاتی دوای نیوەڕۆدا دەرچووینایە، نەك وەکو نەریتی فارسی، کە حەزیان لەوەیە بەسەرما و لەگەڵ تاریك و روونی بەیانیدا هەستن. بۆیە بەلایەنی کەمەوە خواردنی سێ رۆژم کڕی، چونکە ئێمە ناچین بۆ چەمچەماڵ و لەنێوانی سلێمانی یەکەم شوێنی ئاوەدانی وەستان و پشودانمان لەوانەیە سێ رۆژ بێت. گوڵچین نانی رێگای بۆ کردوم، تەبەق، وەکو تەبەقە کاغەزی قاوەیی و کەمێ ئەستورتر، لە نانی سپی. ئەوە و لەگەڵ هەندێ هەرمێ هەموو ئەو شتانە بوو کە من پێمە و هەموو ئەوانە دادەنرێت بە پێویستی لەلایەن هەر کەسێکەوە لەم ناوچانەدا. جامێکی بچووکیش بۆ ئاوخواردنەوە کەلوپەلی رێگای تەواوکرد، جگە لە لێفەیەکی لۆکە، کە بەکاردێ بۆ خۆداپۆشین لە شەودا و بۆ نەرمکردنەوەی سەر کورتانی ولاخەکە.

بەیانیم بەسەربرد لە خواحافیزی ژمارەیەك لە هاوڕێیان و ئەو ناسیاوانەی لەمیانەی مانەوەم لە سلێمانیدا پەیدامکردبوون و ئەوەی ماوە کە جێبەجێیکەم ئەوەیە کە لەگەڵ مەتی- دا هێشتا تەواو نەبووە. ئیدی نیوەڕۆخوانێکی بازرگانانەی کەباب و نانمان پێکەوە خوارد و بەپێ چووینە دەرەوە تا پێکەوە بە شەقامەکەدا کەمێ پیاسە بکەین و بچینە کاروانەکەوە لە دەرەوەی شار. ئەمە یەکەم جارە لەماوەی چەند مانگێکی رابردوودا کە هەر کەسێك بوێرێت بۆ کارێك بچێت بۆ دەرەوەی شار لەلای چەمچەماڵەوە، چونکە هەفتەیەك لەوەبەر هەمەوەندەکان بەو دەشتەدا هاتن یەکسەر بۆ دەروازەی شارەکە.

مەتی بە ولاخدارەکەی نەوتووە کە من کێ بووم و بیروباوەڕ و رەگەزی من چییە و منیش پێشنیارم بۆ نەکردووە کە ئەوە بکات. دەکرێ بپرسن لێم و کە بەخێرایی ئەو جۆرە وەڵامە دەدەمەوە کە لەو کاتەدا حەزم لێیەتی. وا هەستدەکەم کە حەبیب باوەڕی وایە من ئەوە نیم کە خۆمم پێوە

دەرخستووە، چونکە حەزی بە پرسیارکردنی نابەجێیە و بانگەشەی ئەوەی کردووە کە زەحمەتە بڕوابکات. زۆر لەو سەپاندنانەی من لە رووی کتێبە ئینگلیزی و فەرەنسی و نەخشەکانەوە کە ئەو لە ماڵەکەمدا بینیویەتی، کە پێشنیاریکرد وەك خۆگۆڕین و فریودانە، لەبەرئەوەی ئەو نەیدەتوانی لێیان تێبگات.

گەیشتینە لای ئەو ولاخانەی چاوەڕێیاندەکرد- کۆمەڵێکی سێ یان چوار، چونکە کاروانە سەرەکیەکە نەگەیشتووە- و لێرەدا یەکتریمان جێهێشت، کە روداوێکە لەلای خۆمەوە یەك تۆز لێی پەشیمان نیم، بەهیوام لای مەتی- شەوە هەروەها وابێت و بەر لەوەی لە گردەکە بچینە ئەودیوەوە، دوا نیگای سلێمانیم کرد، بریتیە لە کۆمەڵێك سەربانی تەخت لە چاڵاییەکدا، کە لە دووری میلێکەوە دیارنامێنێت، بۆیە پاشا کۆنەکان باشیان کردووە شارەکەیان لەبەر دیدی تورك و کورد وەك یەك شاردۆتەوە. منیش هەروەها بۆ چرکەساتێك چاوم بڕییە دووری هەورامان، دیوارێکی رووتاڵ، ئێستا رەشە، بەفرەکە لە دوورەوە دەرناکەوێت- سنووری ئێران لەوێوە، کە من جارێکی دی لێی کشامەوە.

# بەشی چواردەیەم

# بۆ کەرکوك

کاروانەکەما زۆر کەم بوو، وڵاخدارەکە، تورکومانێکی چوارپەل درێژی ناسراو بە ئەحمەد باش چاوش، کوڕێکی لاو و دەروێشێکی پرچ درێژی لەگەڵدا بوو، کە هەردووکیان خەڵکی شارەکەی خۆی بوون. ئەوەی دووەمیان پیاوێکی هێمن و رووخۆش بوو، وەك هەموو تورکومانەکان کورتەباڵا و بەهێزبوو، هەرچی دەیبینی پێی پێدەکەنی، چونکە وەك خویەك، کڵاوبۆرگەیەکی ئێرانی لەسەردایە، کە دەبووە هۆی گاڵتەپێکردن لەلایەن خەڵکی ناوخۆ و لە یەکەم بینیدا بە ئێرانی دەزانن.

ئەو رۆژە دوور نەڕۆشتین، بەڵام بەخێرایی تا گوندی باوەمەردە چووین، کە دانیشتوانەکەی چەند میلێك دوورتر لە شوێنێکی دڵگیردا هەڵیاندابوو. لەوێ بارەکانمان لەسەر تەپۆلکەیەك خست و لەکاتێکدا لاوەکە وڵاخەکانی برد بۆ سەرئاو، دەروێشیش گۆزەکانی لە کانیەکە پڕدەکردەوە و ئەحمەدیش وەك سەرپەرشت و مافی خۆیەتی ئەو کەمێ بحەوێتەوە- چونکە دوانزە میل رێیکردووە- لەگەڵ مندا دانیشت و جگەرەی دەکێشا.

پاشنیوەڕۆی ئەو هاوینە لە خوارووی کوردستاندا گەرم بوو، لەگەڵ ئەوەی لە رابردوودا گەرمتر بووە و ئێمەش بەختیاربووین لەپاڵ بارەکاندا شنەبایەکی هێواشی هەیە و چاوەڕێین وڵاخەکان ببەسترێنەوە و ئالیك و جۆی بدرێتێ، کە کاری ئەو رۆژە تەواوبووە. ئینجا دەروێش و لاوەکە هاتنە لامان و هاوبەشی ئەو هەرمێیانەمان کرد کە هێنابووم، چونکە هەڵناگیرێت و لەگەڵ ناندا شێوخوانێکی پێکهێنا.

پیاو زوو ماندودەبێت دوای هەڵتەکاندنی زۆر بەسەر هێسترەکەوە و گەرماو هەوای ئاسایش نیە تا دوای خۆرئابوون زۆر دانیشێت. ژەمەکە تەواوبوو، لە کوێدا بووین هەر لەوێدا راکشاین، لەسەر زەوییەکی بەردەڵان و چاوەڕێی نووستنمان دەکرد کە لەپڕ دێت. بەڵام دەروێش لەسەر پاژنەی پێکانی دانیشت و بە دەنگێکی بەرز دەستیکرد بە ویردی "لائیلاهە ئیلائەڵڵا" بە ئاوازێکی بەرز، هەناسەیەکی قوڵی بە دەنگەوە هەڵدەکێشا، تا دەنگی ئەو لە شەوی ئارامدا بزرنگێتەوە. هەناسەی دەرنەدەهات و شەکەتیەکی زۆری بەسەرهات کە بەهۆی ئەم مەشقەوە دێت و عارەقێکی زۆری دەکردەوە بەبێ جوڵە لەسەر زەوی.

## بازیان

ئینجا دوای چەند دەقیقەیەك دەستیکرد بە "ئەڵڵاهو ئەکبەر، ئەڵڵاهو ئەکبەر،" بەتیژی یەك لەدوای یەك، دوا برگەی وشەی"ئەکبەر" زۆر بەتوندی دەردەچوو وەك چەکوش بکێشی بە مێشکدا ئاوا لە گوێدا دەنگی دەدایەوە، جارێکی تریش تا حاڵی لێهات بەردەوام بوو، دووبارە هەستایەوە و دەستیکرد بەهاوار لەسەر "ئەڵڵا". دوای ئەوە هەر لە شوێنی خۆیدا راکشا و ئەو نووست و ئێمەش هەروەها نووستین.

لە شێوازی سەفەری کارواندا هێشتا تا رادەیەك تاریکە، کە لە بەیانیدا کەوتینەوەڕێ و خۆر کاتێك هەڵهات ئێمە گەیشتبووینە داوێنی گرد و ڕێچکەکە بۆ بازیان- کە ئێستا ئەو ناوچەیە هەمەوەندەکانی تێدا نییە.

لەسەرخۆ هەوڵماندەدا و زۆرانبازێمان لە گەڵ سەرکەوتنێکی درێژ و گراندا بە ڕێیەکی بەردەڵاندا دەکرد و لەسەر ترۆپکەوە جارێکی دی تەماشایەکی سلێمانیمان کردەوە،- کە ئاستەکەی لە دۆڵی سورچینادا لەلایەن هێڵێکی سپی بۆ سەر پشتەشاخی کۆمەڵە بەرزاییەکانی بەرامبەر نیشانەکراوە- ڕێگاکەی دەچێ بۆ پێنجوێن و ئێران.

سوڕانەوەیەك بۆ پشتی بەردێك و هیچ شتێیەك لەبەر چاو دیارنەما و لەخوار پێمانەوە دۆڵە تەسکەکەی بازیان راکشاوە، بەلای راست و چەپدا دەکشا. لەبەرامبەر ئەوەشدا لەلایەن کۆمەڵەی بازیانەوە سنووردارکراوە، بەرز نییە، بەڵام سەد پێیەك لە تەختە بەردێکی تیژ بەرزدەبێتەوە، خاکەکە دادەخات و کەش و هەوایەکی سازگار لەبەر درەوشانەوەی رووناکی بەیانیدا دەدات بە شوێنەکە، کە دەگۆڕێت بە تاریك و لێڵی کاتێ رۆژ بەرەو رۆژئاوا دەچێت، تەختە بەردەکان سێبەر بەسەر دەشتەکەدا دێنن و رووی دیوارێکی چەماوە دەردەکەوێت، کە هەمەوەندەکان لە پارێزیدا هەڵیانداوە و لە خێوەتەکانیانەوە تەماشای تێپەڕبوونی کاروانیان و پەلاماردراوەکانیان کردووە.

ئێستا چۆڵ بووە، دوکەڵ لەگەڵ نەسیمی بەیاندا بەرزنابێتەوە، لە خۆرهەڵاتنەوە نە ئەسپ ئەحیلێنێ و نە گوێمان لە دەنگی یەك تەقەی تفەگ بووە. بۆیە هیچ شتێك نەبوو رامانگرێت، ڕێگا لێژاییەکەی بەرەوخوارمان هەڵبژارد و لەبەشی خوارەوە چووینە سەر لای راست بەدرێژایی دۆڵەکە، کە وردە وردە دەمانباتەوە بۆ لایەکی دی بەرەو دەربەندی بازیان. تێپەڕین، وەك بەدرێژایی رۆیشتین، ژمارەیەك باخی بچووك کە هەمەوەندەکان جێیانهێشتووە، پەڵەی جوان و دڵگیری کەمێ کشتوکاڵ لەسەر لاکانی گردەکە و لە بەشی خوارەوەی دۆڵەکەدا، کە ئێستا بەری داوە و

## دەربەندی بازیان

گەشتیارەکانی کاروانێکی بچووکی تر، کە ئێمە بەلایاندا تێپەڕین، خەریکی لێکردنەوە و بارکردنی بەرهەمە جێهێڵراوەکان بوون.

دەوروبەری سەعات یانزە، کاتێ لە ڕێی خۆماندا بووین بەرەو دەربەندی بازیان، هەندێ زەنگی مەترسی لێیدا، ئەویش بەهۆی دیمەنی کۆمەڵێکی بچووك سوارەوە کە لە پیشتمانەوە بە ڕێگاکەی ئێمەدا دەهاتن و هەندێکیان خەریکبوون چەکەکانیان ئامادەدەکرد. بەلام رای گشتی کاروانییان تەبایە، کە ئەگەر ئەو سوارانەی دێنە بەرەوە چەکداری نادەستووری تورکی بن، ئەوە شتیەك نییە مەترسیدار بێت، ئەگەر هەمەوەندەکانیش بن ئەوە پێویست بە بەرگری ناکات، بەجۆرێ کە خێراییەکەمان نەگۆڕێت و بەردەوامیمان دا بە ڕێوڕۆشتنی کاروانەکە، گوایە ناجۆر و نائاساییە. بەلایەنی کەمەوە فریاگوزاری گشتی بوو کاتێ سوارەکان بینران، دووانیان نادەستووری تورکی هێستر سوار و کۆمەڵێك پیاوی شێخان. کە بە کاروانەکە گەیشتن، دەستیانکرد بە سەرنجدانێکی ورد لە هەمووان، وەك ئەوەی بۆ یەکێك بگەڕێن و یەکێك لەوانی تر زیاتر خۆتێهەڵقورتێنەرە و منی ترساند بەوەی ڕەشمەی ولاخەکەی گرت و بانگی هاوڕیکانی کرد:

" Amma niyya ? piaeki bash nabi am kabra." - واتە (ئەمە نییە؟ لەوە دەچێت ئەم کابرایە پیاوێکی باش نەبێت.)

بەلام ولاخدارەکەم بە دەنگێکی بەرز وتی ئەوە بازرگان بووە، هاوڕێی بازرگانە موسلاویەکانە، دەستیانکرد بە پێکەنین لەسەر خەراجی سوارەکە، بۆیە ئاوازی دەنگی گۆڕی و داوای جگەرەیەکی کرد و دوای وەرگرتنی چووەوە بۆ لای ئەوانی تر و چوون بەرەو چەمچەماڵ. ماوەیەکی دوور و درێژە لە باوەمەردەوە بۆ دەربەندی بازیان، یان وا دیارە، چونکە نیوەڕۆ بوو- لە چواری بەیانیەوە دەستمان پێکردووە- کاتێ بەلای چەپدا لاماندا گردەکان شۆڕدەبوونەوە بۆ ناو جۆرە ئاودێرێك و بەناو پەڵەیەکی گەورەی زەوی کێڵراودا، لەوێدا بارەکانمان فڕێدا تا پشویەك بە ولاخەکان بدەین.

ئەمە ئەو شوێنەیە کە ریچی بەهرەدار، نوێنەری کۆمپانیای رۆژهەلاتی هیندی لە بەغدا لەسەرەتای سەدەی نۆزدەدا پێیدا تێپەڕیوە و تێبینیکردووە لە تێپەرینەکەدا، کە لە 1808دا گوندێکی تورکومانی تێدابووە بەناوی دەرگەزێن. ئێستا هیچی تێدانییە جگە لە کەمێ کشتوکاڵ، کە تایبەتە بە گوندی بازیانەوە، نە هیچ نیشانەیەك هەیە لەوەی ریچ باسیکردووە، کە بە بڕوای ئەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ساسانیەکان، لەگەڵ ئەوەدا، لە دیدی ئەو راستیەوە کە ئەم ناوچەیە

لەسەر سنووری ولایەتێك بووە لە چەرخی ساسانیەکاندا کە گرنگیەکی مەزنی هەبوو بەناوی (حەلوان) و هێشتا لەوێدا شوێنەوارێکی زۆری داگیرکردنی فارسی لەو قۆناغەدا پێوە دیارە، هەموو گریمانێك هەیە کە ریچ بەتەواوی لە بۆچوونەکەیدا راستە.

دیوارە فراوانەکەی دۆڵەکە لێرەدا تا رادەیەکی زۆر پاندەبێتەوە لە قولاییدا لە رۆژهەڵاتەوە بۆ رۆژئاوا و دادەبڕێت بۆ لوتکەکان. ئیدی ئەوە بەرەو رۆژئاوا تێدەپەڕێ بۆ چوونە دەرەوەی لە دۆڵی بازیان و بەرزبوونەوەیەکی درێژ دێتە پێشەوە کە بە ملەیەکدا تێدەپەڕێت، بیست یارد پان نییە، لەوێشەوە مرۆڤ دەتوانێ بە دەرگایەکدا بچێتە دەرەوە، گردەکان بە شێوەیەکی کوتوپڕ لە رشتە چیاکەی کە لە ملەکەدا پێشدێت کۆتاییان دێت و لەلایەن رێبواری بەرەو رۆژئاواوە دیوارێك جێدێڵێت.

لەو شوێنەوە کە ئێستا پشوی تێدا دەدەین بۆ ملەکە، لە کاتە مەترسیدارەکاندا شوێنێکی ترسناکە، چونکە هەمەوەندەکان جاران ئەمەیان کردووە بە دەروازەیەکی قایمی وڵاتە تەریکەکەیان و تەڵە بۆ ئەوانەی دەچوونە ناوی. لەسەر گردەکانی هەردوو لاوە و لە پاڵ بەرد و تاوێرەکاندا چاودێری نێچیرەکانیان دەکرد و دەردەپەڕین بەرەوخوار و بۆ ئەو کوڵۆڵانە دەردەچوون، ئەوانەی کە لە ملەکە هاتوونەتە ئەم دیوەوە و بۆیان دەرکەوتووە کە رێی گەڕاوەنەوەیان گیراوە و ئەوانەشی کە تێدەپەڕن و خۆیان دەبیننەوە دەچن بەناو ئاراستەیەکی تەسکی رێچکەیەکدا و لە هەموو لایەکەوە پەلاماردەدرێن. تەنانەت ئێستاش، ئێمە دەتوانین لە دوورەوە خەیمەکەی "بیمباشی" ببینین، کە لەسەر کانیەك هەڵدراوە، کە کشتوکاڵەکانی هەمەوەندەکان ئاودەدا، ئێمە ناتوانین لە بارەکانمان دوورکەوینەوە، چونکە لە پشتی پێچەکانی گردەکانەوە تورکەکان پرکێشی ناکەن بیبڕن و لەوانەیە هێشتا هەمەوەندەکانی تێدابێت.

لەم ملەیەی دەربەندی بازیانەوە، ئەوڕەحمان پاشا، کە یەکێکە لە پاشا کۆنەکانی بەبەی سلێمانی، لە 1805دا هەڵوێستێکی قارەمانانەی وەرگرت، لەمیانەی شەڕێکدا کە هیوای دەخواست ئەم بەشەی کوردستان سەربەخۆ بکات. دیوارێکی بەناو ملەکەدا بیناکرد- شوێنەوارەکانی تا ئەمڕۆش دەبینرێت- و دژی سلێمان پاشای بچووك لە بەغدا جەنگاوە، بە شێوازێك تێکشکاوە کە ریچ دەیگێڕێتەوە:

"ئەو لێرەدا دیوارێك و دەروازەیەك و سێ یان چوار پارچە تۆپی دامەزراند، دووانیانی لە بەرزاییەکەوە دانا بۆ تۆپبارانی سەربازگەی تورك لە داوێنەوە و هێرشەکەی سلێمان پاشا بۆ سەر

ئەو دەربەندە بێ کەڵك دەبوو، ئەگەر مەحمود بەگی، کوڕی خالید پاشا کە لەگەڵ تورك یەکیانگرتووە، رابەری هێزێکی تورکی کرد بە یارمەتی کوردەکان بۆ سەر شاخەکان، لای دەربەندەکەوە کە تەنیا هەندێ کورد پێیاندەزانی پشتگوێ خرابوو وەك نەشیاوە، بۆیە ئەورەحمان پاشا ناستی خۆی بینی هەڵگەڕایەوە و تفەنگەکانی لە بەرزاییەکانەوە روویانکرۆتە خۆی ئیدی ناچاربوو بە کشانەوە و دیوارەکە لەلایەن پاشای بەغداوە وێرانکرا، کە دوای ئەوەش چوو بۆ سلێمانی."[71]

زۆر گەرم بوو، لە قرچەقرچی نیوەڕۆدا و ئەوەی توانیمان کردمان، لەوە دەچوو مەحاڵ بێت هیچ سێبەرێ پەیدابکەین، لەگەڵ ئەوەی بارەکانمان بەرزکردبۆوە و عەبایەکمان دا بەسەر دوو داردا، ئیدی بە ناچاری لەسەر بەردەکان راکشاین و عەرەقمان دەردەدا. پێکەوە ژەمێ شوتی و نانمان خوارد- یەکەمیان کە لە بێستانەکانی هەمەوەندەکانەوە هێنایان. ئینجا دەروێشەکە و لاوەکە دەبووایە دوور بڕۆشتنایە بۆ سەر جۆگاکە بۆ ئاودانی وڵاخەکانیان، لەکاتێکدا من لەگەڵ ئەحمەدی سەرکارواندا بەجێماین. خەریکبوو زۆر بەدڵم دەبوو، چونکە بێدەنگ و بەڕێز بوو، خەریکی کاری خۆی بوو، هیچ جیاوازیەکی لە نێوانی خۆی و نەفەرەکانیدا نەدەکرد، شێوەیەکی ویقاری پێشاندەدا، لەگەڵ وڵاخدارەکان گەشتیارەکانی هاوشاری خۆی. پێکەوە دانیشتین جگەرە کوردیەکانی خۆمان دەکێشا و لێی پرسیم، یەکسەر لەبارەی ئایینمەوە، چونکە منی نەبینیوە نوێژبکەم و لەو بڕوایەدا بووە کە من نابێت موسڵمان بم.

کەسایەتی ئەو پیاوەم بەدڵ بوو، هەوڵمدا راستی پێبڵێم و وشەکانی رێکمخستن گەورەتر بوون لە خودی خۆم، وتم:

" تۆ بیستوتە کە من ئێرانیم، تۆ قسەدەکەی وەکو زمانی ئەو خاکە وەك ئەوەی من بزانم لەبارەتەوە، لەگەڵ ئەوەی من خەڵکی ئێرانم بەشێواز، بەڵام من فارس نیم و ئەگەر فارسیش نەبم نە کوردم نە عەرەب و نە تورکیشم."

پرسی: " ئەی چیت؟"

" من تا ئێستا لە تیرەی نەسارام (مەسیحی رەسەن)، چونکە من خەڵکی خاکێکم پێیدەوترێت ئینگلتەرا، کە لە فەرەنگستانە،"

---

[71] Rich, Travels in Kurdistan, vol. [illegible] p. 58.

وەڵامیدایەوە، " چی! کە لە ئەستەنبوڵە" " کەواتە تۆ لەژێر سەرپەرشتی تورکیادای!"

وتم: " نەء" هێشتا لەژێر سەرپەرشتی تورکیادا نیم. من خەڵکی خاکێکم لە تورکیاوە دوورە."

" چ خوایەك دەپەرستێ؟"

" وەك ئەوەی نەسارا."

وتی: "باشە، باشە،" بە ئاوازێکی گومانا‌وییەوە، " ئەوە ئەوانەن کە لە بەغدا دەیانبینم، کە وەکو جلوبەرگی تورکی ئەستەنبوڵ دەپۆشن، بەڵام کڵاوەکانیان هەمەجۆرە، بۆیە کەس ناتوانێ بڵێ بە کڵاوەکانیاندا سەر بە چ تیرە و ئاینێکن، بۆچی، کڵاوی وڵاتەکەی خۆت لەسەردا نییە؟"

من وتم: "لەبەرئەوەی من دڵخۆشدەکات،" کە لەناو ئەو خەڵکەدا جلوبەرگەکانیان هەڵگرمەوە، چونکە ئەو پەندی پێشینانە فارسیە راستە دەڵێت، " کەسێك لەنێوان غەریباندا بیەوێت شەرمەزارنەبێت، جلوبەرگیان لەبەربکات و بە زمانەکەیان بدوێت" و ئەوەش نە بۆ من و نە بۆ ئەو بارودۆخەی منی تێدابوو نەدەگونجا خۆم لە بەرگی نادڵگیری فەرەنگیدا شەتەك بدەم، کە من دەتوانم بیزاری لە خۆم و ئەوانی دی بەدووربگرم، بەوەی نەریتە سادەکەی خەڵکە سادەکە لە خۆمدا بەرجەستەکەم."

"باشە، تۆ زۆر لە دوورەوە هاتویت، بێگومان هەناسەی بەختیاری بۆ چیاکانی خۆتان هەڵدەکیشیت. ئایا لەوێ کێو و بیابانە مەزنەکانیان هەیە؟"

منیش وەڵامدایەوە، "نەء"، " ئەوە خاکی کێوە بچووکەکان و دۆڵە بچووکەکانە، بێ دابڕان، بێ ئاسایش و بێ پشودان، لە پەلەکردنی بەردەوام، لە بەرپەرچدانەوەی وتەیەکی قورئان، کە دەڵێت،" هەموو پەلە پەلییەك لە شەیتانەوەیە و ئارامیش لە رەحمانەوەیە، ئێمە زنجیرە فارگۆنەکان لەسەر پێچکە ئاسنیەنەکان بەسەر هێڵە ئاسنەکاندا دەگوێزینەوە، کە رۆژە رێیەك بە سەعاتێك دەبڕێت."

ئەو وتی، " پەلەکردن لە شەیتانەوەیە، وتەیەکی راستە." ئەوە جێی داخە کە تۆ موسڵمان نیت، بەڵام هەر کەس بە بڕوای خۆی و نەساراش خاوەنی کتێبن و نەفرەتی نین، بەڵام بە من بڵێ، ئایا لەوێ نە وڵاخدار و نە کاروان هەیە؟"

"نەخێر، بەڕاستی، بۆ ئەوێ کە ئەو فارگۆنانەی تێدا بێت، چی پێویستیەکیان بە وڵاخدار هەیە؟"

" ئەوە چ جۆرە سەرزەمینێکە، هیچ کاروانێکیان نەبێت بۆ پەڕینەوە بە وڵاتەکەدا! کوردەکانتان هەیە؟ و ئەوانە شەمەندەفەرەکانی فارگۆنەکان روتناکەنەوە؟"

" نەخێر، نە کوردی لێیە، نە عەرەب، نە تورك و نە هیچ یەکێ لەم زمانانەی لێرە هەیە لەوێ تێیدەگەن."

ئەو وتی: " لائیلاهە ئیلا ئەڵڵا!" " چ سەرزەمینێکە! و لەگەڵ ئەوەی خوا هەموو مرۆڤی وەك برا دروستکردووە، هەموو وڵاتان کە هەمیشە باش و خراپە و من لەو بڕوایەدام کە تۆ لە باشترینەکەیانی. کێشە چیە ئەگەر مرۆڤ مەسیحی بێت یان موسڵمان. ناتوانێت دوای دەستوورەکانی پێغەمبەرەکەی خۆی بکەوێت و فرمانەکانی خوا؟ تۆش هەروەها، دوور لە میللەتەکەتی و هەڵسوکەوت لەگەڵ تورکومان و کورد هەردووکیان وەك برای خۆت سەیردەکەیت."

لەگەڵ ئەوەدا چوار پێنج گرێیەك خۆی راکێشا بۆ بەر سێبەرەکە کە سندوقەکانی ئێستا هەڵدا و خۆی بۆ نووستن رێکخست و منیش هەمان شتم کرد، سەرم لەبەر سێبەرە و جەستەم دەسوتا و لەبەر گڕەی خۆرەکە عەرەقی دەردەدا.

پشووەکەمان ئەوەندەی نەمابوو. نیو سەعات دواتر هەستاین و دەستمانکرد بە بارکردنی هێسترەکان و جارێکی تریش کەوتینەوە رێ. بە نزیکی لە بەردەکان لە هەردوو لای رێگاکەوە تینی گەرماکە چڕتر دەبوو. بای نەدەهات و دەستەسڕەکانی سەرمان پێ داپۆشیبوو، داماماڵی و هەوڵماندا پەردەکوللەیەکی بچکۆلەی پێ دروستکەین، لەگەڵ کاریگەرییەکی بچووکدا. سەعاتێکمان پێچوو تا گەیشتینە رێچکە بەردینەکەی دەچوو بۆ ملەکە، کە شوێنی دەرچوون لێوەی چەند یاردێك پانە، تاکە رێڕەو بە هێڵێکی نەبڕاوە بە گردەکاندا کە تا رادەیەك بەشێوەیەکی ئاسۆیی بۆ جیهانی دەرەوە پێشاندەدات- دوا شورای کوردستانە بۆ رۆژئاوا. لە دەرەوەی دەربەند زەوی تا دوور کشاوە و دەشتی چەمچەماڵ لەبەر دەمماندایە، لە راستیدا دەشت بەهیچ جۆرێك نییە، ئەوە بەکورتی، دۆڵێکی درێژی فراوانی پڕ لە گرد کە دۆڵە قوڵەکان دەبڕن، بەڵام لوتکەکانیان بە وردی هەمان بەرزیان هەیە کە وڵاتەکە لە دوورەوە وەك دەشتێکی تەخت دیارە.

ئەحمەد باش چاوش ویستی چەمچەماڵ جێبهێڵێت و زیاتر بەرەو باکوور بە رێیەکی گرانتردا و بەڵام نزیکترە وەك بەناو گردەکاندا، لەمیانەی شەودا وەستا، یان ئەوەندەی ماوە لێی، لە گوندێکدا ئەو دەیزانی. کاروانەکەمان ئێستا گەورەتر بووە، چونکە دوو کۆمەڵی بچووك هاتونەتە ناومان، لەگەڵ تێکەڵەیەك لە وڵاخداری سەیروسەمەرە. سێ عەرەبی تێدابوو، چیاوانێك لە خوار کفرییەوە، هەندێ تورکومان، کوردێك یان دووی تیرەی شوان و فارسێکی خەڵکی تاران، لەوە دەچێت زۆر دووربێت لە شوێنی خۆیەوە بە کڵاوە جیهانیەکەی و دیشداشە کورتەکەی لەناو ئەو پیاوە عەشائیرانە و

جلوبەرگی هاوداماندا. پێکەوە لەگەڵ ئەواندا تەکانماندەدا، روومان ئێستا لە خۆرە ئاوابووەکەیە. چەمچەماڵ لە پشتی بەرزاییەکان و بان و تەپە و گردەکانی دەشتەکەوە خۆی حەشارداوە. لە چەند خاڵێکی جیاوازدا ستونە دوکەڵ بەرزبۆتەوە، کە بەربووە لەو گیایەی بە گەرمای هاوین وشکبۆتەوە و گردەگرێت و لە شەودا، وەك چرایەکی گەورە دەدروشێتەوە، چەند میلێکی دی چەمچەماڵمان بینی- کات خۆرئاوابوون بوو.

شارە گچکەکە کەوتۆتە چاڵاییەکەوە و لەسەریەوە قەڵایەك راوەستاوە، کە تورەکەرێژە و دروستکراوە وەك قەڵاکەی هەولێر کە سەردەمانێك لەلایەن ئاشووریەکانەوە داگیرکراوە. خێمەکانی تورکەکان لە داوێنی قەڵاکەوە پەڵەیەکی سپییان نەخشاندووە و لە دیمەنی زەردەپەڕدا دەدرەوشێنەوە.

لێرەدا، لەکاتێکدا هێشتا چەمچەماڵ بەدیناکرێت، رێگاکەمان جێهێشت و کۆمەڵە کاروانەکە و بەرەو تاریکایی دەچوونە پێشەوە، رێگاکەمان لەلایەن بلێسەی گڕی ئەو ئاگرەوە رۆشندەبۆوە کە لە چاڵاییەکەوە وەك گڕکانێك دەهاتەدەرەوە. لە پشتی چەمچەماڵەوە دوا کۆمەڵە گردە کە کەوتۆتە رۆژئاوای رێگاکەی کەرکوکەوە. ئەم دواییە لە لێژاییەکی بەرەبەرەوە نزیکدەبێتەوە- کە گردە بچووکە لە ژمارە نەهاتوەکانی لەشێوەی بازنەییدا دارشتووە و بەدەوریا دەسورێتەوە. ئەو گوندەی ئامانجی ئێمە بوو کەوتبووە بەشی رۆژهەڵاتی ئەو کۆمەڵەیەوە و ئێستا دژوارییەکانمان دەستپێکرد، چونکە شوێن پێکان لقی لێدەبۆوە و لەم لاو لادا دەچوون بۆ گوندە جیاوازەکانی ناوشوان لەو ناوەدا. لە سەعات هەشتدا لە تاریکیدا لەیەك جیابووینەوە لە ژمارەیەکی گەورەوە، بەڵام پشتبەستن بە شارەزاییەکی ناوچەیی یەکێ لە عەرەبەکان، کە وتیان ئەو رێگاکە باش دەزانێت، نەمانویست دوایان بکەوین. لەدوای ئەوەی بازیانمان جێهێشتووە بەلای هیچ ئاوێکدا تێنەپەڕیوین و هەمووان تینویانە، بەڵام جومعەی عەرەب پەیمانی پێمان دا کە لە ماوەی سەعاتێك بۆ دوو سەعات لە گوندەکە دەبین. ئەو رێگە راستەکەی لێتێکچوو، لەگەڵ ئەوەدا دەستمانکرد بە سوڕانەوە بەناو ئەو گردۆڵکانەدا، هەورێکی تەپوتۆز بەسەرمانەوەیە و تینویەتیەکەمانی تەواو ناخۆشکردووە. لە تاریکایەکەوە دەنگێك هات، ئێمە گەیشتینە ئاو، ئێمەش بەخێرای کوڕە لاوەکەمان نارد تا گۆزەڵەکانی پێمانە پڕبکاتەوە.

پاش ماوەیەکی کورت خۆشمان گەیشتینە ئەوێ، بینیمان هێسترەکان هێرشیان کردۆتە سەر کانیە بچووکەکە و قەترەیان لێبڕیوە بەر لەوەی یەکێ لە ئێمە بتوانێ بەشی خواردنەوەیەك بەدەستبێنێت.

## ونبوون لە بیاباندا

ئێستا بۆمان دەرکەوت کە ئێمە ونبووین، چونکە وەك چاوەڕێماندەکرد کانی و ئاو لەسەر ڕێگاکە نییە بۆ سەفەر، لەگەڵ ئەوەشدا ڕێڕەوەکە بەرەو لایەکی هەڵە دەچێت. عەرەبەکە، بەهەرحاڵ هێشتا ڕێگاکە دەزانێت و وتووێژێکی بەرجەستەمان کرد لەبارەی ئەوەی بارەکان لەوێدا بخەین، کە دڵۆپە ئاوێکی تێدا شکدەبەین، یان بۆ پێشەوە بجوڵێین. ترسی ئەوەی دوچاری هێرش بین لەلایەن کوردەکانەوە کە بەشی زۆری کاروانەکان بوون و لەبەرخاتری ئەوان جارێکی دی کەوتینەوە ڕێ، ڕومانکردە ئەو شوێنەی کە واماندەزانی ئاڕاستەیەکی ڕاستە. بەرەبەرە بەرزدەبووینەوە و کاریگەرییەکی سەیر لە کەشوهەوای وشك و بەبێ سرووە بەباشی لێرەدا دەردەکەوێت. دادەبەزین بۆ بۆشایی پلەی گەرمایەك کە ئارەقی پێدەکردینەوە و چرکەیەك دواتر، سەرلەنوێ بەرزبووینەوە، ئیدی شەو فێنك بوو، کە ساردی کرد.

ئێمە لەو ماوەیەدا بۆ دوو سێ سەعاتێك هەڵدەکەوتین، زۆر شەکەت بووین، وشکی و ناخۆشی شەوی تاریك تەنیا بە کەوتنی هێسترێك یان مانگرتی گوێدرێژێك لەبەرەوپیش چوون دەردەکەوێت، تا شریخەی تەقەیەك زرنگایەوە، گوللە بەسەرماندا گیزەی دەهات و وەڕینی سەگە پاسەوانەکانیشی لەگەڵدا بوو. لە پەنایەکدا خۆمان حەشاردا و هاوارمانکرد بۆ هێرشبەران تا تەقە ڕاگرن. ئەوەش بۆ ئەوەی خۆیان دڵنیاکەن لەوەی کە ئێمە خەڵکی بێ زیانین و هاتوین تەنیا لە گوندەکەیاندا دابەزین، ئیدی زانیان ئێمە زیانبەخش نین و خستیانینە سەر ڕێی خۆمان. بەڵام دەبێت دووبارە لە تاریکیدا لەناوچین، چونکە سەعات بە سەعات بێدارین، هەمیشە بەرەبەر بەرزدەبینەوە و هەرگیز دەرناچین، لە بەرزبوونەوە و شۆڕبوونەوە و لە گردۆڵکەکان و تەپۆڵکەکان دەربازنابین. لەوە دەچێت ئێمە هەر بەدەوری ئەم گردە بچووکانەی کۆتایی نایەت بخولێینەوە. گەیشتوینەتە ئەو قۆناغەی کە مانەوە بەسەر هێسترەوە نزیکە لە مردنەوە، چونکە یەکێ خەوی لێکەوت لە وڵاخەکە دەکەوێتە خوارەوە. زۆربەمان ماوەیەك دوور لەیەکتر ڕێمان دەکرد و لە تاریکیدا هەڵدەکەوتین و ماندو نارەحەت بووین. دەتوانین ببینین کە ئەوەی دەیەوێت بەڵام چەند سەعاتێکی ماوە بۆ بەیانی و هێشتا بە هیواین کە پاڵ بە پیاوێکەوە بنێت بۆ کەرێتی، دەچووینە پێشەوە. دواجار، بەهەرحاڵ گەیشتینە خاڵێك کە بەدڵنیاییەوە ڕێگاکە بەرەو باشوور دەڕوات- ئێمە دەمانەوێ بۆ باکوور بچین- و هەروەها لەوێدا وەك یەك زەلامەکان و هێسترەکان وازیانهێنا.

# گەیشتن بە گوندێک

وڵاخەکان کەوتن، بەرزاییە تیژە بەردەڵانەکەی پێشمانەوەیان رەتکردەوە و نەفرەتیان لە هەموو شتێك دەکرد، ئێمە لێیانگەڕاین پاڵکەون، بارەکانیان لەو شوێنەی وەستاون یان کەوتون لێکرێتەوە. لاوەکە هەڵقرچابوو، زمانی ئەوەندە ئاوسابوو نەیدەتوانی قسەبکات، بەڵام تەنیا دەیڕخاند، ئەو و هەروەها ئەحمەد باش چاوشیش نزیکەی چوارده سەعاتە بەبێ پشودان رێدەکەن. نەوەستاوین بۆ رێکخستنی بارەکان یان کۆکردنەوەی تورەکەی وڵاخەکان و پریاسکە بچووکەکانی لەو ناوە کەوتون، ئێمەش لەسەر بەردەکانی رێگاکە راکشاین و لەو کاتەوەی راوەستاوین، لەمیانەی کاری بارکردنەوە و وڵاخ بەستنەوە پێیانەوە، یەك کەس قسەی نەکردووە، لەگەڵ ئەوەی ئەو کارە پێویستی بە تواناییەکی زۆری قسەکردنە.

لەو بڕوایەدام بۆ یەك دوو سەعات یان ئەوەندە زیاتر نووستبین، کاتێ سەرما بێداریکردینەوە. من دەلەرزیم و سەرما چووبووە گیانمەوە. کزەی بەیانی بەرزبۆوە و لە سەرو گردەکانەوە تەقییەوە و پلەی گەرمای نزمکردەوە بە زۆر پلە لە چەند چرکەیەکی کەمدا. کازیوە دروزنە هەر ئێستا لە رۆژهەڵاتەوە دەرکەوت و لەگەڵ گوێنەدان بە سادەیی ئەو ناوەدا لەسەر زەوی دانیشتین و دەستمانکرد بە جگەرە کێشان بە هیوای ئەوەی گەرممانبێتەوە. لە دوورەوە، لەلاکەی تری دەشتەکی خوار بازیانەوە، دەمانتوانی گڕی ئاگری پوش ببینین کە هێشتا بڵێسەی دەهات و ئاهێکی هەڵکێشا بۆ کەمێ لە گەرمیەکەی. بێدەنگی بەیانی زوو تەنیا بە خشەی با بەناو پوشە وشکەکەدا و دەنگی ناوبەناوی تەقەی تفەنگی کوردە بەئاگاکان لەناو گوندەکانیانەوە دەبوژێتەوە. لەگەڵ یەکەم تیشکدا دەستمانکرد بە بارکردنەوەی وڵاخەکانمان و عەرەبەکەی کە بەرپرس بوو لە هەموو کێشەیەك هەوڵیدا بچێت بۆ بەشی سەرەوەی ئەو گردەی کە کزەی بەیانی لەوێ بەهێزە و بەدزییەوە سەیری گوندەکە بکات لەسەرو لای زنجیرەکەدا، کە سەرکەوت لە ماوەیەکی زۆر دوورەوە سەرکەوتنی بەدەستهانی. لەبەرئەوە بە داوێنی گردەکاندا دەڕۆشتین تا دوای سەعاتێك گەیشتینە شوێنەکە، کە لە بەیانیەکی گەشاوەی ساردا زۆر لە جوان دەچوو، چونکە پەڵەیەك داری هەنجیر و دارچناری گەورە لەگەڵ چەند جۆگە ئاوێك و ژمارەیەك پەڵەی سەوز و گژوگیا کە شوێنێکی باشە بۆ مانەوە. کاروانێکی زۆرمان لەوێ بینی باریان خستوە و شوێنێکی بچووکمان پەیداکرد کە سێبەر بیگرێتەوە کاتێ تۆزێکی دی خۆر بەرزدەبێتەوە. کە نزیك بووینەوە، گوندیەکان، هەندێکیان کە سەرقاڵی کارکردن بوون لە باخی هەنجیردا، لە پێشوازیماندا بە سڵاوی کوردانە "ما نەبی" — واتە

ماندونەبی، خۆشحاڵییان دەربڕی و یەکێك یان دوو کەس رایانکرد تا مەشکە دۆمان بۆ بهێنن و هەندێ جۆش بۆ وڵاخەکان. لەژێر دار چنارێکدا بارەکانمان خست و وەك دیوارمان لێکردن تا لە تینی گەرمای خۆرهەڵاتنمان بپارێزن و چاودێریشیان بکەین لەو رێبوارانەی نزیك ئەو ناوەن، هێسترەکانیان برد بۆ ئاودان، لەکاتێکدا ئەحمەد باش چاوش و خۆم چووین بۆ سەر کانیەکی بچکۆلە و بە ئاوی سارد خۆمان باش شت- کە ئەمە یەکەم جارە ئەوەتەی لە سلێمانی دەرچووین و گۆزەڵە ئاوەکانمان پڕکردەوە.

لەم باخەوە دیمەنێکی باش بە گوێرەی سنوورەکانی کوردستانەوە بەدیدەکرێت، چونکە ئێمە ئەوەندە بەرزبووین کە گردەکانی پشتی بازیان و چیا مەزنەکانی ئەودیوی ئەوانیش ببینین. پیرەمەگرون یان عومەر دگرون، وەك لەلایەن ریچەوە ناودەبرێت، بەردە مەزنەکەی سلێمانی، وەك نیگابانێکی سوپایەکی سوارە راوەستاوە و دەڕوانێت بەسەر دەوروبەری خۆیدا، لەگەڵ هێڵە پانەکانی هەوراماندا کە تەنیا لە لایەکەوە دەردەکەوێت و شاخی قەندیل بەسەر رەواندوز و کۆی سنجاق لە لاکەی ترەوە.

یەکسەر لە داوێنمانەوە دەشتی چەمچەماڵە، وەك دەریایەکی گرێ گرێی شەپۆلەکان دەکشێت بۆ بازیانە دابڕاوەکەی زنجیرەکە لە دەربەندا دیمەنی گردەکان لە لاکەی تری دۆڵەکەی ناسراو بە شەیتان دەردەکەوێت.

لە دەوروبەری بەیانیدا کوڕی مامی سەرۆکی شوان هات کە ئەم دەشتە تایبەتە بەوەوە، گەنجێکی کوردی زۆر بریقەدار، دەوڵەمەند بە حەریری خەتخەت و پوتی سووری سواری و تفەنگێکی باش و دەمانچەیەکی ماوزەریش لەبەر پشتێنەکەیدایە و یەك یان دوو وشەی بە هەمووان وت، پرسیارێك لەبارەی بەرەوکوێ و سەفەر، ئیدی دەرچوو، سێ یان چوار پیاو دوایکەوتن.

دەسترۆکەیەکی گەورەی پڕ لە هەنجیری تازەمان کڕی، کە وەکو هەرمێ سەوزە بچووکەکان بوو لەشێوەدا، بە قڕانێك و کەمێ لە نانەکانی خۆمان تەڕکرد- چونکە وەك تەبەقە ئاسن رەق بووبوو- هەموومان بەدەوریا دانیشتین و ژەمێکی گەورەمان پێکهێنا و ئیدی هەموو کێشە و کاروبارمان لەم کاتەدا پشودانە تا پاشنیوەڕۆ، کاتێ دەبێ جارێکی دی بکەوینەوە رێ.

لەسەر گردێکی سەرەوە، لەژێر سێبەری گەڵاکاندا، سێ کورد دانیشتن، کە چاویان تیژە هەموو ئەوانەی نزیك دەبوونەوە دەیانبینی و ئێستا و دواتر دەنگێکی نوستو هاواری "کاروانی، هۆ کاروانی" دەهاتە خوارەوە و وڵاخدارەکان رایانکردە دەرەوە تا هێسترەکانیان گردکەنەوە بۆ نزیکی ماڵەوە، چونکە لەلای گردەگەوە دەلەوەڕان.

## لەسەر ڕێگا

هاوارێکیان بۆ هەمووان کرد، تا وڵاخەکانیان بۆ لای هەوارەکە بێننەوە و پەلەپەلیان پێکەوت و وڵاخەکانیان بە لۆقەکردن گەڕانەوە و هەورێ لە تەپوتۆزیان بەدەوری خۆیاندا بەرزکردەوە. هۆی سەرەکی ئەوەش ئەوەبوو دوای کەمێ بینیمان، لە داوێنی خوارەوە سوپایەکی گەورە لە پیاوان و وڵاخەکان بەرەبەرە ناو دەشتەکەیان پڕکرد، وەکو ڕێچکەی مێرووله- کوردەکان هەوارەکەیان گۆڕی- و سی یان چل سوارە لەگەڵ باخەوانانەکانی لای رانیە، پشدەر و بلباس دەهاتن بە دەمەرقۆپانی کورتە و ئەو جۆرە خەڵکانە، ئەوەندە دڕندەن یەکێ تا حەزیکات بیانبینێت.

هەر زوو دوای نیوەڕۆ جوڵاندن بۆ دووبارە دەرچوون دەستیپێکرد و هەروەك زۆرجار وایە، کاتێك یەك وڵاخ باردەکرا، ئەوانی تریش پەلەدەکەن، تا یەکەم جار دەرچێت. نیوەی کاروانەکە و زیاتر دوای ئەوەی ئامادەبوون، ڕۆشتن، بەڵام ملی ڕێی لاپاڵی گردەکەیان گرتەبەر، کە دواتر دەیانباتەوە سەر دابڕانێك لە زنجیرەکەدا. بەهەرحاڵ، ئێمە لەگەڵ کەمێ لەوانی تردا، ڕێچکەیەکی ڕاستمان بەرەو گردەکە گرت و بەخێرایی لە ناویاندا بووین و بەناو هەندێ دۆڵی جواندا تێدەپەڕین کە چەم و جۆگەیەکی زۆر و خێرا و بە تەوژمی پێدا دەکشا. لە یەکێ لەو دۆڵانەدا وشترەکاروانێك بارییان خستووە، وشترەوانەکان لە سەرەتاوە دیار نەبوون، تا قاچەکان بینران، لەنێوان دوو فەردەی سەرگیراو بە پارچە قوماشێك، کە شێوە لانەیەکی دروستکردووە و لەناویدا وشترەوانە عەرەبەکە لەکاتی ڕۆژدا پشوی تێدا دەدات. ئەم کاروانانە بە هێواشی ڕێ دەبڕن و بە قۆناغی کورت و لەو شوێنانەدا دەوەستن، کە دڕکی لێیە بۆ خواردنی وشترەکان، هەرگیز لە گوندەکاندا لاناداەن. هەمیشە لە شوێنی بیاباندا دەیانبینیت و وەك عەرەبەکانیش لای کوردەکان خۆشەویست نین و پێچەوانەکەشی هەمان شێوەیە، یەکێ لەوانەی پێشو لەوانەیە لە بەغداوە بۆ کەرکوك و سلێمانی تێپەڕێت، بەبێ ئەوەی هەرگیز کوردێك لەو شوێنە نزیکانە ببینێت، یان قسەیەکی لەگەڵدا بکات. زنجیرەکە، وەك لە بازیاندا بینیمان، کە هێڵێکی بەرز پێکدەهێنێت، وادێتە بەرچاو تەنیا یاڵێکە لە گردەکان، بەڵام پێنج سەعاتمان پێچووە تا ڕزگارمانبوو لێی. ڕێڕەوەکە هەمیشە بەزدەبووەوە، یەکێك بەناو دۆڵەکاندا و بەسەر گردەکاندا بۆ زۆر سەرەوە سەردەکەوت، کە لەوێدا دیمەنێکی جوان هەبوو. سەیری دواوە بکەیت، کوردستان و چیاکان بە بەرزییەوە ڕاوەستاوە و بۆ پێشیشەوە دەشتی فراوانی دیجلە بۆ دوور درێژدەبێتەوە، بێ دابڕان جگە لەو زنجیرە نزمەی بەرەو ئاڵتون کۆپری و تاکە شاخەکەی کە لەلای ڕۆژئاوای کەرکوکەوە ڕاوەستاوە، کە ئێمە لەبەر هەتاوی دوای نیوەڕۆدا دەتوانین

لە دوورییەکی زۆرەوە بە زەردی بیبینین. بەدەورمادا زنجیرەیەك گرد بوو، خاکی سوور و زەردی جوان و بەردە پێچخواردوەکان بۆ شێوە سەیر و سەمەرەکان، ڕێگەکە بە هەردوو لادا و بۆ داوێن دەکشا و نیو سەعان لە تەوقەسەری تەختی شاخێکەوە، دەستمانکرد بە دابەزین. تاریکایی داهات لەکاتێکدا ئێمە هێشتا لەناو چیاداین و ئەگەر مانگەشەو نەبووایە، ڕۆشتنەکە دوادەکەوت، چونکە سێبەری گردەکان تاریکایی شەوی ئەوەندەی تر چڕدەکردەوە.

کاروانەکەمان ئێستا زۆر گچکەیە، کە زۆری تر ڕێڕەوی جیاوازیان بەناو گردەکاندا گرتۆتەبەر و ئێمە چەندمان توانی پەلەمانکرد بۆ چوونە ناو کەرکوك بەر لە نیوەشەو، کاتێ دەروازەکە لە ڕووی ڕێبوارانددا دادەخرێت و پێچکردنەوەیەکی دوورو درێژە تا لە ڕێگەیەکی ترەوە دەچیتە ناوەوە. بەدرێژایی ڕێگاکە بەناو دەشتەکەدا شۆڕدەبووینەوە، بەهۆی جێ سمەکانەوە لە دەشتەکەوە چوکڵەی بەردی دروستبووە، بۆ ڕۆشتنی هێسترەکان زۆر نالەبارە و وەك ئەوەی لە شارەکە نزیك دەبووینەوە گەرمتر و گەرمتر دەبۆوە.

لە دەوروبەری نیوەشەودا، دوای 10 سەعات ڕێکردن، بە دەروازەکەدا دەرچووین و چووینە ناو شەقامێکی دوور و درێژی کەرکوکەوە، یەك میلی تەواو لە کۆتای ئەم سەری بۆ کۆتایی ئەوسەری. من نامەیەکم بۆ یەك سەلیم ناو پێیە، کە مەسیحیەکی موسڵاویە و ئێمە بۆ کاروانسەرای نیشەکەی بەرەو پێش دەچووین. ڕێگاکەمان بەناو بازاڕێکی بێدەنگی سەرگیراودا دەیبردین و بە ڕووناکی تاکە چرایەك ڕێی خۆمان لەو تاریکوتونەی بازاڕەکەدا بەدیدەکرد، تا گەیشتینە دەرگاکەی خانەکە، دەنگی لێدانی دەرگاکە لە هەموو شوێنەکەدا دەنگی دەدایەوە.

پاسەوانێکی خەواڵو کردیەوە و دوای ئەوەی ئەحمەد باش چاوش ڕایگەیاند کە ئێمە کێین، مۆڵەتی چوونە ناوەوەمان پێدرا. لە تاریکیدا من نەمدەتوانی بزانم ئەوە چ جۆرە شوێنێك بوو، جگە لە یەك کاروانسەرای ئیشوکاری ئاسایی، بەڵام بەبێ ئەوەی هەیوان بە دەوریا هەبێت لەسەر نهۆمی خواروو. لەجیاتی ئەوە نهۆمی سەروتر هەبوو، ژوورەکانێ کە لە ئاستی دیوارەکەدا وەستاوە، دەڕوانێت بە هەموو دەوری حەوشەی خانەکەدا.

لە سەرەوە پیاوێکی بچکۆلە لە جلوبەرگێکی شل و شێواوی شەودا هاتە خوارە، دەسترۆکەیەکی لەسەری پێچاوە. ئەو خۆی بەناوی خواجە سەلیمەوە ناساند و گوێبیستی ئەوە بوو، کە من بۆلای ئەو نێراوم، تاکە قەنەفەیەکی لە نهۆمی سەرەوە پێشاندام، کە من لەسەری دەنووستم و بەبێ قسەی زیاتر، منیش هەر زوو لەسەر تەختە ڕەقەکە کەروێشکە خەوێکم بۆ کرد.

## مەسیحیەکانی کەرکوک

لە بەیانیدا کەلوپەلەکەم خستە ناو ژوورێکی چۆڵەوە و چووم بۆ قاوەخانە بۆ پیاڵەیەك چا. لێرەدا چاوم بە سەلیم کەوت و پێکەوە کوپێك شیری شیرینی گەرمان خواردەوە، کە وەك نەریتێك لەم ناوەدا بەیانیان زوو شیر دەخورێتەوە. لەگەڵیدا گەڕامەوە بۆ نووسینگەکەی، ژوورێکی بچووك- کە زیاتر پێشکەوتوانە تر بوو لە هاوتاییەکانی لە سلێمانی- لەسەر کورسیەك لە پشتی مێزێکەوە دانیشت. گوێم نەدا بە شێوەی کابرا. کەسێکی بچکۆلە بوو، تا رادەیەك قەڵە و زەردهەڵگەڕاو لەگەڵ سەیرکردنێکی تیژ و فێڵبازانە. لەگەڵ ئەوەشدا تا بڵێی بەڕێز بوو، بەخێرهاتنی کردم بۆ کەرکوك، پرسیاری رەگەزمی کرد. پێموت ئینگلیزم و هیچ تێبینیەکی نەدا، جگە لەوەی پرسی ئەگەر من هاوسێکانمی لە کاروانسەراکەدا بینیووە. من کەسم نەبینیووە،

بردمی بۆ ناو دەرزەنێك ژووری لە شێوەی ئەوەی خۆی، کە هەر یەکەیان دووان لە بازرگانانی موسڵیان تێدایە. بەپێچەوانەی موسڵاویەکانی سلێمانی، کە دەستە پیاوێکی جیاوازی خۆش بوون، سەیری ئەمانە دەکەیت دڵنیاییان تێدا نابینیت، نە بەپێی تاقیکردنەوەکانی پێشو ترم هاندەرێك هەیە بۆ بۆچوونی باشتر بۆ ئەوان. یەکێکیان بەتایبەتی، لاوێك کە جلوبەرگی ئەورووپی لەبەردایە، یاخە و سەردەستی تەواو، نائاسایی و بۆگەن بوو لە دەرکەوتندا. چاوەکانی وەك ئەوانەی لە حاڵەتی سەرخۆشی بەدمەستیدایە و دەموپلێکی پیس و روخسارێکی چەور و تەواو بۆگەنی هەبوو. ئەوە کوڕی بازرگانێکی زۆر دەوڵەمەندی موسڵ بوو. نەبوونی زانخوازی سەلیم دیاردەیەك نەبوو لە هەڵسوکەوتی ئەو پیاوانە. سەریان کونکردم بە پرسیارکردن و باوەڕیشیان نەدەکرد کە ئینگلیزم، ئەیانبردمەوە بۆ سەر ئێرانی، چونکە لەگەڵ سەلیم بە کوردی دەدواین و لە کوردیش نەدەچووم (ئێستا چاکەتێکی کورت و پانتۆڵێکی ئەوروپیانەم لەبەردایە و فێستێکم لەسەردایە)، لەو بڕوایەدان من دەبێ فارس بم. بەهەرحاڵ، لە قسەکانیاندا ئەوان خۆیان رەزامەند کردووە بەوەی بڕوایان پێیەتی، پرسیارێك یان دوو پرسیاری تریان لەبارەی سەردەمی نوێوە لێکردم و وەڵامی رەزامەندیان وەردەگرتەوە، باوەڕیانکرد کە من هەرچۆنێك بێت مەسیحی بووم و ناوی "سۆن ئەفەندی"یان لێنام.

زۆریان دەکرد، تا بمێنمەوە و سەلیم پێیوتم کە رێگەم پێنادات بۆ شێوکردنەوە بەڵێن بە کەس بدەم تا من لەوێ بم، کە من دەبێت هاوبەشییان بکەم و بەدرێژایی رۆژەکە خۆم بسازێنم.

## رەفتاری مەسیحی

ئەو بەڵێنیشیدا، لەهەمان کاتدا هەوڵدەدات هێسترێکم لە کاروانەکەی بەغدادا بۆ پەیدابکات، کە لەماوەی چەند رۆژێکدا دەردەچێت.

ئیدی، هیچ نەبوو بیکەم، من بە بیرەماهات لەم پشودانەدا بچم بۆ بازاڕەکە و پیاسەیەکی پێدا بکەم و بیرەوەریەکانم لەو ناوچەیەدا نوێکەمەوە، کە ماوەی شانزە رۆژ بەر لە چوارمانگ تێیدا ماومەتەوە.

ئێرە زۆر گەرمە. کۆتایی ئاب لە کەرکوک لەوانەیە وەك هەر شارێکی میسۆپۆتامیا گەرم بێت و سازگار بێت لەسەر چیاکانی کوردستان، خەواڵوێتی باڵی بەسەرما کێشا و بەگران گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم و ئیدی راکشام و تا خۆرئاوابوون نوستم، لەلایەن سەلیمەوە بەئاگاهێنرامەوە، کە وای هەستدەکرد لەوانەیە من نەخۆش بم، هاتووە تا بزانێ کێشەکە چییە. چووین لە دەرەوەوە لەبەرهەیوانەکەدا دانیشتین، براکەی سەلیم ژەمە خواردنەکەی لێدەنا و سەلیمیش جلوبەرگی ئیشوکارەکەی لەبەری خۆی داکەند- کە بریتیە لە دشداشەیەکی درێژ، پشتێنێکی حەڵەبی چنراو بە خەیاتەی ئاڵتونی و فێستێك- بەرگێکی نەرمونۆلی لەبەرکرد و دەسترۆکەیەکی لە سەریشی بەستووە.

بۆ ماوەیەك بەناو ژوورەکەیدا دەگەڕا و لە ئەنجامدا بە دوو پیاڵەی بچووك و بوتڵێکی پێچراوە بە پەڕۆیەکی تەڕ هاتەوە، تا ئەوەی تێیدایە بە ساردی بمێنێتەوە و منیش زانیم رووبەڕی خواردنەوە بوومەوە. خواردنەوەکە عەرەق بوو، چێژێکی تیژ لەگەڵ رازیانە و بنێشتێکی بۆن خۆش، ئەو سوور بوو لەسەر ئەوەی لە سێ چوار پێکدا هاوبەشیی بکەم، قاشە شوتی شیرینی بەدوادا دەهات، کە بۆنی ناخۆشی ناودەم ناهێڵێت و تونیەتی گڕەی تیژییەکە دەشکێنێت.

تاریکایی داهات، ئێمەش چووینە سەربانەکە، کە قەنەفەکان دانرابوون. خۆر تازە ئاوابووە و لە سەربانەکەوە دەتوانی بەسەر کەرکوکدا بڕوانیت، لەگەڵ سەربانە تەختەکانیدا، بۆ بیابانە مەزنەکەی رۆژئاوا، کە رەنگی زێڕینی خۆرنشین وەك شێوەی شاخێکی گەورە دێتە پێش چاو، بە تەنیا راوەستاوە و بە داوێنی گردەکان یان سەرکەوتنی لێژ پشتیوانی ناکرێت لە رۆژئاوادا.

کەمێ لەم وەچەی ئاشوورییانە ئەوە دەزانن، کە ئەو ئاسۆیەی تێیدەڕوانن و ئەو شارەی تێیدا دەژین، باووباپیرانی ئەوان بنیاتی ناوە و شاخەکەی کە کاروانسەراکە کەوتۆتە داوێنێوە پێیدەوترێت "قەڵا دەبەیت سەلوك" واتە " قەڵای سەلوکیەکان."

ماوەیەکی کەمی ماوە بۆ ئەوەی چێژ لەو دیمەنە وەرگریت، چونکە خۆر ئاوادەبێت، کوتوپڕ تاریکایی دادێت و دەمەتەقێی مەسیحیەکان و بانگهێشتنیان بۆ خواردنەوە رێگری هەوڵی پیاسەیەکیان کرد لەبەر شنەی بای فێنکدا. هەر یەکەیان بە بوتڵێکی بچووکی عەرەقەوە هاتنە پێشەوە و لەلای قەنەفەکانیانەوە سەتڵێك ئاو دانراوە بۆ بەساردی هێشتنەوەی بوتڵەکان.

دەترسم بۆچوونێکی خراپ لەسەر خۆم دروستکەم، بەوەی کە لەگەڵیان نەخۆمەوە و گفتوگۆکانیشیان گرنگیەکی ئەوتۆی نەبێت و بێدەنگ ببم، کە کەمێ سەرسوڕهێنەر نەبێت، چونکە عەرەقەکە دەیجولاندن و قسەیان بەشێوەیەکی نائاسایی دەکرد، سەرکەوتو نەبوون لەوەی بزانن بۆچی هاوبەشی کۆڕی خواردنەوەکەیان ناکەم. سەلیم پێیوتم بەشداریان بکەم، چونکە بۆچوونێکی خراپ دروستدەکات لەسەر خانەخوێکە ئەگەر تۆ خواردنەوەکەیان رەتکەیتەوە، لەبەرئەوەی ئەمە تاکە شادمانیە لەم ژیانە بێهودەییەدا کە تێیدا دەژین. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە چ جۆرە ئینگلیزێکە کە نەخواتەوە و لەگەڵ ئەوانی تردا هەمان ئاستی خواردنەوەی نەبێت؟

وەڵامدایەوە کە ئیدی لەوە زیاتر دەستکەوت و نیشانەی پەروەردەیەکی باش نیە بخۆیتەوە لەگەڵ مرۆڤێکی تر لەژێر مێزەوە و کۆمەڵ ئەو هەڵسوکەوتە رەتدەکاتەوە و بۆیە منیش نەدەمتوانی هاوبەشییان بکەم، نە گەدەشم دەتوانێت بەرگەی عەرەق بگرێت، چونکە ماوەیەکی درێژە بۆ خواردنەوە بەکارم نەهێناوە. بەڵام ئەو هەر وازینەهێنا و لەدوایدا بەراستی لە ترسی رەنجاندنی ئەو، من پێم وت، ئەگەر بوونی کەسێکی نامۆ و میوانێك کە نەخواتەوە ناپەسەند بێت بۆ ئەو و هاونشینانی، من هاونشینی خۆم بەسەر ئەواندا ناسەپێنم، لەوەوە زۆر پۆزشی هێنایەوە و بە ئاشتی جێیهێشتم و ئیدی شێوەخوان گەیشت و قاپێکی زۆر پلاو و گۆشتی کولاو- دەمەتەقێ کۆتایی هات و بەدەوری مێزێکدا دانیشتین و پەنجەکانمان کرد بەناو خواردنی بەتام و چێژی ناو قاپەکاندا. لێرەشدا جارێکی دی خۆشەویست نەبووم، چونکە ماوەیەکی زۆرە نانی وشك و میوە دەخۆم، پارێزێك کە دۆزیومەتەوە لە هەموو روویەکەوە شیاوە، نەمدەتوانی زۆر لەو قاپانە بخۆم و ژەمێکم لەو نانە دروستکرد کە لەگەڵی دانرابوو، نەفرینێکی زۆرم لە میواندارەکانەوە دەبینی، کە وەکو هەموو ئەو مەسیحییە بێ جوڵانە، برێکی زۆریان خستۆتە لاوە. بەهەرحاڵ لەناو ئەم جۆرە خەڵکانەدا خوشییان لێت نایەت نەنگی نییە، چونکە دەرفەتی پێدام کە بڵێم من ماندوم و بچمە سەر قەنەفەکەم، لەوێ جگەرە بکێشم و تەماشای ئەستێرەکان بکەم، بیرمدەکردەوە، لە کاتێکدا گوێمدەگرت لە دەنگی بەرزی ئەو مەسیحییانە، کە زیاتر پڕدەنگتر دەبوون کاتێ دەیانخواردەوە،

پێچەوانە لە بەراوردا لەگەڵ موسڵمانەکان و بەڵکو تەمەنناداەکەم کە هەر وەك موسڵمانێك بەردەوامبوومایە، لەناوەندی ئەواندا دۆستم پەیداکرد و هاورێی باش بوون لەناو خەڵکانێکدا ژیام کە رێزی یەکتریان دەگرت، بگرە رێزگرتن یەکێ بوو لە بنەماکانی کەسایەتیان.
هەروەك شەو داهات بەسەر ئەو زەلامانەی کە خەریك بوو سەرخۆش دەبوون و هاواریاندەکرد و واوەیلایان دەکرد و گۆرانیان لەسەر شێوازی عەرەبی دەوت و نزگەرەیان دەکرد و بەدەنگی بەرز پێدەکەنین، گردبوونەوەیەکی پووچ و بێ بایەخی هەمیشە مەستەکان. شەوێکە بە ژاوەژاوی ئەوان ناخۆش بووە و کەس نەنووست تا سەرخۆشی نەیدابێت بە زەویدا، یان بەسەر قەنەفەکەدا، درەنگ بوو پێش ئەوەی بتوانم بنووم، دوا دەنگێ کە بیستم رشانەوەیەکی توندوتیژ لە قەراغی سەربانەکەوە بۆ ناو حەوشەکە بوو.
سەرم سەرمای بوو، سەرمایەکی زۆر خراپ، هەروەها بەیانی بە لەرزوتایەکی بەهێزەوە خەبەرمبۆوە، لەتاو تیشکی خۆرەکە کشامەوە بۆ ناو ژوورەکەم و لەسەر جێگاکەم راکشام، کە بریتی بوو لە پارچە بەرەیەکی تەنك و لەسەر خشتەکان، لەوێدا هەموو رۆژەکە کەوتوم و لەبەر لەرزوتا و گەرمی هەواکە دەبرژام. کەرکوك جێیەکە لەم کاتەدا پلەی گەرما لەبەر سێبەر 110 پلەیە و ئەو ژوورە بچووکەش، هیچ دەرچەیەکی هەوای نییە جگە لە دەرگاکە، تەنیا گەرمی تێدا کۆدەبێتەوە، کە لە دیوارەکانی کاروانسەراکەوە پەرشدەبێتەوە و هەرگیز شنە بایەك نایەت تا فێنیکی بکاتەوە.
لە خۆرئاوابووندا لەرزوتا بەریدام و سەلیم پەیدابوو، بۆ پرسکردن بۆچی لە میانەی رۆژدا نەهاتوومەتە دەرەوە. لەو باوەڕەدا نەبوو کە من هیچ شتێکم هەبێت، وایدەزانی لەسەر هەڵسوکەوتی دوێنێ ئێوارە بەردەوامم. بەڵام هێمایەکم دایە، کە لە دواجاردا بەتەنیا جێمبهێڵێت و ئەویش رۆشت بۆ عەرەقەکەی بە غەمگینی و منیش دیسانەوە خۆم ماتکردەوە.
ئیدی بۆ ماوەی سێ رۆژ لە ژوورەکەدا مامەوە، رۆژی جارێکیش دەچووم بۆ بازاڕ بۆ کڕینی پارچەیەك نان و هەندێ شوتی. مەسیحیەکان وایاندەزانی کە من کەسێکی گۆشەگیرم، خۆیان دووردەگرت لێم، کە منیش سوپاسگوزار بووم لەجیاتی شتی تر و کات بەسەربردنی خۆیان دوای خۆرئاوابوون بەو شێوە رابواردنە، کە لەوە دەچوو تاکە سەرچاوەبێت.
لە رۆژی چوارەمدا سەرما و لەرزوتاکەم باشتر بووە و بیرمکردەوە بچم بۆ قاوەخانەکەی کە شیری گەرمی لــێ دەفرۆشرێت، چوومە ئەوێ و داوای خواردنەوەکەی خۆمم کرد. ئەوەم خواردەوە و

# ڕووداوێك لە قاوەخانەیەكدا

پارەكەیم دا، كاتێ یەكێ بە قاوەوە هاتە پێشەوە و هەندێ شتی تفت و تاڵی بۆ تێكردم. هەر كە ڕەتمكردەوە و گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی كە خاوەنی قاوەخانەكە خواردنەوەی ناخۆشی دروستدەكرد، پێكەوە كەوتنە قسەكردن، بە فرمانی ئەوەی كە سەیری منیان دەكرد دەبێ من بابەتی باسوخواستەكەیان بم. ئیدی خاوەنەكە خۆی بە قاوەكەوە هاتە پێشەوە و بۆی تێكردمەوە، دیسانەوە ڕەتمكردەوە، كە ئەوەش توڕەی كرد.

وتی: "تۆ كێی؟" كە هاتویتەتە قاوەخانەوە و قاوەش ناخۆیتەوە؟ یان قاوەكە وەرگرە یان بڕۆ لێرە دامەنیشە."

منیش وەڵامدایەوە: "بۆچی" من شیرەكەم خواردەوە و پارەكەیم داوە، دەبێ هەروەها قاوەش بخۆمەوە؟ بە فرمانی كام نەریت تۆ بەزۆر قاوەكەت دەكەی بە گەرووی مشتەریەكانتدا؟"

ئەویش وتی بە مافی خاوەنداری قاوەخانەكە، شیر فرۆشەكە پەیوەندی نییە بە قاوەخانەكەوە و مشتەریەكانی ئەو نابێ لە قاوەخانەكەدا دابنیشن. ئێستا تۆ ئەو كارەت كردووە، دەبێ قاوەش بخۆیتەوە و پارەكەشی بدەی.

منیش وتم" "هەرگیز !" بە توڕەییەوە وتم قاوەكەت بكەرە گونجەكەوە، كە پیسایی بەو شێوەیە تێدا كۆبۆتەوە، تۆ خەڵكی غەریب سەغڵەت دەكەیت و بەهۆی ئەوەی كە ئەوان بە بیانوی خواردنەوەی شیرەوە هاتون بۆ ئێرە و تۆش دەتەوێ بەو وشە ڕەقانە و بە ئاكاری توركئامێزت ناچاریان بكەیت ئەو شتە پیسەت لـێ بكڕن.

قاوەفرۆشەكە فنجانێ قاوەی تێكردەوە و هێشتا بۆی ڕاگرتوم. لەگەڵ سەرسامیەكی نەفرەتینڈا لەو لاساریەی من، قاوەكەی بۆ هەڵدام و منیش بەو توڕەییە گرتم و ئەوەی مابوو كردم بە سەر و گوێلاكیا و لە قاوەخانەكە چوومە دەرەوە، چەند ئەفسەرێكی تورك سەرسام بوون، كە لە نزیكەوە ئاگایان لەوە بوو كە ڕوویدا. یەكێ لەوانە كە پیاوێكی بەساڵاچوو بوو دوامكەوت و قۆڵی گرتم و هاتە دەرەوە لەگەڵمدا.

وتی: " برا، برا،" " ئەو توڕەبوونە ناشیاوە بۆ؟ ئەو سوكایەتیكردنە بە تورك بۆ؟ ڕاستە تۆ غەریبی لە سیماتدا دیارە نەخۆشی، دڵنیام ئەوەیە بۆتە هۆی ئەو هەڵچوونە خوێناوی و یاخیبوونە. من بەزەییم بە تۆدا دێتەوە، بەڵام بەرهەڵستی ئەو پەلەپەلەی تۆ دەكەم و دەبێ بێیت بۆ ماڵی ئێمە و بۆ ماوەیەك بحەوێیتەوە، چونكە تۆ زۆر ماندو دیاری، كە لە ڕاستیدا وابوو، چونكە هەر هەنگاوێكم

## دیدارێکی نەخواستە

هەڵدەهێنا زۆر بە زەحمەت و عارەقم دەکردەوە و خۆم بە دیوارەکان دەگرتەوە، لەسەری هەر گۆشەیەکدا دەوەستام تا سەرم هێوردەبۆوە.

پیرە پیاو لە خانوییەکی بچووك نزیك مزگەوتی کەرکوك دەژیا، کە لە گڵ و بەرد دروستکراوە و هاوسەرەکەی فەرشێکی لە لای سێبەرێکەوە لە حەوشەکەدا راخست. لەوێدا دانیشتم و داوای چایی کرد و دەستیکرد بە پرسیارکردن لەو جۆرانەی هەمیشە بەرگوێم دەکەوێت. دەمبینێ، ئەو باوەڕناکات کە من کەسێکی ئینگلیزبم و بریتانی بم. کە بیستی دەمەوێت بچم بۆ بەغدا، پێیوتم کە ماوەیەکی درێژە هێشتا کاروان نییە بۆ بەغدا بچێت، من دەبێ لە کەرکوکدا بۆ ماوەی رۆژانێکی زۆر بمێنمەوە ئەگەر بمەوێت لەگەڵ کارواندا برۆم. حەزم نەدەکرد ئەوە بکەم، بەهەرحاڵ، ئەو شتێکی باشی دی پێشنیارکرد، کە من دەبێ بچم بۆ ئاڵتون کۆپری و بە کەڵەك یان قەیاغ برۆم بۆ بەغداد. ئەوە قسەیەکی چاکە و بەلایەنی کەمەوە هەلێکە بۆ دوورکەوتنەوەم لە کەرکوك و ئاوو هەوا نەفرەتیەکەی.

بەهەرحاڵ، ئەو هانیدەدام لای بمێنمەوە بۆ چەند رۆژێك تا تۆزێ دێمەوە سەرخۆم، بەڵام بیری رزگاربوون لە هەوای ناسازی کەرکوك زۆر زۆر باش بوو لێی دوورکەومەوە، تەنانەت بۆ رۆژێ یان دووان تەواو پێویست بوو.

ماڵئاواییم لەو کرد و چووم بۆ کاروانسەراکەی نزیك دەروازەی رۆژئاوا و رووبارەکە، لەو شوێنەی وڵاخدارەکانی ئاڵتون کۆپری و کۆی سنجاق کۆدەبوونەوە. لێرەدا یەکێکم پەیداکرد، کە ناوی عومەر بوو، بە دوو مەجیدی دەمبات بۆ ئاڵتون کۆپری، نرخێکی گرانە، بەڵام من ئامادەنەبووم رەخنەی نابەجێ بگرم، چونکە دەشمەوێ برۆم. بەڵێنیدا لە ماوەی دوو رۆژدا دەرچێت و مەجیدیەکی پێشەکی بدەمێ، منیش گەڕامەوە بۆ ژوورەکەم و هەستم بە ئاسودەتر دەکرد لە ژیانی ئەو چەند رۆژەی لێرە تێپەڕیوە.

(سەلیم)م لە دەرچوونە هەڵپەسێراوەکە ئاگادارکرد و ئەویش پاڕایەوە ئەو ئێوارەیە شێویان لەگەڵدا بکەمەوە، دراوسێکانی بانگدەکات تا یارمەتی بدەن. بۆیە منیش رازی بووم، چونکە لەوانەیە دوا دوو ئێوارە بێت لە کەرکوکدا، لەگەڵ ئەوەشدا مەرجی ئەوەم دانا کە نامەوێ کەس زۆرم لێ بکات تا بخۆمەوە، کە خەریك بوو ببێتە هۆی تێکچوونی دۆستایەتیم لەگەڵ هەمواندا. ئەوانیش لە ئەنجامدا لەسەر مەرجێکی باش لەو کاتەوەی من گەیشتووم رازی بوون .

بەیانی داهاتو لە خانەکە دەچوومە دەرەوە بۆ بازاڕ، کاتێ سەرسام بووم و راچڵەکیم بەوەی یەکێ بانگی کردم "غوڵام حسێن" لە لای بەرامبەری دەروازەی خانەکە و ئاوڕمدایەوە، بینیم سەید نوری لاو، کوڕی شێخ ئەحمەد لە دوکانی زینڕوویەك دانیشتووە، ئەوەی کە لە سلێمانیش بێزاریکردم. لەرزم لێهات، کەس لە مەسیحیەکان نابێت لەگەڵ ئەودا من ببینن، یان گوێیان لێبێت کە قسەم لەگەڵدا دەکات، چونکە ئەو بە دەنگی بەرز قسەدەکات و لە هەموو دوو رستیەکیشدا بەناوی خۆم بانگم دەکاتەوە.

شێوازی قسەکردنی وەك هەمیشە بوو، رستێ پرسیار و یەکەمی بۆچی جلوبەرگەکەم گۆڕیووە. ئێستا وەك لەوەبەر هێمام پێکردووە جلوبەرگی ئەورووپیم لەبەردایە و فێستێکم لەسەردایە، کە دەسترۆکەی لـێ نەبەستراوە، جلەکانم نە یاخە، یان سەردەستی نییە و هێشتا پێڵاوی دروستکراوی ئەوێ لە پێدەکەم و عەبایەکم هەڵگرتووە یان عەبای تورکی وشتر. بۆ سەید نوریم روونکردەوە کە دەمەوێت بچم بۆ بەغداد و وەڵامدایەوە چەند بتوانم زووتر تا لە هەموو شتێك دوورکەومەوە. پرسی لە کوێ ماومەتەوە و منیش وتم "لە کاروانسەرایەکی نزیك،" چونکە نەمدەویست بڵێم لەوێ دەژیم کە لێی هاتمە دەرەوە و ئەوم بینی، تا بێت بۆ ئەوێ و هەواڵی غوڵام حسێن بپرسێت، کاتێ دۆستە مەسیحیەکانم من بە خائین و دوژمن دانێن و لەنێوانی خۆیاندا نەفرەتم لـێ بکەن و من دەبێ چینی موسـڵمانیشم لە دەست بچێت چونکە تێکەڵاوی ئەو خەڵکانە بووم.

خۆشبەختانە کەس لە کاروانسەراکەوە نەهاتە دەرەوە، کاتێ ئێمە لە دوکانی زینڕووەکەدا دانیشتبووین و من توانیم خۆم دەربازبکەم بۆ بازاڕ، کە دەمویست بۆی بچم. چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد سەید نوری ببینم، چونکە وامدەزانی ئەو لەگەڵ باوکی لە چەمچەماڵە، بەڵام لەوە ناچێت خۆی بگرێت لە نزیکی کەرکوك بێت و نەیەت بۆ ئێرە، هەموو چەند رۆژێك ئەو لە گەشتدایە لەنێوانی دوو شوێندا بۆ رابواردن یان پیاسەکردن بەناو بازاڕدا.

دووبارە بینیمەوە، بەڵام پەلەپەلمکرد لەگەڵ وشەیەکی دەگمەن، سەرسامکرد بە پەلەکردنەکەم و هەندێ بریندارم کرد یان رەنجاندم. ئەو دوا رۆژەم بەزۆری لەگەڵ پیرە تورکی یوزباشیدا بەسەربرد کە رۆژی پێشوتر دۆستایەتی کردم و وەك ئەوەشی کە بەڵێنمداوە شێو لەگەڵ مەسیحیەکاندا بکەمەوە، جارێکی تریش خۆم گرت لەوەی کە ئەوان لە بازرگانانی پایەدارەوە گۆڕان بە گەمژەی قیژەقیژکەر و لە هەموو قۆناغەکانی قسەی قۆڕکردن تا راکشان و بێدەنگ بوون.

بەیانی دواتر سەرقاڵبووم بە هێنانی هەندێ شت و کڕینی نان بۆ ڕێگا. سەفەرەکە درێژ نەبوو، بەڵام قۆناغێکی زۆر ماندوبوون بوو، بە ئاسایی دادەنرێت بە دە بۆ دوانزە سەعات، ئەگەر کەسێ نەوەستێ یان دانەبەزێت.

ولاخدارەکە لە نیوەڕۆدا هات بۆ لام و منیش خواحافیزیم لە مەسیحیەکان کرد، کە لە دوکانەکەی سەلیم کۆبووبوونەوە و ئەوانیش بە سۆزێکی زۆرەوە خواحافیزیان لێکردم. یەکەم خاڵی دەستپێکردنمان لە کاروانسەراکەوە ڕێیەکی دوورە و دەبێ کۆڵهەڵگر بەکرێ بگرین تا کەلوپەلەکانم هەڵگرن بۆ مەیدانە گەورەکەی لای کەناری رۆژئاوای شارەکە، کە کاروانێکی زۆری گوێدرێژ بارکراون بۆ ئاڵتون کۆپری. وەك ئاسایی ژمارەیەك لە گەشتیاران ئامادە نین، بۆیە منیش لە دەم راڕەوی ژێر تاقێك لە داڵانی سەراکەدا دانیشتم و لەگەڵ کوردێکی موکریی باڵابەرزدا قسەمان دەکرد، زۆر لە حەمەی لای خۆم دەچوو، کە جێمهێشت، مەشقی ئەوەی دەکرد چۆن دەبێ سەری خۆی بە پارچە بەنێ ببەستێت.

پرسیم هۆی ئەو پەشۆکاویە سەیرەت چییە، وتی کە دوو رۆژ لەوەبەر رێگای هەڵەکردووە لە کۆی سنجاقەوە بۆ کەرکوك و کەوتۆتە ناو گردەکانەوە، لەلایەن هەمەوەندەکانەوە دووچاری پەلاماردان بووە و گوێدرێژەکەیان بۆ ناو دۆڵێك بەرداوەتەوە و کێشاویانە بە سەریشیدا. ئەو سەری پێچاوە تا شکاویەکە پێکەوە جارێکی دی یەکبگرێتەوە، بەڵام ئێستا لە هەموو لایەکەوە هەست بە ئازاری سەری دەکات و لە هەموو شوێنێکیش ئامۆژگاری دەکرێ، کە چۆن سەری بە پارچە بەنێك ببەستێ تا هەمووی پێکەوە بگەیەنێتەوە. لەمیانەی سەرگەرمی بارکردندا، دوو سەربازی تورکی هێسترسوار دڕیاندا بێنە پێشەوە، کە بووە هۆی سەغڵەتکردنی گوێدرێژەکان، بارەکان تەقین و زیان و بەیەکداچوونی گشتی بەرپابوو. ئیدی پێنج هێستریان لە شوێنێکی ئارامدا دۆزییەوە و دەستیانکرد بە هێنانە دەرەوەیان لە کاروانسەراکە، گوێیان نەدا بەو هەموو گوێدرێژ و بار و خەڵکانەی دووچاری ئاڵۆزی بوون. هێسترەکان گوشاریان خرابۆسەر بە هێماکردنی شمشێری پشتێنی سەربازەکان و بە لۆقە هاتن بەرەوپێش، هەموو کاروبار و شتێکیان تێکەڵکرد و شەڕ لەنێوانی کاروانەکەمان و سەربازەکاندا دروستببوو، کە دەیانویست و بەردەوام لە هەوڵدانی بەزۆر هاتنە پێشەوەدا بوون. لەوە دەچوو هەموو خەڵکەکە کەوتبنە شەڕەوە و بارودۆخەکە تەنیا بەوە سەلامەت بوو کە پاڵیان بە گوێدرێژەکانەوە دەنا بۆ ناو شەقامەکە، راڕەوێکی ئازادیان بۆ هێسترەکان و

## جێهێشتنی کەرکوک

سەربازەکان جێهێشت، کە تا رادەیەك بە خراپترین شێوە لێی دەرچوون، یوزباشیەکم لە دەرەوە بینی کە نەفرەتی دەکرد و جنێوی بە دواکەوتنەکە دەدا.

سەعاتێکی تری خایاند پێش ئەوەی بارکەین و هەر کە دەستمانپێکرد بیرمکەوتەوە شتێکم لای سەلیم جێهێشتووە، بۆیە جارێکی تریش بەدرێژایی رێگاکە رامکرد بۆ بازاڕ تا بیهێنمەوە و ولآخدارەکە وتی ئەو هێسترەکەی من دەهێڵێتەوە. پێم وایە بیست دەقیقەیەك یان زیاتری بۆ گەڕانەوە خایاند، کاروانسەراکەم بە بەتاڵی بینی، بۆیە بەپێ دەستمپێکردەوە و بەخێرایی دەڕۆشتم. لەوە دەچێت هەر کە من دەرچووم ئەوانیش دەستیان بە رۆشتن کردووە، چونکە من راستەوخۆ بە قەراغی کەرکوکدا رۆشتم، بەناو گوندی قۆرییەی قەراغی شاردا و بۆ دوو میلێك بەدرێژایی دەشتەکە پێش ئەوەی بیاندۆزمەوە و هەرچەند شوتیەکی گەورەشم کڕیووە و هەڵمگرتووە و ئەوەندەی بتوانم لە گەرمای مانگی ئابدا بەخێرایی دەڕۆشتم، من بەداخ نەبووم لاقەکانم لەسەر ولآخەکەم شۆڕکەمەوە و جلەکانم بکەمەوە تا عارەقی جەستەم کەمێ وشکبێتەوە. پلەی گەرمای خۆر لەم ناوچانەدا لەم کاتەدا دەوروبەری سەد و چل پلەیە. وەك ئاسایی گەشتیارێکی زۆری تێکەڵە. یەکەم ناونیشانێك لە خۆمم نا وەك خەڵکی سنەی کوردستانی ئێران خۆم دەرخست و دەچم بۆ بەغداد. بۆ کوردێك، کە سەفەرێکی بەرفراونی کردووە، دوای شەش یان حەوت بازرگان کەوتووە لە تارانەوە بۆ بوشێر لەسەر دوورگەی فارسی. پێشنیازیکرد کە وەك خزمەتکارێك لەگەڵمدا بێت بۆ بەغداد، بە چەند مەرجێکی ئاسایی لەو رێکەوتنانەدا؛ بە نرخی هاتوچۆکەی و خواردنەکەی. لەسەر ئەوە رێکەوتم، بەڵام بەو شێوەیەی ئاشکرابوو، من ئاڵتون کۆپریم جێهێشت بەر لەوەی ئامادەبێت و ئەوم لە دەست دا.

هەروەها ئەرمەنیەکی خەڵکی حەڵەبی تێدا بوو، کە دەگەڕایەوە بۆ شوێنی خۆی، پیاوێك بە هەندێ زانیاری و زۆربڵێییەوە، کە ماوەیەکی دوورودرێژ بە زمانی ئینگلیزی و رەفتاری ئەوان لەمیانەی رەشەکوژی ئەرمەنیەکان بوونەوەرێکی ناپەسەند بووە، وەك زووربەی هاوڕەگەزانی، بۆیە لەگەڵ سلێمان- دا کەوتمە وتووێژکردن بە کوردی- تا ئەرمەنەکە پشتگوێ بنێم- بۆ ئەوەی خۆمی لێ دوورخەمەوە.

## ئاشنایانی نوێ

ئێمە بەدرێژایی چەند سەعاتێك بەناو گردۆلکەکاندا تەکانمان دەدا، تا پێیدا بۆ دەشتاییەکەی سەر لاکەی تر بپەڕینەوە. مانگ هەڵنەهاتبوو، کۆششی چاوی ئاساییش خەوەنوچکەی بوون، بارودۆخی نیمچە بێ ئاگایی کە زاڵ دەبێت بەسەر یەکێکدا لە شەوێکی دوورودرێژی گەشتکردندا. هەر کە هەمووەمان لە رێدا وەستاین لە گوندێکەوە گوللەباران کراین، گوللە بە دەور و بەسەرماندا گیزەی دەهات، گوێدرێژێکیان کوشت، کە خاوەنەکەی کوردێکی ناوشوان بوو، بارەکەی بە بێدەنگی گواستەوە بۆ سەر ولاخێکی تر و بێ ئەوەی وشەیەك بڵێ رۆشت، چونکە بڕیارمان دابوو بەناو تەقەکاندا بڕۆین و لێی دەربازبین، کە ئەوەمان کرد، دوای تۆزێك، گوللەکان — بە فراوانی دەنران بە تاریکیەوە — لە هیچی تری نەدا.

من بە درێژایی گەشتەکەم ئاشناییم لەگەڵ دوو کەسی سەیردا پەیداکرد. یەکێکیان لاوێکی تەواو ساویلکە بوو. بە جلوبەرگەکەیدا سلێمانی یان کەرکوکی بوو، لە سەرەتادا بردمەوە سەر سلێمانی، تەنیا بۆم دەرکەوت کە هەڵەم کاتێ بە کوردی قسەم لەگەڵدا کرد ئەو بە تورکی وەڵامیدایەوە. هاوڕێکەی باوکی بوو، پیاوێکی بەساڵاچووی تۆکمە و هەڵسوکەوت بەرچاو، کە بە گوێدرێژێکی بچووك هەمیشە لەدوای کوڕەکەیەوە سواربووە، هەردووکیانی بەدرێژایی ئەو رێگایە بەکێشدەکرد. بۆ گوێگرتن لە گفتوگۆیان، کەسێك وا هەستدەکات کە لاوەکە قوربانی باوکێکی توند و تیژە، کە بە توندی بۆ هەموو شتێك دەیڵێت و دەیکات و رەخنەی لێدەگرێت، بەڵام بۆ چەند چرکەساتێك قسەی لەگەڵدا بکەیت بە بەلگەوە گەمژەیی بەلگەنەویستی دەردەکەێت و دادوەری لۆمە و سەرزەنشتی باوکیشی دەبینیت.

ئەوەی سەرەتا سەرنجم بەلای ئەواندا رۆشت شکانی گۆزەڵەیەکی ئاو بوو کە کوڕەکە بەریدایەوە، لەبەرئەوەی ئەو ویستویەتی لە دەمە پانەکەیەوە لەکاتی سواربوونیدا لە کاروانێکی جەنجاڵدا لێی بخواتەوە. ئەنجامی رووداوێکی داوانەکراو- هێسترێك خۆی لێدا و ئەویش ویستی بە دەستێکی خۆی بگرێتەوە و نەکەوێت، گۆزەکە کەوت. دە دەقیقە تێنەپەڕیبوو داوای خواردنەوەی لەوەی من کرد، بەڵام من لە تورەکەی زینەکەی ناکەمەوە باوکی هاتە ناوەوە. "نەء برام، نەیدەی بەو کەرە، چونکە ئەو بەهۆی شکاندنی گۆزەڵەی ئاوەکەیەوەیە تینوە، شایانی ئەوە نییە دەرفەتی ئەوەی بدەیتێ یەکێکی تریش بشکێنێت."

ئەو بە هیچ جۆرێ رازی نەبوو، بەڵام کوڕەکەی دژی دەوەستا و پیاهەڵدەشاخا. بۆ کەرێتی و بۆ هەڵسوکەوتی نەخۆشی لەگەڵ کەسانی غەریبدا، داوای کەمێ ئاو دەکات لەوەی کە خەڵکی تر پێیەتی.

پیرە پیاو کەسێکی کەمدوو بوو، بە بێدەنگیەکی تەواوە سوار بووە جگە لەو کاتانەی کە کەرێتی کوڕەکەی دەیهێنایە قسەکردن، بۆیە زۆر کەم دەیبینی پێش ئەوەی بگەینە ئاڵتون کۆپری، کە سەعاتێ بەر لە کازیوە گەیشتین.

ناچاربووم پشت بە عومەری ولاّخدار ببەستم بۆ شوێنی خەو و ئەو وتی یەکێکی وا دەناسێت و دەمبات بۆ ئەوێ. هەر لە پردە بەرزەکە پەڕینەوە ئیدی کاروانەکە توایەوە و ئێمە لەگەڵ دوو کەرکوکیدا کە بارێ رۆنیان پێبوو، بە کۆڵانە درێژەکەدا دەچووین بۆ کاروانسەرایەك، کە بۆ ماوەیەك لە دەرگاکەیان دا، لە دوایدا پێیانوتین کە چوار هێستر سوار شوێنەکەیان گرتووە و رێ بە کەسی تر نادەین. هەرچەند سەرکەوتوبووین لەرازیکردنیان بەوە و لە تاریکیدا شوێنێکی بچووکمان لە حەوشەکەدا پەیداکرد. لەوێدا ولاّخدارەکە بارەکانی ئێمەی فڕێدا و ولاّخەکانی بردە دەرەوە، بەرلەوەی من بزانم کە نایەوێت لەوێ بیانکاتە تەویلەوە، یان شوێنەکە دەرگاوانی نییە یان کەسێکی خانچی چاودێری گەشتیاران و کاروانسەراکە بکات. شوێنەکە لەسەر ئەوەوە وێرانە بوو. سەرکەوتن بەسەر پلیکانەی گڵێندا بە هەمان شێوە کەمێ بەر لە پایەیەکی ساف بە دیوارەکەی دەچووە سەر سەربانی تەویلەکە و سێ یان چوار ژوور کە من بەرچاوم نەکەوتون. سەربازەکان لەسەر سەربانەکە نووستون، هەرچی لە توانایاندا بووە کردویانە بۆ جێبەجێکردنی خراپترین ئیش، شتەکانم خستە سەر شانم و هەرچۆنی بێت بە پلیکانەکاندا سەرخست بۆ سەربانی تەویلەکە و کیسەیەکم خستە سەر زەویەکە، لە تەنیشت سەربازەکانەوە راکشام و بۆ چەند سەعاتێك نووستم.

# بەشی پانزەیەم

# بۆ بەغداد

لە بەرەبەیاندا هەستام و یەکسەر چووم بۆ سەیری ژوورەکان، کە یەکێکم دەویست تا کەلوپەلەکانی تێبکەم. دووانیان داخرابوون، سێیەم و چوارەم سەقفەکەی کەوتبووە سەر زەویەکە و پێنجەمم بینی دەتوانرا دوای هەندێ چاکردنەوەی دایبخەم، بەهۆی بزماری نالّی ئەسپەوە، کە لە حەوشەکەدا دۆزیمەوە و پارچە تەختەیەکی شکاو لە دەرگایەکی تر. شتەکانم خستە ناوی، دوورکەوتمەوە لەو کونەی کە تەویلەکەی ژێرەوەت لێوە دەبینی و دەرگاکەم داخست.

بازاڕ هێشتا نەکرابۆوە، هەر کە من لە دەرگای کاروانسەراکە چوومە دەرەوە، سەربازەکان تازە بەئاگاهاتبوون، هاواریان بۆ من کرد کە دوای خۆم دەرگاکە داخەمەوە. بەلای راستی شەقامەکەدا رۆشتم، بەردەوام بەو ئاڕاستەیەی گەشتەکەی شەوی پێشوم و چوومە دەرەوە بۆ سەر پانتایی کەناری دەریای لقەکەی باکووری ئەلّقەی زابی بچووك، کە ئالّتون کۆپری دەکاتە دوورگەیەك. لەوێدا باش خۆم شت و ئاوی سارد و شیرینم خواردەوە و وردە نانیشیم خوارد کە لە گیرفانمدا دۆزیمەوە. ئەوەندە برسیم بوو بێجگە لە کەمێ نان و نیو شوتی هیچ شتێکم لەو بەیانیەی پێشووەوە لە کەرکوکەوە نەخواردووە.

گەڕامەوە بۆ دواوە، جارێکی دی هاتمەوە بۆ ناو شار و چوومە قاوەخانەیەك، کە لەوانەیە هەندێ زانیاریم لەبارەی چۆنیەتی شوێنی دۆزینەوەی کەلەکێك و چوون بۆ بەغداوە دەستکەوێت.

لە شەقامە سەرەکیەکەی ئالّتون کۆپریدا چوار قاوەخانەی تێدایە، کە گەورەکەیان و لەوانی دی ناودارتر تەنیا قاوەی هەبوو. بۆیە ئەوەیانم جێهێشت بەلای راستمدا، ئارەزوی چام دەکرد و لەوی تریاندا مامەوە. هاوڕێکەم پێیوتم کە بۆ کەلّەك یان قەیاغ پەیداکردن دەبێت خۆم دیاریکەم بۆ خەلّکەکانی ناو بازاڕی دانەوێلّە و رێنماییکردم چۆن بچم بۆ ئەوێ. ئەو وتی خاوەندارەکان لە قاوەخانەیەك لەلای کەنار دەریاکەوە دەبینرێن، کە کەلّەکەکانی لێ باردەکرێت.

ئیدی حسابەکەم دا، جارێکی تریش بەدرێژایی رێگا سەرەکیە بچووکەکە بۆ سەر کەنار دەریاکە چووم، لەو شوێنەی زووتر خۆم لێ ششت، بەلاّم بەلای چەپدا پێچمکردەوە بۆ دەرەوەی شار و بەردەوامبوون بە قەراغەکەدا دەچووە سەر بازاڕی دانەوێلّەکە، شوێنێکی سەرقالّ کە کۆمەلّە گەنمی نایاب لەسەر زەوی رۆکراوە، بە جوانی جیاکراوەتەوە، بە زەبری بێلّ یان هەندێ ئامرازی تایبەتی بۆ

# گرتنی راپۆرتێك

ڕێگرتن لە دزین و بەناو ئەوانەدا ڕێی خۆم گرتەبەر بۆ دوو قاوەخانەی گەورە لەسەر کەناری دەریاکە لە لقی باشووری رووبارەکە. لەوێدا لەژێر سێبەری گەڵا سەوزەکاندا لە دەرەوەی قاوەخانەکە دانیشتم و چام دەخواردەوە، سەیری ئەو ناوەم دەکرد. عەرەبێکی زۆری خاوەن کەڵەك لەو ناوەدا بوون، بەڵام خاوەن قاوەخانەکە کە فارسی دەدوا، وتی یەکێ لەوانە لەکاتی بەیانیدا دەردەچێت. قسەم لەگەڵ دۆستەکانی دوێنێم دەکرد کە هاتنە ناوەوە، باوکە دڵ رەقەکە و کوڕە گەمژەکە و گوێگرتن لە وتووێژەکانمان وتیان ئێمەش هەمان راسپاردەمان هەیە و کەواتە ئێمە پێکەوە بگەڕێین باشترە. لەسەر ئەوە من سوپاسگوزاربووم، چونکە کەسانی غەریب لە وڵاتی غەریبیدا بە شادمانییەوە چاودێری هاوڕێی سەفەر دەکەن.

لەسەر ئامۆژگاری خاوەنی قاوەخانەکە هەوڵماندا و زوو حاجی عوسمان- ێکمان دۆزییەوە، عەرەبێکی سەیر، کە بینیمان، لە پەناگایەکی سێبەردار بە لق و گەڵاکەی سەر کەناری دەریاکە خەریکی بارکردنی کەڵەکەکە بوون. پرسیارمکرد کە ئەگەر کەڵەکی هەبێت ئەو بەیانیە دەربچێت، ئەو بە ئەرێنی وەڵامیدایەوە و هێمای بۆ یەکێك کرد کە ڕێك لەبەر دەمیدا بوو- ئیدی پشتی تێکردین و کەوتە قسەکردن لەگەڵ عەرەبێکی پیس و پۆخڵدا لەبارەی هەندێ کاروباری بێبایەخەوە. ئەو بۆ ماوەیەك رەتیکردەوە کە بیسەلمێنێت ئێمە هەین، تا ئێمە وەرچەرخاین بۆ رۆشتن بە نەفرینەوە، کاتێ ئەو لەسەر شانیەوە هاواریکرد ئەگەر بمانەوێت شوێنێکمان بۆ بەغداد دەداتێ. داوای چوار مەجیدی دەکرد بۆ هەر کەسێك و کاتێ ئێمە ناڕازی بووین لە گرانی نرخەکە، دیسانەوە پشتگوێی ناین و خۆی بە شتی ترەوە سەرقاڵدەکردەوە. جارێکی دی رووومان وەرگێڕا بڕۆین و ئەوە نرخەکەی بۆ سێ مەجیدی دابەزاند، بەڵام پێویستی بە هەڵوێستێکی تری هاوشێوە بوو تا بیهێنێتە سەر نرخێکی گونجاوی وەك دوو مەجیدی. تا ئەو کاتەش پەسەندی نەکرد لەگەڵ مەرجێکی نمونەیی، پێیدەوتین دەبێ لەسەر کەلوپەلە تایبەتیەکانی خۆمان بنووین و نابێت لەسەر شتومەکەکانی سەر کەڵەکەکە بڵاویانبکەینەوە.

داوای یەك مەجیدی لە هەر یەکەمان کرد، کە دامانێ و پێیوتین بڕۆن بە پەلە پێداویستیەکانتان بکڕن، چونکە کەڵەکەکە لەوانەیە چەند دەقیقەیەکی تر دەستپێبکات و چاوڕێی کەس ناکەین. بەو شێوە سەیرە پەلەمانکرد، لەیەك جیابووینەوە، هەریەکە بۆ خواردن و کەلوپەل هێنان. لەسەر ڕێگاکەم بۆ کاروانسەراکە پیاوێکی پیرم بە گوێدرێژەکەیەوە بەکرێ گرت، پێکەوە چووین شتەکانمان

هێنا و بارمانکرد لەسەر پشتی ولاخەکە و سپاردم بەو و خۆم چووم بۆ بازاڕ، بۆ ئەو شوێنەی دوێنێ عومەری ولاخدارم لـێ بینی.

هاتمدا یارمەتیم بدات و هەر کە بیستی دەستبەجێ دەردەچم، بیری لەو شتەی زۆر پێویستە کردەوە، نان، بۆیە کوڕێکی بانگکرد (لەوە دەچوو لەو شوێنە هەموو کەس بناسێت)، پێیوت راکە بۆ لای دایکت و پێیبڵێ بڕێکی گەورە نان بکات و لە کاتێکدا ئەوە دەکات کیسەیەکیش هەڵدرووێت تا بیخاتە ناوی. ئیدی گەڕاین بەدوای شتێکی تردا لە بازاڕدا کە بۆ گەشتەکە پێویست بێت و تەنیا میوەیەکمان دۆزییەوە، کە ئەویش هەرمێی ورد بوو. دوای مامەڵەیەکی زۆر بڕیارمان لەسەر شتەکە دا لای پیاوێکی دیاریکراو و داوای هۆقەیەکمان کرد لێی، بە مەرجی ئەوەی چونکە ئێمە بڕێکی زۆر دەکڕین، ڕێمان بدات هەرمێکان هەڵبژێرین. بۆیە پێکەوە کەوتینە هەڵبژاردن، یەکێ لێرەو لەوێ و دەستی لێدەدەین و دەیپشکنین و گەنیو و رەشبووەکان لادەدەین، دوای نزیکە سەعاتێك، کە کێشانەکەی خۆمان دیاریکرد فرۆشیارەکەش رازی بوو، شتەکەی کڕیومانە کردیە ناو دەستەسڕێکەوە و هەستاین بۆ ئەوەی پەنیر پەیدابکەین. هەمەجۆرمان بینی و چێژمان دەکرد، بریتی بوون لە سەلکی بۆگەن و لە بەردی خۆڵەمێشی دەچوون، هەندێکمان جیاکردەوە، فرۆشیارەکەی سوێندی دەخوارد کە تەمەنی بەلایەنی کەمەوە ساڵێك دەبێت و ئەوەش بۆ دڵنیایی کە خراپ نابێت. بۆ خواردنی ئەو پەنیرە دەبێت ماوەیەك بکرێتە ئاو، تا کەمێ نەرمبێتەوە و ئەو خوێیەی تێکەڵێکراوە کەمێکی بتوێتەوە. ئێمە پەنیرەکەشمان کردە ناو هەرمێکانەوە و خواردەمەنی سەفەرەکەم دوای ئەوەی نانەکەم وەرگرتەوە ئامادە دەبێت و من نانەکە بلاوکەمەوە، بە کرێکەشەوە نزیکەی چوار مەجیدی، یان (سیانزە شلینگ) بۆ گەشتێکی یانزە رۆژی بۆ بەغداد.

هەموو شتێك ئامادەبووە، جگە لە نانەکە، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ قاوەخانەکە، راستر بڵێم بۆ وێستگەی هەموو کەڵەکەکان و بانگی چامان کرد. کاتێ خەریکی دەمەتەقێی ئەوە بووین، "غولام حسێن" بەرگوێم کەوت و لە هەمان ساتدا عەرەبێکی بالابەرز هات بۆ لام، کە لە بەهاردا هاوڕێی سەفەرم بوو بۆ سلێمانی. ئێستا دڵنیا نیم عومەر دەزانێ ئەو چی دەڵێت و من زۆر شادمانم کە پیرە وکوڕەکەیان لەگەڵدا نییە، چونکە ئەوان دەزانن من مەسیحیم و ئەگەر دەرکەوێت کە من موسڵمانم ئەوا بە درۆزن ناودەبرێم و عەرەبەکەش خۆی پەسەند نییە، بەتایبەتی وەك لە دواتردا دەرکەوت کەسێکی تەواو دەمارگیر بوو، پێکەوە تاووتوێی زۆرمان لەبارەی ئاین و راستی شیعە و سوننەوە کردووە.

رایکردە سەرم و بە سڵاوی ئیسلامانە تەریقیکردمە کە ئەم لاو ئەولای ماچکردم و بە دەنگی بەرز بە تورکی قسەیدەکرد، دەستیکرد بە پرسیارکردن لێم لە کوێ بووم و چی دەکەم. هەموو کاتەکە چاوم دەگێڕا بۆ پیرە و کوڕەکەی و هەوڵمدەدا خۆمی لـێ دوورخەمەوە، بەڵام کابرای عەرەب نەیدەهێشت من بڕۆم، دەیوت بە ڕێکەوت خوا ئەم هەلەی سازاندووە و ئێمە یەکترمان بینیوەتەوە و نابێ کات بەفیڕۆبدەین و دەمەتەقێیەکی برایانە پێکەوە بکەین. ئیدی رایگرتم بە قسەکردن لەبارەی شیراز و ئێرانەوە، ئەوەش بابەتێکی سەرنجڕاکێشە بۆ دەورووبەرەکە و دەبینە ناوەندی کۆمەڵی گوێگران. پیاوە تەنگە ئەستورەکەی کەڵەکەکە بە پەلە هات بۆ ئەوەی پێمان بڵێت کە هەر ئێستا کەڵەکەکە دەردەچێت، لەکاتێکدا ئەوە روویدا، من هێشتا نانەکەم وەرنەگرتۆتەوە، لەبەرئەوە داوای چەند دەقیقەیەك چاوەڕوانیم کرد و بەپەلە رۆشتم، شادمانم کە لە عەرەبەکەش رزگارم دەبێت و تەواو دەترسام جێمبهێڵن بۆ هەفتەیەکی دی لە ئاڵتون کۆپریدا بمێنمەوە و لەو جۆرە.

پێڵاوەکانم لەسەر کەڵەکەکە جێهێشتووە تا فەردەیەکی دیاریکراو نیشانەبکەم کە ئەوە شوێنی منە و بە شەقامەکانی ئاڵتون کۆپریدا رائەکەم بە پێخاوسی پێم لەسەر زەویەگەرمەکە هەڵدەقرچا. جلوبەرگە کۆنەکەم لەبەردایە و سەرپێچێکی کوردی، جلوبەرگێکی دیارە و ئیدی بە خەتی نێوان سمی دوو گوێدرێژدا رادەکەم و نیو یاردم جێهێشت لە دواوە. ئارەقمکردۆتەوە، گەیشتمە بەر دەرگای نانەواکە، بۆ دۆزینەوەی ژنی خاوەن ماڵ و نان ژماردن و خستنە ناو تورەکەوە. منیش پەلامارمدا و خستمە سەر پشتم، حەپەسابووم لە کێش و قەبارەکەی و هێشتا لە خۆمم دەپرسی ئەو شاخە نانە چۆن دەتوانم بخۆم، لە چۆڵاییەکەدا هەڵکەوتم، بێ گوێدانە هاواری ژنە باشەکە بۆ کۆکردنەوەی نانەکە و لەکاتی خۆیدا گەیشتمە دەریاچەکە بۆ ئەوەی خۆم و بارەکەم بچینە سەر کەڵەکەکە، دەبووایە قووڵی چوار پێ بە ئاوادا بڕۆم و هاوڕێ عەرەبەکەم لە قاوەخانەکەوە دەرکەوت و رایدەکرد و هاواریدەکرد خواحافیزیی لێدەکردم. لێشاوی ناوەکە لێرەدا مڕە، لەگەڵ ئەوەدا و بەخێرایی دوورکەوتینەوە و پیرۆزبایی پیرە پیاو سەرنجی منی بەرەو ئەو لایە برد کە لەسەر رێزێك فەردە دانیشتووە و سەیری کراسە دڕاوەکەم دەکات لەگەڵ هاوسۆزیدا.

بۆ نیو سەعات یان ئەو دەورووبەرە خەریکی رێکختنی جێگاکەم بووم لەسەر فەردەکان، لێفە لۆکەکەم لەژێر خۆمدا راخست، نانەکانیشم کرد بە سەرین، هەوڵمدەدا ئەوە لەیادی خۆم ببەمەوە، کە ژێرەخەرەکە تەنانەت زەوییەکی تەخت نییە، بەڵام چی بە فەردەکان بڵێم، بەستەیە بڕەداری درکاوی لە سەختترین داری سەر زەمین، من دڵنیابووم، دەبرا بۆ بەغداد بۆ فرۆشتن.

# جێهێشتنی ئالتون کۆپری

ئەوەندەی توانیم لە پلەیەکی دیاریکراودا و لە ئەنجامدا بە بێدەنگی دانیشتم و لەژێر خۆری مانگی ئابدا ببرژێم، لە ڕۆژێکی بێ هەناسەدا و هەستکردن بە هاتنەخوارەوەی عارەق. کەڵەکەکە بەهێمنی دەسوڕایەوە و دەسوڕایەوە، لە ڕاستیدا هەموومانی وەك کەباب بە شیشەوە دەبرژاند. پلەی گەرما لەم ئاستی گەیشتنەی ڕوبارەکەدا لەنێوان گردە نزمە سورەکاندا زۆرە و بۆ بیرکردنەوە لێی تەنیا بۆ ئەوەیە بیرمان بێت، کە بەدڵنیاییەوە خراپتر بەڕێوەیە کاتێ دەگەینە دەشتەکانی میسۆپۆتامیا.

نزیکەی سەعاتێك بەر لە خۆرئاوابوون لە گوندێکی کوردەکاندا کەڵەکەکەمان بەستەوە، لەوێ دەبوو بارێکی زۆرمان لە بنەوە دەربێنایە و هەموو خۆڕێکخستنەکەمان تێکچووەوە، چونکە دەبوو کەلوپەلەکانمان بخستایەتە سەر کەنار دەریاکە تا ماوە بدەین شتەکان تاووتێ بکەن. شوێنەکە لە کۆتاییدا هێشتا مەودایەکی درێژە گەیشتن بە ڕووبارەکە و شتەکانم لای پیرە پیاو دانا، چووم بۆ شوێنێکی چەپەك و خۆم خستە ئاوەکەوە بۆ خۆشتن، ئەوە یەکەم جارە لە ماوەی یەك ساڵدا مەلە بکەم و یەکەم خۆشتنیشە بە هەرجۆرێك لە مانگێك زیاتر.

ژەمە ساکارەکانمان خوارد کە بریتی بوو لە نان و میوە و لەوێدا لە کەناری دەریای بەردەڵاندا لەسەر چەوەکە ڕاکشاین و تا بەرەبەیان نووستین. بەو جۆرە بۆ ماوەی سێ ڕۆژ چووینە بەرەوە، ڕێگاکەمان بە پێچ و دەورە لەنێوانی گردۆلکە نزمەکاندا بەدرێژایی زابی خواروو بەناو خاکی تا ڕادەیەك چۆڵ و هۆڵدا دەڕۆیشت. کوردەکان و تورکومانەکانمان جێهێشت، وەك ئێستا ئاشکرایە، لەگەڵ ئەوەدا کە ئێمە هیچ نابینین جگە لە عەرەب و ژمارەیەکی زۆر کەم لەوان.

ناوبەناو بە بەدرێژایی قەراغی ڕووبارەکە پەڵەی بچووکی بێستانی کاڵەك بوو، لەکوێ دابەزینی ڕووباری هاوینە قەراغی ڕووبارەکەی داڕماندووە و کردویەتی بە قوڕ و چڵپاو و زۆر جار خاوەنەکەی لەوێیە و ئارەزوی میوە دەکات، بەڵام زۆر جار بەتەواوی هیچ نیشانەیەکی ئاوەدانی نزیکی بێستانەکە نابینین، کە لەوە دەچێت خاوەنی نەبێت و جێهێڵراوە. گەرمای ڕۆژەکە بەتین بوو. وەك ئەوەی کە ڕووبارەکە زۆر نزم بوو بۆ ڕێکردن لە شەودا، بۆیە توانیمان لەسەر قەراغەکان بنووین و بەیانی زوو ئێمە جارێکی دی ڕاوەستاوین چێژ لە نیو سەعات ڕووناکی بەر لە خۆرهەڵاتن دەکەین. ئینجا هەروەها دوو سەعات فێنکی دێت، کزەی ساردی زاڵدەبێت بەسەر تینی گەرمای خۆردا، بەڵام لەمیانەی بەیانیدا ئەوە دادەبەزێت و ئێمە خۆمان ناشارینەوە لە خۆر کە لەوە دەچێت جەستەی ڕووت بسوتێنێت و عەرەقی سەر بەناو قژەکاندا دێ و دەچێتە چاوەکانەوە.

# لەسەر دیجلە

ئیدی پاشنیوەڕۆیەک، رۆژێکی دوایی کە ئێمە نزیک دەبووینەوە لە کەناری شاخێکی راوەستا و سامدار، بەدەوری گۆشەیەکدا سوڕاینەوە بەناو تووڵێکدا و چووینە دەرەوە بۆ ناو دەریاچەیەکی راستەقینە- دیجلە- کە بەدەوری پێچێکی گەورەدا دەکشێ و دەڕژێتە ژێر زنجیرە چیای حەمرینەوە، کە شاخێکی وشك و چۆڵە و جگە لە عەرەبەکانی جەبوور کەسی تێدا ناژی. ئێستا سێ قەیاغی بچووکمان پێکەوە لێکداوە و ئیدی شەوانی سەر قەراغی دەریا نەما. تا بەغدا دەبێت لەسەر فەردەکان بنووین و لە رۆژدا بەرگەی گەرمای زیاتر بگرین.

لێشاوەکە بردینیە ژێر بەردە سوورە رووتە گەورەکانی چیاکەوە و لە پشتیانەوە ژمارەیەك عەرەب دەرکەوتن، کە بەدرێژایی قەراغەکە رایاندەکرد و هاواریان لێدەکردین بووەستن. یەکێك خۆی رووتکردەوە، خۆی هەڵدایە ئاوەکەوە و بە مەلە بەرەو روومان هات. لە کەسێکی دڕندە دەچوو، زۆر بە تووڕەیی و بە بڕواوە مەلەیدەکرد، یەکێ لە کەڵەکەکانی جێهێشت. بە رووتی بازیدایە سەر کەڵەکەکە و وەکو هەموو جەردەکانی رۆژهەڵات، زۆر بە پەلەیەکی خراپ- داوای جگەرە و نانی کرد. ئەوانەیان لەوێ دایە و چووە سەر کەڵەکێکی تر، دیسانەوە لەوێش باجی وەرگرت، کاتێ زانی خەریکە دووردەکەوێتەوە قەڵەمبازی دا و تاڵانیەکەی خستە سەر تەوقی سەری و بەخێرایی بەمەلەکردن بۆ قەراغەکە گەڕایەوە. لەهەمان کاتدا هاوڕێکانی بەردەوام هەڕەشەیان دەکرد و پیاوە عەرەبەکەی کەڵەکەکەمان ترسا، بێ ئەزموونانە پاڵی نا بۆ نزیکی لاکە و بۆ رازیکردنی عەرەبە هاوارکەرەکان، کەمێ جگەرەیان لە هەریەکەمان کۆکردەوە و بە مەلە لەگەڵیدا بۆ قەراغی چوونەوە، ئەوە دادەنێن بەوەی خۆشبەختن کە رێدراون بەبێ زیانی زیاتر. ئەوانە ئەو عەرەبانەن کە ناوبانگیان خراپە و تەقە لە کەڵەکەکان دەکەن تا بێنە کەنارەوە، کاتێ رووتیدەکەنەوە، تەنانەت پێستە و دەستەکەکانیش دەبەن کە کەڵەکەکەی لێ دروستکراوە.

تەوژمی ئاوەکە وردە وردە دووریخستینەوە لێیان و لە دوورەوە بینیمانن شەڕیان بوو لە پێناوی بەشە جگەرەکاندا.

لە گوندێکی کوردی پیاوێکی پیری ناناسایمان وەك گەشتیار هەڵگرت، سیس و کۆماوە، جلوبەرگێکی سەیری لەبەردابوو، رەوان و پیر، کە کیسەیەکی بچووك و کوچەڵەیەکی تەنەکەی ئاوی هەڵگرتووە. ئەو لەکەناری دەریاکەی، کە بۆ یەکەم جار لاماندا لێی دەرکەوت و خۆی بە خەڵکی سەمەرقەند ناسان. لە راستیدا، شێوە و روخساری لە مەغۆلی دەچوو. چاوە بچووکەکانی

سەرکەوتبوون لەگۆشەی پردی لوتە تەختەکەیەوە و ریشەکەشی بەو شێوە تەنکە بوو کە لای تورکومان و مەغۆلیەکان دەردەکەوێت. تورکی و کوردی و عەرەبیش قسەیدەکرد، بەڵام زۆر پیر بوو، بیری چۆتەوە چی چییە و تێکەڵی دەکردن، بە تەواوی پیاوە عەرەبەکەی سەر کەڵەکەکە تێینەدەگەیشت. هەموو رۆژەکە لەبەرخۆیەوە ورتە ورتی دەکرد، پەنجەی دەکرد بە کەمۆڵەی ئاوەکەیدا، یان بە دەرزییەکی تەختە جلوبەرگە کۆنەکەی چاکدەکردەوە. نانی پێنەبوو، هەر ئەوەی دەخوارد کە ئێمە دەماندایە. ئەمە پانزەیەمین جارە دەچێت بۆ مەککە، بەڵام تەواو وەرزی حەجی لەبیرچۆتەوە. قسەکانی لەبارەی زۆر خەڵك و زۆر شوێنەوە بوو، پێکەوە تێکەڵی کردووە. شوێنەوارەکانی لە هەر یەکەی لەو شتانەی هەیبوو: قەڵەمبڕێك لە مەشهەدەوە، پارچە مۆمێك لە حەڵەبەوە، پارچەیەك بنێشتی بۆندار لە گوندێکی دووری پشتکێوی باکووری کوردستانەوە.

"ئەوەی،" بە شێوە زارەکەی خۆی دەیوت،" بە زاری خۆم پێیدەوترێ چەقۆ- بوچەق، یان بە عەرەبی سکین- ئەوانەی کوردەکان پێیدەڵێن کێرد، ئەوە دانەیەکی باشە و بە دوو میتالیك کڕیومە(پارەیەکی بچووکی تورکییە) لە بازاڕی مەشهەد نزیك مزگەوتی ئیمام رەزا، موسڵمانێکی باش کە هەرگیز رێنادا رۆژێك تێپەڕێت تا نان نەدات بە کەسانی وەك خۆم. لێرەش، لەم بەغدایە من چەقۆیەکی هەرزانم لە کوردێکی باڵابەرزی دیاریەکری دەستکەوت، کاتێ — ئەو پچڕاندی و لە ناوەڕاستی بەیانیدا، دەستنوێژی بیرچووە، راوەستا- پشتی لە مەککە، لەجیاتی رووی تێکات و وتی نوێژی عەسرە.

ئەو لە میانەی وتووێژا وەڵامی هەندێ هزری لە مێشکی خۆیدا بەبیردەهاتەوە، وەك ئەوەی زمانی تورکی نەبێت و بە کوردی تەواودەبوو، کە زۆرجار کوردی زۆر دەدوا- کوردی گرانی بایەزیدی کە ئێمەی باشووری بەگران تێیدەگەیشتین. ئەو سەلماندی بۆ گەیشتن بە مەککە لە ماوەی ساڵێکدا، رێگەی خۆی دەگرێتەبەر لە خانێکەوە بۆ خانێك، یان لەوانەیە شوێنی دەسکەوێت لە بەسرەوە بۆ جەدە بە پاپۆڕی حاجی. "ئۆی،" ئەو وتی، " دووجار رێگەی خۆم لە بەغداوە بۆ تەدمور و مەدینە گرتەبەر، لەوانەیە دووبارە ئەوە ئەنجام بدەمەوە، کێ دەزانێ؟"- و بیرەوەری رۆژانی تینوێتی لەناو بیابانی عەرەبیدا، تێکەڵ بە یادەوەری نارەحەتیەکانی کوردستان و زستانی بەستەڵۆکی دەشتەکانی تورکومانستان، جار جارە شێوەزارێکی سەیر و سەمەرە دەدوا، کە تەنیا دەمانبردەوە بۆ سەر بنەچەی شوێنی زێدی خۆی.

# تكريت

ئیدی ئەو هاودەمیە سەیرە بردینی بەرەو ئەو شوێنەی زنار یان تەختە بەرد لەسەر بیابانە تەختەکە دەرکەوتووە و گەشتینە تکریتی پیسوپۆخڵ، لەسەر لێژاییەك لەداوێنیدا راوەستاوە، شارێکی بیابانیە، دەرکەناره لە درێژبوونەوەیەکی کاکی بەکاکی لە هیچ، لەبەر رووبارێکی رووبەر تەسك بە دڵنیاییەوە کە هەمیشە دەڕوات و دەکشێت. تکریتی پۆخڵ، لەگەڵ سیانزە دووکانەکەیدا کە پێیدەوترێ بازاڕ و دوو قاوەخانە، یەکێکیان پڕە لە مشەخۆرە تورکەکان، کە لە تەلارێکی بەرزی بچووکدا لەسەر بەردێك دانیشتون بۆ وەرگرتنی شنەبایەکی گەرمی ئێواران. خانووی نارێکی پیس، شارێکی ناشیرین، پڕ لە عەرەبی پۆشتە کە لەبەر سێبەر دانیشتون و هیچ ناکەن- کە ئەوە هەوڵی دڵخوازی هەموو عەرەبە- ژنەکانیشیان رێچکە دەبەستن بۆ پڕکردنی گۆزە مل باریکەکان لە ئاو، کە ئەوە دەفری تایبەتی بەکارهێنانی عەرەبە لە موسڵەوە بۆ کەنداو. هەندێ لە کیژۆڵە جوانەکان، کە بە وریاییەوە رادەوەستن بۆ شۆردنی پاوپوزیان و گۆزەی ئاوەکە پێش ئەوەی هەڵیگرن و بگەڕێنەوە. بووکە لاوەکە لەوانەیە لەوێدا ببینرێت، کە بەخێرایی دەکەوێتە ناو ژیانی پڕ لە هەوڵدانەوە و تەمەنی بیستوپێنج ساڵە، خشڵەکانی بەخۆیدا کردووە، کە لەسەر خێری کوڕێکی لوتبەرزی بێکارە دەژی و پەڕۆ شڕە پیسەکانی کۆدەکاتەوە لەدەوروبەری پەلە چرچ و لۆچ و رەشداگەراوەکانی. گەوهەری وشکهەڵگەڕاوە، ئەم تکریتە، هێلانەی دووپشکی ژەهری عەرەبە، شاری تەپوتۆزە و لە تەپوتۆز بنیاتنراوە. نە پەڕە گەڵایەك، نە نیشانەی گەڵایەکی سەوز. کەچی لە لایەکەوە یەکێ هات و خورمای تازەی دەفرۆشت و ئێمەش چەند لقێکمان کڕی، نیوەی پێگەیشتووە وەك خۆشگوزەرانی کڕیمان، لە هەمان کاتدا چووینە ناو عەرەبەکانەوە لە پاڵ دیوارێکی روخاودا بۆ ئەوەی لە تیشکی خۆر دوورکەوینەوە.

جۆرە مێژوویەکی هەیە و بێگومان پایەداری پێشینی مەزنە، وەکو زووربەی شار و شارۆچکەکانی میسۆپۆتامیا. مێژوونووسانی فارس و عەرەبەکان دەڵێن، کە لەلایەن ئەردەشێری باباکانەوە بنیاتنراوە، پاشای ئێرانی کە لە سەدەی سێیەمی مەسیحیدا فرمانڕەوایی کردووە و کە بنەماڵەی ساسانی گەورەی بنیاتناوە تا محەمەد ئاژاوەی بەسەر شارستانی مەسیحیەتدا لەژێر دەستەڵاتی فارسدا هێنا. ئەوانی تر دەڵێن دامەزرێنەری خوشکەزای ئەو بەکرە بووە، کە دیاربەکری بنیاتناوە، هەرچەند ئەوە لەوانەیە کەم بێت، بەڵام دەکرێ ئەفسانە بێت.

## ئیمام دۆر

لەسەر تەختە بەردێك لەسەرو تكریتەوە شوێنەوارێك هەیە و لە نزیكی شارەكەوە نیشانەیەكی ئەو كاتە هەیە كە وەك شوێنێك لە كۆندا پێیوتراوە بێرسا، گەورە و شوێنێكی گرنگ بووە. لە میانەی سەردەمەكانی زووی مەسیحی شوێنی نیشتەجێی بەرپرسێكی گەورەی مەسیحی بووە و دەڵێن نزیكەی دوانزە كەنیسەی تێدابووە، هەرچۆنێك بێت، لەمیانەی سەردەمی خەلیفەكانی بەغدادا ئەوەندە گرنگبووە پردێكی باشیشی تێدابووە، كە ئێستا پاشماوەی نەماوە و بەرەنگاری ئابلۆقەكەی تەیموری لەنگی كردووە. لێرەدا، بەهیوای ئەوەی بە پردێك بچنە ناو میسۆپۆتامیاوە و بەغدا لە رۆژئاوا نزیكببێتەوە، هۆلاكۆ خان، سەرۆكی ئاپۆرای مەغۆلەكان كە تەواوی رۆژهەلاتی ناوەڕاستی داگیركرد، هاتە سەر تكریت، بەڵام خەلیفە موعتەسەم بیللا وێرانیكرد بەر لەوەی بگاتە شوێنەكە و شەڕێكی گەورە لەنێوانی دوو سوپاكەدا لەدەوروبەری شوێنەكە بەرپابوو. ئەوە لە نیوەی یەكەمی سەدەی نۆدا بووە.

ئێستا شوێنی نزیكەی هەزار و پێنج سەد ماڵە، كە دانیشتوانەكەی، گەشتیارێكی فارس دەڵێت، " خەڵكەكەی دۆستایەتیان بە دەروێشانەوە هەیە و لقێكی حەنەفین لە موسڵمانی سوونی.

لەوێدا پیرەژنێكمان وەك گەشتیار هەڵگرت كە دەچوو بۆ بەغداد، خزمی یەكێ لە كەڵەكەوانەكان بوو، كە زۆر چاودێرییان دەكرد. ئەویش لەلایەن خۆیەوە پیاوە بەساڵاچووەكەی خستە ژێر چاودێری تایبەتی خۆیەوە و لە نانە زۆرەكەی لای خۆی دەدایە. شێوە كێك ئاسایەكی شیرین كە خورمای لەسەر بوو دابەشیكرد بەسەرماندا، هەروەها زۆر بەسۆز بوو لەگەڵم كاتێ زانی كەمێ عەرەبی قسەدەكەم و خەڵكی دوورە وڵاتم. ئەویش هەروەها لەنێوانی دوو ریز فەردەدا سێبەری بۆ خۆی دروستكرد و هەندێ لە لقەكانی خۆی دامێ، كە منیش هەمان شتی پێبكەم، كە زۆر مەمنون بووم، چونكە لە نیوەڕۆدا خۆر بەبێ نوا تەواو سوتێنەرە.

بەیانی داهاتو هەڵسایین منارەكەی ئیمام دۆرمان بینی، شارۆچكەیەكی بچووك لەسەر كەناری چەپی رووبارەكە، پشتی داوە بە یەكێ لە بەرزاییە دێرینەكانەوە. ئەو دۆرەیە، یان دورا كە لە كۆندا پێیدەوترا، مێژوویەكی زۆر كۆنی هەیە، چونكە ئێمە لە ئینجیلدا خوێندومانەتەوە:- " نەبوخەزنەسر پاشا شێوەیەكی ئالتونی دروستكرد، كە بەرزیەكەی شەست باڵ و پانیەكەی شەش باڵ بووە و لە دەشتی دۆرا دایناوە، لە پارێزگای بابل" و لەوێدا چیرۆكی سێ منداڵە پیرۆزەكەی (شەدراخ، مەشاخ و ئەبێدنەگۆ) بڵاوبۆتەوە. سوپای رۆمانی لەوێدایە، دوای مردنی جولیان،

## سامەڕا

هەوڵیاندا بە دیجلەدا بڕۆن و بەشێکیان لە راستیدا بە زەحمەت و مەلەکردن پەڕینەوە و لەوێدا جۆڤیان سەرکەوت، کە جێنشینی جولیان بوو، دوای گەڕانەوەی لە کتیسیفۆن، لە پەیمانێکدا لەگەڵ فارسەکاندا کە ولایەتەکانی باکووری میسۆپۆتامیایان بۆ بگەڕێنێتەوە. لێرەدا لە هەمان بوارەوە لەلایەن رۆمانەکانەوە هەوڵدرا، کاروانی گوێدرێژەکانمان دەبینی بە مەلەکردن لە رووبارەکە دەپەڕینەوە، ولاّخدارەکانیان بەشێکی رێگاکە بە زەلکاودا گوزەریان دەکرد و باقیەکەشی مەلەیان دەکرد.

دوای سێ یان چوار رۆژ دەرچوونمان لە تکریت، گومەزە ئاڵتونیەکانی سامەڕامان بینی- "سوڕرە مەن رەئا" ("ئەوەی ببینێت شادمان دەبێت"). شوێنێکی گەورەیە لەسەر زنارێك کە تەنیا دەردەچێت بۆ پانتایی دیجلە، رەشداگەڕاو وەك ئەو بیابانەی کە لەناویدا بەرزبۆتەوە، مزگەوتێکی گەورەیە بە ئاشکرا لە سەرو هەموو شتێکەوەیە، لەگەڵ ئەو پاکیەدا، دەرکەوتنێکی نوێ کە هەر بینایەکی بەهێز پێویستە لەم کەشە وشکەدا ئەوەی هەبێت. دار و درەخت شەقامەکانی نەڕازاندۆتەوە، ئەویش بیابانە وەك دەشتەکەی دەرەوە. تەنیا لەبەری ئەوبەرەوە کەمێ باخ و باخاتی لێیە و پاشماوەی پردێك لە بەلەمەکان، کە سەرومڕ پۆزش دەدات بە تورك، تا باجی هاتوچۆ لە هەموو ئەوانە بسەنێت کە بە جۆگاکەدا دەڕۆن.

ناوبانگی کۆنی سامەڕا، ئاپۆرەی فارسەکان کە لەکاتی پێشودا لێرەدا نیشتەجێبوون چووە دەرەوە، دانیشتوانێکی تێکەڵیان لەدوای خۆیان جێهێشت، کە تێبینی بێ بەزەیی و نائومێدییان دەکرا.

مێژوونووسێکی فارسی دەیسەلمێنێ کە سامەڕا لەلایەن شاپوری ساسانییەوە لە ناوەڕاستی سەدەی سێیەمی زایینیدا بنیاتنراوە، بەڵام دوای ئەوەی دەستەڵاتی ساسانی پەکیکەوت و لە سەدەی حەوتەمدا دیارنەما، پێش هەستانی محەمەد شارەکە بووە وێرانە و تا سەردەمی موعتەسەمی خەلیفەی بەغدا پشتگوێ نرا، کە کردی بە پایتەخت و یەکێ لە ناودارترین شاری رۆژهەڵات. ئەو ئاستە تا کاتی خەلیفە موعتەمید راگیراوە، کە بارەگای خەلافەتی لە بەغدا بنیاتنایەوە. داگیرکاری سامەڕا لەلایەن خەلیفەکانەوە داڕوخان و دواکەوتنێك بوو. بەدوای ئەودا راستەوخۆ سەردەمە گەشەکەی ناودار هاڕونە رەشید و مەئمون بوو،[72] کە لە ساڵی 813 زایینی مردووە،

---

[72] جێی سەرنجە کە دایك و ژنی مەئمون هەردووکیان فارس بوون و لەمیانەی خەلافەتی عەباسیەکاندا دەرکەوت- زۆر بە جوانی – کاریگەری فارسی کە هاوبەشی زۆری لە رزگارکردن و پێوانەییەکانی وێژەیی بەرز کردووە.

موعتەسەم کە بیری دەمارگیری و پەرۆشیەکانی ئەو تالآنکردن و راورووتەی هەبوو، لەمیانەی خستنەکاری تورکە بەکرێگیراوەکان، کە یەکەم هەنگاویان بەو رێیەدا نا بۆ پوکانەوەی فرمانڕەواییەکە، لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا هەر نەکوژایەوە، تا مەغۆلەکان بەغدایان تالآنکرد و موعتەسەمیان لە ساڵی 1240دا کوشت.

لێرەدا موعتەسەم مزگەوتێکی گەورەی بنیاتناوە و شارەکەی فراوانکردووە تا ئاستێکی ئەوەندە، کە مێژوونووسانی فارس دەیناسێنن بەوەی درێژ و فراوان بۆتەوە، بۆیە دەڵێن حەوت لیگ (کە بریتیە لە سێ میل) درێژە و لیگێك پانە.[73]

هەروەها لێرەدا منارە ناودارەکەی موعتەسەمی لێیە، کە لە چیرۆکە ئاشقانەکانی واسیقدا هاتووە، کە سەرنجڕاکێشەرترین سەرگوزەشتەیە تا ئێستا وترابێت.

سروشتی دەمارگیریی موعتەسەم کە پێشتر باسی لێوەکراوە و ئەوە هۆکارێکی جولێنەر بوو لە هەوڵی یەکێك لە گەورەترین بێباوەڕان کە لە سەردەمی زوودا هەمیشە هەڕەشەی لە ئیسلام دەکرد. ئەوە بابەك بوو، کە بە خورامی ناسراوە و لە شەڕەکاندا زۆر لە جەرەناڵە هەرە ئازاکانی خەلافەتی بەزاندووە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەو لەلایەن ئافشینەوە بەدەستگیرا، کە سەرکردەیەکی ناودار و پاڵەوانە. بۆ ئەوەی بگەیت بە زانیاری ئەوەی کە بابەك چی رێبازێکی هەبووە ئێستا مەحاڵە، تەنیا یەك تۆمارکراو کە هەمانە پرۆژەیەکی هەژمارەکانی نووسەرێکی موسڵمانە، کە هەوڵیداوە بەشێوەیەکی سروشتی چارەسەری هەموو بیروباوەڕێکی ناپەسەند و تێکدەر بکات کە لەوانەیە کاریگەری لەسەر ئەو هەبێت. بەهەرحاڵ، لەوە دەچێت بابەك لەلایەن کوردەکانی باکورەوە پشتیوانی شەڕەکەی کرابێت، کە زۆر لەوانەی بەشێوەیەکی خراپ پێشتر باوەڕیان بە زەردەشتی هەبووە و نەگۆڕاون، بەتەواوی ئامادەبوون کە قورسایی چەکەکانی خۆیان لەبەرامبەر هەر هێزێك بەکاربێنن، کە زۆریان لێدەکات فرمانڕەوایانی نوێ و ئایینێکی نوێ بەسەریاندا بسەپێنێت، بەتایبەتی کاتێ کە ئەوانە دوژمنی دێرینیان بوو، واتە عەرەبەکان.

پرۆفیسۆر براون، یەکێکە لە مەزنترین تواناکانی، کە بەشێوەیەکی تەواو لەبارەی بیروباوڕەکانی خۆیەوە دەنووسێت،[74] کە لەوە دەچێت باوەڕی "گواستنەوەی گیانی- metempsychosis " خستبێتەسەر و لافی خوایەتی لێدەدات.

---

[73] بوستان نەلسیاحە.

[74] مێژووی ئەدەبی فارسی، بەرگی یەکەم، لاپەڕە 223-228.

کاتێ گیرا، ناردیان بۆ سامەڕا، کە لەوێ کوژرا، لاشەکی لەسەر بەردە تەختەکانی کە دەڕوانێت بەسەر دیجلەدا چوارمێخەکرا. گرنگترین دیاردەی هەموو ئەو تراجیدییە چارەنووسی کۆتایی ئەفشینە داگیرکەرەکە و دەستگیری بابەکە، چونکە ئەو گومانی هاندانی یاخیبووانی مازیاری لێدەکرا (کە لە تەنیشت بابەکەوە چوارمێخەکرا) و لە سامەڕا فرمانی ئەوەی بەسەردا درا، کە خۆی یەکێکە لە وەدوکەوتوانی بابەك و خۆی وەکو ناونیشانی خوایی پێشاندەدا. ئەو تاوانبارکرا بەوە و تاوانەکانی تر و لە کاتێکدا مازیار لە داردرا و لاشەکەی بە تەنیشت بابەکەوە هەڵواسرا، ئەفشینی کەساس لە زینداندا بوو. ئەویش هەروەها مرد و جێی خۆی لەنێوانیاندا گرت و دواتر لاشەکانیان سووتاند و خۆڵەمێشەکەیان فڕێدایە ناو دیجلەوە.

ئەم شتانە لە ساڵەکانی 839 و 840 ڕوویداوە و لەگەڵ گەیشتنە دەستەڵاتی متەوەکیل لە 847دا ستەمکاری و داوێن پیسی، فرمانڕەوایەکە پوکایەوە و سامەڕا ئەو ناوە خراپەی بەدەستهێنا کە هەرگیز لێینەبۆتەوە.

هەرچەند هێشتا لەنێوان شارە پیرۆزەکاندا لە عێراقی عەرەبیدا ئاستێکی بەرزی هەیە، چونکە لێرەدا دوو ئیمامی دەیەم و یانزەیەمی جێنشینی شیعە ژیاون و مردون. لەمیانەی سەردەمی خەلافەت لە سامەڕا، لێرەدا ئیمام عەلی کوڕی محەمەد کوڕی موسا کوڕی جافەر کوڕی محەمەد کوڕی زەین ول عابیدین کوڕی حسێن کوڕی عەلی زاوای خودی پێغەمبەر ژیاوە. ئەوەش ئیمامی دەیەمە و کوڕەکەی، حسێن عەسکەری شوێنیگرتەوە، کە ئیمامی یانزەیەمە، نەوەکەی محەمەد سەغیر (بچووك) دوانزەیەم ئیمامە، ئەوە ئیمامی شاراوەیە کە ڕۆشتووە و بەڵام شیعەکان چاوەڕێن جارێکی تر بێتەوە و لەبارەی دەرکەوتنەوەی دووەم ئەم خەڵکە پێشبینی و چیرۆك و داستانی زۆریان کۆکردۆتەوە. ئەوەش "مەهدی"ە بەناوهێنانی فارسەکان بەرزدەبنەوە و سەردادەنەوێنن، چونکە وا دەزانن ئەو لەوانەیە ببینێت، هەرچۆن ئەو لە جیهانی گیاندایە، دەرناکەوێت بەڵام هەیە. کە لە ساڵی 873دا دیارنەما لەژێرزەمینێکدا لە سامەڕا شوێنێك کە دانیشتوانەکە لەمیانەی گەرمای ڕۆژەکەدا لەناویدا دادەنیشن. بە بڕوای هەندێك ئەو لە حلەی نزیکی بەغداوە دەرچووە.

ئەم هەلومەرجە ئاینییە، شانبەشان لەگەڵ ناوبانگی دێرین و ئەم مزگەوتە جوانەی ئەمڕۆ، سامەڕا دەکات بە شوێنی دڵخوازی حەجی شیعە و سوونە وەك یەك- بەتایبەتی لە کۆندا- بەڵام هەموو هاوڕان لەگەڵ گەشتیارانی فارسدا کە دەڵێن، " ژمارەکانی سادات[75] و سواڵکەرەکان هەموو

75 ئەو کەسەی بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕاستەوخۆ بنەچەیان لە پێغەمبەرەوەیە.

پێکەوە پێناسەدەکرێن"، جارێکی دی، " وتراوە کە دانیشتوانی سامەڕا حەنەفین، بەڵام مەحاڵە لە ڕاستیدا بیسەلمێنی کە ڕەگەزیان و بیروباوەڕیان بزانی چییە، چونکە بەوپەڕی ناپەسەندی و ڕیسوایی کەسایەتی و چاوچنۆکیەك وەك ئەوەی کە سواڵکەرەکانی سامەڕا یەك وشەی ڕێکەوتە لە هەموو ئیسلامدا." [76]

وەك گومەزە ئاڵتونیەکە لە بینایی دوورەوە و لە داهاتنی شەودا لەچاو ونبووە، هەستمکرد کە گەشتەکەم وەك پیاوێکی هەژار نزیکە کۆتایی بێت، چونکە لە بەغدا نزیك دەبینەوە. لەمیانەی دوو ڕۆژی دوابەدوادا ئێمە بەلای کێڵگەی کشتوکاڵ و باخ و باخات و باخی خورما، نیشانەکانی ئەو شارەی لێی نزیکدەبینەوە. لە دوورەوە دیمەنی کازمییەمان بەدیکرد، کە شوێنێکی پیرۆزە، زۆر جار وەسفی ئێرە کراوە و لە ئەنجامدا، ئێوارەیەك پیاوی کەڵەکەکەمان پێی وتین کە نیوەی شەو خۆمان لەسەر پردێکی سەر بەغدا دەبینین، کە کەڵەك بەژێریدا ناڕوات.

منیش دەستمکرد بە بیرکردنەوە چۆن من دەبێ وەك ئەورووپییەك بچمە بەغدادەوە، من دەمویست ڕاستەوخۆ بچم بۆ ئەو تەنیا ئوتێلە و ڕۆژی دوایی لەناو ئەورووپییەکاندا دەرکەوم، لەگەڵ هەندێکیاندا کارم هەیە و هەندێ ناسیاوی. بەوجۆرە لە پشتی فەردەکانەوە لە تاریکیدا، قاتە جلە سپییە تایبەتیەکانم کە چاودێریمکردووە ئامادەمکرد، بێ یاخە- چونکە هاوینە و گەرما زۆر لەو وردەکاریانە دەسرێتەوە. جووتێ گۆرەوی تایبەتم دەرهێنا، خۆشگوزەرانیەك کە من زۆر لە مێژە لێی بەدوورم، شەفقەیەکی نەرمم هەیە، زۆر تێکچووە و پانبۆتەوە- بەڵام هێشتا شەفقەیەکی فەرەنگیە- ئامادەم سەروپێچ پۆشین و جلوبەرگی کۆن لەبەری خۆم داکەنم، چوومە سەر کەلوپەلەکانم و ڕاکشام و بۆ ماوەیەك نووستم. نزیکەی دووی بەیانی هەستام، چونکە کەڵەکەکە دای بە قەراغی ڕووبارەکەدا و بینیم گەیشتوین.

هاوڕێکانم شتەکانیان کۆدەکردەوە و پیرە کەرکوکی لێی پرسیم چون و بۆ کوێ دەمەوێ بڕۆم. منیش وەڵامدایەوە، دەمەوێ دەرچم بۆ " کوفە" یان بە بەلەمێکی دەورەگیراو بە قیر، دەچم بۆ ماڵی هاوڕێیەکم لە خوارووی ڕووبارەکەدایە. ئەو شارەزاییە یەکێ لە پیاوەکانی کەڵەکەکە دوای چەند دەقەیەك بۆی دۆزیەوە و خواحافیزیم لە هاوڕێکانم کرد، دەبێ هاوڕێکانی پێشوم لەو جیهانەدا بن کە من جێیدەهێڵم- نەك بەبێ ئازارەکان، چونکە من بوو بووم بە یەکێ لەوان و خۆشم زۆرجار

---

[76] بوستان السیاحە، لاپەڕە، 303.

دەبینی رادەمام لەگەڵ نەفرین لەوەی کە ئەورووپیە لەو شوێنەی " رەشورووت و دەم بەهاوار و هەڵماڵڕاو" کە لە تورکومان، تورك، عەرەب، کورد و فارسی تێدا راوەستاوە.
شۆڕبوومەوە بۆ کوفە، فیستەکە هێشتا بە سەرمەوەیە، هێشتا "ئەفەندیم" و بەهێمنی دانیشتووم، چاوەڕێین تا دەمانگەیەنێتە پلیکانەکانی دواوەی تاکە ئوتێلەکە، خانوویەکی ملکەچانەیە و مەسیحیەك دەیبات بەڕێوە. کە گەیشتین بە پەلە چووم بۆ لای دەرگاکە و لە سێبەری دەرگاوانەکەدا راوەستام، پیاوە کوفەییەکانم بەدیار شتەکانمەوە دانا. لە تاریکی سێبەردا شەفقە ئەورووپیەکەم کردە سەرم، عەباکەم وەك پاڵتۆ دا بەسەر قۆڵما و راوەستام، بەشێوە ئەورووپی بووم، هەرچەند کەمێ بێ رەنگ بووم.
دەرگاکە کرایەوە، من چوومە ژوورەوە و بە بیانوی ماندوێتی لە گۆشەیەکی تاریکدا دانیشتم، کاتێ کەلوپەلەکانم لەلایەن بەلەمەوانەکەوە هێنرایە ژوورەوە و کرێی بەلەمەکەم دا. ژوورێکیان پێشاندام و بۆ سەعاتێك نووستم، لە بەیانیدا هەستام بۆ گەرماوێکی گەرم و ژەمێك بەرچایی ئەورووپی، چای بەشیر و هێلکەی کوڵاو، ئەو دیمەنە نائومێدم دەکات، ئیدی لێی دوورکەوتمەوە و داوای چام کرد لە چایخانەیەك- بێ شیر و لە پیاڵەی بچووکدا- نەك لێوانڕێژ لە کوپێکدا.
زووربەی رۆژەکەم بەسەردبرد لە هەوڵی ئەوەی رابێمەوە لەسەر کورسی دانیشتن، بەڵام بەشێوەیەکی خراپ نارەحەتە و بەبێ خواستی خۆم قاچەکانم لەژێر خۆما جووت دەبوون.
هەستم بە نامۆیی و تەنیایی دەکرد زیاد لەوەی پێشتر کردبێتم. چووم بۆ قاوەخانە و بازاڕ، لە تێکەڵییاندا من کە یەکێك بووم و یەکسان، لەگەڵ کێ من دەدوێم و پێدەکەنم و شەڕدەکەم و دەمەقاڵێ دەکەم. ئەوان زۆر دوورن و من پێویستە فێربم وەك کەسێکی ناوێزە و چینی خوارەوە سەیریانبکەم، ئەگەر ئەوە ئێستا بگونجێت و جارێکی دی لەسەر سەکۆی رۆژئاوایی لەدایکبوون، جارێکی دی بەرێی خۆمدا دەڕۆم کاریگەری خۆشی و ناخۆشییان پشتگوێ دەنێم- کە لە رابردوودا خۆشی و ناخۆشی منیش بوو.

# بەشی شانزەیەم
# لەبارەی کوردەکان و وڵاتەکەیان

" خوێنڕێژان، بەرپاکەرانی ناکۆکی، بەدواگەڕانی پشێوی و ئاژاوە، چەتە و ڕێگرەکان، میللەتی هەموو ناحەزییەك و سەربەگێچەڵی خراپەکاریی هەڵسوکەوتی بێ ڕەوشتیانە، بێ بەزەیی، دوور لە هەموو مرۆڤایەتییەك، گاڵتە بە بەرگی زانین دەکەن. بەڵام بنەچەی ئازایەتی و نەترسین، لە میوانداریشدا گیانی ئەمەکدارییان هەیە، لە ڕاستی و داوێن پاکیدا بێ نموونەن، لە دڵخۆشکەری هێمنی و بەویژدانیدا دیارن، شانازی بە هەموو شتە جوانەکانەوە دەکەن و سوپاسگوزاری خێروبێرە خواییەکانن." – بوستان السیاحە، لاپەڕە، 459.

نەژادی کوردەکان زۆر کەم ناسراوە و ئیدی بەدناوکردن کاتێ ئاماژەپێیکرا، کە هەندێ بیری بنەچەییان و مێژووەکەیان، هەروەها هەوڵدان بۆ پشتڕاستکردنەوەی کەسایەتیان، ئێرە شوێنی نییە. لەمیانەی ئەم ساڵانەشدا لەوانەیە هەرگیز نەهاتبێتنە بەرچاوی جەماوەری بریتانی جگە لە کەسایەتیە نەرێتییەکانی وەك تاڵانکەری و شەیتانی تورە، وێنە خەیاڵییەکانی دڕندەیی لەناو چیاکانەوە دەرئەپەڕن و هەرچیەکیان پێشهات وێرانیدەکەن و بێ جیاوازی مەسیحی و موسڵمان دەکوژن، بەرەنگاری هەموو میر و خاوەن دەستەڵاتەکان دەبنەوە، کە بیانەوێ ئەوان بخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە یان ناچاریان بکات.

هەرچییەك بن، بنەچە و مێژوویان وا دابنێ کەمتر لە نەژادەکانی تر لە ڕۆژهەڵاتدا ناسراوترە، ژمارەیەکی زۆر و بەهێزن و ئەوەش لەوانەیە بۆ زۆرێك سەرسامی بێت، کە کوردستان مێژوویەکی کۆنی هەیە و بنەماڵەی پایەدار و ئەدەبێکی ناسك- ئەگەرچی دیاریکراوە-.

زۆر باشە نهێنیەکانی نەژادەکە دابینکرا، کە بەلایەنی کەمەوە یەکێ لە گەشتیاران ئەوەی لەناویاندا بۆ ماوەیەکی زیاتر مابێتەوە دەچێ بۆ ئاو ئاستەی بەگوێرەی ئەو حاڵەتەی بە دڵنیاییەوە لەهەندێ تۆمارکراوی کۆندا کە" وەك گورگ و چەقەڵەکان لەناو شاخە بەرزەکاندا دەژین"[77] ئەو قسەیە کە زیاتر تیشك لەسەر نەزانی نووسەرەکەی پەرشدەکاتەوە لەوەی لەسەر کورد، کە ئەو بەو

---

[77] کرەی، ئەرمەنیەکان، کوردەکان و تورکەکان ، بەرگی دووەم، لاپەڕە، 167.

شێوە نیشانەیە هەبووە، بەڵام کەمێ لە شوێنی نیشتەجێبوونی خۆیانەوە بۆ لاپاڵی گردەکان کشاون.

ئەفسانەکەی فارس دەڵێت: کوردەکان نەوەی ئەو لاوانەن کە لە بخۆریی مارە دڕەندەکانی سەر شانەکانی زوحاك رزگارکران لە ئەفسانە فارسیەکەدا، کە بە تەگبیری شەیتان لەسەر مێشکی مرۆڤ دەژیان و هەڵیانخەڵەتاند و مێشکی بزنیان دەدایە لە جیاتی ئەو دوو لاوەی کە بوون بە باوباپیری نەژادی کورد.

ئەفسانەیەکی تری کەم بایەخ، ئەوەی کە سولەیمان ناردی بەدوای چوارسەد پاکیزە لە رۆژهەڵاتەوە و ئەوانیش دوای ئەوەی گەیشتنە ولاتێك ئێستا پێیدەوترێ کوردستان، لەوێدا لەلایەن شەیتانەکانەوە لە کچێتییان خستن، ئیدی سولەیمان وازیلێهێنان بۆ ئەو شەیتانانە و وەچەکانیان پێیان دەوترا کوردەکان.[78]

ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی 1200-1500ساڵ بەر لە زایین، چونکە لەوێدا ئێمە مەلیکەکانی نایری دەبینین، کە لەوە دەچێت باوباپیری ئەو میدییانە بن کە لە دواتردا ناویانگیان پەیداکرد و دیسانەوە لە دواتردا لەژێر ناوی کورد- دا، وشەی کوشتن و بڕین لە گوێی دراوسێکاندا دەزرنگایەوە.

لەو رۆژگارەدا دەستەڵاتی ئاشووریەکان لەو خاکانەی دەوروبەری موسڵ و نێوان رووباری زابدا بووە. دوای ئاڕاستەی زابی گەورە، لە ناوەڕاستیەوە بۆ سەرچاوەکەی، خاکێکی نادیار بووە و لەوێدا ناوجەرگەی خاکی نایری بوو. هەروەها، لێرەدا دواتر مادەکان دامەزرا و ئەوێش هێشتا ناوجەرگە و ناوەندی کوردستانە.

ئەرمەنستان یان ئورارتو، باکووری هەموو ئەوەشی مابۆوە، بۆ پشتی شاخەکان و گۆلی وان- ڤان، لەسەر بانەکەی و پاشاکانی ئۆرارتو بە پیاوەکانی نایری نابەزێنرێن. هەرچەند خاکەکانی نایری بە ئاوی سەرەوەی زابی مەزن سنووردار ناکرێ، چونکە خەڵکانی نێوان سەرچاوەکانی دیجلە و فوڕات باکووری شاخی نایفات، کە ئەوە لەسەردەمی نوێدا، خارپوت و دەرسیم لە بەتلیس و زنجیرەی تۆرۆس، لەلایەن (تیگلاز پیلێسەر) و جێگرەکانیەوە لە (1100-600 بەر لە زایین) ناوهێنراوە، وەك نایری، هەمان ئەو خاکەی کە دواتر لانەی گوردینە نەبەزەکان بوو، کە ناویان یەکسەر دوای دیارنەمانی ناوی مادەکان لە نیوەی فرمانڕەوایی ئەخمینیەکان لە ئێراندا (دەوروبەری 400 بەر لە

[78] یەکێ لەو ژمارە چیرۆکانەی بەهۆی ترس و لەرزەوە داهێنراوە کە هەستی خەڵکیان لە دەوری ئەوان جوڵاندووە- شەرەف نامە.

زایین) دەرکەوت و لە هێما بۆ نەژادەکانی کە دانیشتوی خاکی کوردستانی هاوچەرخن- کە ماد بوو.[79]

لەو کاتەوە کوردستان بۆتە نیشتمانی نەژادە شاخاویەکان، کە زمانێك دەدوێن، بێگەردیی لە شێوە کۆنەکانە، یەکێك لە باشترین بەڵگەکانیش، چیا مەزنەکانە کە لەلایەن کوردەکانەوە وەك مەڵبەندی ژیان داگیرکراوە لەو سەردەمەوە ئاپۆرای ئاریان لە "خاکی بەرەبەیانەکە"وە دەستیانپێکردوە بۆ میللەتی فارس، مادەکان و بەشێك لە ئەوروپا- ئێمە خۆشمان وەچەکانین لە ساکسۆنەکان و خزمایەتی کورد، کە هەرگیز خوێنی لەگەڵ عەرەب یا تورك تێکەڵ نەبووە، بەڵام بە پاکی پاراستوویەتی وەك گوفتارە ناتێکەڵەکەی.

ئاشووریا، کە جیهانەکەی خۆی داگیرکرد، کێشەی گرانتری لەم خەڵکانەی ناو چیاکان زیاتر پێشهات لە هەر یەکێ لەوانەی دواتر بەرەنگاریان بوونەوە. ئێمە پێمانوتراو[80] کە هۆیەك نییە تا باوەڕبکەیت، هەروەها ئاشووریەکان بە زاگرۆسدا تێپەڕیون (چیاکانی هاوتای پایەبەرزی کوردەکانە) کە هەرکامێکیان خستە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە، بەڵام میللەتەکەی دەستبەجێ هاتنە سەر ڕێیان، تایبەتمەندی کوردستان و هەوڵی داگیرکردنی هەر وەك چیرۆکی ئێران و تورکیای هاوچەرخ، کە لەوانەیە چیرۆکی هەر یەکێ لە سوڵتانەکان و پاشاکانی دوو سەدەکەی دوایی بێت.

پرۆفیسۆر ڕاگۆزین، لەو کارەی کە لە داوێنەوە هێمای پێکراوە،[81] تێبینیدەکات:" ئەوە مەحاڵە تێبینی چارەسەری مامناوەندی نەکرێت کە تیگلاز- پلیسەر بەخشی بە مەلیکەکانی نایری، چارەسەرێك زۆر بە توندی دژە لەگەڵ کورتە ئاساییەکەی بەشێوەیەکی ڕوون بۆ هێمای نیازی ڕازیکردن."

دیسانەوە لەبارەی چیاکانی سەروو ئەربیلەوە دەدوێن: " گەشتێك بۆ باشووری ڕۆژهەڵات بۆناو پاسەوانگاکانی چیاکانی زاگرۆس، بەکردەوە ناوبراوە بەوەی سەرکەوتو و سودبەخشە، بەڵام بەبێ بایەخپێدانی زۆر، کە لە ڕوانگەی گوشارێکی دەروونی زۆرەوە هەمیشە لەسەر ڕووی هەر

---

[79] ڕۆژی خۆی تەنانەت لەگەڵ بنەچەی کوردەکاندا ڕەمڵ لێدەدرا، لە بیردۆزەکەی هەندێ پیشکەشیان کردووە کە ئەوان دادەنێن بە نەوەی پارسەکان، ئەو بیردۆزە دوورە لە ڕاستیەوە و ئێستا کە پارسەکان وەك دەزانرێت لە نەژادی ئاسکیتین، لە شێوەی ئەنتۆلۆجیکاڵی و زمانەوانی جیاوازن لە کوردی هاوچەرخ، کە ئاریی پاکن.

[80] ڕاگۆزین، ئاشووریا. Ragozin, Assyria

[81] لاپەڕە 54.

سەرکەوتنێك لەلایەن نیشانە لەسەر هەڵکەنراوەکانەوە، تا رادەیەك هێمادەکات بە گەشتێکی کوتوپڕ."[82]

نەك هەمیشە باردودۆخەکە لەلایەن مەلیکی ئاشوورییەوە بۆ پەلاماردان بوویێت، چونکە ماوەیەکی تەواو زۆرە کە هەندێ لە پاشاکانیان لەگەڵ کوردەکاندا لە شەڕدا بوون، وادەردەکەوێت نیشانەی ئەوە بێت کە ئاشووریەکان بەرگرییان لەخۆیان کردبێت نەك لەپێناوی لایەنی شەڕخوازیدا بووبێت.

شەڵمانەسەری دووەم، لە تۆمارەکانی کە لە (824-860 بەر لە زایین) فرمانڕەوایکردووە، هەموو ئەو خاکانەی ئەو داگیریکردووە بەوردی دیاریکراوە، دەبێت سەرکەوتوونەبووبێت لە دەربڕینی بیروبۆچوون لەسەر شاخەکانی زاگرۆس، چونکە هەرچۆنێك بێت هیچ شتێك لەبارەی نایرییەوە بەیاننەکراوە.

کاتێ هۆز یان تیرە، گرنگ بێت یان گرنگ نەبێت، بەزێنرابن یان دەستیان بەسەردا گیرابێت، ئەوە بە شاکارێکی چەك و ئازایەتی هەژماردەکرێت، کە لە تۆماری تایبەتی پاشادا نرخی خۆی هەیە. بەو شێوەیە سەنحاریبمان بینی، کە ژمارەیەکی گەورەی بەڵگەنامەکانی ئەنجامداوە، ڕەوتێکی دژی هۆزێك لە زاگرۆس کرد بەناوی (کاشو- ,Kasshu) و بەکردەوەش بەزاندنی. دەبێ ئەوەش ڕەچاوکرێت بۆ بەیانکردنی لە تۆمارەکەدا کە ئەو هۆزە لەوەپێش هەرگیز نەبەزێنراوە.

هەروەك فەرمانڕەوایانی ئاشووریەکان پیر و لاوازبوون، مادەکانیش هێزیان بەدەستهێنابوو. هۆزەکانیشیان بە مەبەستی ئامانجێکی هاوبەش یەکیانگرت و لە ئەنجامدا لەژێر فەرمانی یەکەم پاشای ماد کۆبوونەوە، ئەوەی کە لە هەمەدان (کتێبی پیرۆزی خۆی بەناوی ئیکباتانا) دانا، پاشایەتی خۆی لەسەر سنووری ڕۆژهەڵات دامەزراند و بە زنجیرە چیایەکی مەزن خۆی لە ئاشووریان دەپاراست.

ئەوە ئەندامێکی " بنەماڵەی دایاکو" بوو، خێزانێك کە ئاشووریەکان لەوەپێش لە نزیکی وان- ڤان لە گەڵیاندا جەنگیبون.[83]

(فراڤارتیش- Fravartish)ی کوڕی و هەروەها (ئۆڤاکشاتارا- Uvakshatara)ی کوڕی ئەمیش، ڕۆژانی خۆیان بە ڕێکخستنی سوپایەکەوە بەسەربرد، پیاوە لاوەکەیان، کاتێ باوکی سەرکەوت،

---

82 راگۆزین، ئاشووریا، لاپەڕە، 5-54 .

83 هەمان سەرچاوەی پێشو، لاپەڕە، 420.

ڕێکخستنی سوپاکەی گۆڕی لە تاقمی جیاواز لە هۆزە بچووکەکانەوە بۆ هێزێکی هاوچەشن، کە بەشێوەیەکی سەربەخۆ دەجەنگێن. بەدرێژایی ئەوەی مادەکان پێکەوە بوون هەموویانی پێش ئەوان هەلگرت، ئەوەش راستیەکە کە بەلگەی باشتر لە خودی کتێبی پیرۆز لە ئاردا نییە.

بەلام جارێکی دی مادەکان و فارسەکان کەوتنەوە، فارسەکان هەلخەلەتێنران و مادەکانیش بێ بەش بوون لە پشتگیری ئەو خزمانەیان، گەڕانەوە بۆ مەلبەندەکانی خۆیان و دەستیانکرد بە قۆناغی کۆتایی لە مێژووی رەگەزەکەیان- لەژێر ناوی گوردیێ، یان کورد.

زەینەفۆن —کاردوك- ی خۆی دۆزییەوە کە لەسەری کەوتبوون، وەك ئەوەی هەموو ئەو کەسانەی " گەڕانەوەی 10 هەزارەکەی" خوێندبێتەوە لەوانەیە تێگەشتبێت و ئەو لەوێ لە ئەنتی تۆرۆسدا دۆزینێوە، یان وەك ئەوەی ئەمرۆ پێیدەلێین هەکاری، کوردستانی ناوەند.

کاتێ دێتەوەیاد، کە ئەم بەشەی ئاسیای رۆژئاوا بابەتی زۆرترین کۆمەلە شۆڕش بووە، بۆ داگیرکردنەکان لەلایەن سوپای هەموو نەتەوەیەك کە لە رابردوودا ناو و ناوبانگی لە مێژووی جیهانی رۆژهەلاتدا هەبوویێت- ئاشووری، پارسیان، یونانی، رۆمانی، فارسی، عەرەب بە رابەری محەمەد و مەغۆلەکان- سەقامگیری زۆر باشی نەژاد دەردەکەوێت، چونکە هەموو نەتەوەیەکی ئەم خاکانە بەتەنیا خۆڕاگری هەموو سوپایەك بووە و پارێزگاریان لە پاکی زمان و خوێنی خۆیان کردووە و بانگەشەی شانازی نەژادی دەکەن کە هیچ ناتوانێت حەسودی بە پەسەندی بەرێت، ئەوانە ئاریی پاکن، "خاوەنی شاخەکان و زمانی خۆیانن."

لەمیانەی سەدەی رابردوودا گیانی نەتەوایەتی لە چوار سەردەمدا بێداربووەوە و خۆی دلنیاکردەوە لە هەولەکانی بۆ فڕێدانی نیلەی ژێردەستەیی تورکەکان لەسەر شانی خۆیان. یەکەمیان لە سالی 1806دا روویدا، کاتێ عەبدولڕەحمان پاشای بابانی سلێمانی، ماوەیەکی دوورودرێژ قارەمانانە لەدژی تورکەکان بۆ سەربەخۆیی کوردستانی باشووری لە جەنگا بوو، کە لە سالی 1808دا لەلایەن پاشای بەغداوە لە دەربەندی بازیاندا بەسەریا سەرکەوت، ئەویش بە یارمەتی لەلایەن پاشایەکی کورد کە دوژمنایەتی لەگەل عەبدولڕەحمان پاشادا هەبوو، لەلاوە هێرشی بۆ کرد و بەسەریدا سەرکەوتن.

چەند سالێك دواتر، محەمەد پاشا، هەروەها ئەویش بەشێکە لە تیرەی بابان لە رەواندوز، هێزێکی مەزنی هەبووە و هەولی سەربەخۆیی نەتەوەیی دەدا و بە کردەوەش سەروو میسۆپۆتامیا، ئەربیل و کەرکوکی بەدەستهێنا.

فەرمانڕەواییەکەی سروشتێکی ئەوەندە بێ بەزەییانە و نامرۆڤانە بوو، کە تەنانەت سەرکێشترین و بەهێزترینی وەك ئەوەی لەناودەبرد، بەجۆرێ بە یارمەتی سوپا مەزنەکەیەوە لە سوارەی غەیرە نیزامی، پارێزگاری لە ناوچەکانی خۆی کرد بە ملکەچییەکی ڕەها و حوکمێکی بێ وێنەوە. ئەو لەئەنجامدا لە تەمەنێکی بەساڵاچووندا، تورکەکان تەڵەیەکیان بۆ نایەوە و دوای سەفەرێك بۆ ئەستەنبوڵ، پێشوازیەکی پایەبەرزانەی کرا و قەرەبوویانکردەوە، لە گەڕانەوەیدا بۆ شوێنی خۆی کوژرا.

بەهەرحاڵ جارێکی دی، یەکێ لە پاشاکانی دوایی سلێمانی، ئەحمەد، هەوڵی شۆڕشێکی دا لە دژی تورکەکان و چووە دەرەوە بۆ شەڕکردن دژیان، بە ڕیکردن لە بەغداوە دەجەنگی تا لەئەنجامدا بە بەزینی کۆتایی هات.

ڕوداوی چوارەم، کە ناتوارێت بەتەواوی ناوبنرێت هەوڵ بۆ سەربەخۆیی، شۆڕشەکە لەژێر ڕابەری بەدرخان بەگدا بوو لەساڵی 1847، لەو بەشەدا باسکراوە کە مامەڵە لەگەڵ مێژووی کلدانەکان دەکات.

لەم دواییەدا، نزیکەی پێنج سەد ساڵ پێشتر و وەك ناوچەکانی ئەوان کە بەردەست بوون، هەروەها لەبەرئەوەی ژمارەشیان وردە وردە لە زیادبووندابوو، لە باکوور و ڕۆژئاوا بڵاوبوونەوە. سنووری باشووریان هەمیشە و هێشتا هەر ڕێگا کۆنەکەی کرماشان بۆ قەسری شیرین بوو، بەڵام لە خاکی تورکیادا ئەوانە خۆیان لە ئەرمینیادا دامەزراند و پاڵیاننا بە ڕێی خۆیانەوە بۆ ڕۆژئاوا لە دەرسیم و خەرپوت، بەهەمان شێوە کە ئێستا گوندەکانی کوردە میلیەکانە کە ڕۆژە ڕێیەك لە حەڵەبەوە و لە چیاکانی باکووری ڕۆژئاواوە دوورە.

بۆیە کەمێ لە مێژوویان زانراوە، کە زۆر بە زەحمەت دەزانرێت لەناو ئەوانەدا تیرە و هۆزی کۆن و بنەماڵەی خانەدان هەبووە، هەندێکیان بەشێوەیەکی چڕوپڕ لێرەدا شیاوی هێما بۆکردن نییە. بۆ هەوڵدانی چارەسەرێکی شیاو بۆ مێژووی تەواوی تیرە و هۆزەکان، تا ئەو شوێنەی دەکرێت ئەوان بەیانکەم، دەبێت بەرگێکی تر بەتەنیا لەبارەیانەوە بنووسم.

یەکەم جار دەچینە ناوەندی کوردستانی کۆنەوە، بتلیس و وڵاتی هەکاری[84] (لەسەروی زابی گەورە و چیاکانی باشووری گۆلی وان- ڤان بۆ دیجلە لە جزیرەی ئیبن عومەر)، ئێمە تیرەی هەکاریان

---

[84] زۆر جار ئەو وشەیە بە هەکیاری دەنووسرێت چونکە یەکەم "ی" لە شێوە گۆکردنی تورکیدا هاتووە.

دۆزییەوە، كە فەیلەسوفانی ناردووە بۆ ئەوپەڕی باكوور وەك بایەزید و پڕخەڵككردن بۆ فراوانكردنێكی مەزنی ئەو شارە و میرخاتوونیان دراوە بە ڕەواندوز و باشوور.

دوای داگیركردنی دیاربەكر لە سەدەی چواردەیەمدا لەلایەن تەیموری لەنگەوە- (تامەرلەین)، حاكمێك دانرا بەسەر ناوچەی هەكاریەوە، كە ناوی ئەمیر قەرە عوسمان بوو، ئەم میرە بۆی دەركەوت وڵاتەكە ئەوەندە سەختە، كە هاتنە ناوی و داگیركردنی مەحاڵە، لە ڕێی سیاسەتی هاوسەرگیری لەگەڵ خانمێكی خاندانی هەكاریدا، كە لە بنەماڵەی ئاغاكان بوو. بەو هۆیەوە خۆی بە تیرەكە ناساند و كاتێ دەستەڵاتی تەیموری لەنگ بەسەر دەوروبەری كوردستاندا لاوازبوو، ئەم ئەمیر قەرە عوسمانە لە هەموو خواست و مەبەستەكانی بوو بە كورد و نەوەكانی بنەماڵەی كۆنی هەكاریان بنیاتنایەوە، نازناوی "میر"یان هەڵگرتەوە و لە وڵایەتی بتلیسدا فەرمانڕەواییانكرد، كە لەوێدا میرەكانی هەكاری تا سەدەی نۆزدەیەم فرمانڕەواییانكردووە.

زۆر بەهێزبوون و پەیمانیان لەگەڵ خێڵەكاندا زۆر بە حەكیمانە بەست، كە لە جەزیرەی ئیبن عومەر، ئامێدی، جولامەرك و ڕەواندوز، بەگ و میرەكان كە لە هەكاری بوون، بە سەربەخۆیی فرمانڕەوایی هەموو هێزە دەرەكیەكانیان دەكرد، هەرگیز كێشەیان نەبوو لەبارەی داواكاری توركیا و ئێرانەوە بۆ خاكەكەیان، كە نەیاندەتوانی بیگەنێ.

بتلیس لەژێر دەستەڵاتی میرەكانیدا، بوو بە ناوەندێكی زۆر گرنگ و ئیدریسیی وەزیرە بلیمەتەكەی سوڵتان سەلیم، خۆی كوردێكی هەكاری بوو، بەرپرسبوو لە فراوانكردنی خاكەكانی كە هەندێ لە تیرە و خێڵەكان لەژێر دەستەڵاتی هەكاریدا بە دەستیانەوە بوو.

حەیدەرانلۆ و خێڵە هاوپەیمانەكانی گواستەوە بۆ باكوور بۆ ناو وڵاتی ئەرمەنیەكان بۆ پاسەوانی سنووری ئێران و تا ئێستاش لەو كوردانە لەوێ ماون، جەربەزەترینی هەموو كوردەكانن و بنكەیان لە هەموو ئەرمنیا و بۆ دوری ڕۆژئاوا وەك ئەرزڕوم هەیە، كە بە ژمارەیەكی ئەوەندە لەوێ دەژین، خەریكە ناوی كوردستان بسەپێت بەسەر ئەو پارێزگایانەدا.

میرەكانی بتلیس لە سەدەكانی شانزەیەم و حەڤدەیەم و هەژدەیەمدا گەیشتنە ئەوپەڕی دەستەڵاتی خۆیان، كاتێ كە سەربەخۆبوون، هەندێ جار دانیان بەوەدا دەنا كە جۆرە ژێردەستەیەكی ئێران یان توركیا بوون و جاری تریش نكولیان لەوە دەكرد كە هیچ دەستەڵاتێك ناتوانێت بیانخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە. لە كۆتایی هێڵەكەدا، لەمیانەی نیوەی یەكەمی سەدەی نۆزدەیەمدا شەریف

بەگ بۆ ماوەی چەندین ساڵ بەرەنگاری تورك بۆوە، کاتێ کە تورکیا دەیویست کوردستان بخاتە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە، ئیدی ئەو لەلایەن تورکەکانەوە لە 1849دا بەدیلگیرا و برا بۆ ئەستەنبوڵ و لەو کاتەوە بتلیس حاکمێکی تورك فرمانڕەوایی دەکات.

لەگەڵ ئەوەی پایتەختەکەیان لە چنگ دەرهێناون، هەکاری تیرەیەکی زۆر بەهێز و ناودارە و هێشتا لەسەر لوتکەی بەرزاییەکانی وڵاتەکەیان ماونەتەوە.

تورکەکانیش هەڵوێستێکی زیاتر ئاشتەوایی بەرامبەریان وەرگرت، وەك ئەوەی ئەوان لەسەر سنوورن، دەبێ هەڵوێستی ئەوانیش لەبەرچاوگرتنی تورکیا بێت.[85]

دراوسێکانی هەکاری- لە رۆژئاوا و باکووری رۆژهەڵات لە دەرسیم- کوردە زازاییەکان، تیرەیەکی سەیرە، لەبارەی مێژوویانەوە هیچ شتێك نازانرێت جگە لەوەی کە زۆر دەمێکە لەم شاخانەدا دەژین. بەداخەوە من لەناویاندا نەماومەتەوە، چونکە دیالێکتەکەیان تەواو نائاساییە، ئاریە لە کۆمەڵەی فارسی و کوردی، بەڵام لە هەردووکیشیان جیایە. تیرەکە لە شوێنە شاخاویەکانی زووربەی ئەو ناوە کەم ناسراوانەدا نیشتەجێن، لە خاکەکانی دەوروبەری سەرچاوەکانی دیجلەو لە دەرسیمدا. گەشتیارەکان وەسفیاندەکەن بەوەی "شەرمن، خەڵکی بچکۆلەی سەربەگۆبەند" و ئەوانەی من بینیم، لەکاتێکدا شەرمنن، بەدڵنیاییەوە جۆرێکی رەسەن و ئاسایی بوون، ئازا و پیاوی بچکۆلەی ئیشکەر، لەگەڵ رێژەیەکی زۆر چاوی شین و خەڵکی قژ زەرد لەناویاندایە.

جارێکی تر پێچکردنەوە بۆ باشووری رۆژهەڵات، بەناو هەکاری دا دێین بۆ تیرەکانی باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی ئەوانە، موکری و ئەردەڵانی ئێران و جافی ناوچەی تورکیا، سێ تیرە ناودارەکان- و زیاتر بۆ باشوور کەڵهوڕ و گۆرانە.

تیرەی موکری، کە لە خاکی ئێران لە باشووری دەریاچەی ورمێدا نیشتەجێن، باڵی باشووریی ئەوەی لەوانەیە ناوی لقی باکوریی نەژادیی لێبنرێت، کە زمانی کوردی بەهەموو پوختەییەکی شێوە گۆکردن و رێزمانییەوە ئاخاوتندەکەن. موکری بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دیالێکتەکەیان لە هەموویان کۆنترە و لەگەڵ ئەوەی کە سەردەمانی دێرینی ئەو لەوانەیە مەزنتر نەبێت لە هاوسێکانی

---

[85] ئەرێتێکی سەیر دەڵێت لەپەیوەندی لەگەڵ جێنشین بۆ خانەکان. ئەوە بەشەمیراتی بووە، بەڵام ئەگەر خان هاوشانی ئەو پۆستە مەزنە نەبێت، پیاوە گرنگەکان کۆدەبنەوە. ئەگەر دوای راوێژکردن خان دانرا بەوەی کە شایانی ئەو پۆستە نییە، ئەوا جووتێ پێڵاو لەبەر پێیدا دادەنێن و چاوەڕێدەکەن لە پێی بکات و ژوورەکە جێبهێڵێت، دواجار، رەزامەندە لەسەر گواستنەوەی جێنشینیەکە بۆ کاندیدێکی تر. هەروەها هەرچی زەوی و ماڵ و حاڵێکی خانە لابراوەکە هەیە لێیناسرێتەوە.

## موكری

خۆی، نایابی پاراستنی شێوە كۆنەكەیەتی ئەو پارسەنگەی دەداتێ كە هامبەری بكات لەگەڵ دیالێكتەكانی تردا.

تیرەكە ئێستا تیرەیەكی گەورە نییە، بەڵام هاوپەیمانە لەگەڵ ئەوانەی دەوروبەری، بەتایبەتی رۆژئاوا و باشووری رۆژئاوا و ناوێكی مەزنی هەیە، كە بە ئازایەتی میللەتەكەی و هێزی سەردارەكانی یان فرمانڕەواكانی بۆ خۆی بەدەستهێناوە، كە لە سەوج بلاق – سابلاخی پایتەختە بچكۆلە سەیرەكە بۆ چەند سەد ساڵێك فرمانڕەواییانكردووە. شاە عەباس، نادر شاە و فەتح عەلی شاە هەموویان لە كۆمەكی موكری لە جەنگە جۆراو جۆرەكانیاندا كەڵكیانوەرگرتووە و یەكەم لەو ناوبراوانە- كە تا رادەیەكی زۆر پشتی بە كوردەكان دەبەست بۆ هێزە جەنگاوەرەكانی- زۆری لەوانە كرد بە ئەفسەری پلە باڵا لە سوپاكەیدا و دەڵێت بۆ زووربەی سەركەوتنەكانی- بەتایبەتی ئەوانەی رۆژئاوا- قەرزداری ئەو كوردانە بوو، كە لە سوپاكەیدا بوون. ئەوە بارودۆخەكە بوو لە ساڵی 1624دا، كاتێ كە بەشێكی زۆری سوپاكەی شاە عەباس پێكهاتبوو لە كوردانی موكری، كە لە جەنگێكی گەورەدا بەسەر توركەكاندا سەركەوتن. ئیدی هەمیشە تیرەكە لە شێوەی جەنگاوەریەكی باشدا مایەوە لەلایەن نزیكی لە تیرەی ناوداری بلباسی رێگر، كە زۆرجار پێكەوە لە جەنگدابوون و گوێیان نەدەدا بە راووڕوتەكانیان لە ئێراندا و كەم جار بانگەدەكران تا لەسەر ئەو كارانە سزابدرێن. موكری و بلباس كوتومت هەمان رەگەزن و لەوانەشە دوو لقی یەك تیرەبن.

ئەوەش جێی بایەخە تیبینی ئەوەی كە لە ناوچەی موكریدا شوێنی لەدایكبوونی زەردەشت، پێغەمبەری مەزنی ئێرانە و بۆ یەكەم جار خوێندراوە.

لێرە لە سنوورەكانی باكوردا شوێنەوارێكی سەرنجڕاكێش هەیە، كە- ئێستا بە تەختی سولەیمان ناسراوە- دەوترێ كە شیزی كۆنە و پایتەختی مادەكان.[86]

موكری زۆر ئەفسانە دەزانێ كە پەیوەندە بەدەوروبەری ئەم شوێنەوە، هێما بۆ ئەو بەڵگەیە دەكات بۆ پشتگیریكردنیان كە بەرەی كوردی رەسەنن. بەهەرحاڵ، ئەوەشیان دەزانی، بەڵگەی زیاتر دیار و روونی رەسەنایەتیان لە مادەكانەوە ئەو زمانەیە كە ئاخاوتنی پێدەكەن، چونكە ئەوە لە هەموو دیالێكتەكان نزیكترە لە ئاوێستای زەردەشت خۆیەوە.

---

[86] بۆ بەدەستهێنانی وەسفی تەواوی شوێنەكە و تەواوی سەرچاوەكانی پەیوەندار بەوەوە، بڕوانە پرۆفیسۆر ویلیامز جاكسن، وڵاتی فارس، رابردوو و ئێستا، لاپەڕەكانی 123- 143. Prof. Williams Jackson, Persia, past and present, pp. 123-143.

# بەنی ئەردەڵان

دراوسێکانی باشووریان نەژادێکی زیاتر ناوداری سەردەمەکانی هاوچەرخن و لە مورکری زیاتر لە مێژووی ئێراندا ڕۆڵی گرنگیان گێراوە. ئەوانەش بەنی ئەردەڵانە، کە پایتەختەکەیان شارە جوان و خنجیلانەکەی سنەیە، لەو پارێزگایانەی لە ئێراندا بە کوردستان ناسراوە- کوردستان ناوەندێکی زۆر باشی ئێرانە. لێرەدا لە هەرێمی ئەردەڵاندا بنەماڵەیەکی خانەدانی بلیمەت فرمانڕەواییکرد، کە دایمەزراند، بۆیە دەوترێت لە سەدەی چواردەیەمدا کە لەلایەن سەرکردەکانی کۆنی ئەردەڵانەوە فرمانڕەواییدەکرا. بنەماڵەکە بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە کەسێکەوە هاتۆتە خوارەوە کەمترنییە لە خودی سەلاحەدین، کوردێکی حەسەن کەیف، کە لقێکی تیرەی هەکارییە.

ئەو سنەیە لەسەردەمانی کۆندا ژمارەیەکی زۆر نووسراوی لە نزیك و دەوروبەریدا هەیە، کە زووربەی تایبەتە بە سەردەمی ساسانیەکانەوە، کە ناوچەکە بۆ باشووری ڕۆژئاوای، هۆڵوان، زەهاو و قەسری شیرینی ئەمڕۆیە، کە تەختی پاشاکانی ساسانیەکان بووە.[87]

خانەکانی ئەردەڵان، دوای ئەوەیەی کە بە سەربەخۆییەکی ڕەها بۆ ماوەی چەند سەدەیەك فرمانڕەواییانکرد، نازناوی والیی ئەردەڵانیان لە شاکانی ئێرانەوە وەرگرت و هەرێمەکە ناسراوە بەوەی کە لەگەڵ ئێراندایە، بەوەی کە وڵاتی ئەردەڵان هەمیشە بەئەمەك بووە. سەربەخۆیی خانەکان لە سنەدا بە زەحمەت لەلایەن گۆرانەوە کاریتێدەکرا، چونکە تاکە بەڵگە لەسەر وەفادارییان ئەوەیە کاتێ داوای ئامادەکردنی پیاویان بۆ جەنگ کردووە، ئەوان کردویانە. تا سەردەمی خوسرەو خانی کوڕی ئەمانوڵڵا خان- کە وەك سەرکردەیەك ناوەکەی لەو ناوچەیەدا هێشتا ناودارە، ئەردەڵان تا رادەیەك پارێزگاری لە سەربەخۆیی خۆی کردووە، کە لەگەڵ ئێراندا لە جەنگەکانیاندا کاریکردووە زیاتر وەك هاوپەیمانیەك نەك وەك مسکێن یان ژێردەستە.

میرنشینە گچکەکە سنوورەکانی لەمیانەی سەدەکانی پێشودا فراوانکرا تا هەموو پارێزگاکان و تیرە لاوازەکانی سەر سنوورەکانی جاف، موکری و فەرمانڕەوەکانی ڕەواندوزیشی دەگرتەوە.

ئەو پارێزگایانەش جوانڕۆ، هەورامان، مەریوان، بانە، سەقز و ناوچە فارسیەکانی حەسەن ئاباد و ئەسفەندئاباد.

---

[87] شاری سنەی ئێستا لە دەوروبەری ساڵی 1633دا بنیاتنراوە، لەتەنیشت شارە کۆنەکەوە، کە لە شوێنێکی تەختدا بووە، لەکاتێکدا کە شارەکەی ئێستا لە لێژگاییەکدایە.

لەوانەش، بێگومان ئەوەی زیاتر سەرنجڕاکێشە هەورامانە. ئەم ولایەتە بچکۆلەیە بەکردار سەربەخۆیە، لەژێر سایەی فرمانڕەواکانی خۆیاندا دەژین، بنەماڵەیەکی سەربەرزن و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە دەچنەوە سەر ڕۆستەمی پاڵەوانی نیشتمانی ئێرانی، زمانی خۆیان قسەدەکەن، خۆیان بە کورد نازانن، بەڵام تەنیا خۆیان بە هەورامی دەزانن.

ئەو هەورامانە لەناو کۆمەڵە شاخێکی سەرکەشدا دەژین، کە لە هەر لایەکەوە بە دیوارێکی سروشتی بەهێز پاسەوانی دەکرێت و دابونەریتیان دەقاودەق وەك ولاتەکەیانە. بەپێی ئەفسانەکەیان، دارویش مادی رەسەنی هەورامی لە شوێنی زێدی خۆی لە نزیك دەماوەند لە باکووری ئێران دەرکردووە و لەگەڵ کاندوڵی[88] برایدا هەڵهاتون بۆ میدیا، لەناو ئەو شاخانەدا پەناگایەکی دۆزیوەتەوە. لێرەدا خۆی دامەزراندووە و تیرەی هەورامی پێکهیناوە.

هەندێ جار لەمیانی هەڵسانی سوپای ئەردەڵاندا هەوڵی لەناوبردن و هەڵکەندنی هەورامی دراوە، بەڵام ئەوەش بێبەربووە و بەتەنیا لەنێوان تیرە بچووکەکانی سەر سنووری ئێران و تورکیادا هەورامان هێشتا دەڕوانێتە لێژگایی شاخەکانی ئەمڕۆی خۆی و بەرگری لە هەموو شت دەکات لە پێناوی عەلی شاە لە قەڵای هەوراماندا، کە ئەمڕۆ سەربەخۆیە لە هەمووی و تەنیا ناوە.

نیمچە هەرێمەکانی مەریوان و بانە، کە کەوتونەتە باکووری هەورامانەوە، لەژێر فرمانڕەوایی بەگەکان و خانەکانی خۆیاندان و هەرگیز کێشەیان نەبووە وەك هەورامانی هەیبوو، کوردی تەواون و هەروەها هێزێکی کەمیان هەیە. بەگەکانی مەریوان نارەوزیانە شەڕ لەگەڵ سوڵتانەکانی هەوراماندا بکەن (وەك ئەوەی ئەمڕۆ دەیکەن)، بەڵام تا بنەماڵەی ئەردەڵان بەناسایی دەستەڵاتیان بەسەر هەموو وڵاتەکەدا هەبێت لەبارودۆخێکی باشدان.

دەستەڵاتی پاشایەتی بە باشی تا سەدەی رابردوو لە سنەدا بەپێوە بوو، لەوانەشە یەکێ لە خانە بەرچاوەکانی سنە ئەمانۆڵڵ خان بێت، والی ئەردەڵان لە دوو دەیەی یەکەمی سەدەی نۆزدەیەمدا، کە شێوازی پاشایەتی لە پایتەختە بچووکەکەیدا پاراست.

بەهەرحاڵ، بنەماڵەکە پەیوەندیەکی زۆری لەگەڵ بنەماڵەی قاجاریەکانی ئێراندا پەیداکرد، کە یەکەم جارە دێنە سەر تەختی ئێران و وەك دۆست و هاوپەیمان پەیمانیان بەست. هەر کە بەڵێنیان دا

---

[88] دەوترێت وەچەکانیان لە تیرەی کاندولایە، لە رۆژهەلاتی کرماشان و هاوشێوەی هەمان دیالێکت ئاخاوتن دەکەن.

## هەورامان

بە فرمانڕەوایانی قاجار (فرمانڕەوایی ئێستای ئێران)[89] ، وابەستەی بەڵێنەکانیان بوون و یارمەتی پیاوانیان دا لە شەڕەکانی دژی لوتف عەلی خانی زەندی کڵۆڵ، کە تەخت و مەرگی خۆی کەوتە ژێر دەستی قاجارەوە.

خوسرەو خان هاوسەرگیری لەگەڵ کچی فەتح عەلی شاە کرد، کە ژنێکی خاوەن کەسایەتیەکی بەهێز بوو، هێشتا بەردەوامە لە پاراستنی جڵەوی فرمانڕەوایی دوای کۆچی دوایی مێردەکەشی و لەلایەن غولام شاە خانەوە لە 1865 سەرکەوتو بووە.

دوای نەمانی ئەو، دوا والی ئەردەڵان، ناسرەدین شاە، هێز و دەسەڵاتی خۆی بەکارهێنا و لە هەردوو خزمایەتی و دەستەڵاتداریی کەڵکی وەرگرت تا ئەو بنەمایانە بخاتە ناو جێنشینیەوە کە دەبێت کاندید وا لێبکات دڵنیانەبێت و لە هەمان کاتدا، کاتێ خانە لاوەکان چاوەڕێی بڕیار بوون، ئەو لەلایەن کودەتایەکەوە موعتەمەدول دەولەی مامی خۆی کردووە بە حاکمی کوردستان، کە پیاوێکی بەهێزە.

ئەردەڵانیەکان بەرەنگاریەکی کەمیان کرد، چونکە لەگەڵ فرمانڕەوایی شازادە خاتوونی قاجاردا راهاتبوون و لەسەرو ئەوەشەوە فرمانڕەواییەکە بڕێکی زۆری هێز و دەستەڵاتی خۆی لە دەستداوە و لەناوچووە. ئیدی موعتەمەدول دەولە زانی کە ئاسانە تەختی دەستەڵاتەکە لە سنە بگرێتە دەست. بەڵام کە ئاوڕی بەلای هەوراماندا دایەوە خۆی بینی بەرەنگاری بارودۆخێکی زۆر جیاواز دەبێتەوە. هەورامانی، کە زانیان ملکەچکردن بۆ بنەماڵەی ئەردەڵان تەواو سەختە، دیارە لە ژووردەستەیی ئێراندا باری ژیان وەك سروشتی خۆی مەحاڵە بێ تێکۆشان بگونجێت.

موعتەمەدول دەولە ماوەکی درێژ و گران تێکۆشا بەر لەوەی بتوانێت حەسەن خانی سوڵتانی هەورامی ملکەچ بکات و تەنانەت کاتێ ئەوەشی کرد، تیرەکە ئەو رێزە زۆر گەورەیەی بەدەستهێنا بۆ خۆی کە فرمانڕەوایی دوای ئەو درایە دەست کوڕەکەی و براکەی.

لەم سەردەمەدا هەورامان بەشێکی کەوتۆتە تورکیاوە و بەشێکی گەورەشی کەوتۆتە خاکی ئێرانەوە و لەکاتێکدا فرمانڕەوایانی هەردوولا بەناو لەژێر دەستەڵاتی ئەو هێزانەدان، بەڵام لە هەموو خواست و مەبەستەکانیاندا سەربەخۆن، بەتایبەتی عەلی شاە، هەورامانی ئێران، کە بۆ کەس

---

[89] ئەوەش لەگەڵ ئاغا محەمەد شاەدا دەستپێکرد، کە لە 1794دا دەختی پاشایەتی گرتەدەست و بەهۆی فەتح عەلی شاوە سەرکەوتنی بەدەستهێنا، کە هاوچەرخی ئەمانوڵلا خان بوو.

ملکەچ نییە. لەکاتی نووسینی ئەم راپۆرتەدا، لە سنەوە ناردیان تا باجی لـێ بستێنن و هەوڵی ئەوەیان دا ملکەچی فرمانیکەن. بنەماڵەی ئەردەڵان، لەگەڵ ئەوەشی هێزیان داماڵراوە، هێشتا بنەماڵەیەکی بەرچاون و پۆستی زۆریان لە حوکومەتی ئێراندا بەدەستهێناوە. فەخرول مولك، سەرۆکی ئێستای بنەماڵەکە، پیاوێکی بەتەمەنی مەزن و هۆشیارە، حاکمی شوشتەر و دیزفولە لە عەرەبستان و یەك نیشەجێی هەیە کە تەمەنی بیستوپێنج ساڵە.

لەم بنەماڵە پێشکەوتو و بەهێزەوە دەبێ ئاوڕێ لە دراوسێکانی ئەولاشیان بدەینەوە، لە شێوەیەکی جیاواز- جاف، کە لە هەموو لایەکی کوردستانی باشووردا بە توانا و ئازایەتی لە شەڕدا ناسراون. تا ئەم چرکەساتە کە کەمێك لەبارەی مێژووییانەوە زانراوە و لێرەدا لەرێی یەك ئەندامی فرمانڕەوایی بنەماڵەکەوە، محەمەد عەلی بەگی پشتەماڵەی قزڵ رەبات، لەوپەڕی کوردستانی باشوورییە و هەندێ زانیاری پێدام.

تیرەکە بانگەشەی ئەوە دەکات کە لە جوانڕۆدا نیشتەجێیە، کە یەکێکە لە هەرێمەکانی ئەردەن و پێشتر باسکراوە، لە سەرەتاوە تا نزیکەی ساڵی 1700 و لەوێ لەژێر دەستەڵاتی والیەکانی ئەردەڵاندا ژیاون. بەهەرحاڵ، وەك دەردەکەوێت کە یان چاوی تەماعی والیەکانی ئەردەڵان نیشتە سەر ناوچەی جوانڕۆی زۆر بەپیت، یان لە توڕەیی پەرەسەندنی هێزی جافەوە هەڵقولاوە، هەوڵیاندا کە فرمانڕەوایی خاکەکە بخەنە ژێر دەستەڵاتی خۆیانەوە. ئەوەش بەبێ شەڕ جێبەجێ نەبوو، دوای پێکدادانێك سەرۆکی جاف خۆی و براکەی و کوڕەکەی گیران و کوژران، سەرۆکەکانی تیرەکە ئەوەی کە مابوون هەڵهاتن و پەنایانبردە بەر پاشای کورد لە سلێمانی، جگە لەو لقە خێڵانە نەبێ کە پابەندی خاك بوون و گرنگیان نەدەدا بە داگیرکاریەکانی ولاتەکە.

بەهەرحاڵ، هەندێ لەوانە بریتین لە: قادری میر وەیسی، تایشای قەڵغانی، یوسف یار ئەحمەدی، کۆیك، نیرجی و گورگکایش. لەتواناییاندا نەبوو لەژێر زوڵم و زۆری والیەکانی ئەردەڵاندا بمێننەوە، پەنایانبردە بەر گۆران و هەروەها ناوەکەی ئەوانیشیان وەرگرت و ئەمڕۆ ناسراون بە جافی گۆران.

پاشای سلێمانی داڵدەیدان و رێیدا بە خێڵەکانیان کە مافی گەرمیان و کوێستانیان هەبێت لە بەهار و پایزدا لەو رێیانەی کە هێشتا لەژێر دەستەڵاتیاندایە و باکوور بەرەو پێنجوێن و باشووریش تا دووری قزڵ رەبات و خانەقین. بەو شێوەیە بوون بە ژێردەستەی تورك و لەو ساتەوە بەو جۆرە ماونەتەوە.

ژمارەی تیرەکە دادەنرێت بە سەد هەزار کەس و مەحمود پاشا کە ئێستا سەرۆك خێڵە بانگەشەی ئەوە دەکات کە لەتوانایدایە لە ماوەی چەند سەعاتێکی کەمدا نزیکەی چوار هەزار سوارە لە گۆڕەپانەگەدا ئامادەبکات.

یەکێ لە سەرۆکەکانی ئەم دواییە، وەسمان پاشا، کە لە پایزی ساڵی 1909دا کۆچی دوایی کردووە، (کە لە بەشە نووسینەکانی سلێمانی و هەڵەبجەدا هێمای بۆ کراوە) تیرەکەی بەهێز و دەوڵەمەند کرد لە ڕێی هاوسەرگیری لەگەڵ عادیلە خانم، کە خانمێکی بنەماڵەیەکی دێرینی ئەردەڵان و لە خێزانی وەزیرانی والیەکان و بەجارێ تورەیی تورکەکانی لەسەر خۆی ڕامالی و ڕەزامەندی فارسەکانیشی بەدەستهێنا، کە شمشێرێك و ناونیشانێکیان پێبەخشی وەك نیشانەی دانانان بەوەی کە ژێردەستەیەکی ئێرانی هەڵبژاردووە بە هاوسەر.

پاشاکانی جاف پیاوانێکی چینی سەربەرز و لەخۆبای و کەم دوون، بەڵام لە ئیشوکاردا بەدەستوبردن و ئەوان لەمیانەی سەد ساڵی ڕابردوودا کاتێ کێشەیەك لەناو تیرەکەدا بەرپابوویێت، ئەو دەستوبردە کاریگەرە دەکەن وەك ئەوەی لە دابەشکردنی تیرەکەوە شتی وەها ڕووینەدابێت. ئەم تیرەیە توانیویانە لەپەیوەندیەکی باشدا لەگەڵ تیرە گەورەکانی کورد- دا بژین، هەرچۆن سەرۆکانی بنەماڵە جیاوازەکان بەهاوکاری کاریانکردووە، تیرەکەش دەوڵەت و هێزی گەشەیکردووە.

ئەوە سیمایەکی بەرچاوە لە ژیانی کورد- دا، چونکە هۆی ئەوەی بۆچی ئێران و تورکیا پارێزراون لە داگیرکردنە مەزنەکان لەلایەن کوردەوە، کە لەوانەبوو پێچەوانەی ئەوە ڕوویدات، نەبوونی توانای خێڵەکانە بۆ پێکەوە ژیان بە ئاشتی لەگەڵ یەکدیدا- ئەوەش دیاردەیەکی دەگمەن نییە لە سروشتی نەژادە شاخاویەکان لە هەموو لایەکی دنیادا.

بە دەگمەن تیرە بە سنووری ئێراندا تێدەپەڕێت، جگە لە سنووری کۆچبەری باکوور نزیکی بانە نەبێت، چونکە لەسەر سنووری باشووری هەرێمی گۆرانە، کە تیرەیەکی کۆن و ناودارە، هەرچەند ئەوەندە بەهێز نییە وەك لەوەپێش، هێشتا فرماندەکات و ڕێزی تەواوی خۆی هەیە بۆ پاراستنی لە دراوسێ یاخی و هەڵچووەکانی لە خاکی تورکیادا.

لەناو هەموو تیرەکانی کورد- دا، لەوانەیە زۆر ناسراوبێت و گرنگیەکی زۆری ورووژاندبێت لەناو ئەوانەی گەشتیانکردبێت بۆ ڕۆژئاوای ئێران و کوردستانی باشووریی. بەهەرحاڵ، ئەگەر بتوانرێت توێژینەوەی ڕەگەزناسی لەسەر تیرەکە بکرێت، لەوانەیە دەرکەوێت کە گۆران کورد نەبێت، بەڵام یان

لوڕە یان فارسە. لەسەر سنوورەکەی، کوردستان و لوڕستان جیادەکاتەوە، ژمارەیەك تیرە هەیە کە نە لوڕن و نە کوردن و بە زاراوەیەکیش دەدوێن کە دەردەکەوێت پاشماوەی تاجیکی فارسی کۆن بێت. ئێستا بیردەکرێتەوە کە ئەم وڵاتە دانیشتوانێك بەناوی گوران بەجێگیری لێرەدا نیشتەجێبووە، کە بە زمانێکیش ئاخاوتندەکات کە لەسەرەوە ئاماژەی پێکراوە و هێشتا لەگەڵ هەندێ گۆڕانکاریدا لەلایەن تیرە سەقامگیرەکانی هەورامان، کاندولە و ریژۆوە بەکاردەهێنرێت. زمانەکە زمانێکی کۆنی بنەماڵەی ئەردەڵان بووە و هێشتا بەکردەوە لە ئارادایە و لە تەواوی شیعرەکان لە سنە و لەبارەی سنەوە بەو زمانە نووسراوە و ئێستاش پێیدەوترێ هەورامی یان شارەزووری.

ئەم بیردۆزەدا راستیەك دەردەخات کە بەشێکی گەورەی تیرەی گۆران- بەشە سەقامگیرەکە- هێشتا ئەو زمانە ئاخاوتندەکات. خێڵە کۆچەریەکان بێگومان دیالێکتی کوردی بەکاردێنن، بەڵام ئەمە بە ئاسانی پەیوەندە بەو بارودۆخەی کە بۆتە هۆی ئەوەی هەندێ لە خێڵەکانی جاف و کەڵهوڕ خۆیان بخەنە ژێر پارێزگاریی گوران و ناوەکەشیان هەڵگرن.

تیرە رەسەنەکە، کە بنەماڵەی سوڵتان فرمانڕەواییان دەکات، تیرەیەکی زۆر کۆنە و بانگەشەی ئەوە دەکات کە راستەوخۆ لە "بەهروم گور"ەوە هاتون، ناوەکەی لای ئەو کەسانە ئاشنایە، کە وەرگێڕانەکەی (FitzGerald- فیتزجرالدی) عومەر خەیامیان خوێندۆتەوە.[90]

لە ساڵی 1639دا، کاتێ کۆتایی بە کەمترین سنووردانان هات بۆ ماوەیەکی نادیار لە هەموو پەیمانە سنووریەکانی نێوان ئێران و تورکیا، کاتێ تیرەی جاف و تیرەکانی تریش هاتنە ناوی، گۆران بەهێزێکی گەورەوە لە گەوارەی پایتەختە دێرینەکەیدا فرمانڕەوایی دەکرد و زیاتر ناوداریکردووە بە چیرۆك و شیعرەکان- کە ناوێکی کوردی بەرزکردۆتەوە و داوێتی بە جۆرە شیعرە دیاریکراوەکانی "گۆرانی".

ئیدی لەدوایدا بەهۆی لاوازی فرمانڕەواکانیانەوە هێزیان لەدەستدا و لەو چەند ساڵەی رابردودا گەڕانەوە بۆ دواوە، گۆڕەپانەکەیان بۆ تیرەی کەڵهور چۆڵکرد، ئێستا لە هەر کاتێکی رابردو زیاتر بەهێزە، دارێژەیەك لە خێڵەکان ناوە گشتییەکەیان هەڵگرتووە.

گۆران مامۆستای ئەو بیری پەرستنە سەیر و ناڕوونەی عەلی ئیلاهیە، ئەوانەی بە ئاشکرا باوەڕیان بە عەلی هەیە، کە زاوای پێغەمبەرە، وەك گیانبەبەرداکردنی خوایی و وەك ئەوە دەیپەرستن.

[90] فیتزجیرالد، واتە Edward Fitzgerald کە روباعیاتی عومەر خەیامی کردووە بە ئینگلیزی. وەرگێڕ.

## عەلی ئیلاهی

مەحاڵە تەنانەت بەگشتی ئەو بارستاییە راپۆرت و پروپاگەندەیە بەیانبکەین کە لەبارەی ئەم بیروباوەڕەوە دروستکراوە. هەموو گەشتیارێك، ئێرانی و ئەورووپی، سەرنەکەوتون لە زانینی ئەوەی لەسەرین، هێشتا دەخوازن زانستی بە تۆمارکراوی دانێن، وەك راستیەك هاتە پێشەوە وەك چۆن لە هەندێ جاردا جگە لە بیردۆزەکانی خۆی زیاتر نییە. لەناو ئەو لێشاوەدا ئاسان نییە یەك شت دیاریکەیت کە نیشانەی دیاردەیەکی راستی پێوەبێت.

لەوە دەچێت لەمیانەی خوێندنەوەی کۆمەڵێك لە بیردۆزەکان لەبارەی عەلی ئیلاهیەوە هەندێك تێکەڵیکردبێ لەگەڵ ئیزیدیدا، ئەوانەی لە بەشی چوارەمدا روونکردنەوەی لەسەر دراوە، چونکە لەلایەن هەندێکەوە تاوانبارن بە کۆمەڵی شەوە ئاهەنگی تێرژانن، بەو شێوەیەی لەدژی ئیزیدیەکانیش هەمان تاوانبارکردن کراوە. لەناو ئەو هەموو پێناسانەی بڕیاری روونی شیعەی محەمەدی دەدات، چونکە لەگەڵیدا هاوبەشە، کاتێ هەوڵدەدات پێناسەی رێبازێك بکات کە ئەو نەزانە، ئەوە لایداوە بەلای ئەوەی کە لە نهێنیی محەمەدیدا نایاساییە، هەروەها چیرۆك و سەرگوزەشتە بۆ گوێگرانی رێکدەخات تا ئەیانگەیەنێتە پلەی ئەوپەڕی لادانی دووبەرەکیەکان. ئیدی-" لە گوندەکانیاندا نە نکولی لە بەکارهێنانی شەراب و خواردنەوە دەکەن، نە خۆشیان تەبەرادەکەن لەو خواردن و خواردەمەنیانەی لە قورئاندا قەدەغەکراوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە بەوپەری سەربەستیەوە جڵەویان بۆ خواردنی گۆشتی بەراز و خواردنەوەی سەرخۆشکەر بەرەڵاکردووە."

دابونەریتیان هەرچیەبێت ئەوەی هەیە، باوەڕەکانیان بەهەرشێوەیەك بریتیە لە پیرۆزی بابە یادگار، کە لەلای ئەوان دادەنرێت بە یەکێ لە شێوەکانی خوا، چونکە لەوە دەچێت ئەوان لەو بڕوایەدان ئەوە بکرێت، ئەوەش لەو حاڵەتانەدا رویداوە: بنیامین، موسا، ئەلیاس، داود، عیسای مەسیح و عەلی و حەوت "جەستە" یەکێ لەوانە سەنتە، کە لە بابە یادگاردا نێژراوە، شوێنی زیارەتی حەجە.[91]

ئەوان زووزوو لە داود دەپاڕێنەوە و ناوی داود لەناو تیرەکانی گۆران و کەڵهوردا بەناویانگە و دەڵێن بەرلەوەی بچن بۆ شەڕ، مەڕ بۆ داود کراوە بەقوربانی.

ساڵی جارێك جەژنێك دەگێڕن، پێش زستان دەستپێدەکات، کە لەوەدا عەلی تێدا دەپەرسترێت و لەمیانەی وەرزی هاوینیشدا جەژنی "بەرخ"ە، کاتێ مەڕ و باڵندەی ئاویی تێدا دەکرێتە قوربانی،

---

[91] سەید رۆستەم، کە سەرۆکی رێبازەکەیە، لەلایەن ژمارەیەکی زۆریانەوە دوپاتکراوەتەوە کە گیانی خوای کراوە بەبەردا.

# عەلی ئیلاهی

بێگومان دەیکەن بە تەقەکردن، هەرچۆن تا رادەیەکی زۆر لەناو تیرەکانی تریشدا لە هەموو کوردستاندا هەیە.

شوێنە پیرۆزەکانیان بریتیە لە: لەگەڵ بابە یادگاردا کە لەسەرەوە هێمای بۆ کراوە، زەردە، کە زۆر نزیکە لە چیای دالاهو و دوکانی داود، ئەوەی دواییان بریتیە لە هونەری پەیکەرتاشی کۆنی فارسی و رێورەسمی ئاینیە لەلایەن زەردەشتیەکانەوە.

ئاشکرایە نیشانەیەکی دیاریکراو نییە کە بتوانرێت وەك عەلی ئیلاهیزم جیابکرێتەوە. لەوە دەچێت، هەروەکو بەگوێرەی ئیزیدیەکانیشەوە وەهایە، کۆمەڵێکی تایبەت لە دابونەریتی زۆر سیستمی ئاینەکان کۆبووبێتەوە، هەندێك لەوانە بۆ دەرخستنی هاوجوتیە لەگەڵ دینی نەژادی فرمانڕەوا بەمەبەستی دورکەوتنەوە لە ئازار و چەوسانەوە بەهۆی ئەوەی کە بە نهێنی راهێنانی ئاینپەرستی خۆیان دەکەن. هیچ بەڵگەیەك نییە کە ئایینی زەردەشتیەکان کە بڕوایەیەکی رەسەن بێت، لەگەڵ ئەوەشی کە لەناویاندا شوێنەواری بەهێز هەیە. ئاشکرایە ئیسلام هەرگیز دەستی لێنەداون تا رادەیەك وەریانگێرێت و ستایشی عەلی بێگومان هەمان چەشنە کە دراوە بە ئەوانی دی لە "گیان بەبەراکردنی خوایی" و بۆ ئەو هۆکارانەی لەسەرەوە باسکراون. ئەو خەڵکەی لە نەریتی موسڵمان بێ ئاگان وەك ئەوانەی جولەکە، سەرەڕای ئەوەی گەشتیارە تایبەتیەکان، بەتایبەتی راولینسن، لەو بڕوایەدایە هەندێ نەریتیان تایبەتە بە جولەکەوە.

بۆچوونە فارسیەکەی بۆ رێبازەکەیان وەك ئەمەی دێت، کە لە زووربەی کارە بێلایەنانەکانیاندا دەردەکەوێت. تێبینی دەکرێت کە رەگەزی محەمەدی خاوێنیان دەدەنێ. باوەڕی سەرەکییان ئەوەیە کە عەلی خوایە و وەك رێبازەکانی نوسەیری، دەڵێن ناسینی خوا مەحاڵە، لەبەرئەوەی بوونی بنەڕەتی ناپێویستە (خوا و مرۆڤ) بەهیچ جۆرێ پەیوەندیان بەسەر یەکەوە نییە، مەگەر ئەوە پێویست بێت بوون لە نەبوونەوە بێتەخوارەوە، لەوانەیە و لەلایەن مرۆڤانی رێبەرەوە پێبگات.

مەسەلەی خوایەتی و فەرمان لەوانەیە ئیدی بەرجەستەبێت و هاوبینە بن لە سازاویدا تا لەلایەن مرۆڤەوە بەرچاو بێت و ئەوەش لە بارودۆخەکەی مریەمی بەتولدا کرا، کە چەندین دەرکەوتەی دروستکراو ئەنجامدرا.

لە هەر چەرخ و زەمانێکدا هەندێ گیان بۆ رابەریی مرۆڤ شتی پێدراوە،[92] کە لەم سەردەمەدا عەلی کوڕی ئەبو تالیب، " هەموو بوونەوەری ئاسمان گەواهی دەدەن" و بانگی دەکەن بەشکەری رۆژو (بیەری پیرۆزی).

لەناویاندا باوەڕێك هەیە کە خودی خوا بەڕاستی لە زووربەی مرۆڤە چاکەکاندا دەردەکەوێت و ئەوەش لە "عەلی"دا دەرکەوتووە.

ڕێبازێك لەوانە دڵنیایە " کە پیرۆزی لەگەڵ خوادا بەردەوامە، وەك تیشك لەگەڵ خۆرا، بەڵام خواش نییە و لەگەڵ ئەوەشدا لە خواش زیاتر نییە، نە لەخوا جیادەبێتەوە و نە تێکەڵیشی دەبێت."

عەبدوڵڵای کوڕی سەباح، عەرەبێکی هاوچەرخی عەلی خۆیەتی، یەکەم جار بڵاویکردەوە کە ئەو خوایە، " خوا نابێ دەرکەوێت، بەڵام گیانی خوایەتی لە عەلی ئەبو تالیبدایە: هێمای پێغەمبەری بۆ ئەو کراوە و پیرۆزان لەلایەن ئەوەوە ئیلهامیان پێبەخشێنراوە، هەموو زانستیەکیان لەوەوە وەرگرتووە، کە بەدیهێنەر و دەوڵەمەند بووە و هەموو سنووردارییەکان راوەستاوە." خودی عەلی، کە نەفرەتی لە بیروباوەڕەکەیان کردووە، ئەو عەبدوڵڵایەی گرتووە و بووە هۆی ئەوەی باوەڕدارانی فڕێدرێنە ناو چاڵێکەوە و ئاگریان تێبەربدرێت. بەڵام لەسەر باوەڕی خۆیان سوور بوون و هاواریان دەکرد " ئێستا بێگومان تۆ خوای، چونکە پێغەمبەر وتویەتی، " هیچ شتێك سزای ئاگر نادات جگە لە خوا."

ئەم کردەوەیە لەناو ڕێبازی عەرەبدا لەناونەچووە، چونکە دوای کۆچی دوایی عەلی دڵنیان لەوەی کە بەشێوەیەکی کاتی دیارنەماوە، لە ئاسمانەوە تەماشادەکات، بریسکەی هەورەچەماخە نیشانەی ئاشکرای بوونی ئەوە و خۆریش دەرکەوتنێتی.

بەشێك لە فارس یان کورد دەڵێت کە عەلی سێ سەد ساڵ لەوەبەر دەرکەوتووە بڕوا و یاسای خۆی نوێکردۆتەوە.

ناوی دووەم دەدەن بە خەلکە پیرۆزەکانیان و عەلی دادەنێن بە"ساحێب کەرەم"، بە ئیبن یامین دەڵێن پیر، ئیمام رەزا ناودەبەن بە داود، ئیمام حوسەین بە ناوی یادگار دەناسرێت.

هاوباوەڕانی خۆیان واژەی "یار"ی بۆ بەکاردێنن و بۆ کەسانی نامۆش واژەی "جۆز"ە و کاتێ گۆڕانێك دەکرێت ئەو دەبێت تۆو یان کاکڵەی جۆرە گوێزێکی بۆن خۆشە لەگەڵ خۆیدا بیهێنێت،

---

[92] یەکێکە لە بنچینەی باسەکانی شیعە.

ئەوەش نیشانەی داماڵینی هەموو بیروباوەڕێکی ترە. ئەوان قینیان لە ریش تاشینە یان قەڵەمکردنی سمێڵە.[93]

پیاوە سەرکردەکانیان بە سەید بانگدەکرێن، ئەوەش وەك شێوەیەك لە شێوەکانی "ساحێبی کەرەم"دەناسرێت و دەستەڵاتی ئەوەیان هەیە چی یاساییە و چی نایاساییە.

نوسەرێکی فارسی، میرزا محەمەد حسەین ئەسفەهانی، زەکا ئول مولك، دەڵێت:- " نووسەر ساڵانێك لەناویاندا بووە و — کاتێ بەربەرچی باوەڕەکانی ئەوان دەداتەوە- دەبێ ئەوەش بڵێت کە لەگەڵ ئەوەی ژنەکانیان سەرپۆش ناپۆشن، بەرەڵایی کەمە، یان هەر لەناویاندا نییە."

ئەوە بیروڕاکانی باشترین نووسەری فارسیە کە پەیوەندە بە بنەڕەتی ڕێبازەکەوە و ئاشکرایە کە بەشێوەیەکی تەواو شیکردنەوە لەسەر باوەڕەکانیان نەکراوە و ئەوەش بۆتە هۆی کردنی هەندێك هەڵە لەڕێی هەوڵدان بۆ پێدانی ڕەگەزی محەمەدی تەواو بە عەلی ئیلاهی. ئەوەی ماوە بۆ تێبینیکرد تیرەی کەڵهوڕە، کە بە زەحمەت دەچێتە ناو ئەم کتێبەوە و بۆیە کورتە هێمایەك لەو رووەوە بەسە.

تیرەکە ئەمڕۆ بەهێزترین تیرەی کوردستانی باشوورییە و بۆ ماوەی چەندین سەدەیە لە خاکەکانی نزیکی سەرسنوور نیشتەجێن، لەسەر سنووری ئەوبەری کوردستان بۆ کرماشان. سەرۆکەکەیان داود خانە و پیاوێکی تا بڵێی بە دەستەڵاتە، کە لە چەرچێتییەوە بەرزبۆتەوە بۆ سەرداریی و تا مانگێك یان دوو مانگ لەوەبەر لە کرماشانەوە بۆ سنووری تورکیا مەشقی سەرداریەکی تا رادەیەك سەربەخۆی دەکرد، وەك هەندێ دەستەڵاتی لە گۆران داماڵی و هەندێ خێڵی بچووکی وەك سنجابی بەتەواوی ملکەچبوون.

زۆر بیر و بۆچوونی ناوێزە لەبارەی بنەچەی کەڵهوڕەوە هێنراوەتە پێشەوە، هیچیان وەك ئەوەی (راولینسەن- Rawlinson) سەرنجڕاکێش نییە، کە وەچەی جولەکەکانن و لەلایەن نەبوخەزنەسرەوە بەدیلی براون.

ئەوان خۆیان شەیدان، وەك یەك یان دووی تر لە تیرەکانی باشوور، بۆ دڵنیایی ئەوەی کە ئەوان لە نزیکی شیراز و باشووری ئێرانەوە هاتوون.

---

[93] - سمێڵکردنی موسڵمان لەبەر ئەوەیە کە ئەو بەشەی لەکاتی خواردنەوەی شلەمەنیدا دەکەوێتە ناو خواردنەوەکەوە.

هیچ هۆیەکی دیاریکراو نییە لەو بڕوایەدابێت کە ئەوانە جیابن لە کورد، لە ڕەگەزی کوردی، بە دڵنیاییەوە تێکەڵن بە خوێنی لوڕیی، بەڵام نەك لە بنەچەی تر جگە لە ڕەگەزی ئەوانی لەسەریان دادەنرێت.

زانیارییەکی زۆر لەبارەی تیرەکەوە کۆکراوەتەوە، کە پێویست ناکات لێرەدا درێژەی پێبدرێت. لەو باردودۆخەیەوە بەدرێژایی ڕێگای بەغداد بۆ کرماشانە، سەوداگەری نێوان سەرکردەکانیان لەگەڵ ئێراندا و لە ڕاستیدا لە ڕووی ئایینەوە هەردوولا شیعەن، کەڵهوڕ لەوانەیە زۆر ئامادەتر بێت لە هەموو تیرەکانی کورستان و بەهەرحاڵ زیاتر سەرنجڕاکێشترە، لە ڕووی زمان و نەریت یان مێژووەوە.

وەك بۆ زمانی کوردی، کەمێکی لێدەزانرێت و وەسفیدەکەن بەوەی دیالێکتێکی سەقەتە و لە فارسی و عەرەبی پێکهاتووە، " جۆرێکە لە سەگی فارسی "و" دیالێکتێکی کۆنی فارسی ریسوابوو."

هیچ شتێیەك لەوانە نییە.

لەوانەیە فارسی ئەمڕۆ، وەك ئەوەی هەیە جوان و بێ کەموکوڕی بێت- تەواوترین زمانەکانی ئارییە- بەهەمان شێوە کوردیش ناتوانێت نیشانەکانی چاخی پێشو پێشان بدات. زمانی کوردی هەیە، زمانێکی تەواوە، شێوازەکانی ڕێزمانێکی دەوڵەمەندی هەیە، ڕستەسازی ئاشکرا و سەربەستیەکی تەواو لەو هاتنەناوەی عەرەبییەی کە هەیە، لەکاتێکدا فارسی دەوڵەمەندکرد، وشە کۆنەکانی ئاریی ڕەسەنی فرێدایە دەرەوە کە لەوەپێش بەکاردەهێنرا.

ریزبەندیەکی شان بە شانی یەکی ژمارەیەك لە دیالێکتەکانی کوردستان هەیە، کە جیاوازن لە گۆکردن و شێوەدا بە بڕی ئەوەی بە کردەوە ببن بە زمانێکی جیاواز، ئێمە بینیمان یەکێ لەناو ئەوانەدا نەزمی شێوازێك پێشاندەدات، کە سیستمێکی ڕێزمانی تەواو پێکەوتووە، لەگەڵ کورتەیەکی ڕوونی بنیاتنان و گۆکردندا.

ئەوەش زمانی موکرییە، کە لە لاهیجانی ئێراندا قسەی پێدەکرێت، باشووری گۆلی ورمێ و ساوچ بولاق- سابلاخ، کە شارۆچکەیەکی بچووکی ناو چیاکانە و پایتەختی تیرەی موکرییە.

ئێرە شوێنی ئەوە نییە گەشتێك بکەین بە لێکۆلینەوەکانی هاوشێوەی ڕەگی کورد لەگەڵ "زەندئاڤێستا"، ئەوەندە بەسە بڵێین کە موکریانی لەوێ دەژین کە زەردەشت دەستیکردووە بە فێرکردن و لەوانەشە شوێنی بنەڕەتی ئەو بوویێت و ئاخاوتنی زمانەکە تاڕادەیەك نزیکە لە شێوەی

## ئەدەبی کوردی

کۆنەوە، هەندێ بانگەشەی باشیان هەیە کە پارێزەرانی یەکێ لە باشترین نمونەکانی زمانی ئاریی ڕەسەنن.

لێکۆڵینەوە لە زمانی کوردی بەگشتی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زمانێکی پاکە کە دووچاری داخورانی شێوە و تێکدانی گۆکردن بووە، کە دەربازبوون لێی مەحاڵە و جێگیر نییە لەلایەن هەبوونی ئەدەبی بەکارهێنراو بەگشتی.

لە روانگەی بەرژەوەندی لێکۆڵەرەوە، زۆر جێی داخە کە کورد ئەدەبیاتێکی زۆر کەمی هەیە، لە راستیدا، بەگشتی هەستناکرێت کە هیچیان نەبێت، بەو شێوەیەی پێشتر باسکراوە، بەهەرحاڵ، برێکی زۆر لە کاری نووسین هەیە.

نەتەوەی کورد وەك دێتە بەرچاو بەو شێوەیە نادیار و کێوی نییە، لە دابینکردنی پیاوانی پایەبەرز لە دەوڵەت و سوپای تورکیادا کەم توانا بووە. لەوانەیە خەڵکێکی کەم ئەوە بزانێت کە سەلاحەدین ناودارێکی کوردە، یان کە ئیدریسی وەزیری سوڵتان سەلیم لەهەمان رەگەز بووە.

بەڵام ئەوەی پەیوەندە بە رۆڵیان لە کاروباری سەربازیدا، ئارەزوی خۆرستی رەگەزەکە ئەو گیانی سەروەرییەی پێداوە کە لە هەر بوارێکدا وەك سەرکردە هەوڵی بۆ داوە و تورکیاش لەنێوان جەنەراڵە بەجەرگەکانیدا ژمارەیەك لە کوردانی باکووری تێدایە.

بایەزید، شارێکی سەرسنووری تورکیایە لە ئاسیادا، لە داوێنی چیای ئاراراتدایە، لەم سەردەمەی ئەمڕۆدا شارێکی کوردیە و لەسەردەمی زووتردا لە 1591دا پیاوێکی کورد لەوێدا نیشتەجێبوو، کە ناوداری سەردەمی خۆی بووە، ئەویش ئەحمەدی خانیی هەکاریە، کە مزگەوتێکی بیناکرد، ژمارەیەك کاری فەلسەفی و ئایینی و شیعری بە زمانی دایك نووسیوە و قوتابخانەیەکی گەورەشی بەڕێوەدەبرد کە کوردەکان تێیدا قوتابی بوون و زمانی تایبەتی خۆیان بابەتی سەرەکی بوو بۆ فێربوون.

یەکێ لە یەکەم کتێبەکانی بریتیە لە زانخوازێکی بچووك لە وشەگەلێکی عەرەبی و لەشێوەی شیعردا نووسراوە، وەك خۆی وتویەتی، بۆ فێربوونی "کورمانجی" واتە منداڵی کورد کاتێ قورئان تەواودەکات، ئیدی کە بەباشی تێیگەیشتن، خوێندنەوە و نووسینیش فێردەبن." قەبارەکەی بچووکە و بە یادەوەرییەك دەستپێدەکات.

"ئەگەر رێزمان و وانەکانی کە تۆ نەتوانی شیبیانبکەیتەوە، ناو و ناوبانگ بۆ تۆ بوونی نییە."

## هۆنراوەی کوردی

تێکستەکە بە هۆشیاریەوە لە بڕێکی جیاوازدا نووسراوە، ناوی ئەوەی نووسیویەتی لەسەر هەر برگەیەك بەیاندەکرێت و کە مەحاڵە لە وەرگێڕاندا لاسایی بکرێتەوە:-

بە "رجل" و "المراه"ی عەرەب، ئێمە دەڵێن مر و ژن.

"الاب" باب و "الام" دا، "الاخ" پێیدەڵێین برا.

"الابن" ئێمە دەڵێین کوڕ، "ابنة" کچ و "عم" مام.

"العمة" مەتە، "عمامه" شاش، "الجده" پیرە دا.

"الاجارة" کرە، "تعهد" کلرو، "الفقدان" زیان و درۆ "الکذبة".

"البیع" فروتن، "اعطا" دان و "شراء" کڕین،

"الرقبه" مل، یان ئەستو، "القلب" دڵە و شاهینە " الجذلان".

بەو شێوازە بڕی دوو هەزار وشەیان بە منداڵان خوێندووە و لەگەڵ زەینی نایابی ئاریدا، ئەم شێوە پەروەردەیە (یەکێ لە ناودارترینە لە سەرانسەری رۆژهەڵاتدا) کەم خۆکارە و " توتی ئاسا" دێتە بەرچاو.

لە ئەحمەدی خانییەوە ئاوڕ لە شەرفنامە دەدەینەوە، ناودارترین مێژووی کوردەکان، کە شەرەفەدین بەگی هەکاری بتلیس نووسیوێتی و کتێبێکی دەگمەن و بە پەرۆشەوە کۆششی تێداکراوە لەو بەرگەدا و کۆپییەکی لە مۆزەخانەی بریتانیدایە. ئەوە بەناوبانگترین کارەکانی ئەدەبی کوردەکانە، لە راستیدا چونکە بە زمانی کورد نەنووسراوە بۆیە بێبەشی دەکات لە شوێنی ئەدەبی کوردی.

سلێمانی لەمیانەی ژیانێکی کورتی دووسەدەییدا، ژمارەیەکی زۆر لە شاعیرانی وەبەرهەمهێناوە، کە هاوبەشیان لە ئەدەبی شیعری کوردستاندا کردووە، بەجۆرێکی گشتی بە کوردی نووسراوە و هەندێ لەوانەش تا ئەمڕۆ بەرگە قەوارە گەورەکانیان نووسیوە.

ناودارترینیان نالی بوو، کە دانەری زووربەی شێوازە جیاوازەکانی شیعرەکانە، کە دیوانێکی تەواوی تەواوکردووە، یان وەك پێیدەڵێن " کۆمەڵەی کارەکان".

بابەتی شاعیری سلێمانی نزیکەی وەك تەواوی شیعرەکانی هاوشاریەکانە، خۆشەویستی، لاپەڕە لەدوای لاپەڕە خەیاڵبازی و یاریکردنە بە وشەکان، بەتەواوی لەسەر شێوازی فارسیە، کە کورد هەمیشە رێ بەوە دەدات ئەو کاریگەرییە بکەوێتە سەر شیعر، کاتێ لە یەکێ لە شێوەکانی بەکارهاتو لەلای فارسەوە بێت. بەهەرحاڵ، شاعیرانی کوردی سلێمانی وابەستەی نووسینی هەندێ شیعری کوردیی سەیر و سەمەرەن کە ناسکی خۆماڵی تێدایە. بۆ وەرگێڕانی ئەوە جوانی

بنەڕەتیەکەی وندەکات، تەلیسمەکەی زیاتر پشتبەستە بە زمان و ڕۆڵی دەربڕینەکانەوە وەك لە بیرەکە. شیعرەکانی خۆشەویستی زیاتر وابەستەی لێکچوواندنە، کە بە بەکارهێنانی هەموو چەمکە خواستراوەکانی کە هونەری هۆنراوەی فارسی ڕێی پێدەدات و کەمێکی دی، چێژی کوردی لە ئەدەبیاتدا بەجۆرێك نزیکە کە بەبێ ئاگا چۆتە ناو فارسیەوە. هێشتا، من لێرەدا تەنیا باسی شاعیرانی سلێمانی دەکەم. لەدەرەوە، لەناو دەشت و لەسەر لاپاڵی چیاکان یەکێ گوێی لە هەزاران ئاواز دەبێت، سادە و جوانە، چونکە کوردەکان نەژادێکن بەشێوەیەکی سروشتی لەگەڵ تەواوی تواناکانی شاعیرانەدا بەواتای زمان ئاشنایە و زۆر دەگمەنە، یەکێ ببینیت کە بیرەوەری (ناتوانابێت لەلایەن بەکارهێنانی یاداشتەکان و هونەری نووسین و بارێکی قورس لەلایەن هزرێکی زۆرەوە) ئەمبارێك لە ئاوازە میلیە کۆنەکان نییە.

حەمەی یاوەرم لە چرکەساتە ئارامەکاندا زۆر خولیای وتنی گۆرانیەکی سەیری موکری کۆن بوو، کە شەڕکەرەکە ژنەکەی جێدێڵێت تا بچێت بۆ شەڕی دوژمنایەتی خێڵەکی:-

" من دەمەوێت بە چیاکاندا بڕۆم بۆ دوور، هاوسەر،

بڵێ، ئایا بڕۆم، یان بمێنمەوە، هاوسەر؟"

ئەگەر بڕۆی، خوا ئاگاداریت بکات لە ڕێدا،

منیش دەڕوانمە ئەو ڕێیەی پیاتێەڕیت، تا دەگەڕێیتەوە،

من لەوێدا لەبەر هەتاودا دەوەستم تا بەرگەکانت سپی دەدرەوشێتەوە،

تا تۆ پێش دیدەنیارەکان دەکەویت کە سەفەردەکەن بەرەو شەو.

" چیم لەم هاوسەرەمدا خۆشدەوێت، گەر بگریەم یان واوەیلات بۆ بکەم؟

یان پشت لە ماڵ و کێڵگە بکەم و هاتوهاواری مناڵانە بکەم.

مەسیحی، تورك و فارس نووزەنووز و ترس و لەرزە،

وەرە، ماچمکە و بە پەلە بڕۆ، پیاوی ئازا و موکری، ئای ئازیزم."

سەدەها زیاتر لەم جۆرە گۆرانیە هەیە، هەندێ لەبارەی خۆشەویستیەوە و ئەوانی دی لەبارەی مێژووە گاڵتەجاریەکانەوەیە، وەك ئەڤینی کوردەکان و یادەوەریەك، هەر کە دەستیپێکرد، هەرگیز کۆتایی نایەت.

لەبارەی شیعری نووسراوەوە بڕێکی زۆر لە سنەدا هەیە کە بە دیالێکتی کۆنی گۆرانی نووسراوە، لەلایەن ئەو کوردانەوە کە لە دیوانی سنەدا فێربوون و ئەم بەیتانەی لای خوارەوە لە بەرگێکی

دەستنووس وەرگێڕاوە کە بریتیە لە هەندێ شیعری شاعیرە زۆر ناودارەکانی سنە، هەورامان و سلێمانی، زووریەشی لەدەوروبەری ساڵی 1750دا نووسراوە.

**لە شیعرەکانی زەینەلعابدینی پڵنگانی:-**

کازیوەی بەهار

"من تەماشای دڵۆپە مرواریەکانی شەونم دەکەم

بە لقەکەوە راگیراوە و لە لق و گەڵای نوێوە."

خونچە وەنەوشەیەکان پێشانیدەدا برینی ساڵی نوێ نزیکە،

فرمێسکەکان لە تەمومژ دێتەخوارێ- خودی خۆی ئاهێکی ساردە.

" غونچە و گوڵەکان بەدەم بولبولەوە پێدەکەنن.

هەرچەند ئەوانە بێ باڵن، بەڵام لەباوەشی باخچەی رەنگ پەرپویدا دەژین."

لەدەرەوەی چیمەن، نێرگس لە جێی کۆنە برین دەچێت،

لەسەر خاکی زستان- تا ئێستاش بەسەرنەچووە."

**لە شێخ ئەحمەدی تەختیەوە، لەدەوروبەری 1770:-**

وەرە لەگەڵ من گەنجینەی ئێستای جەنگەڵ ببینە،

زیو گۆڕاوە بە زێڕ و درەختیش لە غەم و پەژارەدا بووە بە کەمان.

گەنجینە و من، ئێمە هەردوو لاواز و فەرامۆشکراوین.

بۆ ئەو دەورانەی دێتەوە و من لە پەژارەدا هاوڕێی پایزم."

" پایز دەڕوات و

تۆفانەکانی زستان جەنگەڵ جێدێڵێ ناحەسێتەوە.

گریانی بەکوڵ، لورەی با، گۆرانی بۆ مەرگی جەنگەڵی پایز دەچڕێ،

درەختە ئاڵتونیەکان گریانی بەکوڵی گەڵا زێڕینەکان بەناو هەناسەی ساردی چیاکاندا دەبارێنێ.

هەندێك لەوان ئێستا تەواوی بەرگەکانییان بە خوێنی خۆیان رەنگینە و زوو

هەر یەکەیان دەبێ بوێرانە راوەستێ، ئازا و تەواو وەك بێستون.[1]

" لقەکانی دەرکەوتووە، ماوەیەکی دوور نییە، سەد هەزار رەنگی گرتۆتە باوەش،

---

[94] بەردێکی ناودارە لە کوردستانی باشووری.

ئیدی ئەو دوژمنایەتیە گەرمە، راوکردن بە چەکەکانیان، لەترسا سەرما پێگەیشت.

ئینجا هەموویانی گرت ئامادەنەبوون، با هات و هەڵیکرد و

گوریسە گەڵای درەختی دوور فڕێدەدا، شکۆ و سەربەرزیان سەرنگونە.

گەڵاکانیان پارچەپارچە بوو، رەنگی سەوزیان لێ داماڵرا

تا شکۆی داچۆڕاویان دوور بڕژێت و بەواتای لەدەستدانی ئاستەکانیان.

لەکوێ پەرستگا جوانەکانی پایز راوەستاوە، لەوێ بێ هیوا جێماوە.

هاودەمێکی ماتی غەمەکان لەگەڵ جلوبەرگێکی دڕاو و شڕدا.

**گۆرانیەکی کۆنی موکری:-**

جوتێ پاوانەی سێ تایی لە دامەنیا دەلەرزێ

ئای ئامینە بەرکە بەم لاوە..[95]

ئەوانە وەك دەبینرێت بەستەیەکی بێفەڕ و پڕوپوچ نییە، بەهۆی هەژاریی وەرگێڕانە ئینگلیزیەکەوە وەها دەردەکەوێت، ئەگینان دەقە بنەڕەتیەکە زۆر شیرینە و تا ئەوپەڕی ئەوە پیشاندەدا کە ئەو نەتەوەیە بەتاڵ نییە، وەك چۆن لە هونەری میلیدا ناسراوە، لە هەموو شیعر یان هەر بیرێك لەپشت ژیانی کێوی و شەڕی چاوەڕواننەکراو و کوشتندا پێشاندەدات. نەژادەکەیان لەم رۆژگارەدا شێوازێکی شاخاوی و کێوییە و زۆر لە تیرەکان بە تەواوی شیاوی نەفرەتکردنە، کە دەستەڵاتیان بەسەردا هەبووە بۆ ئازاردان و رەشەکوژیی، ئەوەیە، کە بەتەواوی بێبەشن لە سەردەمی چەرخی نوێی ئەوروپا. لەگەڵ ئەوەدا، ئەگەر دادوەریی بەرکەماڵ بێت، ئێمە دەبێ بۆ بەراوردکردن، کوردستان بخەینە هاوشانی ئەوروپای شەش سەد ساڵ لەوەبەرەوە و دوای ئەوە ئیدی تەنیا هەندێ خاڵی کەم دەردەکەوێت بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوەیی، کە لە دیدی بێ بەزەییەتی، لە یاخێتی و دڕندەیەتیەوەیە، ئەم میللەتە یەك باوەڕی نیمچە دەستوریی تا رادەیەك شیاوی پشتبەستنە لە دژی پەڵە رەشەکانی سەدەی ناوەڕاست لە خاکێکدا، کە ئاین لە خزمەتی ژیاندا بێت و رابەری بەرجەستەیی بێت. نە لەم رۆژگارەدا کورد بە نالەبار دەردەکەوێت لەبەراوردا لەگەڵ ئەوروپایی، ئەگەر لەسەر نموونەیەتی بەرز و پەیڕەوی دادوەری بکرێت، کە لەوانەیە مرۆڤ بەتەنیا فرمانی

---

[95] وەك نووسەر خۆی لە داوێنی ئەم دێڕە هۆنراوەیەدا دەڵێت ئەوانە بەستەیەکی بێفەڕ و پڕوپوچ نین، بەڵام بەهۆی هەژاری وەرگێڕانی ئینگلیزییەکەوە نەتوانراوە گیانی بەرزی هونەری بەستەکە بپارێزرێت. بۆیە منیش نەمتوانی ئەو هەڵەت و پەڵەتە وەربگێڕم و دەقی گۆرانیە کۆنەکەشم دەستنەکەوت تا لێرەدا دایبنێم ...داوای لێبووردن دەکەم..وەرگێڕ.

# کەسایەتی کورد

بەسەردا بدرێت، لەگەڵ ڕەچاوکردنی سروشتی بەرزی هەریەکە، یان وەك زۆر جار وەهایە، ئامادەنەبوونیان. تاوانی چاوشۆڕی لەناو هەزار کورد- دا کەمترە، بەگۆترە هەڵبژێرە، لەگەڵ هەمان ژمارە لە ئەورووپییەکانی کە بەهەمان شێوە ڕەفتاردەکەن.

بەهەرحاڵ کەسایەتی کوردەکان یەکێکە لە کێشە تەواوەکانی کە نووسەر بەرەنگاری دەبێت، چونکە سروشتی خێڵایەتی زۆر جیاوازە لەوەی یەك کورتە بۆ هەموو نەتەوەکە بە کەموکورتی بکەیت.

لە باکوردا، بارودۆخەکە تا رادەیەکی زۆر وایکردووە کە کورد کێویە، چەتەیە. لەناو تیرەکانی حەسەنانلو، سپیکانلو، حەیدەرانلو، ئادەمانلو و زیرکانلو، کە لەسەر چیاکانی ئەرمینیا و ناوچەکانی سەر سنووری تورکیادا نیشتەجێن، کەسایەتیەکە بەرهەمی ژیانی دژواری ڕێگریە تا ئەوپەڕی. لەگەڵ خێڵەکانی سەر سنوورەکە، کە هەمیشە ژیانی دووڕوویی ژیاون، لەلایەن سروشتی فێڵ و تەڵەکەی هەڵهاتن لە تووڕەیی وڵاتەکانی کە سنوورەکانیان وێراندەکرێت، مرۆڤەکە گومانلێکراو دەبێت، دڵەڕاوکێ و بێ ویژدان دەبێت. چیاکانیشیان هەروەها نە زەوی کشتوکاڵی تێدایە، نە شار و شارۆچکەی بازرگانی. بۆیە دەگەڕێنەوە بۆ ئەسپ و تفەنگ و وەك سروشتیە، بە چەشنی نەخشەی پێویستی ژیان و کۆنترۆڵی نەخشە، کە بەخێرایی دەبێتە خویەکی ناپاکانە. لەبارەی ئازایەتییانەوە کەمێ گومان هەیە، لەگەڵ ئەوەی ئەوە من زیاتر دایدەنێم بە ئازایەتی " بوێری"یە تا ئازایەتی ئارام و هێمنی دژی گریانی جێگیر. ئەوە بەهەرحاڵ، دیاردەیەکی زووربەی خەڵکانی شاخاوی و شەڕکەرانی پارتیزانەکانە.

گیانی دەرەبەگایەتیی راستەقینە لە نەژادەکەدا بەهێزە. تایبەتە بە چیاکان و بۆ خێڵەکەی خۆی، شانازی زۆر بەوەوە دەکات کە کوردە، باکووریەکان بە وتەیەکی سەرۆکەکەی چەك هەڵدەگرێت، هەرگیز ناپرسێت تا هۆکەی بزانێت. Fraser- فرمیزەی گەشتیار لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا دەڵێت: "هاوشێوەیی لەنێوانی ئەم کوردانەی کە هەن و خێڵە چیانشینە سکۆتلەندیەکاندا زۆر بەهێزە، کە چەند سەدەیەك لەوەپێش نەبووە.

شەڕکردنی کورد وەکو چیانشینە کۆنەکانە، هەمیشە لە بەرگریدایە و چاو بۆ دوژمن دەگێڕێت و کەسایەتیەك کە لەلایەن ئەم بارودۆخەوە پەیدابووە، هاوجووت لەگەڵ ژیانی کێوی و وڵاتی سامناکدا لەوەی کە کوردی باکووریی تێیدا دەژی، چووە بۆ دروستکردنی ئەو کەسایەتیە کە بریتیە لە گومان و ئازایەتی و بەئاگاییەکی بەتین و توانای بەرزی تێبینیکردنەوە.

لەبەرچاوگرتنی تایبەتمەندیەکانی تاوانکاریی نەژادێك یان چینێك، ئەو مەرجانەی کە لەوەدا هەیە هەمیشە دەبێت رەچاوکرێت، هەروەها وەك برِی فێربوون لەوەی ئێمە دەکرێ ناوی بنێین داننان بە بوونی کەسانی تردا.

خۆبەختکردن، جگە لەوەی دایك بۆ منداڵ، کە غەریزەیە، ئەوە جۆرێکی تەواو دروستکراوە و کەسێك دەخاتە کێشەی گەورەوە و بەئاسانی وندەبێ لەلایەن ئەوانەی کە سەرکەوتونین لە راگرتنی نمونەیەکی بەرز یان باوەڕێك لەبەردەمیاندا. ئێستا ئیسلام نموونەیی ئاوا دابیننا‌کات. مەسیحی نموونەی بەرزی هەیە بۆ ئەم جۆرایەتیە، کە پێویستە بنەچەی هەموو شارستانیەکی راستەقینە بێت و تەنانەت هێشتا ئەوەش بەشێوەیەکی شیاو گونجاو نییە بۆ لەبیرکردنی ئەوە لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا.

کورد تەنانەت فەرمانە سەختەکانی ئیسلامیان لەبەردەمدا نەبووە و بۆیە بە تاقیکردنەوەی سەخت دەتوانێت بەم ئەنجامە بگات، کە چۆن دەبێت ژیانی خۆی بژی ئەگەر ئەو هەیە و ئەوەش، وەك لەناو هەموو کۆمەڵگایەکی دڕدا خۆپەرستیەکی تەواوە و لەوکاتەوە کە مرۆڤ بیری لە شت کردۆتەوە بەڵام خۆی، ئێرە دەرفەت نیە بۆ لەدایکبوونی ئەو سیفاتانە، کە ئێمە بۆ دەرخستنی مرۆڤ دەیخەینە روو. لەسەرو ئەوەشەوە، دەتوانی بڵێیت، لەگەڵ ئەوەی هیچ و پووچیە، کە رۆچوون و گەڕانەوە بۆ دواوەی بارودۆخی دەوڵەتە ئیسلامیەکان بەگشتی دەگەڕێتەوە سەر ئەو سانسۆرکردنە لە هێمای نابینندا، چونکە هەموو چاکسازییەکی گشتی دەبێتە بنەما بۆ داننان بە بوونی ئەوانی دیدا.

ئینجا ئەگەر ئێمە لە کەسایەتی کوردا هەر جۆرایەتیەك کە دەڕژێتە ناو هاوپۆلە باشەکانی جۆرایەتی لەنێوان رۆژئاوایەکانماندا بدۆزینەوە، دەبێت بخرێتەپاڵ بۆ سروشتێك کە ئەو ئارەزووەی هەیە، لەتوانایدا دەبێت پەرەپێبدات بەدرێژایی ئەو هێڵانە بۆ خێروبێری کۆتایی کۆمەڵگا. ئێمەش ئەوە دەبینین.

باوەڕداریتی جێگیر، ناسینەوەی وشەی تایبەت، سۆزێکی دەست و دڵ فراوانانە بۆ خزمە نزیکەکان،[96] چارەسەرێکی پیاوانە (لەنێوان کوردانی باشوور و ناوەڕاستدا) بۆ ژنەکەی زیاترە لەچاو

[96] ئەوە لەوانە نییە بۆ خوێنەری ئەورووپایی رووبدات وەك هەر شتێك بەڵام نابێت لە سروشتی هەمووادا بێت، وەك خۆشەویستی دایك، لەوانەیە، بەڵام ئەوە شتێکی نائاسایە لە رۆژهەڵاتدا، کە نزیکترین خزم هەروەها واتە گەورەترین دوژمن.

# کەسایەتی کورد

ئەوەی لەنێوان نەژادەکانی موسڵمانی تردا دەبینرێت، هەست و سۆزی ئەدەبی و تێگەیشتنی واتای شیعری، ئامادەیە خۆی بکاتە قوربانی بۆ تیرەکەی خۆی و شانازی بە وڵات و نەژادی خۆیەوە دەکات. لەگەڵ ئەوەی کە هەوا خۆشە، کورد خۆی بەرزدەکاتەوە و دەڵێت، بەپێی دیالێکتەکەی خۆی "ئەز کورمانجم" یان " من کوردم".

ئینجا ئەگەر یەکێ بتوانێ بە سەختی لەگەڵ وەسفی عیرفانی هاوڕابێ، کە لەلایەن گەشتیارێکی فەرەنسیەوە بەشێوەیەکی کورت دەڵێت:" کوردەکان قۆز و بەهێز و هوشیار و زۆر جوانن و ئەگەر شارستانی هێڵەکانی بۆ ئەوان هەبووایە، ئەوان لە دراوسێ تورکەکان و فارسەکان پێشتر دەبوون."[97] هێشتا مرۆڤ دەتوانێت ئەوان بە باشتر ببینێت بەگوێرەی ئەو نەژادە زۆرەی کە ئێستا لەبەر خۆری "شارستانیدا" شانازی بەخۆیانەوە دەکەن.

خوویەکی خراپیان هەیە، کوتوپڕ هەڵئەچن- بەهۆی ژیانی ناخۆش و دژوارە- لەگەڵ هەموویاندا، لەناو باشووریەکاندا، حەزیان لە گاڵتەوگەپە. ئەوان هەمیشە ئامادەن تا سەرگوزەشتە لەسەر تایبەتمەندێتی خۆیان بگێڕنەوە.

جارێك خانێکی هەرکی لە ئۆرامەرەوە (لە هەکاری) بوو، کە مێش پێوەیدابوو، شوێنەکەی خوراند، دوای پێنج دەقیقە هێشتا توڕەیە و دیسانەوە خوراندیەوە. جارێکی تر دەستیپێکردەوە و ئەویش دەمانچەکەی لەبەر پشتێنەکەی هەڵکێشا و جوێنی بە باوکی مێشەکان دا و تەقەی لە پەنجەی خۆی کرد و پەڕانی.

دوو کورد گفتوگۆیان لەسەر شوێنی ئەستێرەی سیریوس- کاکێشان کردووە (کە کۆتایی گەرمترین کەش نیشان دەدات) لەوانەیە لەگەردووندا جێگیربێت. بەبێ هیچ زمانێکی ئابڕووبەر لەسەر شوێنەکە ڕێناکەون، لە ڕێگا دەوەستن و پەلاماری یەکدی دەدەن و یەکێکیان لەوێ بە مردوویی جێماوە.

ئاوایە، زۆر بە کورتی کەسایەتی کورد. لە باشووردا هەمان پێناسە بە باشی هەڵدەگرێت، تەنیا توڕەیی کێوێتی باکووری لێنیە، کەمێ بە ئارامترن و گیانی نوکتەبازی هەیە لە هەر کارێکدا کە دەیکەن.

---

[97] هێنری بیندەر، Au Kurdistan لاپەڕە، 110.

## ژنی کورد

بێگومان نەزانیەکی مەترسیداری تیرە شاخاویەکان لەوێدا هەیە. ئایا چەند لەوانە تەنانەت تەمەنی خۆیان دەزانن چەندە؟ یان بزانن چی لە دەرەوەی کوردستان هەیە؟ ئەو بەپێی ئەو هەلە تەواو بەخێرایی فێردەبن و فێربوونی کورد وەك تێرنەخواردنە بۆ زانست، وەك جەردەیی بۆ تالآنی. تواناى زمانزانی سەرنجراکێشە و هەروەك هێمای بۆ کراوە غەریزەی ئەدەبی خۆرسکە.

لەنێوان دانیشتوانی باشووردا، کە دانیشتوانێکی زۆر جێگیربوون، جۆرێکی زۆر باش گەشەی سەندووە، زۆربەی کراوە بە سەرباز، بەگشتی لە تیرەکانی کەڵهور و باجەلان و جافدا هەلیان بۆ رەخساوە بۆ دەرخستنی تواناى کاری میکانیکی لەگەڵ مافی بەکارهێنانی نەوت، کە لەنزیکی قەسری شیرینەوە دەستیپێکردووە. لەوێ ئەو کەسانە خراونەتە کارەوە لەسەر بیرەکان و فرۆشگای ئامێرەکان و ئەو توانایەیان پێشانداوە کاتێ کۆمپانیاکە کارەکەی گوێزرایەوە بۆ بیرە نەوتەکانی ئێستا لە باشووری رۆژئاوای ئێران، ژمارەیەك لە کوردەکانی قەسری شیرینیان بردووە بۆ ئەوێ و هێشتا وەك بەشێکی وریاو شارەزای ئیشکەرانی ئەوێن و هەندێکیان برێکی گەورە توانا و شارەزاییان لە کاری تەکنیکی و میکانیکیدا بەدەستهێناوە. ئەو جۆرە جێگیر و لەسەرخۆن، بە دڵ کاردەکەن، لەگەڵ خواستێکی زۆر بۆ کۆکردنەوەی هەموو شتێکی پەیوەند بە ئەندازیاریەوە.

کورد لە باکورەوە بۆ باشوور یەك ژنی هەیە و خێزان بە دەگمەن لە سێ یان چوار تێدەپەڕێت. هاوسەر سەربەستیەکی بەرچاوی هەیە و ژنی کورد چینێکی باش لە ژنانی بێ بەزەیی و ئازان، کە شایستە رێزن لە چۆنیەتی ئەوەی لە ناخی خۆیاندا هەن، وەك جوانی لەش و لار کە زۆریان ناسکن. شۆڕەسوارێکی بوێرن و دەتوانن مامەڵە لەگەڵ تفەنگ بکەن و لەناو تیرە شەرخوازەکاندا ژنیش خۆیان پەیوەندی بە مشتومڕەوە دەکەن.

میلینجن- Millingen، گەشتیارێك لەناو کوردەکاندا، داستانێکی سەرسوڕهێنەر دەگێڕێتەوە کە چۆن ژنانی کورد خۆیان لەناو گروپە جیاوازەکاندا دەسازێنن بۆ تێکشکاندن و رووتکردنەوەی رێبواری نەگبەت.[98]

لە ماڵەوە ئەوان چاودێری هەموو شت دەکەن و کاتێ ئەوان بەتایبەتی لەناو خێڵە نیشتەنیەکاندا، ناچارە کاروباره دژوارە دەستیەکان بکات، وەك هێنان و هەڵگرتنی ئاو، ئەوان بە شێوەیەکی تەواو

[98] Millingen, Wild Life among the Koords, p. 244.

و بە گیان و دڵێکی پەرۆشەوە ئیشوکاری خێزان و ران و مێگەلەکانی رێکخستووە، بە توندی رووبەڕووی سەختی دەبنەوە، بەڵام وەك رووداوێکی بێ نرخ لە ژیاندا، کە لەوە دەچێت چێژی زۆری لـێ ببینن.

زووربەی کات هاوسەرەکە بە ئامادەنەبوونی پیاوەکەی لەناو گوندەکەدا، لەگەڵ نووسەری ئەم بابەتە دانیشتووە و گفتوگۆی لەگەڵ کردووە، هەرگیز هیچ لەو شوورەییە هەڵبەستراو یان ملکەچییەی تورك یان فارسی پێشان نەداوە و هاوبەشی لەگەڵ کردووە هەرچیەك لە ماڵەکەدا بۆ خواردن و خواردنەوە هەبوویێت و کاتێ پیاوەکە هاتۆتەوە، گرنگی پێنادات لەبەر رێزی میوانەکە، تا ئەسپەکە دادەمەزرێنێت، ئیدی مێردەکەی دێتە ژوورەوە و هاوبەشی میوانەکە دەکات، من لێرەدا باس لەوانە دەکەم کە وەك خۆیان سادە و ساکارن. من ئەوە دەزانم لای ئێمەی ئەورووپی شێوەی هەڵسوکەوت جیاوازە.[99]

لەئەنجامی ئەم سروشتە بێ پەردەییە و ژیانە سەربەستە، دەتوانرێت بوترێت لە زمانی کورمانجیدا تاکە وشە بۆ "لەشفرۆشی" تورکیە یان فارسیە و تەنیا لە شارەکاندا لەوانە تێدەگەن. داوێنپیسی لەناو وڵاتی کورداندا وەك دابڕانێکی بەرچاو و ناسروشتی لە هەموو هۆ و نەریتێك تەماشادەکرێت و سزاکەشی کوشتنە.

ژمارەیەکی زۆر هاوسەرگیری یەك هێزی راکێشانی دوولایەنەیە- نمونەی ئەوەم لە بەشی پەیوەند بە مانەوەی من لە هەڵەبجەدا باسکردووە. خۆشەویستی رەسەن لەنێوان ژن و مێرددا (کە لەنێوان میللەتانی ئیسلامدا دەگمەنە)، بەهیچ واتایەك لەنێوان تیرەکانی کەمتر کێوین نەناسراوە و دیاردەیەکی وردتری نەژادی نییە لەچاو ئەوەی کراوەیە و باش تێیدەگەن لەنێوان رەگەزەکاندا. شایەتحاڵ نمونەی عادیلە خانم[100]، بێوەژنەکەی غولام شاە، خانی سنە، لە ژنی بنەماڵە کۆنەکانی هەکاریە، کە ناونیشانی "خان"ی وەرگرتووە، واتە ئەو دەسەڵاتەی کە یەکسانە بە زۆر گەورەتر لە پیاوانی بنەماڵەکەی خۆی و زۆری تر لە هەموو لایەکی کوردستانی ناوەڕاست و باشووریی. ئەوە لەوانەیە تەنیا ئەنجامی تێگەیشتنی نێوان رەگەزەکان بێت زیادتر نزیکە تا رادەیەك لە بیری ئێمەی ئینگلیزەوە لەچاو ئەوەی لەنێوان نەژادە رۆژهەڵاتیەکانی تردا و لەهەمان کاتدا ئەوەش پێشاندەدا کە ئیسلام چۆن لەسەر خووگریی سەردەمەکانی کۆن کاریگەری هەبووە.

---

99- هەمیشە وانییە، بەهەرحاڵ، بڕوانە لایارد- Layard ، نەینەوا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە 153.

100- هەروەها خانمانی کرندیش، هەر یەك دیوەخانێکی گچکەیان هەیە.

نموونەکانی شێوەی مرۆڤ داوەریکراوە، کە لەوانەیە ئاستێکی بەرزتر لە ئاستی کورد نەبێت. باکووریەکان پیاوی بالأبەرز و تەنکن (قەڵەوی بەتەواوی لەناو کوردا نییە). لوتی درێژ، باریك و زۆرجاریش قولاپی، دەم بچکۆلە، روخسار هێلکەیی و درێژکۆلە. پیاوان بەئاسایی سمێڵی درێژ دەهێڵنەوە و هەمیشە ریش دەتاشن. چاوەکان تیژ و درِ. لەناویاندا زۆر قژی زەرد و چاوی شینی گەش هەیە و منداڵی کورد لەو جۆرە لەنێوانی ئاپۆرەیەکی منداڵانی ئینگلیزدا، مەحاڵە لەوان جیابکرێتەوە، لەبەرئەوەی پێستی سپییە. لە باشووردا روخسار هەندێ جار کەمێك پانترە و چێوەی قورسترە. لە چل پیاوی تیرەکانی باشوور بە هەرِەمەکی نۆیان باڵای لەژێر شەش پێوەیە، هەروەها لەنێوانی هەندێ تیرەی باڵا ناوەندی نۆیان پێنج پێیە. هەنگاویان درێژ و لەسەرخۆیە و توانای بەرگەگرتنی چەرمەسەرێیان بەرزە.

ئەوەی تەنیا پیاوانی شاخ دەتوانن بیکەن ئەمانیش بۆ خۆیانیان هەڵگرتووە، بە شانازی و رێك و رەوان و لەدیدی ئەوەی کە مادەکانی ئەمرۆن، بەنرخ بوون، ئەوانە تەنیا یەکگرتوبن، جارێکی دی دەبنەوە بە نەتەوەیەکی سەربازی مەزن، کە توندوتیژ و سەختی سروشت دەتوانێ واتاداریی نەژادەکان لەنێوانی ئەوانەی پێکەوە دەژین. زۆر و زۆر کەسم لەنێوانیاندا بینیوە کە وەك وێنەی "نۆرسمان" وەستاوە.

قژی زەرد، سمێڵی درێژی شۆڕ، چاوی شین و پێستی سپی- یەکێکە لە بەڵگە باوەڕپێکراوەکان، ئەگەر زانستی فیزیۆگنۆمی- شروشت و رەوشتی مرۆڤ- پێوەرێك بێت (زمانیان نابێتە بەڵگەیەکی تر)، کە ئەنگلۆ- ساکسۆن و کورد یەکێکە و لە هەمان قەدی درەختن.

لە جلوبەرگدا هەمیشە سەرنجڕاکێشەر بووە و لەوە باشترم پێناکرێت جگە لەوەی دەقی ئەو شێوازی کوردانەی سەد و حەفتا ساڵ لەوەبەر دەربڕمەوە:- لە پێشەوە، بەسەر ئەسپێکی بچووکی لاواز و ماندو، باڵا بەرزێك سواربووە، پەیکەرێکی رەقەڵە، هەموو ئەو جلوبەرگە ناشرینانەی پۆشیوە کە زەوقی کورد پەسەندیکردوون. سەرومێزەر تەواو جوانە و تاراِدەیەك بە قەبارەی ئەسپ و سوارەکەیە، سەری دەشارێتەوە، کە لەوە دەچێت پەرچوویەك لەنێوان شانەکانیەوە بە پەستانێکی زۆر پاڵپێوەنرێت. لەناوەندی ئەم هەموو پەرۆ رەنگاورەنگانەدا کلاوێکی شێوە قوچەکی لە لبادی سپی بەرزبۆتەوە. ئەم بارتایە لەوە دەچێت رێورِۆشتنی ناجێگیر بدات بەو لەشولارە لەرِ و لاوازە، کە بەزەحمەت بتوانێت راگیریکات. شەرواڵێکی زۆر فراوانی سووریاوی لەبەردایە کە لاکانی لەملاولای ئەسپەکەوە دەرچووە و بەباشی لەم بەرەوە بۆ ئەو بەری چەمەکە دەکشێت. هەموو رەنگی سوور و

زەرد لە چاکەتەکە چنراوەکەی و عەباکەیدا دەردەکەوێت و لەبەر پشتێنەکەیدا چەکێکی قەوارە سەیری تێدایە و هەموو شتەکان کارێکی خەیاڵیە."[101]

لە داوێنەوە هێمادەکەین بە جلوبەرگی کوردەکانی موکریی باکوور، باشووری ورمێ:- " شاڵێکی حەریری خەتخەت لە سەریان دەبەستن، سوور، سپی و شین، داوینەکەی گێزوگوڵنکەی پێوەیە، کە بەشێوەیەکی رێکوپێك لە دەوری کڵاوێکی سووری چنراو دەبەسترێت و ریشو و گوڵنکەکانی بە رێکی بەردەداتەوە، روخسارێکی موسوڵمانە و چاوی گەش و رەش، لەژێر ئەو سەرومێزەرەوە سەیر دەدرەوشێتەوە. پۆشاکی بەری بریتیە لە جۆرە کەوایەکی بێ قۆڵ و چاکەتێکی پانوپۆڕی تورکی گەرمی قۆڵدار، کە زۆرجار دەوڵەمەندانە چنراوە، ئەویش بەپێی پلە و پایەی خاوەنەکەیەتی. لەژێریشەوە شەرواڵێکی لەبەردایە، کە جیاوازی نیە لەگەڵ ئەوانەی مەمالیکەکان، کە لەکاتی سواریدا چاکی کەواکەی ئەشەکێتەوە. لەدەوری کەمەری، لەجیاتی شاڵ، کەمەربەندێك بە ئاوزونەیەکی زیوی زل و ناقۆڵا دەبەستن، نەخش و نیگارەکەی لەوانەیە بەپێی خواستی خاوەنەکەی بێت لەگەڵ گەوهەرەکەدا و تەنیا خەنجەرێکی کوردی پێدا ناکەن، بەڵکو جوتێ دەمانچەی دەسکداری مسی زەرد یان زیوی باشی پێدا دەکەن. هەروەها لێرەدا، کەڵەشاخی باروت و سەندوقی فیشەك و ئەو جۆرە شتانەی پیادەکرێت و لەسەرو هەموو ئەوانەشەوە جۆرە عەبایەك دەکات بەسەریدا، کە لە توکی وشترە و سپی یان رەشە، یان خەتخەتی سپی، قاوەیی و رەش، لەسەر سنگی دەبەسترێت و وینەییەکی ناجێگیری هەیە لە پشتەوە."[102]

ئەو پۆشاکانەی لێرەدا پێناسەدەکرێت هەرگیز نەگۆڕاوە، جگە لەوەی دەمانچە گەورەکان لەوانەیە گۆڕابێت بە دەمانچەی تۆپلی و فیشەکدانیش کراوەتە سەر شان و چوار یان هەندێ جار تەنانەت پێنج ریز فیشەکدانە، یەك بەسەر ئەوی تردا، دەوری جەستەی سوارەکەی داوە. لە باشووری سلێمانی و جاف، "J. C. Rich ریچ" ئەم پێناسەیەی لای خوارەوەی داوە:- "پۆشاکەکەی شێوەی هیندی سورمەی چنراوی پڕ گوڵی ئاڵتونی، شاڵێکی کەشمیری جوانی هەیە، کە ریشووی ئاڵتونی بۆ کراوە، لەسەر سەری بەشێوەیەکی لابەلا دەیبەستێت، بەرگی سەرەوەی پاڵتۆ، یان عەبایەك لە قوماشی رەنگ قاوەیی سووریاو لەگەڵ قوڵفە ئاڵتونیەکاندا، یان دوگمە و تەرەقەکانی سەری.

---

[101] لایارد- Layard ، نەینەوا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە 206-7 (پێناسەی هەکاری)، 1848.

[102] فرمیزە، گەشتێك لە کوردستاندا، لاپەڕە، 86، ساڵی 1835.

" پیاوانی جاف جۆرە کەوایەك دەپۆشن و پشتێنێك لەناوەڕاستیدا لەسەری دەبەستن، لەگەڵ خراپترین پیلاودا، کە پێکان بە خۆشی دادەپۆشێت و کلاوێکی شێوە قوچەکی کردۆتە سەر."[103]

بندەر- Binder کە گەشتیارێکی هاوچەرخە، وەسفی پۆشاکی هەکاری باکوور دەکات، دەڵێت:- "کلاوێکی قوچەکی سپی بەدەوریدا جامەدانیەکی گەورە دەبەستن، شەرواڵەکانیان بەئەندازەیەك پانە." کە لە توکی بزنی سوور دروستکراوە و زۆرجار وێنەی تێدا نەخشکراوە، کەوایەکی کەمێ کەمەر تەسك دەپۆشن و زۆر جار درێژبۆتەوە بۆ لای پاژنەکانی و لەسەر کەمەریدا بە پشتێنی قوماش یان قایش بەستراوە، زۆرجاریش بەسەر ئەوەدا پاڵتۆیەك دەپۆشن کە لە درێژیی کەواکە تێناپەڕێت و لە توکی بزن چنراوە و بە شێوەی گەورە رازێنراوەتەوە. پێڵاوەکانیشیان لە پێستە و رەنگی سوورە، پاژنەیەکی بەهێزی لسێ درراوە."[104]

لای کوردەکانی موکری و رەواندوز هەندێ شت گۆڕاوە، لەوانە لەجیاتی کلاوی سپی بووە بە سەوز و لە قوماش دروستکراوە و زۆر بەرز نییە، بەڵام لەگەڵ یەك دوگمەی رەقی سەخت و نوساوە بە خاڵێکی بەرزدا. مێزەرەکەیان بچووکترە و بەشێوەیەك پێچراوەتەوە کە هەردوو لای روخساری داپۆشیوە. "قابا"یەکی فارسی دەپۆشن، کە بریتیە لە کراسێکی دەڵبی بێ قۆڵ و ناگاتە لای ئەژنۆکان و زۆر جار بەسەر ئەوەدا "سەرداری" یان کەوایەکی توێ توێکراو لەبەردەکەن، کە لە قەدیفەیەکی رەنگی کاڵ دروستکراوە.

هەروەها کەسێك کە دەچێت بۆ باشوور جلوبەرگ زیاتر لەوە دەچێت کە عەرەب لەبەریدایە. جلوبەرگی ئیشکەرانی باکوور، کە پیاو زووربەی کات لە کراسی فەقیانەداردا بوون، کە گۆڕاوە بە کەوایەکی درێژ و دەگاتە قولەپێ، بەسەر کراسێکی سپیدا، قۆڵەکانیشی وەکو قۆڵەکانی پۆشاکی سەرەك قەشەکان لە زەوی دەدات. "سەڵتە" یان چاکەتی زوافە دەپۆشن، کە بەئاسایی لە قوماشێکی رەنگ ناسك دروستکراوە و بە زێڕ رازێنراوەتەوە و بەپێی تیرەکە مێزەری جیاواز دەبەسترێت، بە ئاسایی بە گوێرەی کلاوەوە لە قوماشی لۆکەیە و چنراوە.

لەوەش زیاتر بۆ ئەم جلوبەرگە هەموو خێڵەکانی باشوور یەلەکێکی کوردانە دەپۆشن، کە بێ قۆڵە و نزیکەی نیو گرێ ئەستوورە.

---

[103] ریچ، مانەوە لە کوردستاندا، بەرگی یەکەم، لاپەڕە، 77 و 181، ساڵی 1820.

[104] بیندەر، لە کوردستاندا، لاپەڕە، 109- 10، ساڵی 1887.

جلوبەرگی ژنانە سادە و ساکارە. لە باکوور، کراسێکی هاودامانی رەنگی و ئاوەڵکراسێکی تەواو کە لە داوێنەوە سورمەییە. هەروەها سەروپێچێکی گەورەش دەبەستن.

بەگوێرەی ناوەڕاست و باشووری کوردستانەوە، جلوبەرگ زیاتر ئاڵۆزترە. ژنانی موکری و سنە ناودارن بەوەی لە ژنانی تیرەکانی تر مێزەری گەورەتر دەبەستن، برێکی گەورە لە دەسرۆکەی حەریری رەنگاورەنگ پێکەوە تێکەڵ دەکەن. گوارە، بازنە، پۆیلانەیەك لە پارەی ئاڵتون بە دەوری ناوچەوانیاندا دەکەن، ئەوە هەمووی هاوبەشە لەگەڵ جلوبەرگەکانیان. لەناو موکریدا ژنان زۆرجار "سەرداری" دەپۆشن، ئەگەر ئەوەش نەبێت، "چارۆکەیەك" کە جۆرێکە لە قوماشێکی ئەستوور دەدرێت بە شان و ملدا. حیجاب بەتەواوی لای کوردەکان نەناسراوە و ژنان هەرگیز رووی خۆیان ناشارنەوە.

ئەو جلوبەرگانەی لەلایەن ژنانی سلێمانییەوە لەبەردەکرێت، لە هەمان کاتدا سروشتی کوردیە، کەچی لەژێر کاریگەریی شێوازی عەرەبیدایە.

جلوبەرگی ژێرەوە بریتیە لە ژێرکراسێکی کورت و ئاوەڵکراسێکی پانوپۆڕ، کە بەشی سەرەوەی لە مەلمەلێکی لۆکەی سپییە و داوێنەکەشی لە قوماشی خەتخەتە. بەسەر ئەوەدا کراسێکی هاودامانە لەگەڵ فەقیانەیەکی لۆکەی سپی و لەلای ملەوە کراوەیە. هەروەها بەسەر ئەوەشدا "کەوا"یە هاوشێوەی پاڵتۆیەکی درێژە هەروەها دەگاتە سەر پێکان- بێ دوگمە، لە پێشەوە لە یەکنادەن، لە قوماشێکی ئەستورترە، قۆڵەکانی کەمێ تەسکە، بەڵام تلیشێکی بەرووی ناوەوەدا تێدایە چەند پەنجەیەك لە مەچەکەوە.

کڵاوی سەر بریتیە لە"فێست"ێك کە کەمێك رازێنراوەتەوە، کە دەسترۆکەیەکی رەنگین لە پشتەوە دەدرێت بەسەریدا و زۆرجار دەهێنرێتەوە بۆ ژێر گەردن. سرکەیەکی رەش لە دەوری دەبەسترێت، کە لە "شامار" دەچێت. ئیدی سەرپۆشێك دەدات بە سەریدا، پۆشاکێکی ناسك وشکۆدارە، بەتایبەتی کاتێ باڵابەرزێك دەیپۆشێت، وەك زووربەی ژنانی سلێمانی.

کوردەکانیش هەرچۆنێك بێت بەتاڵ نین لە ئەفسانەی پڕوپوچ و فۆلکلۆر کە پێشبینیکراوە لەناو ئەو جۆرە میللەتەدا.

وەکو فارسەکان کە ئیسلام ئەفسانە پڕوپوچەکانی کۆنی لێ دوورنەخستۆتەوە، هێشتا باوەڕیان بە پەری هەیە و هەروەها بە جنۆکەی عەرەبەکان کە شوێنێکی گەورەیان داگیرکردووە لە نەخشەی جیهانی ژێرەوەدا، پەری و شەخس هێشتا ئاستی خۆیان پاراستووە. هەروەها پیر و پیرۆز، بەردەوام

بنچینەی ئەوانە پێچراوەتەوە لە نادیاریدا و کە باوە دەبێت لە شوێنە تایبەت و گۆڕستانەکاندا هەبن، شوێنێك کە پێشنیهادی جادوگەری لەوێدا سەریهەڵداوە، وەك ئەوەی ناو ئێران کە پاشماوەی ساڵانێکی زۆر پێش ئیسلامە.

شەخسەکان گروپێکی سەیرە لە بوونەوەرە شۆڕبووەکانی سروشتن، لەناو ئەوانەدا هەموو شەهیدانی ئیسلام و زۆر لە کوردەکان لەبەرگری لە تیرەکەی خۆیاندا شەهیدبوون و ئەوانیش وەك ئەوانەی لە ژیاندان، تیرەیەکی کۆچەری پێکدەهێنن، یارمەتی کوردەکان دەدەن لە گەیشتن بە ئامانجەکانیان. لە راستیدا، ئەوانە لەبەر تیشکێکی زۆر هاوشێوەدا دادەنرێن بە پیر و لەوانەیە لەو شوێنانەی ئەوانی لێوەستاوە بپارێنەوە- زۆرجار درەختی گەورە لەم لاو لای گردەکاندا هەیە.

پەری کە وەك وشە تایبەتەکەی ئێمە و بیری پەرییان- لە بنچەدا هەمان بوونێکە کە فۆلکلۆری خۆمان بۆمان دەگێڕێتەوە، هەرچەندە داستانەکەی ئێمە لە باکووری ئارییاییەکانەوە هاتووە، کەواتە پەرییەکانی ئێمەش هەمان میلییە گچکەکەیە وەك پەرییەکە.

بە گوێرەی جنۆکەوە، عەرەبی نەگبەت دروستیکردووە، وەك محەمەد، کە لەوانەیە لە نەریتەوە وەریگرتبێت، ئەو دەناسێنێت بە، "بوونەوەرێکە لە ئاگر، بەڵام بە چەشنی مرۆڤەکان، وابەستە بە خۆراك بۆ بوون و وەك مرۆڤەکان، هەندێ گەغوو و هەندێ بەباشی لێی رزگار بووە و هەموو گەغوویەك وەك شەیتانەکان نین."[105]

بەڵام بە گوێرەی شەیتانەکانەوە، ئەوان هەن، وەك ئەوەی کردیان لە رۆژانی زەردەشتدا، بەڵام کورد، چونکە ژیانێکی زۆر دژوار و سەخت دەژی، لەوە دەچێت کەمێ بیر لەوانە بکاتەوە.

---

[105] لە کتێبێکی گچکەوە لەبارەی بناماکانی ئیمان، شیراز، 1902.

## پاشکۆ

## تیرەکانی کورد

تیرە سەرەکیەکان لەسەر سنووری تورکیا و ئێران. لە 1-9 کوردی کورمانج- کوردمانجی، کوردەکان، لەکاتێکدا ئەوانی دی تەنیا "کورد" بۆ رەسەنایەتی خۆیان بەکاردەهێنن. ئەوانەی ناوی یەکەم بەکاردەهێنن "کورمانج" لە پاکترین خوێنی کوردن.

- **حەیدەرانلو**

تیرە ژێرلقەکان: زیلانلو، حەسەنانلو، نادەمانلو، سپیکانلو، جیبرالو، زیرکانلو، شادی، میلان، مامەنلو .

شوێنی ژیانیان: بانەکانی ئەرمینیا و بەرەوژوو بۆ سنووری ئێران.

- **شەکاک- شوکاک**

شوێنی ژیانیان: سنووری ئێران، نزیك سەڵماس.

- **هەکاری**

تیرە ژێرلقەکان: ئۆرامەر، شەمسدینیان، جەلو، هەرکی، زێباری، روژەکی (تیرەیەکی کۆنە کە میرەکانی بتلیسی لێوە هاتووە)، شەرناکلی، خیزان، بەرزان، گیردی، بەهدینان (کە بنەماڵە بەهێزە ئاییبنیەکان و شێخەکانی لێوە هاتووە)، میزووری، بوهتان، حەسەن کەیفان، ناوچەی، جەلالی، رەوان و زۆر خێڵی بچووکتر.

شوێنی ژیانیان: بتلیس، دۆڵی زابی گەورە، تیاری، ئامێدی، جزیرەی ئیبن عومەر.

- **موکری**

شوێنی ژیانیان: سەوج بولاق- سابلاخ و ناوچەی دەوروبەر، تا سنووری تورکیا.

- **پشدەر**

تیرە ژێرلقەکان: نورەدینی و ئەوانی دی...

شوێنی ژیانیان: سەرو دۆڵی رووباری زابی خواروو.

- **بڵباس**

شوێنی ژیانیان: چیای قەندیل لەناو کوردستانی ناوەندا.

- **ڕەواندوز**

شوێنی ژیانیان: ڕەواندوز.

- **شوان**

باشووری زابی خوارو، باکووری ڕۆژهەڵاتی کەرکوك.

- **بابان**

شوێنی ژیانیان: سلێمانی.

- **بانە**

شوێنی ژیانیان: بانە.

- **مەریوان**

شوێنی ژیانیان: مەریوان.

- **جاف**

تیرە ژێرلقەکان: پوشتەماڵە، ئامالە، جافی سەرتەك، تیلان، میکایەلی، ئاغاسووری، چەنگانی، ڕۆخزایی، تەرخانی، باشاکی، کیلالی، شاتری، هارونی، نەورۆلی، کۆکۆیی، زەرداوی، یەزدان، بەخشی، شێخ ئیسماعیلی، سادانی، باداخی، موسایی و تیلەکۆ.

شوێنی ژیانیان: لە قزلّ ڕەباتەوە بەدرێژایی کەناری ڕووباری سیروان تا دووری شارەزوور و پێنجوێن.

- **هەمەوەند**

شوێنی ژیانیان: قەرەداغ نزیك سلێمانی.

- **شەرەفبەیانی**

شوێنی ژیانیان: هۆرین، لەسەر باشووری ڕووباری سیروان، لە خاکی ئێراندا.

- **باجەلان**

تیرە ژێرلقەکان: جومور، شیراوەند، حاجیلەر، چەرپیاوەند، دەندەوەند و قازانلو.

شوێنی ژیانیان: یەکسەر باشووری شەرەفبەیانی.

- **ئۆرام، یان هۆرام- هەورامی**

تیرە ژێرلقەکان: هۆرامی عەلی شاە، هۆرامی سولتان جەعفەر.

شوێنی ژیانیان: چیای هەورامان.

- **ساڵەیی**

شوێنی ژیانیان: کفری، ناوچەی سالەیی.

- **گۆران**

تیرە ژێرلقەکان: غەوارە، بازیانی، نەرژی، قەڵخانی، بویانی، کاڵە زەنجری، قادری میر وەیسی، تایشای و خێڵە بچووکەکانی تر.

شوێنی ژیانیان: بەشی ڕۆژئاوای پارێزگای کرماشان.

- **کەڵهور**

تیرە ژێرلقەکان: شوان، کۆچیمی، چەرزریەری، ئەڵوەند، خالیدی، شیانی، سیاسیا، کازم خانی، خامان، کالەجوبی، هارونئابادی، بەیداخبەگی، کەرکاە، مەنسوری، ڤەرمیزیاری و ئەوانی دی.

شوێنی ژیانیان: پارێزگای کرماشان

- **سنجابی**

شوێنی ژیانیان: نزیك سنووری تورکیا، لە پارێزگای کرماشاندا.

# BIBLIOGRAPHY

The undermentioned are the principal works which have

Been used for purposes of reference and comparison:——

The Bible.

A Literary History of Persia^ Prof. Browne, M.A., M.B., F.B.A. Unwin, 1906.

A Year among the Persians^ Prof. Browne, M.A., M.B., F.B.A. Murray.

Bustan us Staha, Haji Zainu'l 'Abidin Shirwani.

Hagaiqu't Taraig, Haji Mirza Ma'sum Shirazi, Naibu's Sadr. Teheran, 1314 a.h.

Treaties between Persia and Turkey^ Aitchison.

Ghayyath ul Lugha. Bombay.

Dictionary of Islam, Hughes. Allen, 1895.

Athar-i-Ajain, Fursat Shirazi. Bombay, 1314 A.H.

Persia, Past and Present, Prof. T. Williams Jackson. MacMillan, 1906.

Nineveh and its Remains, Layard. Murray, 1850.

DabistanuH Mazahib, A.H. 1267.

The Qur'an.

Commentary on the Quran, Wherry. Paul Trench Trubner, 1896.

Sale's Quran.

Persia, Lord Curzon.

Assyria, Ragozin. Unwin, 1898.

Parthia, Rawlinson. Unwin, 1893.

Armenia, H. F. B. Lynch. Longmans, 1901.

Travels in Koordistan, Fraser. Bentley, 1835.

Residence in Koordistan, Rich. Duncan, 1836.

Armenia, Koordistan, etc., Kinneir. Murray, 1818.

Wild Life among the Koords, Millingen. Hurst <& Blackett, 1870.

Au Kurdistan en Mesopohvnie^ Binder. Paris, 1887.

Travels in Persia^ etc.^ Wagner. Hurst & Blackett, 1856.

Annenians, Koords, and Turks, Creagh. Tinsley, 1887.

Histor)' of Persia, Malcolm (Persian translation).

Assyrian Life and History, Ilarkness. R. T. Sec.

# ئیندێکس



## وەرگێڕ

## مینە

## (محەمەدئەمین حسین عەلی)

### بەرهەم و نووسین

- سەلیقەی کوردەواری، لە بڵاوکراوەکانی سوید- کوردستان، ساڵی 1994
- زمانی جەستە، پەیوەندیە گۆنەکراوەکان، سلێمانی، ساڵی 2004
- عەشق لە جوانکاریدا، بەڕێوەبەرێتی چاپ و بڵاوکردنەوە سلێمانی، ساڵی 2005
- زمانی جەستە، درۆ و هێماکانی درۆکردن، کۆمپانیای ئاوێنە، سلێمانی، ساڵی 2007.

# له بواری وەرگێڕاندا

- نامە ئاوارەکان، نووسینی کارۆ، لە فارسیەوە، سلێمانی، ساڵی 2006
- زمانی روخسار، نووسینی رۆبەرت وایتساید، لە ئینگلیزیەوە، کۆمپانیای ئاوێنە، سلێمانی، ساڵی2007
- سلێمانی..ناوچەیەك لە کوردستان، نووسینی مەیجەر سۆن، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، لە ئینگلیزییەوە، سلێمانی، ساڵی 2007
- کوردی سووریا، نووسینی هێریەت مۆنتگومری، بە هاوبەشی مینە و پێشەوا، مەڵبەندی کوردۆلۆجی، لە ئینگلیزییەوە، سلێمانی، ساڵی 2009.
- گەشتەکەی ریچ، نووسینی کلاودیوس ریچ، بەرگی دووەم، بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان، لە ئینگلیزیەوە، سلێمانی، ساڵی 2012
- ولایەتی موسڵ، راپۆرتی کۆمەڵەی نەتەوەکان، بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان، لە ئینگلیزیەوە، سلێمانی، ساڵی 2012
- زانایانی ئایینی کورد و قوتابییە ئەندەنووسیەکانیان، نووسینی مارتن ڤان برۆینەسن، ناوەندی مێژوویی جەمیل رۆژبەیانی، لە ئینگلیزیەوە، سلێمانی، ساڵی 2016
- لیڤیەکانی عێراق، نووسینی جۆن گیلبەرت براون، ناوەندی مێژوویی جەمیل رۆژبەیانی، لە ئینگلیزیەوە، سلێمانی، ساڵی 2016.
- گەشتێك بۆ میسۆپۆتامیا و کوردستان لە بەرگی نادیاردا، نووسینی مەیجەر سۆن، لە بلاوکراوەکانی کتێبخانەی یادکار، لە ئینگلیزیەوە، سلێمانی، ساڵی 2018.
- رامان لە مرۆڤدا، نووسینی رجاءالنقاش، لە عەرەبییەوە، بە 26 ئەڵقە لە بلاوکراوەی مانگانەی مەڵبەندی رۆشنبیری کورد لە لەندەن بلاوکراوەتەوە، ساڵی 1990.

# TO MESOPOTAMIA AND KURDISTAN IN DISGUISE

## WITH HISTORICAL NOTICES OF THE KURDISH TRIBES AND THE CHALDEANS OF KURDISTAN

BY
Ely Banister Soane

LONDON
1912

Translated By Meena